"ئەم بەرگرینامەیە پێشکەشە بەو شەهیدانەمان کەلە پێناو رزگاری گەلە خۆشەویستەکەیان و

ئەو جوگرافیایەی لانکەی لە دایکبوونی مرۆڤایەتییە، قارەمانانە گیانیان بەخت کرد"

عەبدوڵڵا ئۆج ئالان

# لە دەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە

# بەرەو شارستانییەتی دیموکراسییانە

## بەرگی یەکەم

لە دەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانییەتی دیموکراسییانە

نووسەر : عەبدوڵڵا ئۆج ئالان

چاپی دووەم: ئازار ٢٠٠٢

لە بڵاوکراوەکانی میزۆپۆتامیا

ناوەڕۆك.........................................................

## پێشەکی

لە قۆناخی دادگای ئیمرالیدا هەلومەرج وەهای پێویست دەکرد بە خێرایی رێ لەبەردەم ئەو توندوتیژییە بگیردرێت، کە لە ئەنجامی دەستگیرکردنی من لەمیانەی پیلانگێڕیەوە هاتە ئاراوە. بەمرەنگەش دەرفەت نەدرێت ئامانجەکانی پیلانگێڕان و کۆڵەکەکانیان ئەنجامگیر ببێت. بۆیە ئەگەر بە شێوەیەکی سنووردداریش بێت، هەنگاونانێکی راست و بەجێ لەپێناو رەخساندنی کەش و هەوایەکی ئاشتی و شەرەفمەندانە پێویست بوو. هەڵوێستی هەرە کردارییانە ئەوە بوو بەرگرینامەکەم لەسەر بنەمای پێشخستنی ئاشتی و چارەسەری دیموکراسییانە بێت. هەرگیز پێویستە ئەوە لەبیر نەکرێت لەو هەلومەرجەدا کەش و هەوای سزادانێکی (لینجی) سیاسیانەی بێ دادگایی کردن سەپێنرابوو. من وای بۆ دەچم کە دەوروبەر و ناوەندە بەرپرسیار و واقیعبین و لۆژیکیەکانی تورکیاش لەژێر ئەو هەلومەرجەدا لە رەوشێکی وەهادابوون زۆر لەوە دووربوون دەرك بە چۆنیەتی پێشکەوتنی لۆژیکی ئەم پیلانگێڕیە بکەن، یاخود بۆ ئاراستەیەکی بەمجۆرەی پێشکەوتنەکان ئامادە نەبوون. دەتوانین بڵێین کە لە هیچ ئاستێکدا زەمینەی بڕیاردانێکی گونجاو لە ئارادا نەبوو، یاخود سنووردار بوو. بە شێوەیەکی سەرەکی پیلانگێڕیەکە لە ئاسمانەوە دیارییەکی پێشکەش بەم شۆڤینیزمە کرد کە گەیشتبووە ئاستی "**هەستریا**"، بەمجۆرە لە سەدەی بیست و یەکەمدا "**لەیستۆکی مەیدانی ئارانا**"ی رۆما ئامادە دەکرا، واتە نێچیر دەرخواردی شێر دەدرا. لێرەدا چڕبوونەوەی توندوتیژیەکی کوێرانە هاتە ئاراوە کە لە دەرەوەی ئامانجەکانی PKK و تەنانەت دژی ئامانجەکانیشی دەبۆوە. چەندە بە ئێش و جێگای داخە تەواوی ئەوانەی دژ بە یەکتری بوون باوەڕییان بەوە کردبوو، یان ناچار کرابوون، بەمجۆرە تێبگەن و پێویست ببینن، پەیڕەوکردنی هێرشی گیانبازی بە شێوەیەکی دژوارانە، ماڤ بەرگری رەوایانە. لایەنی هەرە خراپی ئەم مەسەلەیەش ئەوە بوو لایەنەکان زۆر لەوە دوور خرابوونەوە لە راستینەی ئەم پیلانگێڕییە تێبگەن. یەکێك لە خیانەتە هەرە مەزنەکانی سەردەم خیانەتی ئەو کەسانە بوو کە تاکو ئێستاش خۆیان بە دۆست و ئازادیخواز نیشان دەدەن، بەمجۆرە کەسانی هەرە ستەملێکراو و خاوەن هەڵوێستی قارەمانانە بە شێوەیەکی بێ بەزەییانە لەنێو دەبردران و لەبیر دەکران. بەمجۆرەش گۆڕەپان بۆ ئەو خیانەتکار و نۆکەرانە دەمایەوە کە لە بۆسەدا بوون و لەڕابردووشدا بە بێ شومار بە زەمینەی بەمجۆرەدا تێپەڕ ببوون.

لە راستیدا هەموو شتێك بە گوێرەی لەنێوبردنی من رێکخرا بوو. بە شێوەیەکی سەرەکی ئامانج پاکتاوکردنی جەستەیی بوو. ئەگەر ئەمەش پێك نەهاتایە، ئەوا بێکاریگەرکردن و لەناوبردنی مەعنەوی ئامانج بوو. سەرەڕای ئەوەی سەبارەت بەم مەسەلەیە زۆر سەرقاڵی بیرکردنەوە بووم، بەڵام شیمانەی ئەوە ناکەم جیاواز لەمە ئامانجێکی دیکەیان هەبووبێت. پیلانگێڕی هێندە قووڵ و پڕ لە نهێنی بوو، کە بەڕاستی بۆ پووچەڵکردنەوەی پێویستی پێهەڵگرتنێکی **مرۆڤایەتی** وەها بوو کە لە ئاستی **موعجیزە**دا بێت. هەموو شتێك بەگوێرەی چارەنووسێکی بێ بەزەییانەی وەها رێکخرابوو، کە تەواوی جیهانی خستبووە نێو هەڵوێستێکی دژ، تەنانەت هەڤاڵانم و دۆستانی هەرە نزیکیش بە گوێرەی بیروباوەڕی و بەهای ئەخلاقییان، لە "**مردنێکی شەرەفمەندانە بەولاوە**"، ئومێدێکی دیکەیان نەبوو. ئەمە لۆژیکی سەردەم بوو. لۆژیکی دۆست و دوژمنانیش بەمجۆرە بوو. ئەمەش ئەو خاڵە بوو کە هەست و باوەڕیەکانی تەزاندبوو. هەموو شتێك منی مەحکومی تەنیایەکی ترسناك دەکرد. بە گوێرەی یاساکانی شەڕ گوللەباران کردن ناتوانم بڵێم سزایەکی دوورە، سەرەڕای ئەوەی بە مافێك دادەنرێت، بەڵام ئەم مافە بۆ من رەوا نەبینرا. شارستانییەت دەیخواست بە شێوەیەکی دیکە تۆڵە بسێنێتەوە.

من هیچ کاتێك لەپێناو ناووبانگ و قارەمانێتی رۆڵم نەبینی و کارم نەکرد. هەروەکو چۆن خاوەن جەسارەتێکی کوێرانەی وەهاش نیم کە شیمانە دەکرێت، سەرباری ئەوەی داخوازیم ئەوە بوو وەکو راستینەی خۆم بناسرێم، بەڵام زۆر باش بۆم روون بۆوە کە تەنانەت نزیکترین هەڤاڵانیشم بە گوێرەی راستینەی خۆم نامناسن. بەڵام تایبەتمەندییەکم هەبوو کە نەمدەتوانی خیانەتی لێبکەم: ئەویش ئەوەبوو کە دەبوایە درێژە بە رەوشی ئەو مندالە بدەم کە خیانەت لەخەیاڵەکانی ناکات، خوداوەندەکانی شارستانیم نەدەناسی و لەنێو دام و دەزگاکانیدا نەدەتوامەوە و بۆ ژنەکانیان نەدەبووم بە پیاوی ماڵ. دیالەکتیکی کەسایەتیم لە پێشکەوتنێکی بەمجۆرە سەرکەوتبوو. زۆر لەمێژبوو کێشەکە ئەو سنوورەی تێپەڕاندبوو کە ناکۆکییەکی ئاسایی ناوخۆی تورکیا بێت. ئەو شوێنگەی کە تێیدابووم ناچاری دەکردم رۆڵی پرۆمیتۆسی هاوچەرخ ببینم. هەروەکو چۆن لە خاچدانی من لەنێو گاشە بەردەکانی ئیمرالی جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ لە خاچدانی پرۆمیتۆسی ئەفسانەیی نییە کە لە چیاکانی قەفقاسیا لە خاچدرا، لێکچوونێکی چەندە بەئێش و خەمگینە کە لە خاچدانی منیش لەلایەن نەوەکانی زیۆسی خوداوەندی "**ئەتینا**"وە ئەنجامدراوە.

مۆسکۆش کە یەکێکە لە ناوەندە هەڵبژێردراوەکانی شارستانییەت، وەك چۆن گەمەی بێ هاوتا و چەپەڵانەی بەرامبەر بە سۆسیالیزمی بونیادنراو ئەنجامدا، کە ئومێدی ملیۆنەها خەڵك بوو، ئەوا سەبارەت بەمەسەلەی منیش بە بێ هیچ شەرم و سڵەمینەوەیەك لەپێناو قەرزوەرگرتن لە سندوقی دراوی نێودەوڵەتی"IMF"، هەمان رۆڵی دووبارە کردەوە. لەڕۆماش گۆڕەپانی کلاسیکی کۆیلەداری و لێکدانەوە ووردەکانی سەرمایەداری سەردەم هیچ بەهایەکی یاسایی و ئەخلاقییان نەدەناسی و هەموویان پێشێل دەکرد و بەتیرۆرێکی سایکۆلۆژی سەرسووڕهێنەر لەپێناو پاراستنی کەرامەت منیان ناچاری شەڕێکی مەزن دەکرد. منیش ناچار دەبووم پێداویستییەکانی ئەم شەڕە جێبەجێبکەم. ئەتیناش بە شێوەیەکی هێندە چەپەڵانە باوەڕی دۆستانەی بەکارهێنا کە تەنانەت گڵاوترین و پیسترین سۆزاانیش خەیاڵی بۆ ناچێت و ناوێرێت ئەنجامیبدات، بەمجۆرەش منی بۆ پایتەختی "**کینیا**"ی وڵاتی هۆڤان بە دیاری دەنارد. بەمرەنگە چرکە دوای چرکە زیاتر رووی رەش و تەڵەکەباز و بێ هەستی شارستانییەتی سەدەی بیستەم ئاشکرا دەبوو کە لە بەرژەوەندی خۆی بەملاوە بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکاتەوە، منیش لە بەرامبەر ئەم راستینەیە سەرم سووڕدەما. هەر ئەم واقیع و راستینەیەی لایەنی بەرامبەر بوو کە هێزی بەرپەرچدانەوەی لە مندا بەربەست کرد، ئەمەش راست بوو. ئەگەر ئەو دەوروبەرانەی چاوەڕوانی هەڵوێستێکی جیاواز بوون، هەموو لایەنەکانی راستی تێنەگەن و تاوەکو مۆخی ئێسقانیان هەستی پێ نەکەن، ئەوا دەرئەنجامی هزری و ئەخلاقی پێویست بەدەست ناهێنن.

هیچ کاتێك باوەڕیم بەقەدەر نەهێناوە. بەڵام ئەو چارەنووسەی هێزەکانی قەدەر بۆیان دیاری کردبووم، ئەوە بوو کە لەخاچی هاوچەرخی سەدەی بیستەمدا بە تەنیا و بە بێ دەنگی لەلێواری گۆڕەوە چاوەڕان بکەم. وەکو داخوازییەکی واتادار و گەوهەری خۆم دەبوایە تاوەکو دواترپەکانی دڵم و تەنانەت تەواوی ئاستی وشیاریم لەخزمەتی **مرۆڤایەتی** بەکاربێنم و پاشان ئاراستەی رووداوەکانم بۆ راستەڕێی سروشتی خۆی بەجێ دەهێشت.

لە کاتێکدا پێناسەیەکی پوختەی دۆزی ئیمرالی بۆ ئەو کەسانە دەکەم کە دەخوازن لێی تێبگەن، ئاماژە بەوە دەکەم کە ئەوەی پێشم خستووە رەخنە و رەخنەدانێکی رووکەشی و چاوەڕوانکردنی شێوازێکی دیکەی ژیان و لێبوردن نییە. ئەو گۆڕانکارییانەی ئاراستەیەکی وەها بگرێت هەرگیز واتای گەوهەر و ژیانی من نابەخشێت. رەوش زۆر لەمە جیاوازترە و پێویستی بە دەرك پێکردنی رەسەنایەتی و تایبەتمەندێتی ئەم بوویەرە هەیە. لەبەر ئەوەی هیچ گومانێکم لەوە نەبوو کە هەڵوێستی ئاشتی و برایەتی لە گەوهەری قووڵی خۆمەوە هەڵدەقوڵێ، هەربۆیە بە بێ هیچ دوودڵییەك هەنگاوم بۆ هاوێشت و رێگام بەوە نەدا مەسەلەی هەڵوێستی سیاسی دەرکەوێتە پێش کە پێویست بوو نیشانبدرێ، هەروەها بە گوێرەی

چاوەڕوانی ڕەوتە چەپڕەو و ڕاستڕەوکانی شارستانییەت هەڵوێستێکی توند و دۆگماتیکیانەم نیشان نەدەدا و خۆم نەدەکرد بە ئامرازێکی دەستیان. دەبوایە لێرە لە شکۆمەندی بگەڕێم و لەژێر فشار و نەفرەتی شارستانییەتی هاوچەرخ تێك نەشکێم. بەها و بایەخم بەهەر هەڵوێستێکی سیاسییانە دەدا کە بەڕاستەڕێی ئازادی و ئاشتییەکی شەرەفمەندانە و ژیانێکی برایانە و هاوبەشدا تێپەڕ ببوایە. هەروەکو چۆن هێندە باوەڕیم بە بەهای دوورگە سیاسیە جیاجیاکان نەدەهێنا و باش دەمزانی بە ئەندازەی ئەوەی شتێکی خەیاڵین، لەهەمانکاتدا ڕێگا لەپێش هەژاری و نەداری دەکەنەوە، هەربۆیە لە هەموو ئاستێکدا پێویست بوو لەسەر بنەمای ئازادی را دەربڕین، بژاری یەکپارچەیی وڵات هەڵبژێرم. وەك رابردوو بە بێ ئەوەی بکەومە نێو هەڵوێستی جوداخوازی زۆرەملێیانە و یەکێتییەکی زۆرەملێیانە، دەبوایە بە پێودانگێکی تایبەت درێژە بەم هەڵوێستە واتادارەم بدەم.

ئەمەیە گەوهەری بەرگرینامەکانی ئیمرالی. ئومێدەوارم لەگەڵ بەسەرچوونی کات زیاتر دەرك بە بەها و بایەخەکەی بکرێت. ئەگەر توانیومانە ئەو تیرۆرە ڕاستەقینەیەی سەر تورکیا بوەستێنین کە وەکو چارەڕەشییەك ببوە چارەنووسی، تا ڕادەیەك کۆسپمان خستۆتە بەردەم بەرژەوەندییەکانی زۆردار و بازرگانەکانی شەڕ و هەروەها توانیومانە لە ڕێگای دیموکراتییانە تێکۆشانی سیاسی واتادار و هەمیشەیی بکەین و چۆنیەتی پەیڕەوکردنی تێکۆشانی چەکداری لەسەر بنەمای بەرگری ڕەوامان، نیشانی ئەو دەوروبەرانە دابێت کە ئاشتی ناخوازن، ئەوا ئەمە ئەو واتایە دەبەخشێت کە بووینەتە خاوەنی هەڵوێستێکی مێژوویی وەها ئەو کەسانەی خاوەنی ڕاستی و دادپەروەری و هەستی گەوهەرین، بەهاو بایەخی پێبدەن.

لەبەر ئەوەی باوەڕیم بەوە هێنا کە بەرگرینامەکەم گوزارشت لە بەهایەکی مێژوویی دەکات و بەرلە هەموو شتێك بە واتای بەرگرینامەی کولتووری ڕۆژهەڵاتی ناوینە لە بەرامبەر ڕۆژئاوا و شارستانییەتی ئەوروپا، ئەوا لەهەمانکاتدا لەمیانەی پشت بەستن بە ڕۆشنکردنەوەیەکی ڕاست سەبارەت بە مێژوو لە پلاتفۆرمێکی یاسایی دیموکراسییانەی گەردوونیدا نوێنەرایەتی کردنی گەلان بە ئەرکێکی خۆم دەزانم، ئەوا مافی پێشکەشکردنی بەرگرینامە بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا بەکار دێنم. هەروەها لەمیانەی بەرگرینامەکەم کە بەئاستی بەدیهێنانی مافی چارەسەرکردنی تەواوی کێشە کۆمەڵایەتییەکان گەیشتووە، ئامانج بەلاوەنانی گرێ کوێرەی سیستەمی ئۆلیگارشییانەیە کە لەگەڵ ئامانجی ئاواکردنی کۆماری تورکیادا ناکۆکە، ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێ ئەوا لەسەر بنەمای پشت بەستن بەڕێگاچارەی ئاشتی و یەکێتی دیموکراسییانە هەڵوێستێکی بەمجۆرە بە هەڵە نابینم کە ئەم پلاتفۆرمە ڕۆڵێکی باش لەمەسەلەی ئەندام بوونی تورکیا لەیەکێتی ئەوروپادا ببینێ. ئەوروپا لەڕیزی پێشەوەدایە. ئەگەر بێت و ئاوێتەبوون لەگەڵ ئەو لایەنانە ئەنجام نەدەن کە بۆتە هۆی دەوڵەمەندی شارستانیەتەکەی، ئەوا ئەو کولتوورانەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتی ناوین کە بەردەوام باوەڕیم بەگەوهەرەکەیان هێناوە دەرفەتی ئەوەیان نابێت بتوانن قەڵەمبازێك ئەنجام بدەن. هەروەکو چۆن فۆستنەوەی دەرفەتی هاوبەشی کردن لەبەهاکانی ئەوروپا لەپێناو بەرژەوەندی دادوەرانەی هێزە کۆمەڵایەتییەکان وەکو لەقەڵەم دەدرێت، شتێکی سووك و بەکرێگیراوی نییە، ئەوا لەهەمانکاتدا دژایەتیکردنەکەی پێشکەوتنخوازی نابێت و شتێکی ڕوون و ئاشکرایە لە پاشڤەڕۆیەتییەکی کوێرانە بەولاوە هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێت.

لەبەر ئەوەی ئەو هەلومەرجەی ڕێگای لەبەردەم دەستگیرکردنم کردەوە، ئەو لایەنانەی ئەوەیان ئەنجامدا هێزە دەسەڵاتدارەکانی شارستانییەتی هاوچەرخ بوون، هەربۆیە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە پێویست دەکات بەرگرینامەکەم بە گوێرەی ئەم ڕاستینەیە پێشکەش بکرێت. ئاشکراکردنی گەلێك لایەنی بەسەرهاتی ئەوروپام کە گەلێك ئەزموونی تێدا بەدی دەکرێت، لە ریزی پێشەوە دێت. ئەگەر بێت و سەرچاوەی مەسەلەکە تەنیا بۆ ڕاستینەی تورکیا و ڕۆژهەڵاتی ناوین بگەڕێنینەوە، ئەوا ناشێ تەواوی ڕاستییەکان ببینین. بە ئەندازەی بینینی سەرچاوەی کێشەکە، ئەوا گەڕان بەدوای چارەسەری لەنێو ڕاستینە و واقیعی شارستانییەتی ئەوروپادا زۆر گرنگە. هەر لەبەر ئەوەی گەلێك لەو بزووتنەوانەی بەرزگاری نەتەوەیی ناوزەد دەکرێن نەگەیشتن بەم ئاستە گشتگیرییە، یان ئەوەتا بوونە دیلی ئەو ڕێگاچارانەی کە لەمێژە ئەوروپا تێپەڕی کردوون و ئێستاکە وەکو زنجیر لەپێیان ئاڵاوە، یاخود لەنێو قووڵایی سیاسەتی "**پەرتکە و زاڵ بە**"دا دەخنکێن. بەئەندازەی ئەوەی ماوەیەکی درێژە ئەوروپا دیاردەی لەجۆری نەتەوەپەرستی و ئایین پەرستی و دووربوون لەدیموکراسییەتی تێپەڕاندووە و لەهەمانکاتدا ئیتر بەدەزگابوونی نێو دەوڵەتی و ژیان لەسەر بنەمای هەمەڕەنگی کولتوور و مافی تاکەکەس وەکو سیستەمێکی دیموکراسییانە خۆی سەلماندووە و بۆتە بەهایەکی هاوچەرخی گەردوونی. ئەم هەڵوێستە سەرەکیە شیکردنەوەیەك سەبارەت بە شارستانییەت دەکاتە پێویستییەك.

خاڵێکی دیکەی گرنگیش ئەوەیە ئەو تراژیدیایەی سەبارەت بە کەسایەتی من هاتۆتە ئاراوە جگە لەوەی مەسەلەی تاکە کەسێك دەرباز دەکات، هەروەکو بە شێوەیەکی کرداریش دەرکەوتووە، گوزارشت لە ڕاستینەی گەلێك دەکات، واتە ڕاستینەی گەلی کوردە. پێناسەکردنی ڕاستینەی کوردان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە ئەو کێشەیەی هەر لە ئێستاوە بۆتە ڕۆژەڤی ئەوروپا، بە شێوەیەکی ڕاست دەستنیشان بکرێت. بەشێوەیەکی سەرەکیش ئەم دەستنیشان کردنە بۆ تورکیا خاوەن ڕۆڵێکی هێندە گرنگە کە چارەنووسی دیموکراسییەت دیاری دەکات. لەم چوارچێوەیەدا پێشکەوتنی چارەسەری دیموکراسییانە لەتورکیا ڕۆڵێکی گرنگی دەبێت لەپێشخستنی چارەسەری تەواوی کێشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین، قەفقاسیا، ئاسیای ناوین، بەلقان. گرنگی و مەزنی ئەم کێشەیە لەئاستی نێودەوڵەتیدا لەم ڕاستینەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەو هەڵوێستانەی تاکو ڕۆژی ئەمڕۆمان نکوڵی لەکێشەکە دەکەن یاخود بە پێچەوانەوە هەڵوێستی زێدە ڕۆیین و دەرفەتی چارەسەرییان نییە و تاوەکو ڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام بوو، هەروەکو چۆن کێشەکە لە ڕۆڵە پۆزەتیفەکەی دوور دەخاتەوە، لەهەمانکاتدا ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە کە قەیران و بنبەستبوون قووڵ بێتەوە و درێژە بکێشێت و بەردەوام بێت.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گفتوگۆیەکی چڕوپڕ سەبارەت بە مەسەلەی کورد ئەنجام دەدرێت، بێگومان لەبەر ئەوەی خاوەن ڕۆڵێکی گرنگین لە گەیشتنی کێشەکە بەم ئاستەی ئەمڕۆ، هەربۆیە بە بناخەگرتنی هەڵوێستێکی تێر و تەسەل چارەنووسسازانە بۆ بەرگرینامەکەم بایەخێکی تایبەت لەخۆوە دەگرێت.

لەم چوارچێوەیەدا ئەگەرچی بە شێوەیەکی زۆر قووڵیش نەبێت وەلێ شیکردنەوەیەکی مێژوویی خاڵە گشتییەکانی شارستانییەت دەکەین، جگە لەوەی لەمیانەی ئەم شیکردنەوە بۆ نێو سەرچاوەی کێشەکە درێژ دەبینەوە، ئەوا بۆ چارەسەرکردنیشی پشت بە ڕێنومایییەکانی ئەم شیکردنەوانە دەبەستین. هەروەکو چۆن سیاسەتی نکوڵی و هەڵوێستە هۆڤێتی و شۆڤینییەکان دوور لە بەهای زانستین و کین و کاردانەوە لەخۆوە دەگرن، لەهەمانکاتدا نەیهێشتووە ڕاستەڕێ دەستنیشان بکرێت و هۆکاری سەرەکی خراپی و زیانە هەرە مەترسیدارەکان بووە. بێگومان هێشتنەوەی کێشەکان ڕووبەڕووی ڕزین، پێویستە خراپترین شێواز بێت. لەوانەیە لۆژیکێکی تایبەتی بە لەنێوبردن هەبێت، بەڵام ڕزین هیچ لایەنێکی نییە کە بەهای لۆژیکی هەبێت.

هەروەکو چۆن لە کێشەی تەواوی ئەو گەلانەدا دەبینرێت کە دووچاری کێشە کۆمەڵایەتییە بنچینەییەکان هاتوون، ئەوا پێناسەکردنی ڕاستینەی گەلی کورد و دەستنیشان کردنی نەخۆشییەکانی و دۆزینەوەی ڕێگا چارە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست، گرێدانێکی چڕوپڕی بەم شێواز و نزیکبوونەوەیە هەیە. لە قۆناخی

دەرکەوتنی PKK دا جگە لە کاریگەرییە دۆگماتیکیەکانی ئەو سۆسیالیزمە بونیادنراوەی لەنێو کەم و کورتی دا بوو، لەهەمانکاتدا کاریگەرییە سۆزدارییەکانی (**عاطفي**) نەتەوەپەرستی سەرەتایی بوونە هۆکاری سەرەکی ئەو بنبەستبوون و زیان و ئێش و ئازارانەی دواتر کە هاتنە ئاراوە، هەربۆیە جێبەجێکردنی ئەو ئەرك و تێکۆشانەی لەکاتی خۆیدا پێویست بوو ئەنجام بدرێ ئەگەرچی درەنگیش بێت و بوو بێتە هۆکاری ئەم هەموو ئازارانەی ڕابردوو، هەربۆیە ئەمڕۆ پێویستە هەرکەسێك بەگوێرەی هێزی خۆی ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات. هەڵبەتە تەنیا ئەو کەسانەی خاوەن هێز و هەستی بەرپرسیارێتین دەتوانن وەڵامی پێویستییەکانی ئەم ئەرکە بدەنەوە.

ئەنجامدانی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی سەبارەت بە هێڵە گشتییەکانی شارستانییەت لەم پێناوەدایە. دەشێ ئەمە بۆ چەندین گەل و کۆمەڵگاکانی دیکە یەکلا بووبێتەوە. چونکە تێکۆشانە مێژوویی و کۆمەڵایەتییە بەرفراوانەکانیان ئەم دەرفەت و تواناکارییەی خولقاندووە. بەڵام بۆ ڕاستینەی کوردان پێویستییەکە و واتابەخش دەبێت. لە کاتی ئەنجامدانی ئەوە پێویست دەکات مێژوو بە بناخە وەربگیردرێت. ئەگەرچی بە شێوەیەکی پڕشنگدار و بە شێوەی هێڵی گشتی نەبێت، دیسان مێژوویەکی کوردان هەیە. لێرەدا بە بێ ئەوەی ئەم مێژووە

ڕۆشن بکەینەوە، ناشێ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان تێبگەین و ناتوانین ئەو ڕاستییە دەستنیشان بکەین کە چۆن دووچاری بنبەست بوون هاتووە و چۆنیش چارەسەری بۆ بدۆزینەوە. کاتێك میتۆدی پێشکەوتنی مێژوو سەربکەوێت ئەوا هێزێکی بێ هاوتای چارەسەری دێتە ئاراوە و لەهەمانکاتدا ڕێگا لەپێش ئاسانکاری دەکاتەوە. تەواوکردنی ڕێنماییە مێژووییەکان لەسەر بنەمای قۆناخە بنچینەییەکان دەرفەت و تواناکاری ئەوە دەڕەخسێنێ کە لەڕۆژگاری ئەمڕۆمان تێبگەین و شەوەزەنگ ڕۆشن بکەینەوە و ڕێنماییە دەوڵەمەندەکانی چارەسەری بەدەست بێنین. کاتێك دەرك بەوە بکرێت، هەم هەڵوێستە ئایینی و دەمارگیری نەتەوەپەرستی تا چ ڕادەیەك چاوەکانی کوێر کردووە و هەڵوێستە خەیاڵییەکانی لەیەك لایەنەوە مەزن کردووە، ئەوکاتە بایەخی مەزنی ئەم نزیکبوونەوەیە ئاشکرا دەبێت. لەلایەنێکەوە ئەم کارە هێندە درەنگ نەکەوتووە. کاتێك ئەم کێشەیە لەگەڵ کێشەی فەلەستین و کێشە هاوشێوەکانی بەراورد بکرێت، ئەوا دەبینین کە بەلاوەنانی بنبەستبوون و شانبەشانی ڕیشە ئایینیەکەی، دەستبەردان لەو شێوازە نەتەوەپەرستییەی کە چەندین سەدەیە بەسەختی بەردەوام دەکات جگە لەوەی دەتوانرێت بەهەنگاوێکی زوو دابنرێت لەهەمانکاتدا هەڵوێست و پێویستییەکی زانستی دیموکراسییانەی هاوچەرخە. بینینی نوێکاری لەشێوازدا لەلایەن هەر توێژ و دەزگایەکی پەیوەندیدار و ئەنجامدانی ریفۆرمی پێویست لەهەڵوێستەکانی، خاوەنی گرنگییەکی ژیانییە. پێکهاتە بەرفراوانەکەی ڤەیرانی تورکیا ئەمە دەکات بە ئەرکێکی لەپێشینە و دەست لێبەرنەدراو.

بێگومان یەکێك لە ڕەهەندەکانی پەیوەندییە مێژوویی و هەنووکەییە بە کاریگەرەکانی ڕاستینەی کورد، پەیوەندی **کورد ـ تورکە**. بە بنەماگرتنی ئەم بوارەی پەیوەندی بە شێوەیەکی قووڵ و تێر و تەسەل پێویستییەکی ژیانییە. ئەگەر دەخوازرێت ئەو چارەسەرییەی بێتە ئاراوە لەسەر بنەمای پێکهاتەی یەکێتی وڵات و یەکێتی دیموکراسییانە بێت، ئەوا ئەم ڕەوشە دەبێتە هۆی بایەخدانێکی زیاتر بەشیکردنەوەی زانستی مێژووی پەیوەندییەکان. ئەو کەسانەی ناخوازن دان بەکێشەی کوردیشدا بنێن دەبێ ئەوەیان بە بیر بێنینەوە کە، با یەکێتی کۆمەڵگا و دەوڵەتە تورکییەکان لەژێر سایەی دەوڵەتێکی هاوبەشدا لەولاوە بمێنێت، تەنانەت هاوکارییەکی سنوورداریش پێویستی بەوە هەیە کە پێکهاتەی مێژوویی و ڕاستینەی ئەمڕۆ بە شێوەیەکی ڕاست پێناسە بکرێت و ئەمەش وەکو مەرجێك خۆی دەسەپێنێ. لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا زۆر بەڕوونی ئاشکرا بووە کە هەڵوێستە سۆزدارییەکان ڕێگا لەپێش کین و کاردانەوە دەکاتەوە. ئەمە شێوازێکی هەڵە و ناتەواوە. هەربۆیە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەنجامدانی ریفۆرمێکی دیموکراسییانە سەبارەت بەپەیوەندی کورد ـ تورك وەکو ئەرکێکی بەپەلە خۆی دەسەپێنێ و پێویست دەکات چۆنیەتی و لایەنە باش و خراپەکانی ئەم پەیوەندییە سەرلەنوێ هەڵسەنگێنرێت و سەر لەنوێ ڕێکخستن و ریفۆرم لەم بارەیەوە ئەنجام بدرێت. بێگومان ریفۆرم سەرچاوەی خۆی لەدینامیکیەتی ناوخۆوە دەگرێت؛ بەڵام ئەو تێڕوانین و باوەڕییەی ، کە تورکیا خۆی بە پارچەیەکی ئەورووپا دەبینێ و داخوازی تەڤلیبوونی یەکێتی ئەورووپای هەیە، گرنگی مەسەلەکە دوو هێندەی تر زیاد دەکات. هەلومەرجی سیاسی ناوخۆ و دەرەوە نەك ریفۆرم دەکات بە بارێك، بەڵکو دەرفەتی ئەوە دەکاتەوە کە لەو پێکهاتە ڤەیراناوییە مەزنە ڕزگاری بێت کە دووچاری هاتووە.

بەرگرینامەکەم لەو بەشەی کە تایبەتە بە PKK گرنگییەکی زیاتر لەخۆوە دەگرێت. ئەنجامدانی هەڵسەنگاندنێکی زانستییانە سەبارەت بە PKK نەك تەنیا بۆ ئەندامانی PKK و جەماوەرە بەرفراوانەکەی، بەڵکو بۆ ئەوانەش پێویستییەکە کە دژایەتی دەکەن و لەڕەوشی ڕکەبەریدان. لە ڤەڵەمدانی PKK تەنیا وەکو تیرۆرێك، هیچ لایەنێکی چارەسەری لەخۆوە ناگرێت. بە پێچەوانەوەی ئەمەشەوە، ئەگەر بڵێین "**هەموو ئەو کارانەی ئەنجامـانـداوە پیرۆزە**"، بەرەو هەڵەی مەزنمان دەبات. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تەنیا بۆ واقیعی تورکیا بەمجۆرە نییە بەڵکو دیاردەی PKK و کوردان لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناویندا ڕاستینەیەکە لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ بوون. ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی وردەکارانە سەبارەت بە PKK بە ئەندازەی ڕێ خۆشکردن بۆ پێشخستنی ڕەخنەدانێکی واتادار، لەهەمانکاتدا ڕێگا لەپێش ئەگەرەکانی ڕێگاکانی چارەسەری دەکاتەوە.

کاتێك باس لە PKK دەکرێت پێویست دەکات هەر دوو زاراوەی "**تیرۆر**" و "**جوداخوازی**" ڕوونبکرێتەوە چونکە گرنگییەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت و زیاتر کراون بە دوو ڕۆژەڤی سەرەکی. بێگومان پێویستە ئەو سەرچاوە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەی کە ئەم دوو زاراوەیە پێیەوە گرێدراون باش ببینین و، هەروەها لەبەرچاو دەربازکردنی ئایدیۆلۆژیا و پراکتیکی شۆڕشە هاوچەرخەکان پێویستییەکە. شتی لەمە گرنگتر و مەرجی هەرە سەرەکی ئەنجامدانی هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەیەکی زانستیانەیە سەبارەت بەو تیرۆرە سەپێنراوەی کە بەدرێژایی مێژوو پەرەی پێدراوە و بەشێوەیەکی هەمیشەیی و بەردەوام ڕاستینەی کوردانی بەرتەسك کردۆتەوە. قەدەخەکردنەکانی تەنیا لە ئاستی ئابووری، کولتووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی نەهێشتووە، بەڵکو هەڵوێستێکی تیرۆریستی وەها هەیە کە لە ئاستی دەستووری بنچینەییدا قەدەخەکردنی زمان ڕەوا دەبینێ و پیادە دەکات، هەربۆیە هەڵسەنگاندنی ئەم ڕەوشە هەم لەبواری سیاسی و سەربازی و هەم لەبواری یاسایی و دیموکراسییەوە پێویستییەکی ژیانییە. هەربۆیە پێشخستنی شیکردنەوە و ڕوون کردنەوەی ئەو زاراوە و بیرۆکانەی لەلایەنی بەرامبەرەوە سەرچاوە دەگرێت، دەرفەت و زەمینە بۆ PKK دەڕەخسێنێت، گرنگییەکی بەرچاوی هەیە. لەسەر ئەم بنەمایەش ئەنجامدانی ڕوونکردنەوەی سیاسی و یاسایی سەبارەت بە زاراوە و بیرۆکەی لەجۆری سۆسیالیزم، سەربەخۆیی، ئازادی، دیموکراسی، نەتەوەپەرستی، توندوتیژی، تیرۆر، یەکپارچەیی، نەتەوایەتی، یەکێتی و جوداخوازی و دەستنیشانکردنی ڕاستی و چەوتییەکانیان زۆر گرنگە. لەبەر ئەوەی PKK تا ڕادەیەك بەشی خۆی لەکاریگەری ئەم زاراوە و بیرۆکانە وەرگرتووە، هەربۆیە دەستنیشانکردن و ڕوونکردنەوەی لایەنی تیۆری و پراکتیکی PKK، ڕۆڵێکی گرنگی دەبێت لە گەیشتنی قۆناخ بە چارەسەرییەکی پۆزەتیڤانە.

ئێستا ئەوە ئاشکرا بووە کە هەڵوێستی تاوانبارکردنی زێدەڕۆیی یاخود بە پێچەوانەوە هەڵوێستی خۆپاراستن، بە هیچ جۆرێك خزمەت بە چارەسەری ناکات. کاتێك هەڵسەنگاندن سەبارەت بە PKK پێشدەخرێت، ئینجا ئەمە چی لەناو خۆیدا بێت یان دەرەوە، بە لایەنی ئەو یاخود دژی ئەو، دەبێ تایبەتمەندێتی کێشەی کورد ڕەچاو بکرێت کە لەنێو ئێش و ئازار و هەلومەرجی توند و تیژیدا ڤاڵ بۆتەوە و لە زانست و لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و تەنانەت ڤەبوونی سیاسی بێبەش بووە، بەردەوام فشار و قەدەخەی لەسەر پەیڕەو کراوە. ئەگەر پەیوەندی نێوان کار و کاردانەوە نەبینرێت، ئەوا ئەو شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنانەی ئەنجام دەدرێت دوور لە ڕاستی دەبێ و ئەنجامی سیاسی مەترسیدار لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ. ئەمەش گەوهەری ئەو هەڵوێستانەیە کە نەك تەنیا چارەسەری لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ بەڵکو بەرەو هەڵدێرمان دەبات و بنبەستبوون لەگەڵ خۆیدا دێنێ. بەلاوەنانی ئەم ڕەوشە لای من زۆر گرنگە. بە ئەندازەی ئەوەی بە بەرپرسیارێتییەکی مەزن پێداویستییەکانی جێبەجێ دەکەم، لەهەمانکاتدا بە ئەرکێکی مێژوویی دەزانم. چونکە ئەمە ئەرکێکی سەختە و کەسانی دیکە ناتوانن جێبەجێی بکەن. ئەو هەڵسەنگاندنانەی سەبارەت بە PKK دەکرێت واتادارە و ڕۆڵێکی کاریگەر لەدۆزینەوەی چارەسەریدا دەبینێ و دەرفەت بۆ پێشخستنی ڕەخنەدانێکی پێویست و واقیعی دەڕەخسێنێ. هەروەکو چۆن هەڵوێستەکانی وەك مەحکومکردنی ڕەها و تاوانباری کردن، دەرفەتی ئەنجامدانی وەرچەرخان کەم و تەنگەبەر دەکات، لەهەمان کاتدا هێز بەو چەمك و هەوڵوێستانە دەبەخشێت کە دۆگماتیکە و جەخت لەسەر بەردەوامکردنی شێوازی کۆن دەکاتەوە. کاتێك پراکتیکی ئەو هەڵوێستانە بێنینە بەرچاو کە بەرامبەر بە مەیلی لایەنە چەپڕەو و ڕاست ڕەو و ئایینیەکان، دەرگای سیاسەتی دیموکراسییانەی داخست و ڕێگای لەپێش خۆ دووبارەکردنەوە و لەدەستدانی بەها کردەوە، ئەوکاتە گرنگی و بایەخداری ئەم هەڵوێستەمان بە شێوەیەکی زەقتر بۆ ئاشکرا دەبێت. ڕەوشی باڵابوونی ئەورووپا لەم بارەیەوە بۆ ئەو سیاسەتە دیموکراسییانە دەگەڕێتەوە کە دوای ئەزموونێکی درێژخایەن پێی گەیشت و بە هەموو شێوەیەك دەرگای لەپێش هەموو جۆرە ئازادییەك کردەوە. باوەڕهێنان و درەفەت دان بە ڕاستی ئەم شێوازە ڕێگای هەرە هاوچەرخ و چارەسەری کێشەکەیە.

دەست بەردان لە توندوتیژی وەکو شێوازێکی چارەسەری کێشەی کورد، ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت، بەلاوەنانی سیاسەتەکانی فشار و نکوڵیکردن لەنزیکەوە پەیوەندی بەو ڤەبوونە گەوهەرییەوە هەیە کە سەبارەت بە بژاری دیموکراسییانە هاتۆتە ئاراوە. هەروەکو چۆن قەدەخەکردنی پەروەردە و ڕاگەیاندن دەرهەق بە زمان و کولتوور زێدەڕۆییترین شێوازی تیرۆرە، لەهەمانکاتدا بەردەوام بانگەوازی بۆ تیرۆری بەرامبەریش دەکات. لەنێو PKKدا توندوتیژی تاڕادەیەك لەکۆنترۆڵ دەرکەوتوە و جار جار چەمکی پاراستنی ڕەوای دەرباز کردووە.

ئەم راستییەش زۆر بەباشی دەزانرێت کە لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەم رەوشە لەلایەن هەندێ بزووتنەوە گەیشتۆتە ئاستێکی یەکجار بەرزی زێدەڕۆیی. بەرامبەر بە رەوشێکی بەمجۆرە ئاگربەستی یەکلایەنە و هێشتنەوەی هێزەکان لە رەوشی بەرگری رەوا و دەرەوەی سنوور، تاوانبارکردنەکانی سەبارەت بە "**تیرۆریزم**"ی مایەپووچ کردۆتەوە. ئەو هەنگاوەی پێویستە بهاوێژرێت ئەوەیە کە ئەو هەڵوێستانە پەیڕەو بکرێت کە رێگا لەبەردەم قۆناخی دیالۆگ و یەکێتی دیموکراسییانە دەکاتەوە و رەوشێکی بەمجۆرە بهێنرێتە ئاراوە کە بە تەواوەتی دەست لە چەك بەربدرێت.  پێویست دەکات شوێنگەی ئێستای PKK لەم چوارچێوەیەدا هەڵسەنگێنرێت و ئەمەش دەرفەتێکی بەبایەخ دەڕەخسێنێ بۆ ئەوەی رێگا لەو پێشکەوتنانە بگیردرێت کە لە داهاتوودا رێگرتنی زەحمەت دەبێت. هێشتنەوەی رێگای وەرچەرخانی دیموکراسییانە و یاسایی لەبەردەم PKK زۆر لەشێوازی قەدەخە کردن و لەناو بردنی یەکجارەکی واقعییانەترە و شانسی پراکتیزەکردنی هەیە و رێگای هەرە راستی چارەسەری سیاسیانەیە.

بە بێ ئەوەی لە بەرگرینامەکەمدا دەست لە نەرمایی هەڵوێستێکی بەمجۆرە بەربدەم ئەم چارەسەریەم وەکو بژار و شێوازێکی سەرەکی دیار کرد کە لەبەر چاوان بگیرێت. لەتەواوی رۆژهەڵاتی ناوین و لەنێو سنووری ئەو دەوڵەتانەی کە کێشەی کوردی تێدایە، لەجیاتی دووبارەبوونەوەی شێوازی پێکدادانی  جوداخوازی ـ نەتەوەپەرستی، لەسەر بنەمای دانان بە ماف و ئازادییەکان یەکێتی دیموکراسییانە و برایەتی گەلان و ئاشتیم وەکو هەڵوێستێکی سیاسی و واقیعیانە دەستنیشان کرد. گەلێك ئەزمونی هاوچەرخانە بوونەتە گەواهی ئەو راستیانەی کە جگە لەوەی پێکدادانەکانی نەتەوەپەرستی تەسك رێگای لەبەردەم بێچارەیی کردۆتەوە، لەهەمانکاتدا ئەمەش دەرکەوتووە کە تەنانەت لەو نموونانەی کە سیمای چارەسەریشیان پێوە دیارە گیروگرفت و کێشەی خراپتری لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە ئاراوە. بەرپرسیارێتییەکی مەزن بۆ ئەوە پێویست دەکات کە نەهێڵدرێت جوگرافیا لەبارەکەی کوردستان بۆ شەڕ و پێکدادان بخرێتە نێو رەوشێك وەکو دووەمین ئیسرائیل ـ فەلەستینی لێ بێت. پێویست دەکات بەردەوام بژاری رۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراسییانە وەکو ئامانجێکی ستراتیژی لەبەرچاوان بگیردرێت.

قۆناخی دادگای ماڤ مرۆڤی ئەوروپا لەهەمانکاتدا دەرفەتی ئەوەمان پێدەدات کە تواناکاریەکانی یاسا لەپێناو چارەسەری تاقی بکەینەوە یاخود بەکارهێنانی وەکو شانسێك بایەخدار بێت. پەیمانی ماڤ مرۆڤی ئەوروپا کە تورکیاش بە شێوەیەکی یاسایی پێیەوە گرێدراوە جگە لەوەی کەسێتی من پەیوەندیدار دەکات، لەهەمانکاتدا رەوشێکی گشتی دێنێتە بەرچاوان. هەر سێ مافە سەرەکییەکانی کە نەتەوە یەکگرتووەکان پەسندی کردووە واتە ماڤ تاکە کەسی، ماڤ مەدەنی و ماڤ ئابووری و کۆمەڵایەتی، ئەوا لەلایەن پەیمانی ماڤ مرۆڤی ئەوروپا بە شێوەیەکی بەرفراوانتر هەبوونی ئازادانەی کولتوور و گەلان دانی پیانراوە و جێبەجێکردنی پێویستییەکانی بەسەر تەواوی ئەندامانی خۆی کردۆتە ناچارییەك. ئیتر گەلێك لەو دۆزانەی بردراونەتە دادگای ماڤ مرۆڤی ئەوروپا ئەوە دەکەنە ناچارییەك کێشەکە بە شێوەیەکی ریشەیی بگرنە دەست، واتە لەگەڵ ئەوەی کە مەسەلەی کەسێتی تێپەڕ دەکات، لەهەمانکاتدا ئەوە دەکاتە پێویستییەك کە بگاتە پێوانەیەکی یاسایی. ئیتر بڕیاری جیاجیا سەبارەت بە هەزاران دۆزی یەك لەدوای یەك واقیعی و گونجاو نییە، لەم پێناوەدا پێویست دەکات و بۆتە ناچارییەك کە پەرلەمانە نەتەوەییەکان دان بە یاسایی بوونی ئەم بڕیارانە دابنێن. تورکیا تاکە ئەندامی کۆنسەی ئەوروپایە کە ئەو داواکارییانەی کەوتۆتە سەرشانی، لە سەرووی هەمووشیانەوە ماددەی سەبارەت بە ماڤ ژیانی، جێبەجێ نەکردووە. تەنانەت لە قۆناخی بەرئەندامی لە یەکێتی ئەوروپاش پێویستی و داواکارییەکانی پێوانەکانی کۆپنهاگنی جێبەجێ نەکردووە کە رێگاخۆشکەرە بۆ گەیشتن و پێکهێنانی پەیمانی ماڤ مرۆڤی ئەوروپا.

چاوەڕوانی دەکرێت دۆزی تایبەت بە کەسێتی من کاریگەرێتی لەسەر خێرابوون بکات. ئاماژە بەوەش دەکەم کە ئەگەر تورکیا ئامادە بێت و بخوازێت، ئەوا من بۆ چارەسەرییەکی دۆستانە کراوەم. ئەو لایەنەی بەرگرینامەکەشم بە شێوەیەکی راست و بەجێ دەرفەت و رۆڵی یاسا لە پێشخستنی چارەسەرییەکی سیاسییانە هەڵدەسەنگێنێ. بە کورتی لە بەرگرینامەکەمدا ئەوە بە بایەخداری دەبینرێت لەجیاتی ئەو شێوازە سەربازی و سیاسییە دژوارانەی بە شێوەیەکی بەربڵاو لە رابردوو بەکار دەهێنرا، لە چوارچێوەی پێوانەکانی دەوڵەتی یاسایی دیموکراسییانە دەرفەت بەچارەسەری بدرێت؛ بەرگرینامەکەم بەو هیوایە پێشخراوە کە تورکیا بە هەڵوێستێکی بەرپرسیارانە ئەم پێداویستییەی خۆی هەڵسەنگێنێ و چارەسەری دۆستانە بەرفراوان بکات و دەرگا لەبەردەم دیالۆگی سیاسی ئاوەڵا بکات. تاوتوێ کردنێکی تێر و تەسەلی رەوشی کەسێتیم وەکو ئەرکێکی مێژوویی بینی. هەرچەندە بە زمانێکی ئەدەبی بێت و لە دەرەوەی داخوازیە تەکنیکییەکانی دادگا بێت بەڵام باسکردنی هەندێ بوویەر لەپێناو رۆشنکردنەوەی بنەما شاراوەکانی دۆزەکە ئەرکێکە ناتوانین بەلاوەی بنێین. نەك تەنیا پێشێل کردنی یاسای نێودەوڵەتی، بەڵکو بنپێکردنی گەلێك بەهای ئەخلاقی ناچاری کردم کە بە شێوەیەکی زۆر قووڵ بەرگرینامەکەم بگرمە دەست. ئەوەی لە رەوشی کەسێتی مندا دەبینرێ تەنیا تراژیدیایەکی ئەم قۆناخەی گەلی کورد نییە. تەنیا لە رێگای روونکردنەوەی بەرفراوان و هەمەلایەن دەتوانرێت ئەو تەنیاییە سەرسووڕهێنەرەی مێژووی رەش و بەردەوام بوون بە ئامرازی پیلانەکان و ئەنجامدانی خیانەتە بێ هاوتاکان رۆشن بکرێتەوە. لێرەدا ئامانج ئەوەیە هیچ نەبێت ئیتر لەمە بەولاوە سنوور بۆ ئەم تراژیدیایە دابنرێت و راستەڕێی پێشکەوتنی هاوچەرخ بگیردرێتە بەر. دەشێ ئەم بەشە وەکو پوختە و بەشی کۆتایی بەرگرینامەکە هەڵبسەنگێندرێت.

دەشێ ئەو بەرگرینامەیەی لەسەر بنەمای ئەم پێشەکییە پێشم خستووە گەلێك کەم و کورتی لەخۆوە بگرێت. جگە لە نەبوونی هەندێ پێداویستی سەرەکی لەهەمانکاتدا کاریگەری خراپی رەوشی تەنیایی سێ ساڵەم لە ئیمرالی لەسەر زمان و بیرم **(زاکرە)** هۆکارێکی گرنگە. بەڵام لەبەر ئەو ئەزموونانەی لە پراکتیکە دژوارەکانی رابردووم وەرگرتووە و هەروەها لەبەر ئەوەی باوەڕیم بەوە هەیە ئاستی ئەو قاڵبوونەوەیەی پێی گەیشتووم، خزمەت بە دەورووبەرە پەیوەندیدارەکان دەکات، بۆیە بۆ ماوەیەکی درێژە یەکەمجارە دەنووسم و هەوڵمدا ئەم ئەرکە جێبەجێبکەم.

## بەشی یەکەم

### کۆمەڵگای کۆیلەداری و پێشکەوتنی شارستانییەت

**کێشەی** کورد کە گەوهەری دۆزەکەی من پێکدێنێ خاوەنی راستینەیەکی کۆمەڵایەتی بەمجۆرەیە کە لەناوخۆیدا بێشومار دووچاری قۆناخەکانی پەرتەوازەبوون هاتووە. ئەم راستینەیەش هەر لەسەردەمی دەرکەوتنییەوە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان لەنزیکەوە گرێدراوی پێشکەوتنەکانی راستەڕێی شارستانییەت و پەیوەندی و ناکۆکییەکانیەتی. ئەو هەڵسەنگاندن و شیکردنەوانەی بەگوێرەی پێودانگە هاوچەرخەکان سەبارەت بە پێکهاتە نەتەوەیی و چینایەتییەکان دەکرێت، تواناکاری و دەرفەتی ئەوە نادات بە تەواوی دەرك بە راستینەی کوردان بکرێت. هەرچەندە لەم چوارچێوەیەدا هەندێ هەڵسەنگاندنیش ئەنجام بدرێت، ئەوا دوور لەواقع دەبێت و ئەنجامی سیاسی ئەوتۆ دێنێتە ئاراوە ناتوانرێ دەستبەرداری لێبکرێت و گەلێك هەڵە و کەموکورتی لەخۆوە دەگرێت. تەنانەت کێشەکە سنوورەکانی رۆژهەڵاتی ناوینی دەرباز کردووە، جێگرتنی لەنێو رۆژهەڤی وڵاتە هاوچەرخەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە ئەوروپا، ئەم راستینەیەی کردۆتە ناچارییەك کە کێشەکە لەسەر بنەمای بەرفراوانی مێژووی شارستانییەت تاوتوێ بکرێت. ئەگەر بێتو بەشێوەیەکی راست و دروست ئەو بنەمایانە پێناسە نەکرێت کە کێشەکە پشتی پێدەبەستێت، ئەوکاتە کۆسپ دەخرێتە پێش ئەوەی ئەنجامی یاسایی راست لەگەڵ خۆیدا بێنێ.

پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا و دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا دوو دەزگای یاسایی دیموکراسییانەن کە شارستانییەتی ئەوروپا لەم قۆناخانەی دواییدا پێشی خستوون. راستینەیەکی حاشا هەڵنەگرە کە نوێنەری هەڵبژاردە و هەرە باڵای شارستانییەتی ئەم قۆناخە، بە گوێرەی پێوانەی بەهاکانی ئەوروپا دەستنیشان دەکرێت. کوردان، کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان لە رەوشێکی زۆر تایبەتیدا لە دەرگای ئەوروپا دەدات، لە راستیدا سەرچاوەی سەرهەڵدان و لەدایك بوونی ئەم شارستانییەتەن. ئیتر دایکێکی بەساڵاچوو، دادپەروەری لەو نەوانەی خۆی چاوەڕوان دەکات کە بەهەزاران ساڵە لەلانکەی خۆیدا مەزنی کردن و ئەمڕۆ وایان لێهاتووە دایکی خۆیان نەناسن. ئایا دان بەمافی ئەم دایکەی شارستانییەت

دادەنرێت؟ کێشەکە بەمجۆرە بووە بە گرێکوێرە. هێزی بە کۆمەڵگابوون و هێزی تاکەکەسێتی بوون رووبەڕووی یەکتر بوونەتەوە. جوگرافیاکانی رۆژهەڵات، رۆژئاوا، ئاسیا، ئەورووپا، ئەنادۆڵ، یۆنان سیناریۆی پشت پەردەی ئەو شانۆگەرییەی رووداوی ئیمرالی پێکدەهێنن.

ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێت و تەنانەت ئەگەر مرۆڤێکی زۆر ئاسایی بە وشیاری تەماشای مەسەلەکان بکات، ئەوا دەپرسێ کێ بوون ئەوانەی ئەم شانۆگەریە یاساییەیان نووسی، چۆن رۆڵە سەرەکییەکان دابەشکران، ئەکتەرە سەرەکی و لاوەکییەکان کێ بوون و خواستیان پەیامێکی چۆن بدەنە بینەرەکان؟ دوای پرسیارکردنیش بەدوای وەڵامی پرسیارەکانیدا دەگەڕێت. لێکۆڵینەوەی دۆزەکەم لەچوارچێوەیەکی تەسك و مەسەلەیەکی تاکەکەسی لەلایەن دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا مەترسی ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە گەلێك راستی رەچاو نەکرێن و ببێتە پەردەی کۆتایی شانۆگەرییەکە. ئەگەر بێتو لەم دەزگا تایبەتانەی یاسای دیموکراسییانە، دادگا و بڕیارێکی دادوەرانەش بەڕێوەنەچێت، چونکە ئەم دەزگایانە بەرهەم و دەرئەنجامی کاردانەوەی پێشکەوتنێکی خوێناوی و بەئێش و ئازاری مێژوویین، ئەوا دیسان لەبەر ئەوەی باوەڕیم هەیە کە دەرفەت بە ئەنجامدانی هەڵسەنگاندنێکی ئازادانە دەدات و بۆ ئەوەی ئەم دادگایە نەبێتە پەردەی دوایی شانۆگەرییەکە، رۆشنکردنەوەی ئەو مێژووە رەش و خوێناوییە بە ئەرکێکی سەرەکی خۆم دەزانم. دەخوازم ئاماژە بەوە بکەم کە ئەو هەڵسەنگاندنانەی بەشێوەی چەند بەشێکی سەرەکی بەئامانجی پێشخستنی بەرگرینامە پێشکەشی دەکەم، دەخوازم ئاماژە بەوە بکەم کە بەهۆی ئەو لاوازییەی (**زاکرة**) کە لە ئەنجامی بەتەنیا مانەوەم لەژوورێکی تاکەکەسیدا هاتۆتە ئاراوە، دەشێ بەرگرینامەکەم هەندێ کەم و کورتی لەخۆوە بگرێت. لەبەر ئەم هۆکارانەیە کە دۆزی مێژوویی، ئەنجامدانی هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی مێژوویی دەکاتە پێویستییەك. بۆ ئەوەی ئەم دۆزەی، کە لە ئەنجامی ئێش و زیانی مەزن دەرکەوتۆتە مەیدان ببێتە ئەزموونێکی سوودبەخش و پێویست بۆ هەموو کەسێك، پێویست دەکات بەرپرسیارەکان بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەرکی روونکردنەوەی مەسەلەکان جێبەجێ بکەن. هەر ئەمەش پێویستی و شایستەی دۆزی مێژووییە. تا چ رادەیەك ئەم ئەرکە بە شێوەیەکی واتادار جێبەجێ بکرێت، ئەوا بەو ئەندازەیەش خودی دۆزەکە شایستەی تایبەتمەندێتی مێژوویی دەبێت.

## ا ـ سۆمەر: ئەو شارستانییەتەی لە کەناری دیجلە و فورات لە دایك بوو

تەواوی بەشەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە زانستی خوداناسی و نەژادناسی و شوێنەوارناسی لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوە بەرفراوانانەی ئەنجامیانداوە، ئاماژە بەوە دەکەن کە سۆمەریەکان خاوەنی یەکەم شارستانییەت و کۆمەڵی خاوەن دەوڵەت و مێژووی نووسراوەن. ئەگەر بێتو ئەوە رەچاو بکەین کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن خودی مێژوو و دام و دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگای دەوڵەتی بەڕاستینەیەکی لێکچوو لەقەڵەم دەدرا، ئەوا زێدە رۆیی نابێت ئەگەر بەگەورەترین پێشکەوتنی مێژوو دابنرێت. بەدەوڵەت بوون بەلایەنە باش و خراپەکانییەوە بەقەڵەمبازێکی مەزنی مێژووی مرۆڤایەتی دادەنرێت. لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا دەوڵەت وەك ئامرازێکی بە کۆمەڵگا بوون و گشتگیرترین دەزگا، لەسەر بنەمای هێڵە گشتییەکانی سەردەمی لەدایك بوونی، درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات. دەوڵەت شێوەی ئەو باڵادەستییەیە کە کراوەتە سەر بەرهەمە جیاوازەکانی رەنجی مرۆڤ. هەربۆیە ناسینی سۆمەریەکان، بە واتای ناسینی خۆمان و رۆژگاری ئەمڕۆمانە. ئەگەر سۆمەریەکان نەدۆزرابانەوە، ئەوا شانبەشانی لەبیرکردنی سەرچاوەی شارستانییەتی دایك، خۆشمان لەبیردەکرد و نەماندەتوانی بەشێوەیەکی راست و دروست دەست بە لێکۆڵینەوە و نووسینەوەی مێژوو بکەین. لەبەر ئەم هۆکارەشە کە سۆمەریەکان بەواتای رابردوومان دێت، بە ئەندازەی رابردوومان وەکو دوێنێ لێمان نزیکە. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا دەبێ بپرسین چۆن سۆمەر ئاواکرا و کام دەزگای سەرەکی شارستانییەت لەخۆوە دەگرێت؟ ئەو لێکۆڵینەوە مێژووییانەی ئەنجامدەدرێت رۆژ لەدوای رۆژ بەشێوەیەکی بەرچاو وەڵامی راستی ئەم پرسیارانە دەداتەوە.

بێگومان هەبوونی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بەر لەقۆناخی بەدەوڵەت بوون، بووە زەمینەیەك بۆ کۆمەڵگای دەوڵەتی. بەگوێرەی پەیڕەوکردنی بیرۆکەی زانستی مرۆڤناسی ئەوە سەلمێنراوە کە پریمیتە بەراییەکان ـ واتە یەکەمین باپیرە گەورەی مرۆڤ کە مەیموونە ـــ شەست ملیۆن ساڵ بەر لەئێستا پێکهاتوون و بیست ملیۆن ساڵ بەر لەئێستاش لەئەنجامی هەلومەرجی سروشتی ژینگە لەمیانەی ئامێری سەرەتاییەوە ئەوجۆرە لە ئەفریقیا پێشکەوت کە لەسەر هەردوو پێی دەوەستێ. لە ئاکامی ئەنجامدانی لێگەرین و وردبوونەوە لە پاشماوەی داڕووخانەکانی جوگرافیای رۆژهەڵاتی ئەفریقیا، دەریای سوور، دەریای سپی سەلمێنراوە کە سێ ملیۆن ساڵ بەر لەئێستا لێشاوی کۆچ و بڵاوبوونەوەیەکی گرنگ لە ئارادا بووە. ئەوە دەبینرێت کە بە درێژایی نزیکەی یەك ملیۆن ساڵە رۆژهەڵاتی دەریای سپی و کەوانەی تۆرۆس ـ زاگرۆس ـ بە گوتنی مێژوو نووسەکان کەوانی زێڕین (الهلال الخصيب) ـ بوونەتە جێگای چڕبوونەوەی ژمارەی دانیشتووان. لێرەدا ئەو تواناکاری و هەلومەرجە رەخساوەی لە ئەنجامی رەوشی جوگرافیا و هەبوونی دانەوێڵە و ئاژەڵی جۆربەجۆر دەرەخسێت، رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت. ئەو نیشتەجێیانەی کە ژمارەیان یەکجار زیادبووە، لەم جوگرافیاییەوە بەهەر چوار لای جیهاندا بڵاو دەبنەوە. هەبوونی ئەم تایبەتمەندێتیە بە شێوەی بۆماوەیی ( GENATIK) لە مرۆڤەکانی ئاسیا و ئەورووپای رۆژگاری ئەمڕۆماندا سەلمێنراوە. کەوانی زێڕین بە تایبەتیش نێوانی هەردوو رووباری دیجلە و فورات کە ناوە مێژووییەکەی میزۆپۆتامیایە، خاوەنی رۆڵێکی سەرەکی و درێژخایەنە لە پێکهاتنی کۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتایی. لەگەڵ دەستپێکردنی کۆتایی هاتنی قۆناخی بەستەڵەکی لە بیست هەزار ساڵ بەر لەئێستا و جێگرتنەوەی کەش و هەوای فێنك و باراناوی لەجیاتی ساردی و وشکایی، ئەوا لەساڵانی نێوان دوانزدە تا بیست هەزار ساڵ بەر لەئێستا، رێگای لەبەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵگای مەزۆلیتیك کردەوە. بە شێوەیەکی بەربڵاو لەناوچەکەدا راستی پاشماوە و بەڵگەی سەبارەت بە کۆمەڵگای چاخی بەردینی ناوین (مەزۆلیتیك) دێت.

لەبەر ئەوەی پێشکەوتنە کۆمەڵایەتییەکان لەنزیکەوە پەیوەندی بەکەش و هەواوە هەیە، ئەوا ئەو وشکاییەی نزیکەی دە هەزار ساڵ بەر لەئێستا لەناکاو هاتەئاراوە، لەجیاتی شێوەی پێشکەوتنی نێچیرکردن و کۆکردنەوەی بەروبووم، رێگای لەپێش ئەم قۆناخە کردەوە کە لە مێژوودا بە شۆڕشی نیۆلیتیك دەناسرێت. تاوەکو ئێستا لەبەشی سەرووی دیجلە و فورات دا پاشماوەی کۆمەڵگای نیۆلیتیك وەکو مێژووی کۆن دەبینرێت. دەشێ گەوهەری شۆڕشی نیۆلیتیك وەکو شۆڕشی لادێ پێناسە بکرێت، کە لەسەر بنەمای دەستپێکردنی کشتوکاڵ و ماڵیکردنی ئاژەڵ هاتۆتە ئاراوە. ئەو لێکۆڵینەوە ئەرکۆلۆژیانەی لە ئەنجامی هەڵکەندنی شوێنەوار لە ناوچەکانی دیاربەکر ـ ئەرگانی چای ئۆنۆ ـ چەمێ کۆتەبەر و باتمان ـ چەمێ خەلان و ئورفە سیڤەرەك ـ نەوالاچۆری، کراون، مێژووی نیشتەجێبوونی بەکۆمەڵ بۆ دە هەزار ساڵ پ.ز دەگەڕێننەوە. ئەو لوتکە و گردۆڵکانەی لەخاك پێکهاتوون و دەکەونە نێوان رووباری دیجلە و فورات، یەکەمین گوندەکانی شۆڕشی نیۆلیتیکی لەژێر خۆی حەشارداوە. بەکوردی گوند بە واتای لادێ (KOY ـ بە زمانی تورکی) دێت. ئەمەش بە زمانی لۆییەکان کە کۆنترین گەلی ئەنادۆڵە واتای "وڵاتی شوێنە بەرزەکان" دێت. سەرەتا ـ **گوندوانا** ـ یە دوایی دەگوترێت **کوردیان** و دواتریش بە گوێرەی زاراوەی سەلجوقییەکانی ئێران ـ **کوردستان** ـ ی پێدەگوترێت. لەبەشی تایبەت بە مێژووی کوردستان، دەتوانرێت لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوانتر سەبارەت بەم بابەتە بکرێت. ئەو گردۆڵانەی لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا بەردەوام دەیبینین، بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا نیشاندەدات کە بە شێوەیەکی قووڵ و بەرفراوان شۆڕشی نیۆلیتیك لەم ناوچەیە بەڕێوەچووە. تاوەکو ئێستا لەهیچ شوێنێکی جیهان شوێنەوارێکی کۆنی بەمجۆرەی نیشتەجێبوونی بەکۆمەڵ نەدۆزراوەتەوە.

هەروەکو چۆن کۆمەڵگای مەزۆلیتیکی لێرەوە بەجیهاندا بڵاوبۆتەوە، لەهەمانکاتدا هەموو کەسێك ئەم تێڕوانینە وەکو تێڕوانینێکی زانستییانە پەسند دەکات کە کۆمەڵگای نیۆلیتیکیش لەم خاکەوە بەهەر چوار لای جیهاندا بڵاوبۆتەوە. وەکو چۆن ئەم لێشاوە بنەڕەتیانە گرنگترین سەردەمی پێش دەستپێکردنی مێژوون، ئەوا لەهەمانکاتدا بەهۆی بەرفراوانی لایەنە کۆمەڵایەتییەکەیەوە تایبەتمەندێتی ئامادەکردنی هەلومەرجی سەرهەڵدانی شارستانییەت لەخۆوە دەگرێت. لەماوەی نێوان ٤ تا ٦ هەزار ساڵ پ.ز کۆمەڵگای نیۆلیتیك لە ناوچەی دیجلەی ناوەڕاست و فورات پێشکەوتووە، کاتێك کۆمەڵگای نیۆلیتیك گەیشتە ئەو قۆناخەی کە بە کولتووری خەلەفایەتی دەناسرێت، لەساڵانی شەش هەزار ساڵ پ.ز لە باکووری ئەفریقیا،

میسر، خاورووی فورات، کەنداوی بەسرە و ئەنادۆڵی ناوین و چەتال هۆیك بڵاوبۆوە و لەدەوروبەری ٥٠٠٠ساڵ پ.ز لە قەفقاسیا و باکووری دەریای رەش و بەلقان و باکووری رۆژهەڵاتی ئێران و هیندستان و پەنجاب و کەنارەکانی ئیندۆس بڵاوبۆوە، لە ٤٠٠٠ ساڵ پ.ز لە چین و تەواوی ئەوروپا، ٣٠٠٠ ساڵ پ.ز گەیشتە کیشوەری ئەمریکا. لەسەر بنەمای ئەم بەڵگانەی کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە بەدەست هاتوون، ئەوا تێڕوانینی زانستییانەی سەبارەت بە مێژوو ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەم شێوازەی پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوە، بیرۆکەی هەرە نزیکن لە راستی. کولتووری تەل خەلەفی تەواوی ئەو ئامێرانەی خوڵقاندووە کە بۆ شارستانییەت پێویستە. گلکاری، تەور، گاسن، خوری رستن، تەون، هاڕین، ئاواکردنی گوندی بەکۆمەڵ، پێچکە، ئامێری لەبەردی کانزای دروست کراو، پەسندکردنی ئەستێرە وەکو هێما (ئیشارەت)، ئایدیۆلۆژیای بەگوێرەی چەمکی خوداوەندی ژن و هتد، تەواوی ئەم ئامێرانەی بوونە ئامادەکارییەك بۆ شارستانییەت، بەرهەمی مرۆڤە بلیمەتەکانی سەردەمی بەرەبەیانی مێژووە. ئەگەر بێتو رۆڵی ئەم داهێنانە لەگەڵ پێشکەوتنە مێژووییەکان بەراورد بکرێت، ئەوا تەنیا لەگەڵ سەدەی شانزدەهەم و بیستەم بەراورد دەکرێت. جێگای ئەم کولتوورە لە مێژوودا واتایەکی بەوجۆرە لەخۆوە دەگرێت.

بڵاوبوونەوەی ئاوەڕۆکانی دیجلە و فورات لە لیتە دەشتەکانی نزیك کەنداوی بەسرە و لە ئەنجامی هەوڵی ئەو گروپانەی نوێنەرایەتی کولتووری تەل خەلەفیان دەکرد، رێگای لەپێش زیادبوونێکی وەهای بەرهەم کردەوە کە تا ئەو کاتە نموونە و هاوتای نەبینرابوو. پێشخستنی جۆگەلەی ئاو و کشتوکاڵی ئاودێری لە ئەنجامی ئەو وشکاییەی لەماوەی ساڵانی سێ ـ چوار هەزار ساڵ پ.ز دەرکەوت، رۆڵێکی دیاریکراوی لە زیادبوونی بەرهەمدا بینی. کاتێك ماسی و ئەو خورما زۆرەی کە هەبوو، هاتە سەر بەرهەمەکانی دیکە، ئەوا ئەم جوگرافیایە وەکو چەمکێکی بنچینەیی بەهەشت لە هزری مرۆڤایەتیدا جێگیر بوو و شانسی دەستپێکردنی قۆناخێکی مێژوویی بەدەستهێنا. ئیتر قۆناخی **"مێژوو لە سۆمەرەوە دەستپێدەکات"** دەستپێکردبوو. لەمیانەی پێشخستنی نووسینی بزماری لە سێ هەزار ساڵ پ.ز بەولاوە، قۆناخی مێژووی نووسراو دەستی پێکردووە.

سەرەڕای ئەوەی گەلێك تایبەتمەندی هەن کە شارستانییەتی پێ بناسرێت و پێناسە بکرێت، بەڵام ئەو تایبەتمەندێتیەی رۆڵی دیاریکراو و سەرەکی و یەکلاکەرەوەی هەیە ئەوەیە کە، رەنجی مرۆڤ زیاد لەپێویستییەکانی خۆی بەرهەمی بەدەست هێنا و بوو بەئامرازی موڵکایەتی و بەرهەمی زیادە و پەیوەندی کۆیلایەتی. شێوەی ئەو شارستانییەتەی سۆمەریەکان ئاوایانکردووە بە **"زیگوراتی راهیبەکان"** ناوزەد دەکرێت کە رۆڵی یەکینەکانی عیبادەت، کاری کۆمەڵکاری و ناوەندی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای دەبینی. ئەو سەنتەرانەی کە بوونە ناسنامەی کۆمەڵگا و واتایەکی پیرۆزی پێدەدرا وەکو نوێنەری سیستەمی ئاسمان لەسەر زەوی واتادار و پیرۆز دەبینرا. بناخە و کرۆکی ناوەندەکانی کار و ئەنجوومەن، پەرستگای مەزن و بڕیارگای سەربازی و ناوەندەکانی پەروەردە و کولتوورن کە دوای ئەوە بەدرێژایی تەمەنی شارستانییەت پەرەی پێدرا؛ واتە سەرچاوەی سەرەکی بەدەزگابوونی دەوڵەتە. ئەو داهێنانە نوێیەی بەدەوڵەت ناو دەبرا واتە زیگوراتەکان بەهۆی ئەو بەرهەمە زۆرەی لێیکەوتەوە هەر لەسەرەتاوە لەلایەن ئایدیۆلۆگەکانی ئەو سەردەمە لەلایەن راهیبەکانەوە بە پیرۆز راگەیەنرا؛ بەمجۆرەش وەکو نوێنەری سیستەمە پیرۆزەکەی ئاسمان لەسەر زەوی لە هزر و بیری خەڵك جێگیرکران و دەکران بە سەرچاوەی بە کاریگەرترین دەسەڵات.

ئەمەش لەلایەکدا وەکو ئامێرێکی بەرهەم هێنان رێگا لەبەردەم بەرهەمێکی بێ هاوتای رەنجی کۆیلەکان دەکاتەوە، لەسەر ئەم بنەمایەش ئەو مرۆڤانەی لە دەرەوەی بەرهەمهێنان دەمانەوە، دەرفەت و کاتی ئەوەیان بۆ دەرەخسێ بە کاری ئایین و پیشەی دەستکاری و بەڕێوەبەرایەتی خەریك بن و خۆش گوزەران بن، لەلایەکی دیکەشەوە لەگەڵ خوڵقاندنی سیستەمی خوداوەندەکان لەلایەن ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی سۆمەریەکان زیگورات (زەقورە) ئەمە بەواتای دەستپێکردنی قۆناخی زاڵ بوونە بەسەر مێشك و هزر و پێکهاتە رۆحییەکان. بەردەوام پێشکەوتنە ماددی و مەعنەوییەکان یەکتریان تەواوکردووە؛ موڵکایەتی پیرۆز و خێزان و ئەو دەزگا ئایینیانەی بوونە کۆڵەکەی سەرەکی خێزان سەرلەنوێ شێوەیان گرت؛ بەمجۆرەش لەسەر بنەمای خوێن و رەچەڵەك کۆمەڵگا، بوو بە خاوەنی پێکهاتەیەك کە لەمیانەی دەزگا و چینایەتی نوێ نوێنەرایەتی بکرێت.

لە راستیدا دەوڵەت، سۆمەریەکان دایانهێنا. پێشەنگەکانی ئەم قۆناخە بە ئەندازەی ئەوەی لە سەرەتادا ئایدیۆلۆگی مەزنن، لەهەمانکاتدا لە رەوشی سەرەتایی و پێکهاتەی سەرەتایی چینێکدا بوون، کە وەکو بەڕێوەبەر لە رێکخستنی کردارییانەی بەرهەمدا خاوەن رۆڵ بوون. ئیتر هیچ کۆسپێك لەئارادانەبوو کە قۆناخی راهیبەکان بەرەو قۆناخی شای راهیب هەنگاو بهاوێژێت. زەمینەی ماددی و مەعنەوی بە تەواوی پێگەیشتبوو. ئێستا کاتێك لێکۆڵینەوە و لێگەرین سەبارەت بەو بەڵگە و دیکۆمەنتەی سۆمەریەکان بکرێت، کە لەبەر دەستدان، ئەوا بەشێوەیەکی زانستییانەتر لەهۆکاری ئەوە تێدەگەین بۆچی هەر شتێکی ئەنجامیانداوە بەسیستەمی خوداوەند ناوزەدیان کردووە. بەڵام لەو سەردەمەدا مرۆڤ لەجیاتی ئەوەی وەکو سیستەمێك بیناسێت کە مرۆڤ ئاوایکردووە، وەکو سیستەمێکی خودایی سەرزەوی باوەڕییان پێدەهێنا کە راهیبەکان ئاوایانکردووە. شێوەی سەرەکی بیرکردنەوە لەجیاتی زانین لەسەر بنەمای باوەڕهێنان بوو. هەموو شتێك هی سیستەمی خوداوەندەکان بوو. بەبێ هیچ گومانێك باوەڕییان بەمە دەهێنا.

هیچ ئایدیۆلۆژیایەك بە ئەندازەی میتۆلۆژیای سۆمەریەکان تا ئەو رادەیە کاریگەری لەسەر مرۆڤ نەکردووە. مرۆڤ سەری سوڕ دەمێنێ لەوەی، چۆن سۆمەریەکان ئەم میتۆلۆژیایەیان دۆزییەوە و کردیان بە تیۆلۆژی، گرێدراو بەمەش چۆن وەکو دەوڵەت و ئایدیۆلۆژیا رێکیان خست و کردیان بە بنەمای تەواوی ئەو لێشاوە ئایینی و فەلسەفییانەی کە پاشان سەریان هەڵدا و کردیان بە سەرەتایەك بۆ دەستپێکردن، هەروەها چۆن وەکو شێوازێکی سادە و سەرەتایی ئەدەبیات و هونەر واتایان پێبەخشی. نابێ سەرمان لەوە سووڕ بمێنێ کە سۆمەرناسی رۆژ لەدوای رۆژ گرنگییەکی زیاتر و بایەخدارتر بێت. سەرچاوە زۆر گرنگە. تاوەکو ئەم سەرچاوەیە شینەکرێتەوە، ئەوا تەواوی مێژوو مەحکوومی ناتەواوی و چەواشەکارییە. هەربۆیە سۆمەر زۆر گرنگە، بەڵام جێگای داخە کە تازە بەتازە دەرك بەم گرنگییە دەکرێت و دەرئەنجامی گرنگ ئاشکرا دەبن.

دەتوانین بەمجۆرە دەسکەوت و رۆڵی سۆمەریەکان لەپێشکەوتنە مێژووییەکان ریزبەند بکەین:

ا ـ دۆزینەوەی نووسین.

ب ـ دۆزینەوەی بیرکاری و رۆژ ژمێر.

ج ـ دۆزینەوەی یەکەمین میتۆلۆژیای بەرفراوان و تیۆلۆژی.

د ـ داهێنانی دەزگای دەوڵەت، سیاسەت، جیابوونەوەی چینەکان.

ه ـ دۆزینەوەی یاسا و دەستووری نووسراوە.

و ـ داهێنانی شارۆچکە، پەرستگا، پیشەکاری، بەناوەندیبوونی بازرگانی.

ز ـ موڵکایەتی تایبەت و بەکۆمەڵ.

خ ـ داهێنانی خانەدانی و خێزانی پیرۆز.

ح ـ داستان و ئەدەبیاتی نوسراو، مۆسیقا.

ر ـ یەکەمین داگیرکاری و ئیمپریالیزم.

دەتوانرێت گەلێك زاراوە و دەزگا و سیستەمی دیکە بخرێنە سەر ئەمانەی باسمان کرد. بەڵام ئەم تابلۆ سنووردارەش ئەوە روون دەکاتەوە کە پایە و سەرچاوە سەرەکییەکانی شارستانییەت پێکهاتووە. ئەوەی دوای ئەو پێشخراوە سنووردارە و لەبواری چەندایەتییەوە؛ لق و پۆپی سەرچاوە سەرەکییەکە و چالاکی پەرەپێدانە. گوتنێکی سۆمەریەکان هەیە کە زۆر

بەکاریان دەهێنا و خۆشیان دەویست، ئەویش "ME"یە واتە یاسا، دەشێ بە تایبەتمەندێتیەکانی شارستانییەتیش ناوببرێت. واتە دەرك بەواتای داهێنانەکانیان دەکەن و بە یاسا پیرۆزەکان **(ماکان)** ناو دەبرێت. تاوەکو ئێستا ١٠٤ ی ئەوانە ژمێردراون. لەوە دەچێ ئەم ژمارەیە زیاد بکات. نەوەد و نۆ تایبەتمەندێتی سەرچاوەی خۆی لەم زاراوەیەی سۆمەریەکانەوە وەردەگرێت.

بابەتێکی دیکەی سەرەکی کە دەتوانرێت لەو باسەی دەرهەق بە سۆمەریەکان تاوتوێ بکرێت ئەوەیە کە لە مێتۆلۆژیاکاندا گوزارشت لە قۆناخی ناکۆکییەکانی نێوان سەردەمی دایکسالاری و باوکسالاری دەکات. لەگەڵ ئەوەی لە سیستەمی باوکسالاری دەوڵەتی سۆمەردا خوداوەندی ژنی ناوچە شاخاوییەکانی باکوور و باشوور، کە سەرەتا بە **"نین هورساك"** دەناسرا و لەنێو کوردانیشدا بە ئەستێرە دەناسرێ، کەوتە پیلانی دووەم و شانبەشانی پێشکەوتنی کۆیلایەتی و لە ئەنجامی لەدەستدانی هێز لەلایەنی ژن و شکاندنەوەی بە لایەنی رەگەزی دیکەدا، بووە مەیدانی پێکدادانی مەزن. لە سەردەمی سۆمەریەکاندا ژن رێزی لێدەگیرێت و هێشتا هەموو شتێکی لەدەست نەداوە؛ لە سیستەمی خوداوەندی پیاواندا (لە سۆمەر) ژنان دەستیان بەسەر نیوەی بوارەکاندا گرتووە. **"نین هورساك"** بە شێوەیەکی دژوار و رووبەڕوو لەگەڵ خوداوەندە فێڵباز و شیارەکەی پیاوان **ئەنکی** لەنێو ململانێدایە و بەشێوەیەکی گشتی ئەم ململانێیە بە رێککەوتن ئەنجامگیر دەبێت. کاتێك دوای ئەوە وەکو **ئینانا** رووبەڕوومان دەبێتەوە، کاتێك وەکو ژنە خوداوەندی خولقێنەری نئۆلیتیك **"ماکانی"** خۆی واتە داهێنانەکانی خۆی لە شارۆچکەی جێنشینی ئەنکی **ئەریدۆ** بۆ شارۆچکەی خۆی **ئورك** دەگەڕێنێتەوە، بەمەش دەبێتە خاوەنی سەرکەوتنێکی شکۆمەندانە. هەروەها لەبەر ئەوەی لە میتۆلۆژیای سۆمەریەکاندا بیر و باوەڕی رەها جێگای باسە، هەربۆیە ئایینی بووە. لە راستیدا تەواوی ئەو شەڕ و پێکدادانانەی ئەنجامدراوە رەنگدانەوەیەکی روون و ئاشکرای بە دەوڵەتبوونی سۆمەر و ململانێی چینایەتی و شەڕی نێوان شارۆچکەی بنەماڵە خانەدانەکان بووە. هەرگیز مرۆڤە ئاساییەکانی ئەو سەردەمە شەڕیان لەگەڵ یەکتری نەکردووە. لە سیستەمی خوداوەندەکاندا شتێکی بەمجۆرە روونادات، چونکە کۆیلەکان تەنیا دەتوانن ببن بە سێبەر. تەنیاخوداوەندەکان خاوەنی ئیرادەن. تەنیا ئەوان دەتوانن بەناوی خەڵکەکانی دیکە شەڕ بکەن و رێککەوتن ئەنجام بدەن. ئەمەش باڵادەستییەکی ئایدیۆلۆژی ئاشکرا و بەرچاوە و نوێنەرایەتی گەوهەری ئەو زاراوە و رێوڕەسمانەی دەوڵەت دەکات، کە دوایی پەیدابوون و بە ناوەندیبوونی دەوڵەت لە تەواوی بوارەکانی سیستەمی ئایینی، یاسایی و سیاسییەوە لەخۆوە دەگرێت. هەرچەندە شێوەی ئەم باڵادەستییە رووخساری خۆی گۆڕیبێت، بەڵام تاوەکو ئێستا بەردەوام دەکات.

## ب ـ بەدەزگابوون و رۆڵی مێژوویی شارستانییەتی سۆمەری

سەرەڕای ئەوەی قۆناخی شارستانییەت بە شێوەیەکی شکۆدار لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە دەستی پێکردووە، بەڵام هۆکاری سەرەکی نەبوونی بەخاوەن جێگا و رۆڵێکی شایستە لە مێژووی زانستیدا، بۆ درەنگ دۆزینەوە و دەرك کردن بەم راستینەیە و هزری باڵادەستی ئەوروپا دەگەڕێتەوە، کە خۆی بە ناوەندی هەموو شتێك دەزانێ. خۆ بەناوەند زانین **"ئۆگۆیستی"** شارستانییەتی یۆنان ـ رۆما لەم لایەنەوە رۆڵێکی گرنگ دەبینێ. لە راستیدا هەر هەنگاوێکی شارستانییەت خاوەن سروشتی خۆخۆیی وەهایە، کە هەموو پێشکەوتنەکان لەخۆیدا سنووردار دەکات و بەخۆی دەستپێدەکات. سۆمەریەکانیش لەنێو هەڵوێستێکی من منێتی بەمجۆرەدا بوون و هەموو شتێکیان کرد بە موڵکی خۆیان، بەڵێ سۆمەریەکانیش بەرامبەر بە بەهاکانی سەردەمی نئۆلیتیك کەوتنە نێو هەمان هەڵوێستەوە. خولقاندنی هەموو شتێك تەنانەت خولقاندنی خۆشیان بە سیستەمی خوداوەندەکانەوە گرێداوە. شتێکی زۆر روون و ئاشکرایە کە سیستەمی میتۆلۆژی ـ تیۆلۆژی سۆمەریەکان سەرچاوەی تەواوی ئەو زاراوە و دام و دەزگایانەن کە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەن. دەتوانین بەشە سەرەکییەکانی ئەم کاریگەرییە بەمجۆرەی خوارەوە ریزبەند بکەین:

١ ـ پێکهاتنی کۆمەڵگای چینایەتی. لەلایەنی زانستەوە پەسند کراوە کە قۆناخی بەکۆمەڵگابوون خۆی لەخۆیدا سەرەکیترین دیاردەی گۆی زەویە کە لەلایەن مرۆڤەوە ئەنجامدراوە. لەکاتێکدا قۆناخی پەرەسەندنی تەواوی بوونەوەرەکان بەشێوەیەکی سروشتی و پلە بەپلە بەرێوە دەچێت. ئەوا لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا لەسەر بنەمای ئیرادە و وشیاری مرۆڤەوە بەشێوەیەکی زانستی بەرێوە دەچێت. ئەو قەڵەمبازەی لەئەنجامی قۆناخی دەرك پێکردنی مرۆڤەکانی جۆری **"هۆمۆسلیانس"** هاتە ئاراوە و لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا دەروازەی لەپێش پێکهاتەی زمان کردۆتەوە، دەرفەت و تواناکاری بۆ پێکهاتەی کۆمەڵگای خاوەن ئیرادە رەخساندووە. لە قۆناخی گروپە سەرەتاییەکانی ـ هۆڤێتیشدا مرۆڤ لەئاستی کۆمەڵە ئاژەڵە پێشکەوتووەکاندا دەژیا. کاتێك مەزنبوونی بواری مێشك و بەکارهێنانی ئامێر و تەکنیك پێشکەوت و لەلای هۆمۆسلیانس گەیشتە ئاستی قەڵەمبازێکی چۆنایەتی، لەڕاستیدا بەواتای پێکهاتنی یەکەمین و سەرەکیترین قۆناخی شۆڕشی کۆمەڵایەتی بوو. سەرەکیترین تایبەتمەندێتی ئەم شۆڕشە کۆمەڵایەتییە دەرك پێکردنی پۆزەتیف بوونی ژیانە بەشێوەیەکی کۆمەڵ. هەروەها پێکهاتنی یەکەمین فاکتەرەکانی ماددە، ئەوا لە بە کۆمەڵگابوونیشدا هەمیشەیی بوونی یەکینەی پتەو و پێشکەوتن و بەرێوەچوونی لەسەر هێڵێکدا جێگای باسە. بەر لە مێژووی شارستانییەت مێژوویەکی بەکۆمەڵگابوونی بەمجۆرە هەیە، کە هەزاران ساڵی خایاندووە.

لەم قۆناخەدا شۆڕشی گوندی نئۆلیتیك دووەمین قۆناخی مەزنە. ئەم شۆڕشەی کە نزیکەی ١٢ هەزار ساڵ بەر لەئێستا پەرەی سەندووە، گەورەترین هەنگاوی بەکۆمەڵگابوونە. کاریگەری ئەم هەنگاوە لەمیانەی کاریگەری ماددی و مەعنەوی دەزگاکانی لەسەر پێشکەوتنی مرۆڤایەتی دیارە و تاوەکو ئێستا ئەم کاریگەرییە لەسەر پێکهاتەی هزری بەردەوامە. ئەوەی هزری ژیانێکی ئازاد و سروشتی داهێنا، کە ئەمڕۆ بۆتە داخوازییەك، دۆستایەتییەکی زیندووی لەگەڵ سروشت و پێکهاتەی رۆحی دۆزییەوە، کە هێزە تۆقێنەرەکانی خوداوەند ناتوانن بەسەریدا زاڵ بن و کاریگەری لێبکەن، داخوازی یەکسانی نێوان ژن ـ پیاو و چاندن و نێچیرڤانی و ئەو بەرهەم و ئامێرانەی داهێنا کە تا ئەمڕۆکەش شارستانییەتی ئەوروپا بەخێودەکەن، پێکهاتە و زاراوەکانی بیرکردنەوە و زمانی داهێنا و کانزای دۆزیەوە و بەکاریهێنان و ئەو فاکتەرە سەرەکییانەی خولقاند کە تاکو ئێستا بەردەوام شارستانیەتی بەخێو کردووە، شۆڕشی گوندی نئۆلیتیك و پێکهاتەی کۆمەڵگای نێشتەجێی لادێییە، کە لەسەر ئەم بنەمایە پێشکەوت. ئەگەر ئەو سیستەمە مەزنەی کۆمەڵایەتی نەبوایە کە بە پشت بەستن بەو ئامرازانە پێشکەوت و شارستانییەتی ئافراند و لەمیانەی دەشت و سروشتەوە دیجلە و فوراتی بەخێو کرد و لەخۆوە گرت، ئەوا نە کۆمەڵگای چینایەتی سۆمەر و دەوڵەت و دەزگاکانی سەرخان، نە رێبازی پێشکەوتنی شارستانییەکانی دوای ئەو دەهاتە ئاراوە. دەتوانرێت بگوترێت مێژوو رانەدەوەستا و مسۆگەر لەشوێنێکدا کەلێنی دەکردەوە و بەوروژم پێشدەکەوت. ئەمە شیمانە و بیرۆکەیەکە. ئەم مێژووە بونیادنراوە بەهەند وەردەگیردرێت، ئەمەش تاکە هەڵوێستی گونجاوی مێژووی زانستییانەیە. هەربۆیە لەپێناو نووسینەوەی مێژوو بەشێوەیەکی راست و تێگەیشتنی راست سەبارەت بە مێژوو و ئەم هەڵوێست و نزیکبوونەوەنانە گرنگییەکی ژیانی هەیە.

بەگشتی ئەگەر کۆمەڵگاکانی دەرەوەی ئەوروپا، بە تایبەتیش رۆژهەڵات بەشێوەیەکی راست دەرك بەرۆڵی مێژوویی خۆیان بکەن، ئەوا لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا باوەڕیان بەخۆیان بەهێز دەبێت و توانکاری و دەرفەتی ئەوەیان بۆ دەرەخسێت کە بکەونە سەر راستەڕێی خۆیان. مەترسیدارترین لایەنی ئیمپریالیستانەی شارستانییەتی رۆژئاوا لایەنی باڵادەستی ئایدیۆلۆژیە؛ هەتا ئەم باڵادەستییە تێك نەشکێندرێ، ناشێ لەمیانەی هێزی گەوهەری خۆیی، رێگای پێشکەوتنێکی سیاسی و ئابووری بگیردرێتە بەر و لە نێو سیستەمێکی دروست و دادوەر و راستەقینەی جیهان، هاوبەش بن و شوێنگەیەکیان هەبێت. تاوتوێ کردن و قووڵکردنەوەی ئەم بابەتانە لەبەشە پەیوەستدارەکاندا بەگرنگ دەزانم و لەشوێنی خۆیدا دەبینم. ئەگەر ئەمە وەکو زێدەکردن و پاشماوەش ببینرێت، وەلێ لەو باوەڕەدام ئاماژە نەکردن بە بابەتێکی بەمڕەنگە کەم و کورتی جددی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. لەبەشەکانی داهاتوودا زۆر بەباشی ئاماژە بەوە دەکرێ و روون دەکرێتەوە. تاکڕەوێتی بەرلەوەی پێك بێت کە، کۆڵەکەیەکی سەرەکی شارستانییەتی ئەوروپایە و لەنێو دام و دەزگاکانی ماڤ تاکەکەسیدا مۆرکێکی فەرمی بوونی وەرگرتووە و، بەدرێژایی سەدان هەزار ساڵ هەوڵ و تەقەلایەکی مەزن دراوە بۆ ئەوەی یەکەمین گروپی پێکهاتە سەرەتاییەکانی مرۆڤ بۆ نێو بەکۆمەڵگا بوون رابکێشن. تەواوی پێکهاتە سەرەتاییەکانی ئایین و بیر و باوەڕیە بەراییەکان لەپێناو گرێدانی مرۆڤ بە سیستەم و کۆمەڵگا لەنێو شەڕ و ململانێدا بووە و لەم بوارەوە هەوڵەکانی خۆی کەم

نەکردۆتەوە. تەواوی دەزگاکانی دایك سالاری، باوکسالاری، جادووگەری، شامانیزم، راهیبێتی و پێغەمبەرایەتی، لەپێناو ئەوەدا بووە کە مرۆڤ لەژێر کاریگەری ئارەزووە ئاژەڵییەکان رزگار بکات و گرێدراوی یاساکانی کۆمەڵگا و سیستەم بێت. دەشێ ئەو شێوازانەی لەم پێناوەدا بەکارهێنراون زۆر بەئێش و سەیر و سەرسوورهێنەر ببینرێن؛ دەبێ پێشکەش کردنی دیاری و قوربانی، لەسەرووی هەمووشیانەوە پێشکەشکردنی مرۆڤ بەقوربانی، وەکو پارچەیەکی پەروەردەی سەرەتایی ببینرێت و ئەمەش لەپێناو ئافراندنی هێزی بەکۆمەڵگابوونی جۆری مرۆڤە. نابێ بڵێین کۆمەڵگایەکی هۆڤانەیە و بەمجۆرە پشت گوێی بخەین. پێویستە ئەو کۆششانەی شارستانییەتی لەگەڵ خۆیدا ئافراند و مرۆڤی لەڕەوشی ئاژەڵێتی رزگار کرد و بەشێوەیەکی گونجاو سروشتی خستە ژێر خزمەتی خۆیەوە، وەکو هەوڵێکی مەزن و رەسەنی مرۆڤ ببینرێت. ئەگەر ئەم هەوڵ و کۆششانە نەبوایە ئەوا ئێمەش بوونمان نەدەبوو. لەنێو رەوشێکدا کە شیمانەی هەیە لەهەرکاتێکدا جەهالەت هەلومەرجەکانی سروشت بکات بە دۆزەخێك، گرتنە بەری رێگای جیهانی بەهەشت، گرێدراوی رێچکەی زەحمەت و بەئێش و ئازاری بە کۆمەڵگابوونە. لەکاتێکدا دۆزەخ، کەمرۆڤ لەڕاستی خۆی دوور دەخاتەوە، وەکو یەکێك لەسەرەکیترین زاراوەکان لەهزری مرۆڤدا جێگیربووە، ئەوا زاراوەی بەهەشت واتای بانگەوازیە بۆ ئومێد و ئایینده و ژیانێکی مرۆڤانە.

کاتێك لێکۆڵینەوە سەبارەت بەو ئایین و میتۆلۆژیانە دەکەین کە لای ئێمە وەکو بابەتێکی کۆمیدیا دەبینرێت، ئەوا نابێت چیرۆکی ئەوە لەبیر بکەین کە مرۆڤ چۆن بوو بەمرۆڤ.

ئەگەر ئەمە لەگەڵ یاسایەکی فیزیا بەراورد بکەین، دەبینین هەروەکو چۆن بەیەکگرتنی ئەتۆمەکانی ئەو هایدرۆجینانەی وزەی خۆر پێك دێنن، دەبن بە ئەتۆمەکانی هیلیۆم، ئەوا لەپێناو بەدیهێنانی وزەی کۆمەڵایەتی و ئەنجامدانی تەقینەوە پێویستی بەم دیاردەیەی کۆمەڵگابوون هەیە. ئەگەر بێتو کەسایەتییەکانی دایك، باپیر، تەوتەم، خوداوەند، جادووگەر، راهیب و پێغەمبەر وەکو دەزگا خوڵقێنەرەکانی قۆناخ ببینین، ئەوکاتە بە شێوەیەکی راست و دروست دەرك بەکۆمەڵگابوون دەکەین. یەکێك لەتایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی شارستانییەتی رۆژئاوا یاخود ئەوروپا ئەوەیە کە هەندێ لایەنی ئەو قۆناخە پێچەوانەی کە بەرەو پێشەوەی بردووە ئەوەیە کە لەژێر ناوی ئازادی تاکەکەس، ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییانەی بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی نابینێ، پەرتەوازە دەکات. ئەو کەسایەتی و دەزگا سەرمایەدارییانەی کە لە تەواوی پادشا و دەوڵەمەندەکانی مێژوو دەوڵەمەندتر و بەدەسەڵاتترن، بەرهەمی ئەم فەلسەفە بەرەواژووەن. لە کاتێکدا تەواوی ئەو کەرەستانەی بەکۆمەڵگابوونی کە لەسەر بنەمای رەنجی ملیۆنان ساڵەی مرۆڤ هاتۆتە ئاراوە و ئەو جوگرافیایەی پشتیان پێی بەستووە و پێکهاتەکانی سەرخان و ژێرخان و لایەنە ماددی و مەعنەوییەکانی کە بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانیان نییە، بەکورتی لەکاتێکدا تەواوی ئەم لایەنانە پەرتەوازە دەکەن کە قازانجی لێوە نابینن، ئەوا ئەو لایەنانەش دەکەن بەموڵکی خۆیان کە بەگوێرەی بەرژەوەندییانە و قازانجی لێدەکەوێتەوە. یەکێك لەو بابەتە سەرەکییانەی لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەلایەن فەیلەسووفەکانەوە هەڵوەستەی لەسەر دەکرێت ئەوەیە ئەم رەوشە تا چ رادەیەك پەیوەندی بە شارستانییەتەوە هەیە و تا چ رادەیەك دووری شارستانییەت و تەنانەت دەرەوەی کۆمەڵگایە و بەرەو بەئاژەڵبوون دەچێ. بەشێوەیەکی بەرفراوانیش لەبەشی پەیوەستداردا ئاماژە بەوە دەکەین ئەو کاردانەوەیەی بەناوی " سۆسیالیزم " سەری هەڵدا تا چ رادەیەك بەگوێرەی ئامانجەکانی خۆی بوو.

کاتێك هەوڵدەدەین داهێنانی سۆمەریەکان جیابوونەوەی چینایەتی و کۆمەڵگای دەوڵەتی چینایەتی پێناسە بکەین، هاوکات ئەگەر ئاماژە بە پێشکەوتنە مێژووییەکانی بەرلەوە نەکرێت ئەوا هەڵسەنگاندنەکەمان بە ناتەواوی دەمێنێتەوە. تیۆرییە داتاشراوەکانی سەبارەت بە کۆمەڵگای کۆیلەداری هێندە رۆڵێکی روون کەرەوە و یەکلاکەرەوەی نەبووە. بە تایبەتیش لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی بەرجەستە **"سۆمەر"** شینەکراوەتەوە هەروەکو چۆنیەتی ئاواکردنی روون نەکراوەتەوە و ئاماژەی پێ نەکراوە. تەماشای دەوڵەتی کۆیلایەتی رۆما و ئەتینا کراوە و بەهەندێ ئەنجامی گشتی گەیشتوون. لەوانەیە لەقۆناخی پێگەیشتن و پووکانەوەی کۆیلایەتی ئاماژەکردن بەم نموونانە سوودێکی خۆی هەبێت. بەڵام ئەگەر بێتو سەرچاوە سەرەکییەکانی مێژووی شارستانییەت و پێکهاتەی کۆمەڵگای چینایەتی شینەکەیتەوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجام نەدەین، هەروەکو چۆن تایبەتمەندێتی زۆر لەیەکتر جیاواز لەخۆوە دەگرێت، رەوشی بەرجەستە لەنێو هێڵە گشتییەکانیدا بەشێوەیەکی راست و واقیعی بەرچاو دەرباز نەکەین، ئەوا ناتوانرێت تێگەیشتنێکی راست سەبارەت بە مێژوو بەدی بهێنرێت، ئەگەر بەدیش بێت گەلێك کەم و کوڕی ژیانی و هەڵە لەخۆوە دەگرێت. هۆکاری لەسەر راوەستان و بایەخدان بە کۆمەڵگای سۆمەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مێژوو لە سۆمەردا دەستپێکردووە، بۆ تێگەیشتنی رێبازی پێشکەوتنە بەرجەستەکانە. هەروەکو چۆن زانستەکانی کۆمەڵگا و مێژووی رۆژگاری ئەمڕۆمان بەم راستینەیە نەگەیشتوون، ئەوا بە گوێرەی من، کەم و کوڕی مەزن و هەڵە و بە هیچ دانان و زێدەڕۆیی لەخۆوە دەگرێت. یەکێك لە هۆکارەکانی پێشخستنی ئەم بەرگرینامەیە پێشخستنی بانگەوازیەکە لەپێناو پێناسەکردنێکی راست سەبارەت بە کۆمەڵگا و مێژوو، چونکە نیشاندانی هەڵوێست بە گوێرەی پێوانەکانی دادپەروەریم بە پێویست بینی. دەربازبوون لەو کۆمەڵگایانەی لەسەر بنەمای رەچەڵەك و خوێن پێکهاتوون بۆ کۆمەڵگایەکی سیاسی، گرێدراوی گەشەکردنی دەزگاکانی کۆیلایەتییە. ئەمەش زەمینەی ماددی بۆ وەرچەرخانە گەوهەرییەکان دەڕەخسێنێ. ئەو زێدە بەرهەمییەی لەئەنجامی رەنجی کۆیلەکان دێتە ئاراوە، تواناکاری ئەوە دەبەخشێت کە لەسەرەوە گەوهەری چینێکی نوێ لە توێژی بازرگان و پیشەکاران بێتە ئاراوە کە وەکو بژاردەیەکی کارگێڕین و کۆنفیدراسیۆنی تیرەکانی تێپەڕاندووە و پشت بە پەیوەندییەکانی خوێن و رەچەڵەك نابەستێ. بەمجۆرەش هەر سێ کۆمە لەسەرەکییەکەی کۆمەڵگا شێوەی خۆی گرت کە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە. هەروەکو چۆن جیابوونەوە لەمیانەی هێڵی تیژدا یەکلا نەبۆتەوە، لەهەمانکاتدا بەتەواوی لەپەیوەندییەکانی رەچەڵەك و خوێن دانەبڕاوە. ئەمانە بەشێوەیەکی گرێدراو بەیەکتر پێشکەوتوون. ئەم پێکهاتە کۆمەڵایەتییە گوزارشتێکی روون و ئاشکرای هزری نییە. بەڵام روون کردنەوەی لەمیانەی گوزارشتی میتۆلۆژیاوە، یەکێك لە کارە سەرەکییەکانی نووسەر و شاعیرە سۆمەریەکان بووە. هیچ شارستانییەتێکی دیکە وەکو سۆمەریەکان لە ئارادا نییە کە قۆناخی کۆیلایەتی لەمیانەی چیرۆکی میتۆلۆژیا بە شێوەیەکی سەرنج راکێش و لەچوارچێوەی سیستەمی خوداوەندی پیرۆز، پێشکەش بە تەواوی کۆمەڵگا بکەن. راستتر بڵێین تەواوی ئەو ئایدیۆلۆگ و بەڕێوەبەرانەی کۆمەڵگا چینایەتییەکانی کە پاشان دەرکەوتوون، خۆراکی سەرەکییان لە میتۆلۆژیای سۆمەریەکان وەردەگرن و بەگوێرەی هەلومەرجی تایبەتی خۆیان رەخساندوویانە. واتە ئەو میتۆلۆژی و تیۆلۆژیانەی پێکهاتوون یاخود بەنوێ دادەنرێن، بەردەوامکردن و لاساییکردنەوەی جۆری سۆمەریەکانە. میتۆلۆژیای سۆمەریەکان باڵادەستییەکی ئایدیۆلۆژی وەهای ئاواکردووە کە تەنانەت پادشا راهیبەکانیش لەبەرزترین ئاستدا بوونەتە خوڵقێنەر و پێداویستییەکانی یاساکانی خوداوەندیان جێبەجێ کردووە. لە راستیدا ئەوانەی خوڵقێنراون ئەو باڵادەستیە ئایدیۆلۆژیەیە کە بەرژەوەندییەکانیان بەیەکجاری مسۆگەر دەکات. بەڵام پێشکەشکردن و سەپاندن و ئیقناع پێکردن و باوەڕپێهێنانی خەڵك بەوەی کە رەنگدانەوەی سیستەمی ئاسمانی پیرۆزی خوداوەندە لەسەر زەوی، هونەرێکی مەزن و ئاشکرای خوڵقاندنی کۆمەڵگایە.

لە ساڵانی ٤ هەزار تاوەکو ٢ هەزار ساڵ پ.ز، کۆیلە بە تەواوەتی لەڕەوشی بەندایەتی و وەکو سێبەر وابوو. لەنێو ئەم سیستەمەی کە لەپەرستگاکانەوە بەڕێوە دەبرا، لە شای راهیبەوە بگرە تاوەکو دەگاتە رەنجدەرێکی کێڵگە (سەپانێك)، دەبوایە بە گوێرەی ئەو جێگا و رۆڵە بجووڵێتەوە کە دەستنیشان کراوە. هەروەکو چۆن ئەستێرەکانی ئاسمان خاوەنی سیستەمێکی نەگۆڕن، ئەوا سیستەمی سەرزەویش ناچار بوو بەمجۆرە بێت. تەنانەت نەدەشیا بیر لەشێوازێکی دیکە بکاتەوە. لەنێو چەمکی سیستەمێکی بەمجۆرەدا هەست و سۆز ئەو واتایە دەبەخشێت کە خوداوەند دەیخوازێت. هەست و سۆزێك بە گوێرەی داخوازی تاکە کەسەکان نابێت. هەروەها هزرێکی بەدەر لەهزری خوداوەندەکانیش نابێت. سیستەمێکی وەها جێگای باسە کە چۆن فەرمان بدرێت بەمجۆرەیە و سیستەمێکە نەسەرەتا و نە کۆتاییشی نییە. ئەم میراسە ئایدیۆلۆژیەی چینی باڵادەست و چەوسێنەر کە پشت بە رەنجی کۆیلە دەبەستێت زۆر سەرنج راکێشە. کاتێك پادشای خوداوەند مردووە، لەبەر ئەوەی وەکو خوداوەندەکان خۆیان بە نەمر زانیوە، بۆیە تەواوی ماڵ و موڵکییەتی، بە ئامانجی بەردەوام کردنی ژیان لە جیهانی دیکە، لەگەڵیدا ژێرخاك کراوە. پاشماوەی لاشەی نزیکەی ٧٠٠ کەس لە گۆڕی پادشایەك ژمێردراوە کە زۆربەیان ژن بوون، هەندێکیان ژنی بوون و ئەوانی دیکە خزمەتکار. زۆربەی زۆری ئەمانەش ئەو

کۆیلانە بوون کە بەزیندوویی لەگەڵ پادشادا خراونەتە گۆڕ و زیندە بەچاڵ کراون. ئەم چالاکی و کردەوەیان بەئەرکی خۆیان زانیوە. تەنانەت ئەوەشیان بەخەیاڵدا نایەت ترس و ئێش و ئازارەکانیان بدرکێنن. بوویەری لێکچووی ئەمە لەگۆڕستانی فیرعەونەکانی میسریشدا زۆرجار بینراوە.

باوەڕی و شێوازی عیبادەتی قوربانیدانی مرۆڤ لەلایەن سۆمەریەکانەوە لەنزیکەوە گرێدراوی بەهێزی ئایدیۆلۆژیای کۆیلایەتییە. چینە باڵادەست و چەوسێنەرەکان لە سایەی ئەو گۆڕانکاری و نوێبوونەوەیەی بە درێژایی مێژووی شارستانییەت بەرامبەر بە وشیاربوونەوەی مێشك و ئیرادەی مرۆڤ ئەنجامی دەدات، باڵادەستی ئایدیۆلۆژی پاراستووە. ئەم زنجیرەیە تەنانەت بۆ ساتێکیش نەپچڕێنراوە و بەردەوام لەمیانەی ئەنجامدانی گۆڕانکاری و خۆ نوێکردنەوەدا بەهێزتر بووە. لە کاتێکدا ئامرازەکانی دەوڵەتی سۆمەری، لەم پێناوەدا سادەترین ئامرازی باوەڕپێکراو بوون، بەڵام ئەوانەی دواتر لەمیانەی ئەو ئایدیۆلۆژیا بێ ژمارانەی کە خۆشیان باوەڕیان پێی نەبوو چینەکانی ژێر خۆیان ناچارکردبوو باوەڕی پێبهێنن، بۆیە بەردەوام سیستەمیان پتەو و بەهێزتر دەکرد. هەرچەندە مرۆڤایەتی تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆ، لەپێناو دەربڕینی هزر و ئیرادە بەشێوەیەکی ئازادانە، لەنێو هەوڵ و کۆششی مەزندا بووبێت، وەلێ کۆیلایەتی زۆر لەوە دووربووە کە ئەم شێوازەی باڵادەستی تێکبشکێنێ. بە پێچەوانەوە لەمیانەی ئەو هەوڵانەی لەڕێگای دەزگاکانی پەروەردەوە درا، کرا بە موڵکی گشتی و بەردەوامکردنی بەهێزتربوو. ئەمڕۆش لەمیانەی ئەو تەکنۆلۆژیا هاوچەرخەی لە ئارادایە بەهێزێکی ئەوتۆ گەیشتوون کە تەنانەت بەسەر بچووکترین خانەکانی بۆهێڵی ـ جینی (Gen) مرۆڤیشدا زاڵ و باڵادەستە. لەنموونەی سۆمەردا ئەمە زیاتر بە شێوەی کۆیلایەتی پەرستگای گشتی پێشدەکەوێت. بەڵام هەرچی لەڕۆما و ئەتینایە زیاتر شێوەی کۆیلایەتی تایبەت باڵادەست و باوە.

ب ـ یەکێك لەو پێشکەوتنە گرنگانەی لە سایەی پرەنسیپەکانی کۆمەڵگای سۆمەردا هاتۆتە ئاراوە، ئەو ئاستەیە کە جیاوازی رەگەزی پێی گەیشتووە. ئەو هێزەی کە سۆمەر ئافراندنی و ئەو هێزەی بەسەر بەرهەمی سەردەمی نئۆلیتیك زاڵ و باڵادەستە، ژنە. چاندن وماڵیکردن تا رادەیەکی زۆر داهێنانی ژنە. هەروەها لەبەر ئەوەی سروشتی ژن وەڵامی پێداویستییەکانی داوەتەوە بۆیە سیستەمی ژیانی جێگیر، واتا شۆڕشی گوند، مۆرکی ژنی پێوەیە. دۆزینەوە و داهێنانی گلکاری، تەون کردن، هاڕینی دانەوێڵە ئەو کارانەن کە ژن پێشەنگایەتی کردووە. خێزان لە دەوروبەری ژن کۆبۆتەوە و رەچەڵەك بە گوێرەی ژن دەستنیشان کراوە. سیستەمی دایك سالاری باڵادەستە. ئەمەش واتای ئایدیۆلۆژی خۆی لەو بیر و باوەڕیە ئایینیانە دەبینێت کە خوداوەندەکانیان ژنە و نموونەی لە خێزان و ئەستێرەکاندا دەبیندرێ. واتا و گوزارشتی ئایدیۆلۆژی ئەو جیاوازیە رەگەزیەی لە کۆمەڵگای سۆمەریەکاندا شانبەشانی جیاوازی چینایەتی پێشدەکەوێت، بە شێوەیەکی چڕوپڕ لەمیتۆلۆژیادا دەبینرێت. رەنگدانەوەی جیاوازی ستاتۆ لێرەدا زۆر زەق و بەرچاوە. لە کاتێکدا شوێنگەی خوداوەندە ژنەکان سەرەتا لەپێشەوە دەهات، وەلێ لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا لاواز دەبێت؛ لە سەردەمی بابلیەکاندا سەرەتا لە کەسایەتی "**تیامات**" لێدانێکی کوشندەی بەردەکەوێت.  کوڕی بچووك "**مەردۆك**" نوێنەرایەتی کولتووری پیاوسالاری دەکات کە بەخێرایی بەرەو تاکخوداوەندی هەنگاو دەهاوێژێت. حەزرەتی ئیبراهیم کە دواتر دێت و ئەم کولتوورە بەبناخە دەگرێت، رۆڵی باپیری ئەو پێغەمبەرانە دەبینێت کە تاکخوداوەندی بەبنەما دەگرن. لەکاتێکدا ژنان لە رابردوودا بە ئەندازەی راهیبی پیاو لەپەرستگاکان بەکاریگەر بوون، ئەمجارە لەماڵدا دەکەوێتە پیلانی دووەم. یەکەم جێگای سۆزانییەکان داهێنانی سۆمەریەکانە کە بە "**موساکاتدیم**" ناوزەددەکرا. لێرەدا شوێنگە و رۆڵی ژن بـە ئەندازەی دووەمین شەپۆلی شارستانییەت نەکەوتووە. لە تەواوی میتۆلۆژیای سۆمەریەکاندا ستاتۆیەك رەنگدەداتەوە کە نزیکە لەتەبایی و رێککەوتن.

ج ـ یەکێك لەداهێنانە سەرەتاییەکانی سۆمەریەکان دەوڵەت و شۆڕشی شارە. لەکاتێکدا سەردەمی نئۆلیتیك پشت بە شۆڕشی گوند و کشتوکاڵ دەبەستێ، ئەوا کۆمەڵگای شارستانی لەمیانەی ئاواکردنی شار و ئەو دەوڵەتە پێناسە دەکرێت، کە لەسەر بنەمای دروست کردنی شار ئاوابوو. لێرەدا هەم بە دەزگابوونی ژێرخانی ئابووری و هەم لەمیانەی بەدەزگابوونی سەرخان کە دەوڵەت سەنتەریەتی، بە شێوەیەك رێگای لەپێش سەرلەنوێ رێکخستنەوەی ژمارەیەکی زۆری کۆمەڵە جیاجیاکانی مرۆڤ کردەوە کە تا ئەو سەردەمە لە مێژووی کۆمەڵگادا نەبینرابوو. ئەو پێکهاتەیەی کۆمەڵگا کە مەزن و ئاڵۆز بووە، هزری نوێ و بەدەزگابوون لەگەڵ خۆیدا دێنێ. لەمیانەی بەدەزگابوونی نووسین، ئەدەبیات، ژمێریار، رۆژ ژمێر، تەندروستی و پەروەردە دەبن بە پیشەی نوێ. تەواوی ئەو پیشانە و تەنانەت ئەوانەی لەمانەش دەچن زادەی یەکەمین داهێنانەکانی سۆمەریەکانە. لەم سەرلەنوێ بە دەزگابوونانەدا لە پاڵ پەیوەندییەکانی رەچەڵەك و لەجیاتی ئەو، لەسەر بنەمای پشت بەستن بە تایبەتمەندێتی پیشەکاری، پێکهاتەی نوێی کۆمەڵایەتی شێوەی گرت. ئەو دەزگا کۆمەڵایەتی و شێوازە پەیوەندییانەی کە سۆمەریەکان رێگایان لەپێش ئاوەڵاکرد، تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان بەردەوامە، بەڵام لەلایەنی بەرفراوانی و وردەکاریدا دەوڵەمەند دەبێت و بەمجۆرە درێژە بە بەردەوامبوونی خۆی دەدات. ئەگەر زنجیرەیەك ئەڵقەکانی سەرەتای نەبێت، ئەوا ئەڵقەی کۆتاییش بێ واتایە.

د ـ بە دەزگابوونی بوارەکای ئابووری سۆمەریەکان خاوەنی رۆڵ و شانسێکی بەمجۆرەن کە سەرەکیترین پێکهاتە و بونیادی شارستانییەتن. پەیوەندییەکانی نێوان موڵکایەتی تایبەت و موڵکایەتی گشتی پەرەی سەندووە و بە ئاستی دەزگابوون گەیشتوون. هەردوو شێوازی موڵکداری لەسەر خاك لەئارادا بووە و دانی پیانراوە. لەمیانەی دابڕانی پیشەکاران لە خاك، پیشەی نوێ و سەربەخۆ هاتۆتە ئاراوە. ئەو پیشە جۆربەجۆرانەی کە ئیتر بۆتە راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراو لە سەرووی هەمووشیانەوە بازرگانی، دارتاشی، تەون کردن، گڵکاری، کانزاکاری لە بواری ئابووریدا، بوونەتە کۆڵەکە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای سۆمەری. لێهاتوویی و توانای نوێبوونەوەی سۆمەریەکان تاڕادەیەکی مەزن پشت بە توانست و هێزی ئەم پیشانە دەبەستێ. هەروەها دەزگاکانی پێغەمبەران و بلیمەتان لە نزیکەوە گرێدراوی ئەم پیشانەیە.

هـ ـ دەزگاکانی پێکهاتەی سەرخانی کۆمەڵگای سۆمەریەکان زۆر دەوڵەمەندە و نوێنەرایەتی خوڵقکارییەکی وەها دەکات تا ئەو رۆژە هاوتای نەبینراوە. یەکەمین نموونەی بەشە بیروکراتییەکانی دەزگاکانی دەوڵەتی وەکو پاشایەتی، ئەنجوومەن، سەربازی، وەزارەت پێك دەهێنرێت و دەبن بە سەرچاوەی سەرەکی ئەو پێشکەوتنانەی دواتر لەم بوارەوە دێنە ئاراوە. ئەو بەهایانەی بەشێوەی زاراوە و یاسا و رێسا پێکهێنراون، هێندە تۆکمە کراون کە هێز و توانای ئەوەیان هەیە تارۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوام بن. ئەگەر بێتو سەرچاوەی پێکهاتنی ئەم لایەنەش نەبینین و هەڵنەسەنگێنین، ئەوا ئەو شیکردنەوەیەی سەبارەت بە رۆژگاری ئەمڕۆمان دەکرێت کەم و کوڕی و هەڵەی جددی لەخۆوە دەگرێت.

و ـ خوڵقکاری ئایدیۆلۆژی و بە دەزگابوون رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە گۆڕانکاری و گەشەکردنی هزری مرۆڤ. داهێنانە مێتۆلۆژییەکانی سۆمەریەکان و شێوازەکانی پەرستن، رۆڵی بەنزین و چەورکردن دەبینن لەکاروباری دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگادا. بەڕێوەبەرانی سۆمەر بە تایبەتیش توێژی راهیبەکان زۆر بە چاکی دەرکیان بەوە کردبوو کە بە بێ ئەوەی خەیاڵی ئایدیۆلۆژی و شێوازەکانی چۆنیەتی هەرسکردن و بەرجەستەکردنی بۆ کۆمەڵگا دانەهێنن، ناتوانن چەرخی سەردەم هەڵسووڕێنن. هەر لەبەر ئەوەی بەڕێوەبردن و رێکخستنی کۆمەڵگای گوندی ــ نئۆلیتیك زۆر سادەیە چونکە پشت بە کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ دەبەستن، بۆیە پێویستی بە یاسا و دەزگای بەڕێوەبردن و هزری ئاڵۆز نییە و پێویستی بوون بۆ سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی میتۆلۆژی پێشنەکەوتووە. بە ئەندازەی ئەوەی لە کۆمەڵگای ئەو سەردەمەی سۆمەریەکاندا پێویستی تێپەڕاندنی ئەم قۆناخە دەرکەوتبێتە پێش کە لەمیانەی بیر و باوەڕە سەرەتاییەکانی تەوتەم و ئەستێرەناسی گوزارشتی لێدەکرا کە پشت بە کولتووری دایك و باوك دەبەستن، ئەوا دەزگای راهیبەکان پێشکەوتنێکی گرنگ بەخۆیەوە دەبینێ و دەبێتە دەزگایەکی سەرەکی.

وێنە (**تصور**) ئایدیۆلۆژیەکانی سۆمەریەکان تەنانەت لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا جێگای سەرنج راکێشان و سەرسووڕمانە. هەرچەندە لێکۆڵینەوەیەکی زیاتر پێشبخرێت، دەرك بەوە دەکرێت ئەو پێکهاتە میتۆلۆژیانەی کە بناخەی زانستی خواناسی و ئەدەبیاتن، ئەو تەسەوڕانەی کە کاریگەرییەکی زێدەیان کردۆتە سەر پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی مێژووی شارستانییەت. پێکهاتەی هزری سۆمەریەکان رۆڵێکی گرنگ و بەکاریگەر دەبینێ لە پێکهاتنی بناخەی تەواوی بیر و باوەڕیە دۆگماکان. لەم چوارچێوەیەشدا زانستی سۆمەرناسی یەکێکە لەو لقانەی

زانستی مێژوو کە ڕۆژبەڕۆژ گرنگییەکەی زیاتر دەبێت. پێکهاتەی دۆگماتیکی شێوەکانی بیرکردنەوە تاوەکو دوایی بۆ وەرچەرخانی دیالەکتیکیانە کراوەیە و سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی خولقکارییە.

دەشێ هەندێ تایبەتمەندێتی و پێکهاتە بنچینەییەکانی یاسا و ڕێساکانی هزر بەمجۆرە ریزبەند بکەین:

١ ـ پێکهاتەیەکی سەرەتایی دیالەکتیکی نیشان دەدات. هەروەکو چۆن ئاسمان بەرامبەرەکەی زەویە، لەهەمانکاتیشدا نوێنەرایەتی پرەنسیپێکی بەمجۆرە دەکات لەم دوانە یەکێکیان نێرە و ئەوی دیکەیان مێیە. ئاسمان بە **"ئەن"** زەویش بە **"کی"** ناو دەبرێت. **"ئەنکی"** شێوەی نێرێتی ئەم یەکێتییەیە و زۆرباش هەست دەکات کە لەگەڵ خوداوەندەی ژندا ڕێککەوتووە. ئەنکی سەرچاوە و باپیرەی زاراوەی باوکە. تەواوی خوداوەندە ژنەکان بۆ خۆی دەهێنێ و ڕێگا لەپێش منداڵبوونێکی یەکجار زیاد دەکاتەوە. خوادەوەندی ژن **"تیامات"** کە دوای هەمووان لە دایك دەبێت لەلایەن خوداوەندی بابلیەکان **"مەردۆك"** لێدانێکی کوشندەی بەردەکەوێت و لە ریزی دەستەی خوداوەندەکان بەدەر دەنرێت. لە ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز بەو لاوە بیروباوەڕی خوداوەندی ژن و ئەو چیرۆکە میتۆلۆژیانەی گوزارشتی لێدەکەن، بە ڕادەیەکی مەزن دوا دەکەوێت و دووچاری بەلاوەنان و پەسندنەکردن دێت. ئەم گۆڕانکارییەش لە نزیکەوە پەیوەندی بەو کەوتنەی ژنەوە هەیە کە لە ئاستی ستاتۆی کۆمەڵایەتیدا دووچاری هات. پرەنسیپی نێرێتی ـ باڵادەستی پیاو ـ زاڵ بوونی خۆی لەنێو پێکهاتەی کۆمەڵگا و دەوڵەتدا تۆکمە و بەهێز کرد. لە ئاکامی ئەوەی دەسەڵاتی پادشایەتی بە شێوەی ئایینی تاکخودایی و باڵادەستی پیاو لە بەرزترین دەزگاکانی دەوڵەتدا تاوەکو یەکینە هەرە ژێرەکانی جێگیر بووە، ئیتر بەپێی دەربازبوونی کات میتۆلۆژیا شێوەی بیر و باوەڕییەکی مسۆگەر لەخۆوە دەگرێت، کۆمەڵگا وەرچەرخانێکی ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی مەزن بەخۆوە دەبینێ. پادشاکان یا ئەوەتا ڕاستەوخۆ بۆ خۆیان خوداوەندن یاخود ڕۆڵی نوێنەریکردنی خوداوەند دەبینن. بەمڕەنگە بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر پەیوەندی نێوان **کۆیلەدار ـ کۆیلە** گۆڕدراوە بۆ پەیوەندی **خودا ـ بەندە**. بیر و باوەڕی سەرەکی میتۆلۆژیا و ئایین و وەرچەرخانی یاسا بۆ دەستوور، پێشکەوتنێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی مەزنە و دەرئەنجامی گرنگ لەگەڵ خۆیدا دێنێتە ئاراوە. پەرستگاکانی سۆمەریەکان و **(ئودوبا)** واتە ئەکادیمیای کولتوور یان ئەو دەزگا هزریانەن کە تا دواڕادە کاردەکەن بۆ ئەوەی دەسەڵاتی **پادشا ـ ڕاهیبەکان** پێشبکەوێت و بەردەوام بێت. بۆ پێکهاتنی میتۆلۆژیا لەلایەکەوە ئایین کە بە واتای زانستی خوداناسی دێت، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو بیرۆکە و ئەندێشانەی بە شێوەی داستانی ئەدەبین، ئەرکی تایبەت و سەرەکی ڕاهیب و نووسەران و بیریاران بوون. **"نیپور"**ی پیرۆزیش لەلای بابلیەکان دەبێتە سەنتەری ئەو کولتوور و ئایین و ئەدەبیاتەی کە بە هەزاران ساڵ بەردەوام دەبێت.

٢ ـ سیستەمی بیرکردنەوە پشتی خۆی بە سیستەمی ئاسمانی دەبەستێت. هەروەکو چۆن ئەستێرە و مانگ و خۆر شێوازێکی نەگۆڕی جوڵانەوەیان هەیە، هاوکات دەبێ یاساکانی سەرزەویش نوێنەرایەتی ئەم یاسا ئاسمانیانە بکەن. دەوڵەت و پادشای ـ ڕاهیب بە ناوی خوداوەند نوێنەرایەتی ئەم سیستەمە دەکەن. ئیرادەیان پیرۆزە و وتەکانیان یاسایە. هەموو هێزەکانی سەر ڕووی زەوی هەر یەکە و خودایەکیان هەیە. هەمان شت بۆ هێزەکانی کۆمەڵگاش بەڕێوە دەچێ. ناشێ هیچ تایبەتمەندێتی و بوونەوەرێکی بێ خوداوەند بوونی هەبێت. دەبێ ئەمە بە شێوازی هزری **"خودایی"** زانستی خوداناسی ناوزەد بکرێت. ئەم شێوازەی بیرکردنەوە دواتر پێشکەوتنێکی مەزن دێنێتە ئاراوە و دەبێتە بناخە و سەرەتای فەلسەفەی یۆنان (گریکی کۆن) و ئەو هزرە زانستییەی کە لە ئەورووپای هاوچەرخدا پێشکەوتووە. هەرچەندە لەسەر بنەمای یەکتری ڕەت کردنەوە و نکۆڵی کردن ناکۆکییەك لە نێوان ئەم قالبە سەرەکیانەی شێوازەکانی بیرکردنەوەدا هەبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی دەرهاوێشتەی یەکترن و یەکدیان ئافراندووە پەیوەندییەکی توندیان بەیەکترەوە هەیە. بۆیە تاوەکو پەیوەندییەکانی نێوانیان ئاشکرا نەکرێت ناتوانرێ مێژووی ئایینەکان و مێژووی فەلسەفە و مێژووی هزری زانستی بە شێوەیەکی ڕاست ڕوون بکرێتەوە. شێوازی بیرکردنەوەی سۆمەریەکان بە گوێرەی خۆی بە واتای پێشکەوتنێکی مەزن دێت. پاشان یاساکانی خودا بە شێوەی یاسای زانستییانە دەرکەوتوونەتە پێشمان.

٣ ـ زاراوە سەرەکییەکانی میتۆلۆژی وەکو مرۆڤی یەکەم، بەهەشت و دۆزەخ، لە بەهەشت دەرکردن و تۆفان لەنێو هزری سۆمەریەکاندا، جێگا و شوێنێکی گرنگیان گرتووە. ئەو ڕەوشە ناکۆك و سەخت و زەحمەتەی لەنێو سروشت و کۆمەڵگادا دەرکەوتوون گێڕانەوەیان بە شێوەی زمانی شیعر و داستان داب و نەریتێکی سۆمەریەکانە. ئەو دیاردە سروشتی و کۆمەڵایەتییانەی بە گوێرەی خۆیان ناویان لێناوە و کردوویانە بە تیۆرییەك، بە شێوەی سیستەمێك گوزارشتی لێدەکرێت. تیۆلۆژییەکانیان لەسەر هەر بوویەر و پەیوەندییەك پیادە دەکەن و ئەنجام لەهەر یەکەیان وەردەگرن. ئەم هەڵوێست و نزیکبوونەوەیەش ڕێگا لەپێش تەڤینەوەیەکی هزری دەکاتەوە. هیچ شتێك لە هەڵوێست و دادگایی کردنەکانی ئەم سیستەمە ڕزگاری نابێت، هیچ شتێکیش بێکار و دەست بەتاڵ نییە. هەموو شتێك گرێدراوی یەکترە. هەروەکو بڵێی ڕووبەڕووی شێوەی سەرەتایی یەکەمین پرەنسیپی دیالەکتیك بووینەتەوە. یەکەمین یۆتۆپیا و داستان سەرچاوەی خۆی لە سۆمەریەکانەوە وەردەگرێت. یۆتۆپیای بەهەشت، ژیانی ئادەم و حەوا و دەرکردنیان لە بەهەشت، یەکەمین شەڕی براکوژی نێوان هابیل و قابیل و داستانی کەسایەتی گلگامیشی **نیوخودا ـ نیو مرۆڤ** بە شێوەیەکی تۆمارکراو گەیشتۆتە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان. ئەوەی لەم یۆتۆپیا و داستانانەدا باسی لێوەکراوە، زۆری و زەحمەتی ئەو ناکۆکییە کۆمەڵایەتییانەیە کە لە ئەنجامی ئەو ململانێیانە دەرکەوتن، کە ئامانجی گەڕانەوە بوو بۆ گەوهەری یەکسانی ڕۆژانی سەردەمی نئۆلیتیك. گێڕانەوە و هزرەکەش بەمجۆرەیە. بۆ ڕوون کردنەوەی زانستییانە زووە و کاتی نەهاتووە. لێرەدا ژیری و هزری مرۆڤ زۆر لەسەردەمی چەرخی زانستی دوورە. دەبێ لەبیرنەکرێت، هەروەکو چۆن زانستیبوون لە شارستانییەتی یۆنان ـ ڕۆما زۆر سنووردار بووە، ئەوا فەلسەفە زۆر لەوە دوورە کە لەژێر کاریگەری میتۆلۆژیا و تیۆلۆژیا ڕزگاری بووبێت.

ژ ـ ئەوەی بۆ یەکەمجار کردەوەکانی ئیمپریالیزمی و داگیرکاری کرد بە سیستەم، شارستانییەتی سۆمەرە. **"سەرجۆن"** کە بنەماڵەی خانەدانی ئەکەدی دامەزراند و تەواوی نیمچە دەوڵەتەکانی سۆمەریەکانی فەتح کرد و کردنی بەیەك، بە یەکەمین ئیمپراتۆر ناوزەد دەکرێت. سەرجۆن قۆناخی دەوڵەتی داگیرکاری دەستپێکردووە. دەوڵەتی شاری سۆمەریەکانی پێش لەو، جگە لەوەی هەندێ پایگای سەربازیان لەپێناو خۆپاراستن و بازرگانیدا ئاوا دەکرد، پەنایان نەدەبردە بەر هێرشەکانی فەتح و داگیرکاری. بەڵام هەرچی **سەرجۆنە** خولقێنەری قۆناخی سیستەمێکی خۆ فرەکردن و پەلهاوێشتنە لەسەر بنەمای پەیڕەوکردنی توند و تیژی، چونکە لەجیاتی پێگە سەربازییەکان کۆلۆنییەکی بەرفراوان و لەنێو شارەکانیشدا شاری سەرەکی (پایتەخت) ئاوا کرد، ئەوەی تەواوی ئیمپریالیست و داگیرکارەکان دوای ئەو ئەنجامیانداوە تۆکمەکردن و پەیڕەوکردنی ئەو سیستەمەیە. کوشتنی مرۆڤ بە شێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو، دەست بەسەرداگرتنی هەموو شتێکیان، بە کۆیلەکردنیان، داگیرکردنی ئەو شوێنانەی بەرژەوەندی و قازانجی خۆیان تێدا دەبینن و لەسەر دەسەڵات هێشتنەوەی ئەو تاقم و کەسانەی بە گوێرەی خۆیانە، یەکێك لە قۆناخە گرنگەکانی پێشکەوتنی مێژووییە. دەبێ بەمجۆرە لەقەڵەم بدرێن کە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك ئیمپراتۆرییەتێکی گەردوونییان لەو قۆناخەدا ئاواکردووە. هەربۆیە لەم چوارچێوەیەدا سۆمەریەکان جگە لەوەی کۆمەڵگای دەوڵەتی ـ چینایەتین، لەهەمانکاتدا شارستانیەتێکی ئیمپریالیستی وەهایە کە خاوەن پێکهاتەیەکی فرە ئەتنیکییە.

ڕ ـ شەرەفی نووسینی یەکەمین ڕێسای یاساکان تایبەت بە سۆمەرکانە. سۆمەریەکان یاساکانی دەستووریان لەسەر بەردەکان هەڵکەندووە و نووسیویانە و بەمجۆرە، سەبارەت بە دەرك پێکردنی و پەیڕەوکردنی یاسا سەرەکییەکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا گرنگی و بایەخێکی تایبەتیان پێداوە. ناوبانگی یاساکانی **ئورنامۆ و حامورابی** تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. بەها سەرەکییەکانی شارستانییەتی وەکو مۆسیقا، هۆنراوە، بناخەی چالاکی و کردەوە سەرەکییەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان پێك دێنێ. سەلماندنی ئەم تایبەتمەندێتی و ڕاستییانە شتێکی هێندە سەخت و ئاستەم نییە. هەروەکو چۆن ئاواز و ستران و گۆرانی بە ئامراز و مەقام و شێوازی خۆیان دەگەن، بەمڕەنگە بە هەزاران ساڵ کاریگەری لەسەر قۆناخەکانی دوای خۆی کردووە.

**س** ـ بەهۆی گرنگییەکەیەوە خاڵێکی دیکە کە پێویستی بە یەکلابوونەوە هەیە، بابەتی نەژادی سۆمەریەکانە. ئایا خاوەنی چ جۆرە تایبەتمەندییەکی ئەتنیکین و، هەڵوێستیان بەرامبەر نەژادە جیاوازەکانی تر چۆنە؟ چ پاشماوەیەکی نەژادی ئەم شارستانییەتە ماوەتەوە کە مۆرکی خۆی لەمێژوو داوە؟ بێگومان ئەم پرسیارانە گرنگن و پێویست دەکات لەم بارەیەوە

لێگەڕین و لێکۆڵینەوەکان قووڵ بکرێتەوە. شوێنی سۆمەریەکان جێگای بەیەك گەیشتنی دوو ناوچەی سەرەکین کە ڕۆڵێکی مەزنیان لەمێژوودا بینیوە. شتێکی روون و ئاشکرایە مەملەکەتی سۆمەریەکان کە دەکەوێتە ئەو دەشتە بەپیتانەی نێوان بیابانی عەرەبی و زنجیرە چیای زاگرۆس ـ تۆرۆس، بە ئەندازەی ئەوەی شارستانییەتی خۆی پێشخستووە، بەردەوام رووبەڕووی پەلامار و داگیرکاری دەبێتەوە. هەروەکو چۆن سەردەمێك ئیمپراتۆرییەکانی یۆنان و رۆما جێگای سەرنجی هەموو لایەنێك بووە، هاوکات شارستانییەتی سۆمەریش لەسایەی ئەو دەوڵەمەندییەی خولقاندبووی ببوە جێگای چاوتێبڕینی دەرەوە. جگە لەوەی کە بەخۆشی بەردەوام پەلی بۆ دەرەوە هاوێشتووە. کاتێك پرەنسیپی کار ـ کاردانەوە بە شێوەیەکی چڕوپڕ بکەوێتە بواری کردارییەوە، ئەوا راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراوە کە حوکم و کاریگەری دیالەکتیکی بە شێوەی پێشکەوتنی مێژوویی بەڕێوە دەچێت. لە باشووری رۆژئاوا (سامی) سامییەکان، لە باکووری رۆژهەڵاتیش ئارییەکان (ئاریان) هەروەکو سۆمەریەکان بە **"هۆریت"** ناوزەدیان دەکەن. ئەم نەژاد و رەگەزانە بە ئەندازەی ئەوەی شارستانییەتیان هەرس نەدەکرد هاوکات بەردەوامیان بە هێرشەکانیان دەدا و هەنگاویان بۆ دواوە نەدەهاوێشت.

دەشێ ئەم هەڵوێستە کۆتاییەکانی سۆمەریەکان روون بکاتەوە، بەڵام دەرفەتێکی سنوورداریش بۆ روون کردنەوەی سەرچاوەکەی دەڕەخسێنێ. لەئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی دەرهەق بە نووسینە هەڵکەندراوەکان کراوە، لەو تاتەڤوڕینە و ئاسەوارانەدا دەرکەوتووە، کە بڵاوبوونەوە و کۆچبەری لە باکوور و رۆژئاواش ئەنجامدراوە. ئامۆریەکان کە لە باشوور و رۆژهەڵاتەوە هاتوون، لەبەر ئەوەی بە شوانکاریەوە خەریك بوون، هیچ ئاسەوارێکیان لەپاش بەجێ نەماوە. پێدەچێ ئەم گروپە کۆمۆنە بچووکانە کە لەم دوو ناوچەیەوە هاتوون، یەکەمین یەکینەکانی نیشتەجێبوونیان ٦٠٠٠ ساڵ پ.ز ئاوا کردبێ. توانستەکانی ناوچەکەی دەرهەق بە بەرهەمی جیاواز و بە پیت بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، ڕێگای لەپێش وەرچەرخانی پێویست کردەوە و جیاوازی نەژادی سۆمەریەکانی خولقاند. هەبوونی گەلێك وشە کە سەرچاوەی خۆی لە ریشەی هەم هۆریەکان و هەم ئامۆریەکان وەردەگرێت و جێگرتنیان لەنێو پێکهاتەی زمانی سۆمەریەکاندا، ئەم نزیك بوونەوەیە پشت راست دەکاتەوە. بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت کە سۆمەریەکان قەومێکی رەسەن نین، بە پێچەوانەوە هەروەکو چۆن لە گەلێك شوێنی جیاوازدا روویداوە، یەکینە کولتوورییە جیاوازەکان تێکەڵ بە یەکتر بوونە و لە سەنتێزێکی باڵاتردا بە یەکتر گەیشتوون و کوولتوورێکی نوێیان خولقاندووە، ئەمەش سەرچاوە رەسەن و راستەقینەکەی ئەم نموونە زەڤانەیە کە ئاماژەمان پێکرد.

## ج ـ ئەنجامە جێگیر و هەمیشەییەکانی شارستانییەتی سۆمەر

هەروەکو لە هەموو کولتوورەکاندا روویداوە، بە تایبەتیش لەبەر ئەو دەرئەنجامەی لێی کەوتۆتەوە و ئەو شوێنە مێژووییە هەمیشەییەی کە هەیەتی، شارستانییەتی سۆمەریش بە گۆڕانکاری و وەرچەرخانی بەرچاودا دەرباز بووە و بەمجۆرەش لەنێو ئەو کولتوورە جیاوازانەدا درێژەی بە هەبوونی خۆی داوە، کە بە تایبەتیش رۆڵێکی سەرەکی لە ئاواکردنیاندا بینیوە و لە شوێن و جێگایەکی بەمجۆرەدا جێگیر بووە کە بە پێی دەربازبوونی کات دەرك بە نرخ و بەها مێژووییەکەی کراوە. بنەماڵەی خانەدانی ئەکەدی **سەرجۆن** کە بە گرانی مۆرکی سامی پێوەیە، یەکەمین نموونەی گرنگی گۆڕانکارییە کە لەمێژوودا دەستنیشان کراوە. زمانی فەرمی و باڵادەستی کولتووری بەتەواوەتی بەگوێرەی کارەکتەری سۆمەریەکانە. لەسایەی دەسەڵاتی ئەم بنەماڵە خانەدانە لە ماوەی نێوان ٢٣٥٠ تا ٢٢٥٠ پ.ز دا، چڕبوونەوە لە پێکهاتەی زمانی سامیەکان دا دەبینرێت. تا رادەیەك وەکو کاردانەوەیەك بەرامبەر بەم چڕبوونەوەیە، گۆتیەکانی کە ریشەیان بۆ ئاری ـ هۆریەکان دەگەڕێتەوە، دژە هەڵمەتێك بە هاوکاری خانەدانێکی دیکەی سۆمەری ئەنجامدەدەن و بەمڕەنگە وەرچەرخان و هاوسەنگییەکی نوێ دێتە ئاراوە. کولتووری **ئێران ـ ئیلام** سەنگین دەبێت و مۆرکی خۆی لێدەدات. لە ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز دا بە شێوەیەکی بەردەوام داگیرکاری و دەست بەسەرداگرتنی باشوور و رۆژهەڵات لەلایەن گروپە سامی و ئامۆریەکان روودەدات. ئیتر لەگەڵ رووخانی سێیەمین بنەماڵەی خانەدانی **"ئور"** قۆناخی میرنشین و دەوڵەتی ـ شار دەستپێدەکات کە بە گرانی مۆرکی ئامۆریەکانی پێوەیە. لەساڵانی ١٨٠٠ پ.ز و لە ئەنجامی دەسەڵاتی بنەماڵەی بەناوبانگی حامورابی ئامۆریەکان، سۆمەریەکان بە تەواوی هێزی سیاسیان لەدەست دەدەن. ئیتر زمانی سۆمەریەکان لەڕێ و رەسمی فەرمیدا بەکار ناهێنرێت. زمانی فەرمی زمانی ئەکەدی بابلیەکانە کە بناخەی سەرەکی زمانی ئاشووری و کلدانی رۆژگاری ئەمڕۆمانە. ئیتر زمانی کولتووری تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین بابلیە واتە زمانی ئارامییە. ئەمجارە لەمیانەی ئەو پەلامارەی لە باکوورەوە لەلایەنی ئەو هیتیت و کاسی و میتانیانەوە روودەدات کە سەر بە ئاریان ـ هۆریەکانن. لە ساڵانی ١٦٠٠ پ.ز سەرلەنوێ هاوسەنگی لە نێوان هەردوو کولتوور ئاوا دەکرێتەوە، بەڵام دیسان ناوەندی مێشکی بەڕێوەبەرایەتی بابلە و زمانەکەشی بابلیە. ئیتر تەواوی کولتووری سۆمەریەکان بە پارزنگی بابلیەکاندا دەرباز دەبێت و قۆناخی دەستپێکردنی شێوازی تیۆلۆژی و ئەدەبیاتی بابلی جێگای پڕ بایەخی خۆی لەمێژوودا دەگرێت. زانستی ئەستێرەناسی و بیرکاری بابلیەکان هەڵمەتێك ئەنجامدەدات. بنەماڵەی خانەدانی ئاشوور ـ ئامۆری نەینەوا کە دەکەوێتە باکووری بابل، هەنگاوێکی دیکە ئەم قۆناخە بەرەو پێشەوە دەبات. بەمڕەنگە رێبەرایەتی کولتووری و ئایدیۆلۆژی بابلیەکان و رێبەرایەتی سیاسی ـ سەربازی ئاشووریەکان دەست بەسەر تەواوی رۆژهەڵاتی ناویندا دەگرن.

قۆناخەکانی بابلی و ئاشووری شارستانییەتی سۆمەری، قۆناخی تەواوبوونی وەرچەرخانی ئەکەدیەکان و راستەوخۆ بڵاوبوونەوەیەتی بۆ تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین و شوێنەکانی دیکەی جیهان. ئەمەش بە رادەیەکی زیاتر لە ئەنجامی بەکارهێنانی شێوازی توندوتیژی ئیمپریالیزمیانەوە بەدی دێت. دەسکەوتە ئایدیۆلۆژی و کولتوورییەکانی زۆر سنووردارە. زمانی سۆمەری وەکو زمانێکی دێرینی پیرۆز، لەمیانەی فەلسەفە و ئەو وەرگێڕانە بەردەوامانەی لێیەوە ئەنجام دەدرێت، رۆڵی گرنگی خۆی بۆ بڵاوبوونەوە لەتەواوی جیهاندا دەگێڕێت. پەسەندکردنی یەکتری لەلایەن کولتوورە خۆجێیە جیا جیاکان بەپێی دەربازبوونی کات دووچاری گۆڕانکاری دێت. بەڵام شتێکی مسۆگەرە کە یەکەمین نموونەی دێرین سۆمەرە. هەبوونی زمانی سۆمەری لەساڵانی بەرەبەیانی زاییندا بەتەواوەتی کۆتایی پێدێت.

کاتێك تەماشای شوێنگەی شارستانییەتی سۆمەری لەنێو مێژوودا بکەین ئەوا زۆر بە باشی ئەم راستییەمان بۆ روون دەبێتەوە کە هیچ شارستانییەتێك بۆ ماوەیەکی درێژخایەن و بە قووڵاییەکی بەمجۆرە کاریگەری نەکردۆتە سەر مرۆڤایەتی. لە ماوەی نێوان ٤ هەزار ساڵ پ.ز تاوەکو ٢ هەزار ساڵ پ.ز بە شێوەیەکی راستەوخۆ، لەماوەی نێوان ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز تاوەکو سەرەتاکانی زایین بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، هەم مژیین و هەم بەخێوکردنی مرۆڤایەتی لەلای پێڕەوکارانی سۆمەریەکانەوە جێگای باسە. ئامادەکردن و هەمیشەیی کردنی سیستەمی کۆیلایەتی لەلایەن دامودەزگاکانی سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگا و پیرۆزکردنی لەمیانەی دۆگمای ئەخلاقی ـ ئەدەبی، سەرکەوتن و شکۆمەندییە، کە هیچ ئایدیۆلۆژیایەکی دیکە ناتوانێ ئەنجامی بدات. تاوتوێکردن و هەڵوەستەکردن لەسەر واتای ئەم دەرئەنجامە سوودێکی بێ سنوور و بێ ژماری هەیە. بۆ شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی شارستانییەت، پێویست دەکات ئەم واتایە ئاشکرا و روون بکرێتەوە. ئەگەر بێتو لەمیانەی هێڵە ئەستوور و گشتییەکاندا شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنێکی بەرجەستە ئەنجام بدرێت، دەشێ ئەمانە دەستنیشان بکرێت:

١ ـ شارستانییەتی کۆیلەداری سۆمەریەکان لەسەر بنەمای بەهای کۆمەڵگای نیئۆلیتیکدا هەڵکشاوە کە گەلان بە درێژایی ١٠ هەزار ساڵ لە ناوچەی کەوانی بەپیت (الهلال الخصيب ) پەرەیان پێدا و پێشیانخست. هەروەکو چۆن هەندێ جار لەمیانەی بازرگانی و هەندێ جاریش لە رێگای توندوتیژی و زیاتریش لەمیانەی سەپاندن و پەسندکردنی سیستەمە بەرهەمدارەکەیان، تەواوی زانست و **"ئامرازەکانی"** سەردەمی نیئۆلیتیکیان کردووە بە موڵکی خۆیان، ئەوا پیشەکاری و بەهرەکانی دیکەیان گەیاندۆتە ئاستی بەدەزگابوون و لەپێناو هەبوونی خۆیان کردوویانە بە بەرهەم و دەوڵەمەندییەکی نائاسایی. هەروەکو چۆن لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا لە هەڵوێستەکانی ئەمریکادا بەرامبەر بە گەلان دەبینرێت بە هەمان شێوە ئەو گروپە ئەتنیکی و گەلانەی کۆمەڵگای نیئۆلیتیکیان ئاواکرد، لە بەرامبەر ئەم باڵادەستی و بەرزبوونەوەیەی شارستانییەتی کۆیلەداری سۆمەریەکان، بە هەڵواسراوەیی ماونەتەوە. ئیمپریالیزمی سۆمەر بەتایبەتیش لە قۆناخی ئاشووریەکاندا گەلانی بە جۆرێك سەراوبن و دەربەدەر کردووە کە تاوەکو ئێستاکە کاریگەرییەکەی بەسەر رۆژهەڵاتی ناوین و تەواوی

جیهاندا ماوه. لەلایەکەوە شێوازی ڕاکێشان لەسەر زەوی و سینگ تێکوتان، لە لایەکی دیکەشەوە پەرتەوازەکردنی بوونەتە شێوازێکی تیرۆر و ڕیشەکێش کردن، وێرانکردنی شوێنەوار بە جۆرێك مۆرکی خۆی لەنێو چاوانی مرۆڤایەتی داوە کە ناتوانرێ بسڕدرێتەوە. شێوەی یەکەمینی پەیڕەوکردنی داگیرکاری و باڵادەستی لە سەردەمی کۆمەڵگای چینایەتیدا، بە شێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراو و سیستەماتیك لەسەر مرۆڤ، تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە. ئەگەر لەم سەردەمەشدا لەمیانەی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاوە ڤڕکردنی مرۆڤ بە شێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراو و بە سیستەم، بە بەراوردکردن لەگەڵ ڕابردوو، بە شێوەیەکی بەرفراوانتر بەڕێوە دەچێ، ئەوا ئەم ڕەوشە وەکو **بۆهێڵ** (جین ـ Gen) لە هزری کۆمەڵگادا جێگیر بووە و بە شێوەیەکی قووڵ گرێدراوی پراکتیکی یەکەمین شارستانییەتە و لەوێوە سەرچاوە دەگرێت. چۆن "**بۆهێڵە**"کانی مرۆڤ پێك دێت، بە هەمان شێوەش ڕێگا لەپێش چۆنێتی پێکهاتنی نموونەی هاوشێوەی ئەمە دەکاتەوە، هاوکات هزری کۆمەڵگاش "بۆهێڵ"ی پێکهاتووی هەیە و لە کۆمەڵگاکانی دواتردا جێگیر دەبێت و ڕێگا لەپێش هەمان شێوەی کاریگەری خۆی دەکاتەوە. لەکاتێکدا بەردەوام توێژە چەوسێنەر و دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵگا دەوڵەمەند دەبن و ڕێگا لەپێش زیادبوونی بەرهەم دەکەنەوە، ئەوا توێژە چەوسێنەر و ئاراستەکراوەکانی کۆمەڵگا، بەردەوام لاواز دەبن و لەنێو کەم و کورتی دا دەژین. لەگەڵ ئەوەی دیالەکتیکی ستەمکاری و چەوسانەوەی مرۆڤ ئاوا کراوە، بەڵام تاوەکو ئێستا نەتوانراوە ڕەوڕەوەی ئەم چەرخە بوەستێنرێ. مرۆڤایەتی ئەتۆم پارچە دەکات، بەڵام تاوەکو ئێستا لەوە دوورە ئەم چەرخە پارچە پارچە بکات و تێکیبشکێنێ. لە ڕاستیدا ئیتر هەم زیادبوونی بەرهەم و هەم کەم بوونی، بێواتایە. ئەگەر هەردووکیان نەبن، ئەوا کۆمەڵگا لەنێو هاوسەنگیدا دەبێت و بەختەوەر دەبێت.

بەڵێ ئەم ڕەوشە ڕێگا لەپێش سەرهەڵدانی مەیلی بەرخودانی ئازادیخوازی مرۆڤ و سەرهەڵدانی شەرەف و ڕێبازێکی جیاوازی مێژوو و ئێشی مرۆڤ دەکاتەوە کە لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتن و وشیارییە پێشکەوتن، کە مرۆڤی لە ئاژەڵ جیاکردەوە. لە جوگرافیای ڕۆژهەڵاتی ناویندا دەزگای پێغەمبەرایەتی بە تەواوی ئەم مانایە دەبەخشێت. لەم یەکەمین نموونە شکۆدارەدا دەبینرێ کە کاتێك (شارستانییەت) یاخود کۆمەڵگای نئۆلیتیکی یەکسان و دوور لە شەڕ، کە لە هزری مرۆڤایەتیدا بە شێوەی خەیاڵی بەهەشت ڕەنگ دەداتەوە، لە ئەنجامی دزییەکی مەزندا دەڕفێنرێ. ئەوانەی دوای ئەو دەمێننەوە بەردەوام لە مێژوو بەدەر دەنرێن و بەمرەنگە شارستانییەت بە بێ مێژوو دەستپێدەکات. لەمیانەی ئەو بەهایانەی کە کردوویەتی بە موڵکی خۆی و دۆزینەوە و ئافراندنی بەدەزگابوونی دەوڵەت، تەواوی ئەو تاك و گروپە ئەتنیکیانە قووت دەدات کە بێتواناکارین و دەبێتە هۆڤێکی تەواو.

٢ ـ وەکو پوختە و پێناسەی کۆمەڵگای چینایەتی لەدایکبوونی دەوڵەت لەلای سۆمەریەکان بە شێوەیەکی نائاسایی و سەرسووڕهێنەرە. ئەمە ئامرازێکی وەهایە کە هیچ خەیاڵێك نییە نەیتوانیبێ بەدیبێنێ و تاوەکو ئێستاکەش ئەو لایەنە زەق و سەنگینەی دەوڵەت بەمجۆرە دەبینرێ. گوتنی "**یان دەبێ خاوەن دەوڵەت بیت یا ئەوەتا ڕوو ڕەشیت**" سەرنج ڕاکێشە؛ واتاکەی هێندە قووڵە و ئەوە دەبەخشێت کە پیاوی خاوەن دەوڵەت، نەتەوەی خاوەن دەوڵەت، خۆی خاوەنی هەموو مافێك دەبینێ، هەروەکو لە خوداوە بۆی دابین و دیاری کرابێت.

دەوڵەتی سۆمەر کە سەرچاوەی ئەم هێزەی دەوڵەت ڕوون دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی یەکەمین و ساواترین نموونەیە، گونجاوترین و شیاوترین ئامرازی شیکردنەوەی شارستانییەت دەداتە دەست. بە جارێك هەم بەرامبەر تاکە کەس و زیاتریش بەرامبەر ئەو گروپە ئەتنیکیانەی کە تاك جێگای خۆی تێدا دەگرێت، هەروەها بەرامبەر بە تەواوی توێژەکانی کۆمەڵگا کە لەدەرەوەی دەوڵەت ماونەتەوە، بەهێزبوونێکی ئاوارتە و بێ پێوانە جێگای باسە و ئەم هێزە بەردەوام تۆکمە و پتەو دەکرێت. ڕاهیبە سۆمەریەکان سەبارەت بە پێکهاتنی دەوڵەت، بە شێوەیەکی فێڵبازانە و هەم بە کارامەیی لە ڕێگەی داهێنانە ئایدیۆلۆژییەکانیان، هزری کۆمەڵگا دەئافرێنن. شتێکی سەرسووڕهێنەرە کە لەمیانەی ئەم هزرەدا دەوڵەت بەنوێنەری سیستەمی ئاسمانی لەسەر زەوی دەبینرێت. بێگومان ئامانجی سەرەکی ئەفسانە (میتۆلۆژی) و زانستەکانی خوداناسی ئەوەیە کە لە دایکبوونی کۆمەڵگای چینایەتی، وەك سیستەمێکی سروشتی زاڵ و باڵادەستی بکەن. ئیتر دەسەڵاتی خوداوەند لە ڕێی دەسەڵاتی ئەم پادشا ـ خانەدانانە نوێنەرایەتی دەکرێت کە تازە بە تازە بەرز دەبنەوە. بەڵام ڕاگەیاندن و پێشکەشکردنی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ئاشکرا، هەروەکو چۆن ناتوانن باوەڕی کۆمەڵگای پێبێنن، ئەوا ناشێ و ناتوانرێ دەوڵەت دابمەزرێندرێت و بەردەوامی پێبدرێت. سەرەتا لەلایەنی ئایدیۆلۆژییەوە دەوڵەت ئاوا دەکرێ و سەردەخرێ، لەپاشان لەگەڵ گەیشتن بە ئایدیۆلۆژیایەك و یەکبوونی (ئامرازەکانی) کۆمەڵگای نئۆلیتیك لەگەڵ بەرهەمی زیادە، دەوڵەت لە دایك دەبێت. لەگەڵ ئەنجامدانی یەکەمیان، دووەمیشیان بەدیدەهێنرێت، کاتێك هەردووکیشیان بەیەکتر گەیشتن ڕێگا لەپێش بەرهەمێك دەکاتەوە کە تا ئەوکاتە نموونەی نەبینراوە.

شتێکی ڕوون و ئاشکرایە پەرستگای سۆمەریەکان سەرچاوەی سەرەکی دەوڵەت پێکدێنێت. واتە هەروەکو چۆن دواتر بانگەشەی بۆ کرا، هزری دەوڵەت گوزارشتی زانستیانەی مێشکی مرۆڤ نییە، بەڵکو گوزارشت لە بواری دۆگماتێك و تیۆلۆژییەوە دەکات. پێناسەیەکی سادە و نوێ پێشکەش دەکەم. لەڤۆناخە سەرەتاییەکانی جیابوونەوەی چینایەتیدا کە هێشتا هزری زانستی پێك نەهاتبوو، دەوڵەت کە گەوهەری شارستانییەتە، گوزارشتێکی تیۆلۆژی زاراوەی دۆگماتیکە. سەرچاوەی لە زانستەوە وەرناگرێت، بەڵکو بیر و باوەڕە دۆگماکان بناخەکەی پێك دێنن. لەم بوارەشدا ئەو ئامرازەی کە هەرە زێدە لە دەرەوەی سەردەمە، دەوڵەت خۆیەتی؛ بە تایبەتیش ئەو شێوە کلاسیکیانەن کە نەبوونەتە موڵکی گەل. لە بەشەکانی داهاتوودا دەبینین هەرچەندە بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت، گرنگترین و پێشکەوتووترین هەنگاو کە ئەوروپا لەم بارەیەوە هاوێشتوویەتی، پێشخستنی دیموکراسییەتە لەناو کارەکتەری دەوڵەتدا. بێگومان ئەمەش لەئەنجامی خەباتی ڕزگاریخوازی بێ هاوتای گەل و چین و نەتەوەکان بەدیهاتووە.

پەیوەندییەکی توند لەنێوان دەوڵەت و خوداوەند، لەنێوان هزر و بیر و باوەڕی تاکخودایی و ئەو دەوڵەتە هەیە کە لەبواری ناوەندی بوونەوە پێشکەوتووە. تا چ ڕادەیەك خودا خاوەن هێز و بەجۆرێك نیشانی بدەیت کە ناتوانی پێی بگەیت و لێی تێبگەیت و بە خاوەنی هەموو تایبەتمەندییەکانی دابنێیت ـ کە ئەمانەش تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی شارستانییەتن ـ ئەوا بەو ئەندازەیەش دەوڵەت و ئەو دەمامکەی خۆی لە ژێردا حەشارداوە واتە (شارستانییەت)، بەهێز و تۆقێنەر و بە جۆرێك نیشان دەدرێت کە ناتوانرێ لێی تێبگەیت و پێی بگەیت. لەهەمانکاتدا ئەمانە تایبەتمەندێتی پادشاکانن. گەوهەری پەروەردەی پادشا، چۆنیەتی بەدەست هێنان و وەرگرتنی ئەم تایبەتمەندییانەیە. ئەمە پێویستی و شایستەی نوێنەری خوداوەندە. بەر لە کۆمەڵگای چینایەتی تەوتەم پوختەی ناسنامەی ئەو کۆمۆنە بووە کە نوێنەرایەتی کردووە؛ هەروەکو نازناو بوو. هەر لەبەر ئەوەی کۆمەڵگا خاوەنی کارەکتەرێکی چەوسێنەر نەبوو، بۆیە لایەنێکی ترسێنەر و تۆقێنەری بەمجۆرەیان نەبوو. هەروەها خوداوەندیش نەبوون. لەوکاتەی کە کارەکتەری چەوسێنەری لای سەرۆك هۆز و تیرەکان پێشدەکەوێت، تەوتەمیش وردە وردە بەرەو شکۆمەندی خودایی بەرز دەبێتەوە؛ لەسەر زەوییەوە جێگا دەگۆڕێت و بۆ ئاسمان بەرزدەبێتەوە. لە تایبەتمەندێتیەکانی (نزیك، دەست پێگەیشتن، نەترس) دووردەکەوێتەوە و لەجیاتی ئەو تایبەتمەندێتیەکانی (دوور، کەس پێی ناگات، تۆقێنەر) وەردەگرێت. بەمجۆرە خیانەتی کۆمەڵگای چینایەتی بەرامبەر گەوهەری خۆی دەستپێدەکات.

بێگومان هەڵسەنگاندن و لە قەڵەمدانی دەوڵەت بەتەواوەتی وەکو ئامرازێك کە ڕاستەوخۆ پشت بە درۆ و دەلەسە و دزی دەبەستێ، کەم و کورتییەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. دەرکەوتنی دەوڵەت تەنیا لەمیانەی ئەو تایبەتمەندییانە ڕوون ناکرێنەوە. ناوەڕۆکی ئاڵۆزی کۆمەڵگای چینایەتی، زیادبوونی داخوازی و پێداویستی دابەش کردنی کار و پیشە، کێشە هاوبەشەکانی ئاسایش، پێویستی بە هەبوونی کۆردیناسیۆنێکی گشتی ڕەها نیشان دەدات، هەربۆیە بە ئەندازەی ئەوەی چینی باڵادەست و چەوسێنەر دەوڵەت پەسند و ئەرێ دەکات، ئەوا سەپاندنی خۆی وەکو ڕاستینەیەکی دەست لێبەرنەدراو، گرێدراوی سەرهەڵدانی ئەم پێویستییانەیە. شینەکردنەوەی دەوڵەت بە شێوەیەکی ڕاست بۆ ئەم دوو تایبەتمەندێتیەی کارەکتەرەکەی دەگەڕێتەوە. ئەمەش ڕێگای لەپێش پێشخستنی دوو جۆرە شرۆڤەی دۆگماتیك کردۆتەوە. چینەکانی دەوڵەت (لایەنگرانی) هەموویان بەخودایی و بەگزادە پیرۆزەکان ناوزەد و شرۆڤە دەکران، چینە ڕکەبەرەکانی دەوڵەتیش بە لایەنگرانی شەیتان و نەفرین لێکراو و ڕووڕەش ناوزەد و شرۆڤە دەکران. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا دەوڵەت گوزارشت لە ناسنامەی کۆمەڵگایەك دەکات کە ناکۆکی لە نێوان بەرژەوەندییە جیاوازەکاندا هەیە و هەژاری چینێك و دەوڵەمەندی چینێکی دیکە گەیشتۆتە لوتکە و بە بێچارەیی ماوەتەوە. هەر لە سەردەمی

پەیدابوونیەوە تا ڕۆژگاری ئەمرۆمان خەریککردنی دەوڵەت لە بواری هزر و پیادەکردندا بە خۆڕایی نییە. چونکە سەرچاوەکەی خوداییە. لێرەدا لەپەیوەندی زانست ـ سروشت دا خوداوەند بەلاوەنراوە. بەڵام دوورە لەوەی لەنێو کۆمەڵگادا بەسەری بخات، چونکە دەوڵەت لەئارادا هەیە. لەو شوێنەی کە دەوڵەت هەبێت بەردەوام خوداوەند هەیە.

٣ ـ کاتێك لێکۆڵینەوە سەبارەت بە شارستانییەتی سۆمەر بکەین دەبینین کە دیاردەیەکی دیکەش پێویستی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی خۆی دەسەپێنێ. بەئەندازەی شیکردنەوەکانی مارکس سەبارەت بە دەوڵەت و پارە، میتۆلۆژی و زانستی خوداناسی کە لێیەوە سەرچاوەی گرتووە گرنگە ـ بە زمانی یۆنانی تیۆلۆژی پێدەگوترێت، بە عەرەبیش ئیلاهییات ـ تیۆری مارکس دەسکەوتی نوێی بۆ زانست لەگەڵ خۆیدا هێناوە. بەڵام بە گوێرەی من، هەڵسەنگاندنی بناخەی ئایدیۆلۆژی دەوڵەت وەکو هێزێکی بچووك و سادە، جددیترین کەم و کورتی تیۆرییەکەی و مەترسیدارترین لایەنیەتی. گوتنی ئایین **"ئەفیۆنی کۆمەڵگا"**یە و دەربازبوونی مەسەلەکە بە شێوەیەکی سادە و رووکەشی یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی نەگەیشتن بە سەرکەوتن. بە گوێرەی من بە لانی کەم هێندەی شیکردنەوەی **"پارە"** و **"دەوڵەت"** پێویستی بە شیکردنەوەی ئیلاهیات هەیە. راستینەی سۆمەر بەشێوەیەکی روون و بەرچاو ئەم پێویستییە نیشان دەدات. بۆ شیکردنەوە و تێگەیشتنی شارستانییەتی سۆمەر. مسۆگەر پێویست دەکات ئیلاهیاتەکەی شیبکرێتەوە. خوداناسی زانستی تێکۆشانی چینایەتی سۆمەریەکانە. بە بێ ئەوەی رەنگدانەوەی زاراوە و بیرۆکەکانی خوداناسی بەسەر کۆمەڵگا شیبکرێتەوە ناتوانرێ ئایدیۆلۆژیای سۆمەریەکان و ئەو دونیا کۆنە شیبکرێتەوە کە پشتی پێ دەبەسترێ. ئەگەر ئایینە تاکخوداییەکان شینەکەنەوە ئەوا ناتوانن چۆنێتی پێکهاتەی هزر و ئەدەبیاتی کۆمەڵگای دێرین و چەرخەکانی ناوین و تەنانەت کۆمەڵگای ڕۆژگاری ئەمرۆشمان شیبکەنەوە و هەڵسەنگێنن. مۆرکی ئیلاهییات لەهزری تەواوی کۆمەڵگاکانەوە دراوە. ئەگەر ئەم مۆرە نەدۆزرێتەوە و نەسڕدرێتەوە ئەوا ناتوانرێ لەسەر بنەمایەکی زانستییانە کۆمەڵگایەك ئاوا بکرێت کە بە ئەرێیی بیر بکاتەوە. مەزنترین کەم و کوڕی و هەڵەی **"سۆسیالیزمی بونیادنراو"** ئەوەیە کە تەنانەت بە لێواری بوارە مێژوویی و ئایدیۆلۆژیەکانی کۆمەڵگادا تێنەپەڕیوە و لەبواری شیکردنەوەی دەوڵەتدا یەك لایەنەیە. هەروەکو چۆن تەنیا لەمیانەی شیکردنەوەی پارە و سەرمایە راستینەی کۆمەڵگا بەتەواوی روون ناکرێتەوە، بەپێچەوانەوە ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە بکەوێتە باوەشی شێوەیەکی دیکەی ئەو ئایدیالیزمەی کە بەردەوام رەخنەی دەکات. ئەمەش هەر وەکو ئەوەیە کە چۆن **"سۆسیالیزمی بونیادنراو"** لەخۆیەوە تەسلیمی باوەشی سەرمایە بوو. هەروەکو  لێرەشدا دەبینرێت کە هەوڵماندا روونی بکەینەوە هزری مارکسیستی ناتەواو بە کەم و کورتی ئاراستەگرتنی بەرەو ئەنجامێکی بەمجۆرە کردبووە ناچارییەك.

هەروەکو چۆن هێز و توانای ئایدیۆلۆژی شێوەی ئیلاهییات لە پارە کەمتر نییە، بەهەمان شێوە لەهێزی دەوڵەتیش کەمتر نییە. لەڕاستیدا هەرسێکیان لەناو یەکتردان و لەگەڵ یەکتردا ئاوێتە بوون. لەوانەیە هیچ سێکوچکەیەك لەمێژوودا نەبۆتە خاوەن دەرفەت و توانایەکی بەمجۆرە لەمیانەی ئاوێتەبوون و دزەکردن بۆ ناو یەکتری و هێزێکی مەزن پێکبێنن. ئەمەش تا رادەیەك هاوشێوەی پەیوەندی **"باوك، کوڕ، رۆحی پیرۆز"** دەچێت. نەك تەنیا لێکدەچن بەڵکو شێوازی پێکهاتنیشیان وەکو یەکە. یەکێکیان بەپێی تێپەڕبوونی کات دەبێتە ماددییات، ئەوی تریان دەبێتە دیاردەیەکی مەعنەوی. ئەم سێ کوچکە لە لای سۆمەریەکان بەیەکەوە لکاوە، لەم سێ کوچکەیە یەکێکیان هێزی دونیا، ئەوی دیکەشیان هێزی ئاخرەتی لێ لە دایك دەبێ. ئەو سۆمەریانەی ئێمە بە دواکەوتوویان دەبینین باوەڕی بەم درۆ و دەلەسانە ناهێنن؛ باش دەزانن کە خۆیان خوڵقاندوویانە و زۆر چاکیش دەرك بە چۆنێتی کەڵك لێ وەرگرتنیان دەکەن. شتێکی سەیرە، بەڵام پاشڤەڕۆترین و توندڕەوترین وشکە باوەڕەکان وەکو زانست و زانایانی ڕۆژگاری ئەمرۆمان وابوون. هەروەکو چۆن مرۆڤەکانی سەردەمی سۆمەریەکان لەزانستی ڕۆژگاری ئەمرۆمان دوور بوون ئەوا مرۆڤە هەرە زاناکانی ڕۆژگاری ئەمرۆشمان بەو ئەندازەیە لە ئیلاهیاتی سۆمەریەکان دوورن. لێرەدا دەمارگیری زیادکراوە. راستینە لە هەر دوو لایەندایە. جگە لە بە دواداگەڕان و دۆزینەوە و جێگیرکردنی لە شوێنی گونجاودا هیچ ڕێگایەکی دیکەی دەربازبوون دیار نییە. هەروەکو چۆن کوڕ بە بێ دایك ناناسرێت، ئەوا زانستیش بە بێ ئیلاهیات ناناسرێ.

لێرەدا بانگەوازییەك بۆ ئیلاهییات لەئارادا نییە. زانست بەرپرسیارە لەوەی نەیتوانی ڕێگا لەپێش ملیۆنان قوربانی سیستەمە دۆگماتیکەکان بگرێت، لەبەر ئەوەی بە یەکەوە شیکردنەوەی دەرهەق بە ئیلاهیات  و دەوڵەت و شارستانییەت ئەنجام نەدا، کەوتە نێو رەوشی ئەو جادووگەرەی کە بووە قوربانی جادووەکانی خۆی. ئایدیۆلۆگەکانی کۆمەڵگای هاوچەرخ کە بانگەشەی ئەوە دەکەن پشت بەزانست دەبەستن تەنیا ئەگەر تەواوی بوارەکانی کاریگەری بەناو یەکدا چوونی سیانیەکانی ئیلاهیات ـ دەوڵەت ـ پارە بەشێوەیەکی هاوسەنگ و هەروەك چۆن لەگەوهەرەکەیدا جێگیر بووە شیبکەنەوە و بەگوێرەی ئەوە پرۆژەکانیان سەبارەت بە کۆمەڵگا پێش بخەن. لەوانەیە بەئامانجەکانیان بگەن و خۆیان لە کاریگەریە داڕووخێنەرەکانی جادووەکانیان رزگاربکەن. ئەم بابەتانە لای من زۆر گرنگە، لە بەشەکانی داهاتوودا دەخوازم باسیان بکەم.

٤ ـ کاتێ کۆمەڵگای چینایەتی سۆمەر و سەرچاوەی ئەو مێژووەی شارستانییەت هەڵسەنگاندنی دەرهەق بکرێت کە ڕێگای لەپێش کردەوە بابەتێکی دیکەی زۆر گرنگمان بەرچاو دەکەوێت ئەویش ئەو کاریگەرییەیە کە کردوویەتیە سەر پەیوەندی نێوان زانست و فەلسەفە و میتۆلۆژی و ئایین. بانگەشەیەك هەیە ئاماژە بەوە دەکات کە زانست و فەلسەفە لەگەڵ شارستانییەتدا پێشکەوت، تێڕوانینەکەی دیکە بانگەشەکەی پێچەوانەی ئەوەیە. بەشێوەیەکی گشتی تێڕوانینێکی بەمجۆرە پەسند دەکرێت کە داهێنانەکانی ٦ تاوەکو ٤ هەزارساڵ پێش زایین کولتووری تەل خەلەف کۆمەڵگای نئۆلیتیك ـ تەنیا دەتوانرێ لەگەڵ ئەو داهێنانە تەکنۆلۆژیانە بەراورد و پێوانە بکرێت کە لەسەدەی شازدەهەم بەدواوە سەریانهەڵدا. بینینی کۆمەڵگای چینایەتی وەکو سەرچاوەی تەکنۆلۆژی و داهێنانە زانستییەکان بەشتێکی راست و بەجێ دانانرێت. بەپێچەوانەوە لەنموونەی سۆمەریەکان، کە باڵادەستی ئایدیۆلۆژی دەوڵەت رۆڵێکی موحافەزەکارانەی تێدا گێڕا، دەبینرێت کە بەرزترین ئاستی زیادبوونی تەکنۆلۆژیا و زانست بەر لە کۆمەڵگای چینایەتی هاتە ئاراوە. دۆزینەوە و داهێنانی تەکنیك و زانست کە سۆمەریەکان زیادیان کردبێت، سنووردارە. ئەوەی ئەنجامیدا پاوانکردنی کشتوکاڵ و دەوڵەمەندی تەکنۆلۆژی و زانیاری کۆمەڵگا و ئاواکردنی باڵادەستی ئایدیۆلۆژی بوو بەسەریدا. زانیاری وەکو بەرهەمێکی رەنج و پراکتیکی مرۆڤ و تەکنیك نابینرێت، بەڵکو وەکو تایبەتمەندێتیەکی خوداوەندەکان دەبینرێت کە بە دلۆڤانی خۆیان بەزەییان بەخزمەتکارەکانیان (مرۆڤ) دێت و پێی دەدەن. یەکێك لە چەواشەکاریە هەرە گەورەکانی مێژوو ئەوەیە. هێزی چەواشەکردنی ئایدیۆلۆژی راهیبە سۆمەریەکان لە مێژووی کۆمەڵگای چینایەتیدا؛ مەزنترین رۆڵی لەئاواکردنی دەوڵەت و زاڵبوونی جیاوازی چینایەتی لەکارەکتەری شارستانییەت دا هەیە. لەوانەیە ئەگەر ئەم چەواشەکاریە لەمیانەی ئایین و میتۆلۆژیای سۆمەریەکان نەبوایە، ئەوا بەو خەڵەتاندن و باڵادەستیە ئایدیۆلۆژییە، زانست، تەکنۆلۆژیا و فەلسەفە لەمیانەی پراکتیکی بەرهەمهێنانی ئازادانەی مرۆڤ دەبووە خاوەنی دەرفەتی پێشکەوتنێکی خێرا و زووتر.

لەبەر ئەوە یەکەمین نموونەی مێژووی سۆمەر ـ ئارکەتیپ ـ زۆر گرنگە: چونکە لەکاتێکدا ئاستی ئازادی پەیوەندییەکانی کۆمەڵگا بەگوێرەی زانیاری و تەکنۆلۆژیا و داهێنانە فەلسەفییەکان لەبارتربوو، ئەوا هەرچەندە فشار و خەڵەتاندنی ئایدیۆلۆژی پێشکەوت، زانیاری و فەلسەفە پاش کەوت، واتە بەدەست خستنی زانیاری راست دەرهەق بە سروشت و ئاستی شرۆڤەکردنی گشتی، کەوتنێکی جددی و بەرچاوی بەخۆیەوە بینی. لەکۆمەڵگای چینایەتیدا بەتەواوی دابڕانی توێژێك لەبەرهەمهێنان و توێژە بەرفراوانەکەی دیکەش لە مرۆڤ بەولاوە هەروەکو بڵێی پارچەی ئامێرە، کراوە بەکۆیلە، ئەم رەوشە سەرچاوەی هەموو دۆگما ئایینیەکان پێك دەهێنێ. رۆڵی زاڵ و باوی چینی راهیب بەدرێژایی مێژوو بەمجۆرەیە. لە کاتێکدا ئامرازێکی ساختەی بەهەشت و دۆزەخ و چەمکێکی خوداوەندی سزاکار پێشکەشی ئەو مرۆڤانە دەکات کە خزێندراونەتە نێو ئێش و ئازار و بەمجۆرە تۆکمەکراوە  و بەردەوامی پێدەدەن، ئەوا خۆیان و دەوروبەرەکانی بەڕێوەبەرایەتی بە بێ ئەوەی کاربکەن و رەنج بدەن، هێزی بەرژەوەندیە ماددییەکانیان بەشێوەیەك لەم جیهانەدا پێش دەخەن و لەنێو دەوڵەمەندییەکدا دەژین کە هاوتاکەی نەبینراوە. هەربۆیە ئەو ئامرازەی بەڕادەیەکی هەرە زیادە بەکار هێنراوە و پەنای براوەتە بەر ئەوەیە کە بەردەوام خەیاڵ و ئامرازەکانی باڵادەستی ئایدیۆلۆژی، واتە ئایین و میتۆلۆژیای لەخزمەتی چینە باڵادەستەکاندا پێش خستووە. لەکاتێکدا سەرەتا پەرستگاکان سەنتەری بەهەرم هێنان بوون، دواتر ئەم رۆڵە کەوتە سەر ئەو ئەکادیمیانەی کە لەگەڵ

دەرکەوتنی توێژی رۆشنبیر ـ نووسەران سەریهەڵدا. بە تایبەتیش لە شارستانییەتی یۆنان ـ رۆمان سیستەمی ئەکادیمی فەیلەسوفەکان دەردەکەوێتە پێش. لە شارستانییەتی سۆمەردا بۆ یەکەمجار نموونەی سەرەتایی سەنتەری کولتووری لە **"نیپور"** و ئەکادیمیای ئەدەبیات لە **"ئەدوبا"** وەکو شێوەیەکی سەرەتایی دەبینرێت. لەهەمانکاتدا ئەم پێشکەوتنە شانسێکی بەمجۆرەی هەیە کە وەکو یەکەمین زانکۆی مێژووی مرۆڤایەتی جێگای خۆی گرتووە.

نابێ لە دەرئەنجامی ئەم هەڵسەنگاندنەدا نرخاندنێکی وەها بکرێت کە ئایین یەکسانە بە چینی دەسەڵاتدار یاخود یەکسانە بە دەوڵەت. بێگومان لەبەر ئەوەی لەو سەردەمەدا چەمکەکانی سروشت بەسەر کۆمەڵگادا زاڵ بوو، هەربۆیە چەندین چەمکی ئایینی سەرەتایی، زاڵ و باڵادەست بوون. بە تایبەتیش چەمکی تەوتەمی تیرەکان و چەمکی ئایینی باوکسالاری و دایکسالاری بە بنەماگرتووە. باوەڕییەکی رۆحانی گشتی زەمینەی کۆمەڵایەتی پێویستی پێشکەش بە هەمووجۆرە جادوو و سیحربازییەك دەکات و دوور لە چەمکێکی زانستیانەی سروشت دەژین. بەڵام کاتێك کۆمەڵگای چینایەتی پێشدەکەوێت و ململانێی نێوان بەرژەوەندییەکان زیاد دەکات، ئەوا ئەو دابەشبوونەی کە لە بواری ئایین و میتۆلۆژیادا روودەدات، بە لایەنی سیستەمی باڵادەست و چەوسێنەردا دەشکێتەوە؛ چینی نوێی راهیبەکان چەمکە کۆنەکانی ئایین بە تایبەتیش جادوو سیحربازی نەفرینی لێدەکات و بە گوناهی رادەگەیەنێ. مژدەی مەیل و کردەوەی خۆشی وەکو خێر و پیرۆزی بڵاودەکاتەوە. لە راستیدا دابەشبوون و پارچەبوونی کۆمەڵگا بەمجۆرە، رۆڵێکی سەرەکی لەپێکهاتنی بناخەی ململانێی نێوان شەیتان و خودا دا دەبینێ. میتۆلۆژیاکانی سۆمەر بە شێوەیەکی زۆر روون و ئاشکرا ئەمەی ئاشکرا کردووە و خستۆتە روو. چەواشەکاری بۆ ئەو قۆناخە مسۆگەرە، بەڵام ئەگەر لە رۆژگاری ئەمرۆماندا تەماشا بکەین، ئەوا بێچەندوچوون دەبینین کە کارەکتەری چینایەتی هەیە. بە تایبەتیش دەرکردنی ئادەم و حەوا لە بەهەشت دەربڕینێکی میتۆلۆژی و سەرەکی دەستپێکردنی جیابوونەوەی چینایەتییە و چیرۆکە میتۆلۆژیەکەی زۆر سەرنج راکێشە و بە شێوەی هۆنراوەیە. لێرەدا پێویستی ئەوە نابینم وەکو نموونە پارچەیەکی بهێنمەوە و باس بکەم. ململانێی نێوان **هابیل** و **قابیل** رەنگدانەوەی ململانێی نێوان ئەو دوو لایەنەیە کە بەکشتوکاڵ و شوانکارییەوە خەریکن.

لاوازبوونی ستاتۆی ژن و لەدەستدانی ئەو شوێنگە و رۆڵەی لە ئەنجوومەنی خوداوەندەکان ـ **پانتائۆن** ـ هەیانبوو، لەمیانەی گێڕانەوەیەکی میتۆلۆژی شیعرئامێزانە پێشکەش دەکرێت. هەروەها لە ئایینی تاکخودایی کە هەنگاوێك لەپێشترە هەم لەلایەنی دەربڕینی ئایدیۆلۆژی و چەواشەکردن و هەم لەنێو کۆمەڵگادا ژن لەڕەوشی رەگەزێکدایە کە خراوەتە نێو رەوشی کۆیلایەتییەوە. لە هەموو بوارێکدا لە ناوخۆ داخراوبوون و داخستنی دەم و زمانی جێگای باسە. هیچ شوێنەوارێکی سەردەمی خوداوەندە ژنەکان نەماوە. لەبەر ئەوەی لەرابردووشدا ئادەمی ناچاری ئەنجامدانی یەکەمین گوناه کردووە، بۆیە ئەو رەگەزە سەرەکیەی تاوانبار و گوناهبار کراوە بەرامبەر بەم رەوشە بەرپرسیارە. لێرەدا لەمیانەی میتۆلۆژی و لەڕێگای ئەو ئایینەی سەرچاوەکەی لەمیتۆلۆژیاوە دێت، باڵادەستیەکی زەق بەلایەنی رەگەزی پیاودا دەشکێتەوە و بەمجۆرە رەوایەتی پێدەدرێت و زاڵ دەکرێت. لە هەموو ئاستێکیشدا سەردەمی باڵادەستی پیاو شکۆدار دەکرێت و دەبێتە نوێنەرە پیرۆزەکەی ئایین. لێرەدا بە شێوەیەکی تەڵەکەبازی پێشخستنی مێژووی کۆیلەکردن جێگای باسە. کاتێك تەماشای میتۆلۆژیای سۆمەریەکان بکەین دەبینین لەکاتێکدا بابە **"ئەنکی"** وەکو بلیمەتی مەزن و فێڵباز لەمیانەی لۆژیکی رێککەوتن و تەبایی پێشکەوتووە، لەگەڵ دەرکەوتنە پێشی**"بال"**ی خوداوەندی بابل مەردۆك لە کەسایەتی **"تیامات"** هەموو جۆرە لێدانێکی کوشندەی لە خوداوەندی دایك داوە. داستانی خوڵقاندنی بابل **"ئەنومائەلیش"** خاوەنی گرنگییەکی دوو لایەنیە. کارەکتەری رەهای پادشایەتی سەریهەڵدا  و لەمیانەی یاساکانی حامورابی گرنگییەکی مێژوویی پەیدا کرد و ئەمەش تۆمارکراوە. لە لایەکی دیکەشەوە لە میتۆلۆژیای سۆمەریەکاندا ئەو یاسا ئایینیە مسۆگەرانەی کەس بۆی نییە دژی دەرکەوێت رێساکانی خۆی هێناوەتە ئاراوە. ئەمە نوێنەرایەتی قۆناخێکی مەزنی کۆیلایەتی رەگەزی و چینایەتی دەکات و رێگا لەپێش بەدەزگابوونێکی مەزن دەکاتەوە. لەمیانەی خوداوەندەوە بە ئەندازەیەکی هاوشێوە، بێسنوور رێگای لەپێش دەسەڵاتێکی رەها کردۆتەوە. هەروەها ژن بۆ نێو کۆیلایەتی ماڵی تایبەت و گشتی قووڵبۆتەوە و ئەمەش گەیشتۆتە ئاستی بە دەزگابوون و یاسابوون. کاتێك قۆناخی ئایینە فرە خوداوەندە ژن و پیاوەکان دواکەوتنێکی مەزنی بەخۆیەوە بینی، ئەوا تاوەکو دوایی دەرگا لەپێش مێژووی ئایینە مەزنەکانی تاکخودایی ئاوەڵا بوو، کە لە جوگرافیا و کولتووری رۆژهەڵاتی ناویندا بە باپیرێتی حەزرەتی ئیبراهیم خەلیل کراوە بەسەمبوڵ.

لە کاتی ئەنجامدانی ئەم هەڵسەنگاندنانە ناتوانرێ بگوترێ رۆڵی سۆمەریەکان بە تەواوەتی نێگەتیفە، هەرچەندە کارەکتەری یاساکانی پێشکەوتنی رووداوەکانی زانست زانستیانە نەبێت، وەڵێ جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە رەنگدانەوەی گوزارشت و دەربڕینێکی رەمزییە. هەروەکو چۆن ناخوازم هزری خوداوەند وەکو بتپەرستییەکی تەوتەمی سادە ببینم و بەمجۆرە هەڵیسەنگێنم، وەڵێ لەو باوەڕەدام کە سیستەم گەردوونی هزری خوداوەندی، کە  لەسەرەتادا شکۆدارکرا و برایە ئاسمان و دواتر کرا بە تاکخودایی، وەکو قۆناخێکی سەرەتای بیردۆزەی رێژەیی گشتی و تایبەتی رۆژگاری ئەمرۆمان هەڵبسەنگێنرێت کە ئەوکاتە رەمزی بوو، لە زانستی بوون دووربوو. راستترە و لە جێگای خۆیدایە. بەڵام دەبێ بەگرنگییەوە ئاماژە بەوە بکرێت کە بەشێوەیەکی بنچینەیی رۆڵە زاڵ و باوەکەی گوزارشت کردنە لە پەیوەندییە چینایەتییەکان. دەربڕینی زانستییانەی جیهانی هێزە سروشتییەکان کە کۆمەڵگاش پارچەیەکە لێی بەردەوام لەنێو پێشکەوتن دایە. هەروەها کاتێك شارستانییەتی سۆمەری لەمیانەی میتۆلۆژی و ئەو یاسا توند و باو و موحافەزەکارانە، لەسەر بنەمای رێبازی فەرمی دەوڵەت بەرەو پێش دەبات، هەرچەندە لەمیانەی ناوزەدکردنیان بە **"شەیتان"** و **"جادووگەر"** و **"سیحرباز"** لەلایەن دارودەستە فەرمییەکانەوە تاوانبار بکرێن رۆڵێکی گرنگیان لەپێشخستنی زانیاری زانستی و فەلسەفی ئەو توێژانەوە هەیە کە بەلاوە نراون و بەرژەوەندییان لە رەوشی رکەبەریدا هەیە. بەکورتی دەتوانین بڵێین بۆ ئەنجامدانی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنێکی راست دەرهەق بە شارستانییەت لەبەرچاوگرتنی پێشکەوتنی میتۆلۆژی و ئایینی و فەلسەفی و زانستی بەلایەنە پێشکەوتووخواز و موحافەزەکارەکەیەوە، بۆ هەردوو توێژە کۆمەڵایەتییەکە گرنگییەکی ژیانییە.

## د ـ پێشکەوتنی مێژوویی و کێشەی چۆنێتی پەلهاوێشتن و بڵاو بوونەوە

لەبەر ئەوەی لە نزیکەوە پەیوەندی بە بابەتەکەمانەوە هەیە، پێشخستنی هەڵسەنگاندنێك لەئاستی پێناسەکردنی رێچکەکانی چۆنێتی نزیکبوون لە مێژوو بە گرنگ دەزانم. ئەو شێوازانەی دەرهەق بە مێژوو تاوتوێی دەکەین، دژایەتیکردنی نێوان ماتریالیزم و ئایدیالیزم نییە. ئەو ململانێ و رکەبەرایەتییەی نێوان پێڕەوەکان زۆر لەوە دوورە کە گەوهەری پێشکەوتنەکان نیشان بدات. هەروەها روون کردنەوەی مێژوو لەسەر بنەمای ململانێی تاکەکەسی قارەمانێتی ـ چینایەتی رۆڵێکی هێندە رۆشنکەرەوەی نییە. کێشەیەکی دیکە کە زۆر لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم کێشەیەیە، پەیوەندی نێوان پێشکەوتنی کۆمەڵگا و مێژووە. راستترە بڵێین ئەنجامدانی شیکردنەوەی کۆمەڵگا و شارستانییەت بە بێ دەستەوەگرتنی کات (زمان) تا چ رادەیەك راستە؟ گەلێك بەشی سۆسیۆلۆژی بێمێژووە. وەها لەقەڵەم دەدرێت کە بەشێوەیەکی کت و پڕ پێشکەوتنەکان بەدیهاتوون و تەواوی  شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنە ئابووری، یاسایی، سیاسی و سەربازییەکان لەسەر ئەم بنەمایە پێشدەخرێت. ئەمەش بەناوی زانستی بوونێکی بێگەردەوە ئەنجام دەدرێت. لەلایەکی دیکەشەوە لەکاتێکدا پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بۆ قۆناخی مێژوویی بەشی جیاواز جیا دەکرێتەوە، هەمان پەیوەندی داتاشراو و بەستەڵەك بەردەوام دەکات؛ بە شێوەیەك دەگێڕدرێتە دەست و تاوتوێ دەکرێت هەروەکو بڵێی لەقۆناخ و سەردەم جودایە و پەیوەندییەکی دیاریکرا و لە نێوانیاندا نییە. هەر قۆناخێك، یان ئەوەتا نکۆڵی لە قۆناخی پێشتر دەکات یاخود وەکو کەرەستەیەك بۆ خزمەتی هەڵوێست و نزیکبوونە خۆییەکانی خۆی بەکار دێنێ.

لە ئەنجامدا مێژوو دەخرێتە ئاستی واتایەکی نزمی هێندە بەرتەسك کە بەشێوەیەکی سەرەکی تەنیا بەگوێرەی دیاریکردنی هەبوونی خۆی بەکاری دێنێ. لە رۆژگاری ئەمرۆشماندا کێشەی ئەنجام نەدانی هەڵسەنگاندنێکی واقیعی لەئارادایە. بەبێ ئەوەی هیچ زێدەڕۆیی و بچووك کردنەوەیەك هەبێت، دەبێ ئەوە دیاری بکرێت هەر قۆناخێك چی لەقۆناخەکەی دیکە

وەرگرتووە و چی پێشکەش کردووە و ئەگەر قۆناخێك نەبێت ئەوی تریان دەبێت یان نا. لەم چوارچێوەیەشدا ئەگەر بگوترێت هێشتا چەمکی زانستییانەی دەرهەق بە مێژوو لە قۆناخی گاگۆڕە و ساوایەتی دایە ئەوا لە هەموویان راستترە. هەربۆیە باوەڕ دەکەم هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی خۆم لەچوارچێوەی ئەم تێڕوانینە رەخنە ئامێزانە واقیعی تر بێت. بەتایبەتیش لەقۆناخی سنووردداربوونی زانیاریدا هەڵوێستە کتابی و قاڵبییەکان تا دواڕادە مەترسیدارە و ئەنجامی دوور لەواقیعی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. بەکارهێنان و دانانی لیستە ئامادەکراوەکان وەکو شیکردنەوەی مێژوو، کۆمەڵگا تەنانەت ئەو زانا کۆمەڵایەتیانەشی رووبەڕووی بەرپرسیارێتیەکی مەزن کردۆتەوە کە خۆیان لەهەموو کەسێك زانستی تر دەبینن. "**سۆسیالیزمی بونیادنراو**" کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد لە بەرزترین ئاستی زانستیدایە، هەڵوێستەکانی هەمان ئەو دەرئەنجامانەی لێکەوتەوە کە هەڵوێستە دۆگماتیکییەکانی ئایدیالیستی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. ئەوەی بناخەی ئەو ئەنجامە پێك دێنێت، خودی چەمکی خۆ سەنتەر بینینە کە لە سۆمەرەوە هاتووە. هەر چەمکێك بە بن ئەرێکردنی دامەزراوی سیاسیدا دەربازبووبێت، ئەوا تەنانەت ئەگەر بە زانستیترین چەمکیش دابنرێت ئامرازێکی سەرەکی نیشاندان و سەلماندنی رەوایەتی سیستەمە. ئەوەی ئەنجامدراوە زۆر لەوەی راهیبەکانی سۆمەر جیاوازتر نییە. لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی بەرفراوان زانیاری زانستی بەکاردەهێنرێت، لەوانەیە ئەمە زۆر مەترسیدار بێت.

لەسەردەمی قۆناخی زانستیدا ئەو خراپەکاریەی بە شێوەی رتوشکردن و زێدەڕۆیی و بچووك کردنەوە لەژێر ناوی زانستی کۆمەڵگا دووچاری دێت، زۆر لەوە زیاترە کە لەئەنجامی هەڵوێستە میتۆلۆژی و ئایینیەکان دێتە ئاراوە. ئەگەر میتۆلۆژیا و ئایین ئەفیۆن بێت، ئەوا زانستی چەواشەکراو خەنجەرێکە لە گەوهەری کۆمەڵگا دراوە. چەندە بەلاوەنانی کاریگەری سڕکەری و بێ هۆشکەری ئەفیۆن بەسانایی بەلاوە دەچێت، ئەوا سارێژکردنی کاریگەری برین و کوشندەیی خەنجەر هێندە ئاستەمە.

یەکێك لەو هۆکارە سەرەکیانەی کە وایکردووە سیستەمەکانی فشار و چەوسانەوە پشت بە زانست و تەکنۆلۆژیا تا ئەم ئاستە مەزن و زەبەلاحە ببەستن، بێگومان لە شێوازی ئەشکەنجە زیاتر، بەشێوەیەکی بنچینەیی گرێدراوی شێوازی ئافراندن و بەکارهێنانی زانستە. مسۆگەر زانست و نوێنەرەکانی زانست بەرامبەر بەم رەوشە بەرپرسیارن. هەروەکو چۆن راهیبەکانی سۆمەر بەرامبەر دەوڵەت و شارستانییەتی سۆمەر بەرپرسیار دەبینرێن هاوکات لەوان زیاتر، بەرپرسیار بینینی زانایان گرنگییەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. بەرپرسیارێتی رێچکەکانی پەیڕەوکردنی زانست و زانایان بەرامبەر بەو هەژاری و پیسکردنی ژینگە و نەبوونی یەکسانی نێوان رەگەزەکان، هاوسەنگی ئەتۆمی سامناك، زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و تەقینەوەی بێسنووری تەکنۆلۆژی و کێشەکانی دیکە، کە لە ئەنجامی هەر دوو شەڕی جیهانی و شەڕەکانی دیکە هاتە ئاراوە، بەرپرسیارێتی زانایان لە سیاسەتمەدار و فەرماندە سەربازییەکان کەمتر نییە، بەڵکو زیاترە. راهیبەکانی زانست رێگایان لەپێش رێچکەیەکی بەمجۆرە کردەوە. بەرپرسیارێتی زانکۆکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان لەپەرستگاکانی سۆمەری و چەرخەکانی ناوین کەمتر نییە و لەمیانەی هەڵوێستی موحافەزەکاری و من منێتی بەرامبەر بە قۆناخ، کەوتوونەتە ناو بەرپرسیارێتیەکی مەزن. تاوانبارکردنی چەرخەکانی دێرین و ناوین و خۆ پاك دەرخستن لەمیانەی **ئاوی "شێوازی زانستی"** بەهەر حاڵ خاوەنی بەهایەکی بەوجۆرە نییە کە پاك و بێگەردی بکات. ئەمە زێدەڕۆیی نییە. هەموو پێودانگەکان ئەوە نیشان دەدەن کە ئەو قڕکردن، ئەشکەنجە، هەژاری و نەخۆشییەی سەدەی بیستەم لەگەڵ خۆیدا هێنا، لەکۆی تەواوی سەدەکانی دیکە زیاترە. لەم میانەشدا ئەوە دەسەلمێنرێت: ئەگەر بەڕاستی بەرپرسیارێتی بەرامبەر بە مێژوو و کۆمەڵگا هەستی پێبکرێت، ئەوا پێویست دەکات ئایدیۆلۆژیای فەرمی ئەو رۆژگارەمان و ئەو شێوازانەی پشتی پێدەبەستێ  و ئەو شاکارانەی هێناویەتە ئاراوە و شێوازی زانست و بە تایبەتیش ناچاریەکە چۆنێتی پراکتیزەکردنی بە رەخنەدانێکی ریشەییدا دەرباز ببێت. تاوەکو ئەم ئەرکە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە جێبەجێ نەکرێت، ئەوا لەو تاوانباری و دادگاییکردنە رزگاریان نابێت کە بەلایەنی کەم رێگایان لەپێش خراپەکارییەکی هێندەی چینی راهیب و جادووگەرەکان کردۆتەوە.

هەربۆیە ئەوەی پێویستە پێش هەموو شتێك ئەنجام بدرێت ئەوەیە کە هەڵوێست و چۆنێتی نزیکبوونەوە بەرامبەر بە مێژووی کۆمەڵگا راست بکرێتەوە و مسۆگەر ئەزموونە سەرەکییەکانی گرێدراوی ئەنجامە ئەخلاقییەکان بمێنێتەوە. لەڕەوشێکی پێچەوانەدا جادوو یاخود تەریقەتێکی چەواشە کە لەژێر کۆنترۆڵ دەرکەوتبێت هەروەکو چۆن لەڕەوشێکی بەمجۆرەدا نییە کە وەکو **چەرنۆبل** و **هیرۆشیما** رووخێنەر و بەئێش و ئازار بێت ئەوا جادووگەر و پیاوێکی ئایین (زانایەکی ئایینی) لەزانایەك (پیاوێکی زانست) مەترسیدارتر نییە.

دەخوازم بڵێم: لە پشت هەر رووداوێکی کە رێگای لەپێش داڕووخان و ئێش و ئازار کردبێتەوە، زانایەك (پیاوێکی زانست) هەیە کە لەمێژە لەبەهای مەعنەوی و ئەخلاقی دابڕاوە و بە بێ ئەوەی پرس بکات ئەم پلانە خزمەت بەکێ دەکات و دژی کێیە، پیلان و پرۆگرامی تایبەت جێبەجێ دەکات. هەڵە و بێ پێوانەیی و نایەکسانی و بێ دادیەکی مەزن و چەمکێکی ناتەواوی سەبارەت بە مێژوو، کۆمەڵگا و بنەماکانی ئەم رەوشە پێکدێنێ. ئەگەر زانست ئەم کێشە مەزنانە چارەسەر نەکات ئەوا لەم رەخنە و تاوانبارییە گرانە رزگاری نابێت. چونکە ئەو راستییەی لەئارادایە. رەخنەیەکی رەوا و بەجێی خۆیەتی.

لەسایەی رۆشنایی ئەم رەخنەیەدا گرنگی مێژوویی بەستنەوەی پێشکەوتنی شارستانییەتی بە سۆمەریەکان و بەستنەوەی سۆمەریەکانیش بەسەرچاوەی کۆمەڵگای نئۆلیتیك، زۆر باشتر دەرکی پێدەکرێ. چونکە مێژووی شارستانییەت بە سۆمەریەکانەوە دەست پێدەکات. سۆمەریش پشت بە شۆڕشی گوندی ـ کشتوکاڵی و یەکەمین لێشاوی مەزنی کۆیلایەتی دەبەستێت کە مرۆڤ لەمیانەی پشت بەستن بە زەمینە بە پیت و بەرەکەتەکەی ئەو دەشتە بەرهەمدارەوە خولقاندنی، کە دەکەوێتە ئەو ناوچە دەشتاییانەی کە ئاوەڕۆی  دیجلە ـ فوراتی پێدا تێپەڕ دەبێت. ئەمەش بە شێوەیەکی بەردەوام لە ١٠ هەزار ساڵ پ.ز ئەگەر لەمیانەی بەهای وشك کردنی خۆشی بێت، تەواوی شارستانییەتێکی جیهانی لە سەرووی هەمووشیانەوە شارستانییەتی سۆمەری بەخێوکردووە. ئەو دایکەی شارستانییەتە کە بەرهەم دێنێ دایکی زایینی شارستانییەتە. زەوی و مرۆڤی ئەو سەردەمەن کە مێژوو (بە واتای نووسین) و پەیڕەوکردنی پرەنسیپی دیالەکتیکی دەستپێکرد. بەهۆی سۆزداری و وڵاتپارێزییەوە ئاماژە بەو مەسەلەیە ناکەم. ئەگەر بەمجۆرە دەرکی پێبکرێت زۆر هەڵەیە. لەپێناو ئەوەی پەیوەندی دیالەکتیکی مێژوو بەشوێن و کات، بە شێوەیەکی راست ئاوابکرێت، ئەمە زۆر بە گرنگ دەبینم. ئەو رەخنانەی لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا پێشکەوتن و بە شێوەیەکی گشتیش پەسند کراون، منیش بەو ئامانجە بە کورتی ئاماژەم پێکرد تاوەکو پێویستییەکانی جێبەجێ بکرێت. لەبەر ئەوە بە جەخت کردنەوە دیسان لەسەری دەوەستم و تاوتوێی دەکەم، چونکە شیکردنەوەی شارستانییەت پێویستییەکی ژیانییە بۆ دەستپێکردنی سەرەتایەکی راست و دروست. چونکە زۆر باش دەزانرێت کە هەر بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی ئەگەر دەستپێکەکەی بەڕاست و دروستی دانەنرێت هەرگیز بە شێوەیەکی راست پێناسە ناکرێت. ئەگەر کۆمەڵگا و مێژووەکەی بە شێوەیەکی راست پێناسە نەکرابێت، بەردەوام دەبێتە سەرچاوەی مەترسی و قەیران و لەم رەوشە رزگاری‌نابێت.

ئەگەر بێتو سەرچاوەی مێژوو بە شێوەیەکی راست دانرابێت و دەستنیشان کرابێت، ئەوا گرنگی پرسێکی بەمجۆرە پێشدەکەوێت، ئاخۆ سەرچاوەی دیکەش نییە؟ یاخود ئەگەر هەبێت ئەوا پەیوەندی نێوانیان چۆنە؟ سەبارەت بەم مەسەلەیەش هەڵەیەکی مەزن ئەنجامدراوە چونکە شێوەکانی کۆمەڵگا بەجۆرێك دانراوە هەروەکو بڵێی قەدەرێکە و لەمیانەی دەربڕینێکی قاڵبی ناچاریدا خراوەتە روو. لەم چوارچێوەیەدا جیاوازییەکی هێندە زۆر لەنێوان ماتریالیزمی دیالەکتیکی مارکس و دیالەکتیکی ئایدیالیزمی هیگل دا نییە. بێگومان شێوازەکانی چەمکی مارکس و هیگڵ دەرهەق بە شرۆڤەکردنێکی راست سەبارەت بەمێژوو گرنگییەکی مەزن لەخۆوە دەگرن. ئەمانە تاوەکو ئێستاکەش سەردەمیان بەسەر نەچووە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ئەم دوو شێوازە  لەسەرووی هەموویانەوە بەرپرسیار دەبینرێن بەرامبەر خستنە روو و ئاشکرابوونی راستیە بەرجەستەکانی دەرهەق بە مێژوو و کۆمەڵگا. بەگوێرەی شێواز بە رادەیەکی زێدە بەرجەستەبوون خراوەتە پلانی (پلەی) دووەم، یاخود بەئەندازەی ئەوەی خزمەتی شێوازی کردووە، بەهایەکی بەرجەستەی پێدراوە. بە تایبەتیش کاتێك بەرەو سەدەی بیستەم هەنگاو هاوێشترا بەپێچەوانەوە تەنانەت وردترین و بچووکترین لایەنەکانی بەرجەستەبوونیان کرد بە "**لقی زانستی**"و راستینە سەرەکیەکەیان لەژێر ناوی بابەتی"**زانست نییە**"خستە پیلانی دووەم "**پیاوانی زانست**"ی خستۆتە رەوشی "**زانا پاشڤەڕۆکان**".

بێگومان ئەوەش سەرچاوەی خۆی لەوەوە دەگرێت کە زانکۆ و زانایان رۆڵی راهیب و پەرستگاکانیان دەرباز نەکرد و خۆیان لێ رزگار نەکرد. بۆیە جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە نابێ هیچ کاتێك ئەمە لە بیر بکرێت: ئەگەر لە ئاستی تاکە کەس دا خۆ بە سەنتەر بینین تێپەڕیش کرابێت، ئەوا لە ئاستی دەزگاکاندا مسۆگەر لەسەردەمە سەرەتاییەکان و سەردەمەکانی ناوین پێشکەوتوتر نییە و لەگەڵێك لایەنەوە پاشکەوتوترە و کۆمەڵگا لەلایەنی ئەخلاقییەوە زۆر مەترسیدارترە.

"**سۆسیالیزمی زانستی**" کە خۆی بە پارێزەری رەنج و نوێنەری یەکسانی نیشان دەدات، تاوەکو ئێستا زۆر لەوە دوورە هەڵگری ئەم تایبەتمەندێتیەی خۆی بێت. بەڵگەی سەلمێنەری ئەمەش ئەو بێ دادی و تەنگژە ئەخلاقییە مەزنەیە کە "**سۆسیالیزمی بونیادنراو**" رێگای لە پێش کردەوە و تێیکەوت. بێگومان ئەمەش تۆڵە سەندنەوەیە بەرامبەر نزیك نەبوونەوەیەکی راست و دادپەروەرانە بەرامبەر بە مێژوو و کۆمەڵگا. ئەم تێڕوانینە پەسند دەکەم: مێژوو و کۆمەڵگا پێکهاتە و پەیکەرێکی زیندوون. مسۆگەر زوو یان درەنگ وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە بەچەوتی شرۆڤەیان دەکات یاخود نکۆڵیان لێدەکات و ئەو شەقازلەیەی تێهەڵدەدات کە مافی خۆیەتی. بەستنەوەی پرۆگرام و پرۆژە کۆمەڵایەتییەکان بەقاڵبی داتاشراو و تێڕوانینی هەڵە سەبارەت بەمێژوو، بەئێش و ئازارترین ئەنجامەکانی لەمیانەی "**سۆسیالیزمی بونیادنراو**"و"**فاشیزمی بونیادنراو**" و گەلێك دام و دەزگای دەوڵەت و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان دەرخستۆتە روو. هەرشتێکی بناخەی بە شێوەیەکی هەڵە دانرابێت و لەکات و شوێنی خۆیدا ریفۆرمی پێویست ئەنجام نەدات ئەوا بە گوێرەی ناوەڕۆکەکەی خۆی دووچاری داڕووخان دێت. هیچ قۆناخ و سەردەمێك هێندەی ئەم سەردەمەمان لەنێو راستینەی ئەم یاسایەدا نەژیاوە.

سەرچاوەکانی دیکەی کە مێژوو بەخێو دەکەن و لەخۆوە دەگرن هەمەجۆرن. قورسایی هێزە هەمەجۆرەکان لەئارادایە. لێرەدا کێشە و مەسەلەی بنچینەیی سەرچاوەی سەرەکی لێشاوەکەیە؛ هێزی بەڕێوەبردن و بەخێوکردنە. تەنیا ئاوەڕۆ و گۆلە بچووکەکان بەجیا هێندە سوودمەند نابن. بەڵام کاتێك لەسەرچاوەیەکی سەرەکیدا کۆبکرێتەوە و بکرێت بە بەنداوێك، دەتوانرێت بکرێت بە وزەیەك کە سوود بەخش بێت. مێژووش کێشەیەکی بەمجۆرەی هەیە کە ببێت بە رووبارێکی سەرەکی. پێشکەوتنی مێژوویی بەشێوەیەکی سەربەخۆ و جودا بەواتای ئاوەڕۆ و گۆلی بچووك نایەت. مێژووی بەمجۆرەش هەیە. بەڵام وەکو رێبازێکی سەرەکی یان ئەوەتا سەرچاوەکانی دیکەی تەنگەتاو کردووە و تەڤلی خۆی کردووە و بەمجۆرە لەخۆوەی گرتووە، یاخود بەهۆی بەتەنیا مانەوە وشك هەڵاتووە، بەڵێ راستینەی سەرچاوەی سەرەکی بەمجۆرەش هەیە.  رووباری سەرەکی لێشاوی مێژوو لەمیانەی بەخۆوە گرتنی چەندین لق و پۆپی دیکە تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان هاتووە. ئەگەر لەمیانەی کاتدا لەنێو هەندێ گێژەڵۆکدا دووچاری سووڕانەوە و وەستانیش هاتبێت، ئەوا دیسان وەکو لێشاوی رووبارێك وایە کە بەردەوام مەزن و خێرا دەبێت. لێرەدا ئەرکێکی سەرەکی مێژوونوسانە، ئەوە دەستنیشان بکەن کە کامە یەکینەی کۆمەڵگا لەکوێ و لە چ کاتێکدا و بە چ شێوەیەك رۆڵیان گێڕاوە و بەهێزیان کردەوە. دەستنیشان کردنی لە دەرەوە مانەوەی مێژوو لەمیانەی ئەم شێوازەدا زۆر سانایی دەبێت. گفتوگۆی سەبارەت بەوەی، ئایا پێشکەوتنەکان بەشێوەی هێڵێکی راست بەرەو پێشەوە چووە یاخود بەشێوەی ئەڵقەی زگزاگی سەرەڕای ئەوەی گرنگە بەڵام سەبارەت بە شێواز دەکەوێتە پیلانی دووەم.

شتێکی روون و ئاشکرایە کە ئەم هەڵوێستەمان گرێدراوی هۆمانیزمێکی قووڵە. پێویستە باش بزانین کە ئەو کۆمەڵگایەی لەلایەنی ئێمەوە بە نەتەوەپەرستییەکی توندڕەو دادەنرێت، لەلایەنی مێژووەوە بەخێو کراوە. نموونەی هەرە بەچاوی ئەمەش کۆمەڵگای یەهودییە (جولەکەیە). ئەو کۆمەڵگایە کە بەدرێژایی مێژوو خۆی بە نەتەوەپەرستێکی توندڕەو و خاوەن شوێنگەیەکی باڵا و جیاواز دەبینێت کۆمەڵگایەکە بەڕادەیەکی هەرە زیادە لەلایەنی سەرچاوە سەرەکییەکانی مێژوو بە خێوکراوە. هەروەکو چۆن یەهودییەکان ئەو کۆمەڵگایەن کە لە هەموو کەسێك زیاتر خۆراکی خۆیان لەلایەن سۆمەری مەزن، میسر، فینیقییەکان، یۆنان، رۆما، ئەوروپا و نوێنەرە بەهێزەکەی "**ئەمریکا**" وەرگرتووە، بەخێوکراوە، هەروەها ئەوەی بە شێوەیەکی هەرە زانستیانە تەڤلیان بووە و پێویستییەکانی بەخێوکردنیان جێبەجێکردووە، کۆمەڵگای یەهودییەکانە. لەم چوارچێوەیەشدا مێژووی یەهوودییەکان مێژوویێکی وەهایە کە بە باشترین شێوە تایبەتمەندێتی بەناویەکدا چوونی تایبەتی و گشتی بوونی نیشانداوە. دیسان تەڤلیبوون و رۆڵی گرنگی رۆشنبیرە بەرەچەڵەك جوولەکەکان لەئاستی جیهاندا بەشێوەیەکی قووڵ گرێدراوی ئەم تێگەیشتن و تەڤلیبوونە مێژووییەیە. هێزی کۆمەڵگای یەهودیش سەرچاوەی خۆی لەم راستینانەوە دەگرێت.

ئەنجامێکی دیکەی هەڵوێستی من ئەوەیە کە بەڕادەی واقیعی بوونەکەی پێویستی نرخ و بەهاپێدان دەکاتە پێویستییەك. هەروەکو چۆن مێژوو یەکپارچە و هەمەلایەنە، ئەوا لەنێو ئەم یەکپارچەییەشدا هەر بەشێك جێگا و بەهای خۆی هەیە. ناتوانرێت نکۆڵی لەبەهای بچووکترین کۆمەڵگا و تەنانەت سادەترین تاکیش بکرێت. هەروەکو چۆن مێژوو لەکۆمەڵگایەکدا رەنگ دەداتەوە، ئەوا کۆمەڵگاش لە مێژوودا رەنگ دەداتەوە، بە هەمان شێوە کۆمەڵگا لە تاکە کەس و تاکەکەسیش لە کۆمەڵگادا رەنگ دەداتەوە. وەکو دەربڕینێکی پەیڕەوکردنی شێوازی دیالەکتیکیانە سەبارەت بەمێژوو، ئەوا ئەو ئەنجامە سەرەکییەی ماتریالیزمی مێژوویی پێیدەگات، لەم فۆرمیلەدا شاراوەیە و لە ئاستی بەهای بیر و باوەڕییەکی زانستییانەی دادەنێم. لەو باوەڕیەدام کە روونکردنەوەی ئەم کێشانەی سەبارەت بە شێواز، لەبەشە پەیوەندیدارەکاندا تاوتوێ دەکەین و ئەمەش پێویستییەکی گرنگە.

## هـ ـ قۆناخی پێگەیشتن و بڵاوبوونەوەی شارستانییەتی کۆیلەداری

کاتێك کۆمەڵگای سۆمەر لەبەرهەمهێنانی ئابوریدا بەرهەمە زیاد و  نائاساییەکەی خۆی سەلماند، ئەوا بەڵگەی بوون بەکۆمەڵگای باڵای بەدەست هێنا. زیادبوون و باڵاتر بوونی بەروبوومەکانی بەرهەمهێنان لەتەواوی شارستانییەتەکانی دواتردا وەکو پێوانەی دیاریکردنی هێز بەکار دەهێنرا و بەردەوامی پێدەدرا. کۆمەڵگا بە بەروبوومەکان، کۆمەڵگای بەهێزن، هەربۆیە دەبنە سەنتەری سەرنج راکێشان و جێگای هەڵکشان و داکشانی پەلهاوێشتنی و بڵاوبوونەوە. دەتوانرێ ئەم زیادبوونەی بەرهەم لەلای سۆمەریەکان لە دانەوێڵەی وەکو گەنم و جۆدا، یەك بەرامبەر بەهەشتا بژمێردێت. ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی زەق و بەرچاو نیشان دەدات کە چۆن بەگوێرەی سەردەمی خۆی رووبەڕووی هێزی کارتێکردن و پەلهاوێشتنی و بڵاوبوونەوە بۆتەوە. ئەو بەرهەمە زیادەی بەدەست هاتووە جێگا بە چەندین یەکینەی پیشەکاری و بازرگانی دەدات و ئەمەش واتای ئەوە دەبەخشێ کە لەدەوروبەری ئەو پەرستگایانەی کە سەنتەری بەرهەمهێنانن، رێگا لەپێش پەیدابوونی شار و شۆڕشی شار بکاتەوە. ئەم قۆناخەی کە لە دەشتەکانی خوارووی میزۆپۆتامیا دەستیپێکرد رێگای لەپێش خوڵقاندنی رێکخستنی شێوازی دەوڵەتی چینایەتی، شار، کۆمەڵکاری، بکاتەوە کە ناسنامەی باوی سیاسییان بوو. ئەمەش واتای شۆڕشێکی سیاسیە. لەکاتێکدا ئەو بەها کەڵەکەبووانە بەر لەهەموو شتێك رێگایان لەپێش کێشەی ئاسایش دەکردەوە، ئەوا گرنگی بوونی ئامرازەکانی خۆپاراستن و پەلاماردان خۆی سەپاندووە و ئەوەی کردووە بەناچارییەك کە ئامراز و تەکنیکەکانی شەڕی بەگوێرەی ئەو سەردەمە دەرکەونە پێش. ئامێر و تەکنیکی پاچ و تەور و گاسنی لەمس دروستکرا کە پێشتر لە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیدا رۆڵێکی دیاریکراویان دەبینی، ئیتر ببوو بە ئامێر و تەکنیکی شەڕ. چەکی لە مس دروستکراو، هەروەکو باڵایی چەکی ئەتۆمی رۆژگاری ئەمرۆمان بەهێزبوونێکی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. ئیتر وای لێدێت کە بەواتای هێزی چەکداری ئەو سەردەمە هیچ هێزێك لەئارادا نییە بتوانێ بۆ ماوەیەکی درێژ بەرامبەر بە کۆمەڵگای سۆمەری خۆی رابگرێت.

ئەگەر هێزی رێکخراوەیی لێهاتووانەی هاوشێوەی ئۆرگانیزاسیۆنی دەوڵەت، لەگەڵ هێزی پەرستگا کەرۆڵی وزە و چەورکردنی کۆمەڵگا دەبینێ، بخەینە سەر دووەمین شێوەی باڵابوون، ئەمە بەو واتایە دێت جارێکی دیکە لەمیانەی هێڵە گشتیەکان ئەو هێزەمان پێناسە کرد کە مێژوو دەستپێدەکات. رووبەڕووی سیستەمێکین تەنیا بەوە ناوەستێ خۆی بەڕێوە ببات و بپارێزێت، بەڵکو لەمیانەی هێزی سنووربەدەری پەلهاوێشتنی و بڵاوبوونەوە خۆی سەپاندووە و سەلماندووە. کاتێك لە کەسێتی سەرجۆنی دامەزرێنەری خانەدانی ئەکەدییەکان ئەوەمان بینی کە چۆن بۆ یەکەمین جار بوو بە ئیمپریالیزمێکی رێکخراو و نەخشە بۆ کێشراو ئەوا باشتر لەمە تێدەگەین. لەسەر بنەمای پشت بەستن بە سیستەمی کۆمەڵگای کۆیلەداری قۆناخی ئیمپریالیزم دەستپێدەکات. دەتوانرێ ئەمە بەیەکەمین هەڵکشان و داکشانی شارستانییەتی مێژوو دابنرێت، واتە دەتوانرێ بە یەکەمین قۆناخی پەلهاوێشتن و رووبەڕووبوونەوەی

پەلهاوێشتن دابنرێت. دەتوانرێت رۆڵی سەرجۆن لە مێژوودا بەم شێوەیە هەڵسەنگێندرێ کە بۆ یەکەمین جار ئەو نیمچە دەوڵەتانەی شاری سۆمەریەکان، کە لەگەڵ یەکتریدا ناکۆك بوون، کرد بەیەك و لەمیانەی هێزە یەکگرتووەکەیاندا پەلوپۆی بۆ دەرەوە هاوێشت، تەواوی هێزە پەلهاوێژەکانی دواتر ئەم نموونەیان تۆکمە کرد و لاساییان کردەوە. کەواتە تەنانەت لەبواری لەدایکبوونی شارستانییەت و بەدەزگابوونییەوە قەرزاری سۆمەریەکان نین، بەڵکو لەبواری پەلهاوێشتنی و بڵاوبوونەوەش قەرزاری سیستەمی سۆمەریەکانین. ئەگەر بێتو دەوروبەری ساڵانی ٤٠٠٠ تا ٢٥٠٠ پ.ز بە قۆناخی لەدایك بوون و بەدەزگابوون پەسند بکەین، ئەوا لە ٢٥٠٠ی پ.ز بەدواوە رووبەڕووی قۆناخی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالی سۆمەر دەبینەوە کە تاوەکو ئێستا زۆر بەوردی لێتوێژینەوەی سەبارەت دەکرێت و لەگەڵ بەسەرچوونی کاتیش زیاتر پشت راست دەبێت. ئەگەر لۆژیکی ئەم قۆناخە بەشێوەی لقی سەرەکی ریزبەند بکەین بەمجۆرەیە:

ا ـ پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوە، پشت بە بەرهەمی زیادە دەبەستێت کە لە کەڵەکەبوونی کەلوپەلە ئامادەکراوەکان و پێداویستی بەرهەمی زێدە بۆ کەرەستەی خاو پێویستی هەبوونی بازارێك نیشان دەدات و یەکەم جار کڕین و فرۆشتنی بازاڕەکان بەدەزگا دەکرێت، دەکەوێتە نێو قۆناخی پەرەسەندن. لەسەر ئەم بنەمایەش چینی بازرگان وەکو چینی داینەمۆی پەلهاوێشتنی لەدایك دەبێت و رۆڵی مێژوویی خۆی وەردەگرێت کە رۆڵی داینەمۆی ورووژاندنە.

ب ـ هەم پێشخستنی "**تەکنیك**"ی چەکی لە مس دروستکراو، هەم بەرهەم هێنانی بە ژمارێکی زۆر رێگا لەپێش پەیدابوونی هێزێکی چەکداری پرۆفسیۆناڵ (پسپۆڕ) و بەدەزگابوونی دەکاتەوە و لەگەڵ سیستەمیش دەربازی نێو قۆناخی پەلهاوێشتنی و بڵاو بوونەوە دەبن. بە شێوەیەکی فراوان و نەخشە بۆ کێشراو قۆناخی تاڵان دەست پێدەکات. بۆ یەکەمین جار رەچەڵەکی مرۆڤ بە ئامانجی تاڵان کردن و کۆیلە کردن، بەشێوەیەکی پیلانکراو مرۆڤی هاو رەچەڵەکی خۆی قڕ دەکات. ئەو مەسەلە لەبەر ئەوە هێندە گرنگە: لەنێو سیستەمی تەواوی ئاژەڵەکاندا چالاکییەکی بەمجۆرە بەرچاو ناکەوێت کە ئاژەڵێك ئاژەڵێکی دیکەی جۆری خۆی لەنێو ببات و قڕ بکات. تەنانەت لەناوبردنێکی بە پیلان و نەخشە بۆ کێشراو بەهیچ جۆرێك بوونی نییە. بۆ یەکەمین جار مرۆڤ ئەنجامی دەدات. بێگومان ئەمە لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی دێتە ئاراوە و پەرەدەسەنێ. لەسەردەمی نئۆلیتیك و قۆناخەکانی دیکەی کەهێشتا جیابوونەوەی چینایەتی پێش نەکەوتبوو کردەوەیەکی بەمجۆرە نابینین. تەنانەت لەو نموونانەی کە بەدڕندەیی ناوزەد دەکرێت، ئەوە سەلمێنراوە کە بەڕادەیەکی زۆر سنووردارە و ئەمەش وەکو شێوازێکی عیبادەتە و لەپێناو ئامانجێکی پیرۆزە. زەقترین شێوازی ئەم کردەوەیەش یاسای "**کوشتنی پادشایە**". ئەم شێواز و کردەوە خوداییانەی نوێنەرایەتی لەدایکبوون و مردنی وەرزەکانی ساڵ دەکات، ئەوا دواتر بە شێوەیەك بەردەوام دەکات کە لەجیاتی منداڵەکانیان ئەو خزم و کەسە نزیکانە دەکاتە قوربانی کە لەشێوەی منداڵەکانیان دەکەن.

بێگومان لەناوبردن و هێرشەکانی بەشێوەیەکی نەخشە بۆ کێشرا و بەئامانجی تاڵان کردن، وەکو کردەوەیەکی چینی چەوسێنەر ـ باڵادەست پێشدەکەوێت و دەبێت بەسیستەم و هەروەکو بڵێی چالاکییەکی ئاسایی مێژووە، رەوایەتی پێدەدرێت. پاشان لەمیانەی پیرۆزکردنی ئایین و داب و نەریتەکان، چالاکی قارەمانێتی دەبێتە مافێك و دەکرێت بەداستان. چینێکی ناو کۆمەڵگا یاخود جیابوونەوەی چینایەتی ئەمە دەکاتە ئامانجێکی سەرەکی. تا ئاستی بوون بەپیشەیەك بەرزدەکرێتەوە. بەمجۆرە سەردەمی "**مرۆڤ گورگی مرۆڤە**" دەستپێدەکات. دەبێ سەرچاوەی نەفرەت لێکردنیش لەم پێشکەوتنەدا ببینرێت. چونکە گرنگترین داستانی سۆمەریەکان "**نەفرەتکردن لە ئاگادە**" پەیوەندی بە تەختکردنی شاری پیرۆزی **نیپور** هەیە کە لەلایەن ئەکەدییەکانەوە تەفروتونا کرا. هەربۆیە بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، ئاگادە خاوەنی ناوونیشانی "**نەفرەت لێکردن**"ە.

ج ـ لە کاتێکدا ململانێ و پێکدادانی ناوخۆی دەوڵەتەکانی شارۆچکە بچووکەکان رێگایان لەپێش ئەم قۆناخە کردەوە، ئەو پێداویستییانەی کە مەزن بوون، بە ئیمپریالیزم بوونی کرد بە پێویستییەك. بڵاو بوونەوەی کۆمەڵەکانی کۆمۆنەی پێشووتریش بەرەو هەموو لایەنێکەوە جێگای باسە، بەڵام ئەم بڵاوبوونەوەیە بە ئامانجی تاڵان کردن نییە و پشت بەزاڵبوون و حوکم کردن نابەستێ. ئەمە رەوشێکە پشت بەپێداویستییە سروشتییەکان دەبەستێ و گرێدراو بە یاسای بە یەکەوە ژیان پێشدەکەوێت و بەشێوەیەکی چڕوپڕ روودەدات، بە تەواوەتی لەکردەوە و پراکتیکەکانی تاڵان و داگیرکاری ئیمپریالیزمی کۆیلەداری جیاوازترە. بەکورتی چینی باڵادەست و چەوسێنەر کە لەناوەوە تەنگەتاو بووە، هەم بۆ ئەوەی لەم فشارە رزگاری بێت و هەم بۆ ئەوەی ببێتە خاوەن قازانج، وەکو سیاسەتێکی بنچینەیی قۆناخی ئاراستەکردن فشارەکانی ناوخۆ بۆ دەرەوە دەستپێدەکات.

د ـ ئەم سێ هۆکارە سەرەکییە لەژێر ناوی راستینەی "**لەمیانەی پەلهاوێشتـــندا خۆت مەزن بکە و بژێنە**". دەبێتە سەرەکیترین یاسای شارستانییەتی چینایەتی. ئەم شێوازەش تایبەتمەندییەکی سروشتی شارستانییەتە. گرێدراو بەئامانجەکانی بڵاوبوونەوە گەلێك جۆر و شێوەی جیاوازی هەیە. جگە لەو شێوازانەی کە ئامانجی تاڵانکردنی ساتەوەختیە، یاخود لەسەر بنەمای کۆنترۆڵ کردنی سەرچاوەی ئاسن و زیو پێش دەکەوت کە بە گوێرەی ئەو سەردەمە ماددەیەکی خاوی ستراتیژییە، ئەوا لەلایەکی دیکەشەوە شێوازی بەمجۆرە هەن کە ئامانجیان ئاواکردنی کۆلۆنی بازرگانییە و لەسەر ئەم بنەمایەش دەخوازن شاری نوێ دابمەزرێنن. هەروەها جگە لەو بڵاوبوونەوە بازرگانییانەی کە پشت بە دابینکردنی ماددەی خاو و فرۆشتنی کەلوپەل دەبەستێ، ئەوا نموونەی ئەو بڵاوبوونەوە پەلهاوێشتنیە ئایین و ئایدیۆلۆژیانەش زۆرن کە ئامانجی لەپێشینەیان پاراستنی ئەو پەرەستگایانەیە کە هاوشێوەی پەرەستگاکانی خۆیانن. بەگوێرەی تایبەتمەندێتی ئەو گۆڕەپانانەی بڵاوبوونەوەی تێدا ئەنجام دەدرێت، یا ئەوەتا بەشێوەیەکی کاتی یاخود هەمیشەیی نیشتەجێ بوون پەیڕەو دەکرێت. لەدوای ماوەیەکی گونجاودا شێوازە هەمیشەییەکان لەمیانەی ئەو پەسند کردن و هەرس کردنەی لەهەردوو لایەنەوە نیشان دەدرێت، دەبنە گۆڕەپانی نوێی شارستانییەت. لۆژێکێکی بەمجۆرەی پێکهاتن و ئاواکردن رۆڵێکی مەزن لەپێکهاتنی بناخەی مێژوودا دەبینێ. تەواوی ئەو لێکۆڵینەوانەی سەبارەت بەسەرچاوەکانی شارستانییەت ئەنجامدران پشت بەتەواوی ئەو بیرۆکانە دەبەستن کە شوێن و کاتی سەنتەری بڵاوبوونەوە بەسۆمەریەکان دادەنێت. لەمیانەی بەڵگە زانستییەکاندا سەلمێنراوە کە کەوانی زێڕینی نئۆلیتیك و میزۆپۆتامیای سۆمەریەکان رۆڵێکی کاریگەر و دیاریکراویان هەیە لەپێکهاتنی ناوەندە سەرەتاییەکان.

١ ـ **شارستانییەتی میسر**: یەکێك لەو کۆمەڵگایانەی کۆیلایەتی کە یەکسەر دوای سۆمەریەکان سەریهەڵدا شارستانییەتی "**میسر ـ نیل**"ە. کاتێك شارستانییەتی میسر هەڵدەسنگێنین هەبوونی کۆمەڵگای نئۆلیتیکی باکووری ئەفریقیا نابینرێت کە پشتی پێ ببەستێت و رەسەن و بەربڵاو بێت. شیمانەی هەرە لەپێش ئەوەیە کە هەروەکو چۆن شۆڕشی کشتوکاڵی کە لە کەوانی بەپیت پێگەیشت بەهەموو لایەکدا بڵاو بۆوە، ئەوا ٦ هەزار ساڵ پێش زایین گەیشتۆتە ئەم هەرێمەش.

لەلایەنی ریزبەندی مێژوویی ئەم هەڵسەنگاندنە بەگوێرەی لۆژیکی پەلهاوێشتنی گونجاو و کۆکە. لیتە دەشتە بە پیت و بەرەکەتەکانی رووباری نیل دەرفەت بۆ شۆڕشێکی شاری هاوشێوە دەڕەخسێنێ. لێرەشدا دیسان شوێن پەنجەی شۆڕشی شاری سۆمەریەکان لەنێو گەوهەرەکەیدا دەبینرێت. بەڵام رادەی بەرزی بەرهەمهێنان رێگای لەپێش ئەوە کردەوە کە میسر لەماوەیەکی کورت خایەندا، لەمیانەی قۆناخێکی هەرسکردندا پێکهاتەی تایبەتی خۆی بخوڵقێنێ. ئەگەر بەهۆی زوو پشت بەستنی بێت بە کولتووری نئۆلیتیك یاخود بەهۆی توانستی هەرسکردنی خێرای بێت ئەمە وایکردووە میسر وەکو کۆلۆنییەك نەبێت و ببێ بە شارستانییەتێکی رەسەن و دەرفەتی ئەوەی بۆ برەخسێ وەکو کۆمەڵگایەکی چینایەتی شێوە بگرێت. بەڵام سەرەڕای ئەم تایبەتبوونەی، ئەمە راستییەکی مێژووییە کە ئەگەر شۆڕشی کشتوکاڵی کەوانی بەپیت و شۆڕشی شاری ـ سۆمەریەکان نەبوایە، شارستانییەتی میسر بە شێوەیەکی سەربەخۆ نەدەهاتە ئاراوە. هەروەکو چۆن بەبێ هەبوونی رووباری نیل بیر لەهەبوونی شارستانییەتی میسر ناکرێتەوە، ئەوا بەبێ هەبوونی کەوانی بەپیت و شۆڕشی شار و گوندی سۆمەریەکان، بیر لە هەبوونی بەرهەمەکانی نیل و شارستانییەتی میسر ناکرێتەوە. گرنگترین بەڵگەش ئەمەیە کە ئەو جوگرافیا و هەلومەرج و کەش و هەوایەیە کە نیلی ئابڵۆقە داوە، لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە تەنیا بەشێوەیەکی جیا کولتووری دانەوێڵە و ئاژەڵ دەرفەت و تواناکاری بە شۆڕشی کشتوکاڵی نئۆلیتیك نادات. ئەگەر ئەمە بەدیهاتبایە ئەوا بەهۆی ئەو هەلومەرجە نەگۆڕانەی، هەر لە زووەوە دۆڵی نیل دەبووە لانکەی شۆڕشێکی شار و کشتوکاڵ: نەك دوای شۆڕشی کشتوکاڵ و شاری میزۆپۆتامیا بەڵکو پێشتر پێشکەوتنی بەخۆیەوە دەبینی.

ڕۆڵی ڕاستەقینەی نیل لەو تایبەتمەندێتییەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەمیانەی ئاودێری خاکێکی گونجاو و بە بەرهەمی هەیە. کاتێك ئامرازە پێویستییەکانی کشتوکاڵیشی پێگەیشت کەوتە نێو قۆناخی شارستانییەتێکی تایبەت و خێرا.

شارستانییەتی میسر لە دەورووبەری ساڵانی ٣ هەزار پ.ز دەستی پێکردووە و بە بێ ئەوەی هێندە گۆڕانکاری بەسەردا بێت تاوەکو سەرەتاکانی زایین بەردەوام بووە. لە بوارەکانی بیناسازی و شێوەکاری جۆرەکانی نووسیندا پێشکەوتنێکی لە سۆمەریەکان جیاوازتری بەخۆوە دیوە. بە تایبەتیش لەبواری بیناسازیدا کارامەبوونیان لەئاستێکدایە کە تەنیا دەتوانرێت لەگەڵ ڕۆماییەکان پێوانە بکرێت. گواستنەوە لەمیانەی بەلەمی چارۆکەداردا تاڕادەیەکی بەرز پێشکەوتووە. ژماردن و دەستنیشانکردنی ساڵ و وەرزەکان لەمیانەی ئەستێرەکانەوە بەشێوەیەکی ڕێکخراوترە. لەگەڵ ئەوەی بەدەزگابوونی دەوڵەت زیاتر ناوەندییە دەرفەت بە ژمارێکی زۆری دەوڵەتی ـ شار نادات. زیاتر دابەشکردنی بەڕێوەبردن لەجۆری هەرێمە. ئەویش وەکو سۆمەریەکان بە شێوەی سەردەمە دێرین و ناوین و درەنگەکان لەلایەن زیاتر لە سی خانەدانەوە بەڕێوە بردراوە. لەکاتێکدا سەرەتا ڕاهیب گرانییەکەیان پێك دەهێنا، دوایی بە گوێرەی بـاڵابـوونـی ڕاهیبی ـ پادشاوە بووە. چەمکی پادشایەتی ـ خودا زاڵ و باڵادەستە. پێکهاتەی میتۆلۆژیاکەی بە گوێرەی سۆمەریەکانەوە هەژارترە و بە شێوەی ڕەنگدانەوەیەکی سنووردارى سۆمەریەکان پەرەدەسەنێ. لێرە بە یەك گەیشتنێکی خودایی سێکوکچەی باوك ـ دایك ـ کوڕ جێگای باسە. وەکو ڕەنگدانەوەیەکی وشکی سیستەمی ئاسمانی لەسەر زەوی خۆی بەڕێوە دەبات. لەسەر ئەم بنەمایەش بونیادێکی بەهێزی باڵادەستی ئایدیۆلۆژی ئاوا دەکات. هەر لەبەر ئەم سەرچاوەیەیە کە داب و نەریتەکانی ڕاهیبی میسر بەشێوەیەکی بەهێز تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان هەبوونی بەردەوامە. هەوڵەکانی کـۆلـۆنـی ئـیـمـپـریـالـیـسـتـەکـان زۆر سـنـووردار دەمـێـنـێـتـەوە. پـەیـوەنـدی نـێـوان یۆنان ـ فینیقیەکان کە بە ئامانجێکی بازرگانی بوو، کاریگەری لەسەر پێشکەوتنی شارستانییەتەکانی خوارتری ئەم ناوچەیە کردووە. لەنێو ڕووباری سەرەکی شارستانییەتدا تەنیا ڕۆڵی لقێك دەبینێ. ئەگەر بێتو بەرامبەر بەوەی کە سۆمەر سەرچاوەی سەرەکییە، ڕۆڵی شارستانییەتی میسر لە لقێك زیاتر دابنرێت، ئەوا شیمانەی زێدەڕۆیی لەم هەڵسەنگاندنەدا بەهێزە. بەڵام دیسان یەکێکە لەو شارستانییەتانەی کە لەماوەی نێوان ٣ هەزار ساڵ پ.ز تاوەکو سەرەتاکانی زایین ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لەپێشکەوتنی ڕێبازی سەرەکی شارستانییەتی کۆیلایەتی. ڕۆڵی شارستانییەتی یۆنان لە تێرکردن و بەخێوکردنی ڕۆما هەرچەندە کەم  و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بێت بەڵام لەبیر ناکرێت. هەروەکو چۆن نەیتوانی ئەفریقیا بۆ شارستانییەت بکاتەوە، بەڵام توانیویەتی بازرگانی لەنێویاندا پێش بخات. سەبارەت بە دەستپێکردنی پێشکەوتنی بازرگانی بە کەشتی چارۆکەدار لە نیل، دەریای سوور، دەریای سپی گەلێك شت قەرزاری شارستانییەتی میسرە.

لەگەڵ ئەوەی بە گوێرەی سۆمەریەکان میسر لەلایەنی میتۆلۆژییەوە هەژارە، بەڵام خاوەنی شوێنگەیەکی گرنگە لەپێشکەوتن و پەرەسەندنی ئایینە یەکتاپەرستەکان. لەگەڵ ئەوەی کە ئایینی تاکخودایی پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام سنووردار ماوەتەوە. لەمیانەی ڕۆڵی بەهێزی چینی ڕاهیبی میسر لە پەروەردەکردندا شوێنگە و سەنتەری پێگەیاندنی کادیرە ئایینی و میتۆلۆژییەکانی یۆنان (گریکە)یەکانە. تاوەکو پێنجەمین سەدەی پ.ز پێشەنگەکانی فەیلەسوف و ڕاهیبە یۆنانیەکان بە ڕادەیەکی مەزن خۆراکی خۆیان لەپەروەردەکانی میسر و بابل وەرگرتووە.

ئەگەرچی بەهۆی ئەو پێشکەوتنە خێرا و تایبەتمەندێتیەی بێت یاخود بەهۆی مەزنێتیەکەی، لەدوای سۆمەریەکانەوە شارستانییەتی میسر لەپێشکەوتنی شارستانییەتی کۆیلایەتیدا لە ڕیزی دووەمدا خاوەن ڕۆڵێکی گرنگ و بەنرخە. لەتێرکردن و بەخێوکردنی سیستەمدا بەڕێوەبەرە و بە بەرهەمە. لە پیادەکردنی قووڵایی سیستەمی کۆیلایەتیدا هێندە بەرەو پێش چووە، بەتایبەتیش ترسناکی ڕەنجی کۆیلەکان کە بۆ ئاواکردنی ئەهرامەکان (پیرامیتەکان) بەکار هێنراوە، هێندە زەق و سەرنج ڕاکێشە و هۆکاری سەرەکی مانەوەی گەلێك ئیمپراتۆریەتە لەسەرووی هەمووشیانەوە ئیمپراتۆریەتی ڕۆما چونکە جەسارەتیان لێیەوە گرتووە. بێگومان ناتوانرێ ڕۆڵ و کاریگەری سیستەمی میسر لە چاندنی بۆهێڵی (جین) کۆمەڵایەتی لەبیر نەکرێت لەوەی کە تاوەکو ئێستا دەسپۆتیزم لەرۆژهەڵاتی ناویندا بەهێزە. هەروەکو چۆن بەشێوەیەکی قووڵ کۆیلایەتی چالاك کرد، ئەوا دەسەڵاتی سیاسی و ئایینیشی بەو ئەندازەیە کردووە بە خاوەنی چالاکبوونێکی بەتوانا. لەمێژوودا ڕۆڵی سۆمەریەکان سەبارەت بە لە دایك بوون و پێشکەوتنی سیستەمی کۆیلایەتیدا چەندە دیاریکردووە، ئەوا ڕۆڵی میسریەکانیش لەپێگەیشتن و بەردەوامبوونی بەم ئەندازەیە گرنگە.

٢ ـ **شارستانییەتی هاراپا و موهانجادرۆی دۆڵی هیندستان ـ پەنجاب و ئیندۆس:** لە دەورووبەری ٢٥٠٠ ساڵ پ.ز ڕووبەڕووی لقێکی دیکەی شارستانییەتین، کە قارچك ئاسا ئاوا دەبن. ئەمەش لە شێوەی میسر دەچێت کە زیاتر لاتەریك کراوە. لەبواری بیناسازی و نووسیندا پێشکەوتنێکی سنووردارى سەلمێنراوە. شیمانە دەکرێت لەمیانەی ڕێگای زەریای هیندی پەیوەندی بە سۆمەریەکانەوە هەبێت. لەدەوروبەری ٥ هەزار ساڵ پ.ز لەڕێگای ئێرانەوە شێوازەکانی نئۆلیتیکی ناسیوە، بەڵام لەوە زیاتر کە بەرهەمی شۆڕشی کشتوکاڵی ئەم ناوچەیە بێت، شیمانەی ئەوە دەکرێت لەمیانەی شێوازی کۆلۆنی بازرگانی گرێدراو بە سۆمەریەکان پێشکەوتبێت. شیمانەی ئەوە هەیە کە کاتێك دەگەڕێینەوە ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز، بە شێوەیەکی گشتی شانبەشانی ئەو وشکاییەی ڕوویداوە، ئەوا ئەم لقەی شارستانییەت نەیتوانیوە بەرگەی ئەو قەیرانە بگرێت کە لەهەموو ناوچەکانی شارستانییەت هاتۆتە ئاراوە و بەمجۆرە لەدەرەوەی مێژوودا ماوە و کوژاوەتەوە و کۆمەڵێکی تێدا ژیاوە کە تاوەکو ئێستا نەزانراوە. هەروەها ئەوە دەبینرێ کە هێندەی شارستانییەتی میسر نەبۆتە خاوەنی سەربەخۆیی و تایبەتمەندێتی و بەردەوام نەبووە. شارستانییەتی هیندستان لەئەنجامی پەیوەستبوونی بە شوێنی نیشتەجێبوونی گروپە بەهێزەکانی ئاریان لەساڵانی ١٠٠٠ پ.ز دەبێتە خاوەنی ئەم بەردەوامی و تایبەتی بوونە.

٣ ـ **شارستانییەتی چین:** چین کە دەکەوێتە سنووری ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئاسیا لە دەوروبەری ساڵانی ٤٠٠٠ پ.ز سەردەمی نئۆلیتیکی ناسیوە کە لەلایەنی کەوانی بەپیت هاتۆتە ئاراوە. شوێنەوارێکی گەوهەری پێشکەوتنی شۆڕشی کشتوکاڵی تێدا نابینرێت. ڕووباری زەرد لەمیانەی ئەو ڕێکخستنە لەبارەی کە بە گوێرەی ئاودێری و بەرهەمهێنانە، ڕۆڵی ڕووباری نیلی میسر دەبینێ. جگە لە ئاودێری دەستکرد جوگرافیا و کەشەکەی بۆ کشتوکاڵی کولتووری دانەوێڵە لەبارە. لەدەوروبەری ساڵانی ١٥٠٠ پ.ز لەسەر بنەمای پێشکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی ئیمپراتۆریەتێکی کۆیلەداری بەهێز لەچین ئاوا دەبێ و هێندەی میسریەکان لەڕەوشێکی توندی ناوەندی بووندا پێشدەکەوێت. هەروەکو لەنموونەی شارستانییەتی هیندستان بینرا، دووچاری وەستان و پچڕان نابێت. گەلێك قۆناخی پلەبەپلەی پارچەبوون و ناوەندی بوون دەرباز دەکات و خۆی دەگەیەنێتە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان. لەگەڵ ئەوەی دەسکەوتێکی زۆرتایبەتی بۆ شارستانییەت دەستنیشان نەکراوە، تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرەشی هەیە کە دەتوانێ بەردەوام خۆی تێر و بەخێو بکات. شارستانییەتی چین لە سەرەتاکانی دەستپێکردنی زایین واتە لەسەردەمی شارستانییەتی ڕۆما، لەمیانەی لێشاوێکی بەهێز دەتوانێ تەڤلی لقی سەرەکی شارستانییەت ببێت. لەگەڵ بەیەك گەیشتن و یەکبوونی ڕێبازی شارستانییەتی ئاسیا و ئەوروپا ئەوا چەندین لقی ورد و درشتی کۆمەڵگای شارستانی تەڤلی ڕووباری سەرەکی دەبن. ڕووباری سەرەکی مەزن دەبێ و خێرا دەبێ. ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانەی لەباکوور و باشوورەوە بەرەو ئەو هێڵە دێن کە لە زەریای ئەتڵەسیەوە بەرەو زەریای مەزن درێژ بۆتەوە تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی ڕێبازەکە بەردەوام بۆ دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانیان دەگوازنەوە و هەندێ ڕەنگی تایبەتمەندێتی خۆشیان تەڤلی دەکەن و بەمجۆرەش ڕۆڵ لەپێکهاتنی دەوڵەمەندی مێژوویدا دەبینن. ڕاستینەی واتای ئەفسانەیی و مێژوویی ڕێگای ئاوریشم لەو ڕۆڵەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەم دەوڵەمەندبوونەدا گێڕاویەتی.

لە دابەشکردنی شارستانییەت بەسەر کیشوەرەکاندا ئەو ڕۆڵەی کە دەکەوێتە بەشی ئەمریکا ئەوەیە کە لە ٣٠٠٠ ساڵ پ.ز نئۆلیتیکی ناسیوە و پێنج سەدە پ.ز دەربازی شۆڕشی شار بووە. ئەو کیشوەرە کە لەنێو سنوورەکەی خۆیدا پێشکەوتنێکی سنووردارى بەخۆیەوە بینیوە، ئەوا بەپشت بەستن بە کۆلۆنی کردنی داگیرکاری ئەوروپا، زۆر درەنگ و لەسەدەی بیستەم لەمیانەی پێشەنگایەتی ئەمریکا لەئاستی جیهاندا ڕۆڵی بینیوە.

٤ ـ لەکاتی پەلهاوێشتنی شارستانییەتی سۆمەریەکان و بەرەنگاربوونەوەی پەلهاوێشتنەکەدا پێشکەوتنی راستەقینە لەگۆڕەپانی دراوسێکاندا روویدا. لە رۆژهەڵات و باکوورەوە هۆریتەکانی بە رەچەڵەك ئاریان، لە باشوور و رۆژئاواشەوە ئەو گروپانەی رەچەڵەکیان بۆ سامیەکان دەگەڕێتەوە و ناویان ئامۆریتە، لە بەرامبەر ئەو هێز و دەوڵەمەندییەی سۆمەریەکان کە لە نێوانیان بەرەو لوتکە هەڵکشا، کەوتوونەتە نێو جموجوڵێکی مەزنەوە. ژیانی جێگیر و هێمنی سیستەمی گوندی کشتوکاڵی جێگر و سیستەمی رەوەندی شوانکاری لەبەرامبەر ئەم دەوڵەمەندیە دەکەونە نێو هەژاندنێکی مەزنەوە. کۆمەڵگای ئاریان لەنێو رەوشێکی بەمجۆرەدا نین کە بتوانن ئەم سیستەمەی کشتوکاڵی و بەخێوکردنی ئاژەڵ تێپەڕێنن کە بەقووڵایی لەنێویدا دەژیان. هەر لەزووەوە سۆمەریەکان دەستیان بەسەر ئەم توانا و باڵابوونەدا گرت. تیرە شوانکارەکانی ئامۆریت زۆر لەژیانی شار و کشتوکاڵ دووربوون و لەنێو هەلومەرجی دژواری بیاباندا بە تایبەتیش کاتی زیادبوونی وشکایی لەپێناو بەردەوامکردنی ژیان دەکەوتنە نێو شەڕێکی یەکجار دژوارەوە. واتە لە سەرووی ئەوانەوە بەهەشتێك بەرز دەبێتەوە. رووبەڕووی چارەنووسێکی وەها بوونەتەوە، یا ئەوەتا وەکو کۆیلەی خزمەتکار یاخود وەکو فاتح رۆڵی خۆیان ببینن. لەڕۆژئاوا شارستانییەتی میسریش رووبەڕووی رەوشێکی هاوشێوە بۆتەوە. یان ئەوەتا شارستانییەت لەم تاقیکردنەوەدا قازانج دەکات و بەرامبەر بەربەرێتی سەردەکەوێ و بڵاو دەبێتەوە، یان ئەوەتا دەخنکێ و کز دەبێ و دەکوژێتەوە. رووبەڕووی ساتێکی هەستیاری قۆناخی دیالەکتیکین کە مێژوو دیاری دەکات و یەکلای دەکاتەوە. لەڕاستیدا ئەو قۆناخەی کە رێگای لەپێش پێکهاتنی شارستانییەتی سۆمەر کردەوە گرێدراوی جموجوڵی ئەم تیرانەیە. بەڵام کاتێك خۆی باڵادەستی دەگرێتە دەست، ناکۆکی جیاواز دەرکەوتن.

لە دەورووبەری ٢٥٠٠ ساڵ پ.ز کاتێك شار دروست کردن (بە شار بوون) گەیشتە سنووری سروشتی خۆی و لەپێناو موڵکایەتیدا پێشبڕکێ و شەڕی نێوانیان توند بوو، خانەدانی سەرجۆن بە رەچەڵەك سامی ئەوەی کرد بە سیاسەتێکی سەرەکی کە لەمیانەی توند و تیژی، ناکۆکییەکان سەرکوت بکات و بەرەو دەرەوە سەفەربەری بکات. جیاوازی سەرجۆن ئەوەیە کە ئەو چالاکیە قارەمانانەی تاکە کەسی کە ناوە بە ناوە وەکو ڤەبوون بوو روویاندەدا، لەم رەوشە دەرخست و خستیە نێو قۆناخێکی کۆلۆنی بە پیلان و سیستەمی بڵاوبوونەوە. لەمیانەی رێگاکانی وشکانی و دەریا و رووبارەکان قۆناخێکی باڵادەستی بازرگانی بە هەر چوارلادا کراوەتەوە. لەنووسینی سەرکێلە بەردەکان ئەم قۆناخە بەجۆرێکی سەرفراز و شەرفمەندانە یادی دەکرێتەوە. لەماوەی نێوان ٢٥٠٠ تا ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز کۆلۆنییەکانی بازرگانی لە رۆژهەڵاتی دەریای سپی بەرەو دەریای رەش، لەناوەوەی ئێران تا دەگاتە دوورگە و کەنارەکانی کەنداوی بەسرە، بەشێوەی هەرەس ئاسا بڵاو بۆتەوە. فینیقیەکان لەرۆژهەڵاتی دەریای سپی، هیتیتەکان لەناوەوەی ئەنادۆڵ، میتانیەکان لەباکوور و ناوەڕاستی میزۆپۆتامیا، لەرۆژهەڵاتی زاگرۆس و ئێران ئیلامیەکان لە دوای یەکەم کردەوەکانی کۆلۆنی کردن، دواتر هەروەکو لەمیانەی نووسراوی سەر کێلە بەردەکان دەرکەوتووە لە ئەنجامی بەرخودانێکی خوێناوی درێژخایەندا سەربەخۆ بوونە و گەیشتوونەتە ئاستی هێزی سیاسی و دەوڵەتی خۆیان ئاواکردووە. ئەمەش هەروەکو لەقۆناخی داگیرکاری سەرمایەداریدا بینرا، لەو دەوڵەتە خۆجێیی و فیدارسیۆنانە دەچێت کە دوای شەڕەکانی بەرخودان ئاواکران. کۆلۆنییەکانی ئیمپریالیستی سۆمەری و شانبەشانی ئازادبوونی ئەو پێکهاتە خۆجێیانەی لەم میانەدا کاریگەریان لێکرا و جودابوونەوە و بەهێز بوون، ئەم قۆناخە مێژووییەی تازە کراوەتەوە، رێگای لە بەردەم پێشکەوتنی گرنگ کردۆتەوە. هەم پەسندکردن و لەمیانەی جودابووندا، گەیشتن بە کۆمەڵگای چینایەتی، هەم لەئەنجامی ئەو پێشبڕکێیەی لەزیادبووندایە، پێکدادان و دەوڵەتی بچووکی خۆجێی دێتە سەر شانۆی مێژووەوە، ئەمانەش تایبەتمەندێتی ئەم قۆناخەن.

لە کاتێکدا لەماوەی نێوان ٢٥٠٠ تا ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز کۆلۆنی کردن لەسەر بنەمای سۆمەریەکان مەیلی زاڵ و باو بوو، ئەوا دەبینرێ کە ساڵانی دوای ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز ئەو پێکهاتە سیاسییانەی لەدەورووبەری کۆلۆنییەکان پێشکەوتن، هێزیان بە قۆناخێکی نوێ دەدا و دیاریان کردووە. ئەم قۆناخە کە زیاتر لەساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز تاوەکو پێنجەمین سەدەی پ.ز بەردەوام بووە، لە مێژووی رۆژهەڵاتی ناویندا واتایەکی مەزنی هەیە. لەمێژووی مرۆڤایەتیشدا بە لانی کەم بە ئەندازەی رۆڵی میسر و سۆمەری کلاسیك رێگا کردنەوەیان لەپێش چەندین پێشکەوتن، تەڤلی کردنی دەوڵەمەندییە خۆجێیەکان جێگای باسە. ئەمەش بەواتای ئەوە دێت سیستەمی کۆیلایەتی کە بەتەواوەتی وەکو چارەنووس و قەدەرێك بەسەر مرۆڤایەتیدا ساغ بۆوە، بەنێو پێگەیشتوترین قۆناخی خۆیدا دەرباز بوو. هەربۆیە لەهەموو لایەنێکەوە هەڵسەنگاندنی ئەم قۆناخە نوێیەی شارستانییەتی کۆیلایەتی گرنگییەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت.

## و ـ سەردەمی نیمچە دەوڵەتی ـ شاری کۆیلایەتی رۆژهەڵاتی ناوین

دوای ئەوەی سیستەمی کۆیلایەتی میسر و سۆمەر بەدەزگابوون و هەمیشەیی و بەردەوامبوونی خۆیان سەلماند ئەوا هەروەکو لە هەموو سیستەمە کۆمەڵایەتیە باڵادەستەکاندا دەبینرێت، دەربازبوونیان بۆ قۆناخی بڵاوبوونەوە پێویستییەکی سروشتییانەیە. کۆمەڵگای ئەو تیرانەی کە بە کشتوکاڵ و شوانکاری گوزەران دەکەن، دوای ئەوەی دەیانخاتە ژێر کاریگەری و پەیوەندی خۆیان، ئەوا بەپێی دەربازبوونی کات ژیانی ئازادیان رووبەڕووی سنووردار بوون و لاوازبوون دەبێتەوە. سەردەم لەگۆڕاندایە. تیرەکانی کشتوکاڵ و شوانکاری کە لە دەوروبەری ١٠٠٠٠ ساڵ پ.ز پێکهاتوون، بەرامبەر بەم کاریگەریە لەمیانەی دووبژاردا کاردانەوە پێشدەخەن: ئەو توێژەی لە زیادبوون و هەژاربووندایە وەکو سەرچاوەی سەرەتایی هێزی کاری هەردوو شارستانییەت لەدەوروبەری شارەکانی سۆمەر و میسر نیشتەجێ دەبن. لەڕاستیدا لەمیانەی بەڵگەکانیشدا روون دەبێتەوە کە قۆناخێکی بەمجۆرە لە ئارادا بووە. زۆر بە سانایی لەتەورات و چەندین نووسراوی بابلیەکاندا روون دەبێتەوە کە گروپە سامیەکانی عیبرانی لە میسر و کاسیتی ئاریانی لە سۆمەر، وەکو هێزێکی کاری بێ دەرامەتی بەمجۆرە لەنێو هەلومەرجی ئازادییەکی نیوەچڵدا ژیاون. هەروەکو ئەو گوندیە هەژار و نەدارانەی رۆژگاری ئەمڕۆمان وان کە بە لێشاو بەرەو مەترەپۆڵەکان کۆچیان کردووە و ژیانێکی نیوە ئازادیان هەیە و هێزی کار پێکدێنن. ئەوەی دەمێنێتەوە بە گرانیش توێژی سەرەوەی تیرە وەکو ئەڵقەی سەرەکی هەر دوو هێزە ناوەندییەکە هەوڵدەدەن لە گۆڕەپانەکانی باڵادەستی خۆیاندا چڕ ببنەوە و لەمیانەی بەجێکردنی شار وەڵام بدەنەوە. لەکاتێکدا سەرەتا وەکو بازرگانە کۆمبرادۆرەکانی گرێدراو بە سەنتەری ئیمپریالیزمی کۆیلەداری رۆڵ دەبینن، بەپێی دەربازبوونی کات نموونە بنەڕەتیەکە پەیڕەو دەکەن و دەگەنە ئاستی نیمچە دەوڵەتی شار.

شتێکی مسۆگەرە کە لە ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز بەدواوە ئەم قۆناخە بەخێراییەکی زۆر لەجوگرافیای رۆژهەڵاتی ناویندا هاتۆتە ئاراوە. لەسەرەتا بیبلۆس و ئۆگاریت لە کەنارەکانی رۆژهەڵاتی دەریای رەش، لە باکووری سوریا یاخود میزۆپۆتامیای ناوین لەکار، کامش، سامسات، ئەبلە، ئورفا، حەران، ماری، لەئەنادۆڵی ناوەڕاستیش هاتوشاش، کانەش، لە رۆژهەڵاتی زاگرۆسیش ئیلام یەکەمین گۆڕەپانی نیشتەجێبونیانە، ئەو شوێنەی نیشتەجێبوونە، کە لە ئەنجامی یەکەمین شەپۆلی مەزنی بڵاوبوونەوەی سیستەم هاتە ئاراوە.

لەبەر ئەوەی لە سەردەمی نئۆلیتیکدا ناوچەکانی نیشتەجێبوون بەگرانی بە ئامانجی کشتوکاڵ بوون، بۆیە پێکهاتەی گوندیان تێپەڕ نەدەکرد. ئەم مۆدێلە نوێیەی ناوچەکانی نیشتەجێبوونیش بە گرانی لە ناوچە ستراتیژیەکانی سەر رێگاکان بوون و وەکو ناوچەی بازرگانی  و شوێنی کەلوپەلی ئامادە رۆڵیان دەبینی هەربۆیە بەخێرایی دەبوون بە قەزا و ناوچەیەکی بەڕێوەبردن کە بە سەنتەری شارەکان ناوزەد دەکرێت. بەهادارترین ماددەی بازرگانی کە یەکجار نایابە و زۆر بەدوایدا دەگەڕێن گەوهەری کانزاکان و تەختەکانی داری ئەرزە **"شجرة الأرزة"** کە لە چیاکانی تۆرۆس و لوبنان دا هەیە. شانبەشانی ئەمەش گەلێك بەروبوومی پیشە و وەستایی جیاواز لەسەرووی هەمووشیانەوە تەون و گلکاری بەئامانجی بازرگانی دەرەوە بەرهەم دەهێنرێت، بە ئامانجی گۆڕانکاری و بازاڕ پارە دێتە ئاراوە، سیستەمێکی نووسین کە دەگاتە ئاستی نووسینی نامەی بازرگانی، بە تایبەتیش لەشارەکانی فینیقیەکان خاوەنی کارەکتەرێکی سادە و لەبار بوو بۆ بەکارهێنان. هێزی بازاڕ و پارە و نووسین لە زیادبووندایە. قۆناخ چینی بازرگان بە شێوەیەکی شکۆدارانە پێشدەکەوێت. بەواتایەکی دیکە لە مێژوودا قەوارەی پێکهاتەی چینی ناوین و کۆمەڵگای چینایەتی پێکدێت.

کاتێك راهیبەکانی پەرستگا و ناوەندەکانی بەڕێوەبەرایەتی و پادشا و بیرۆکراتەکان و توێژەکانی سەرووی تیرەکانی پێیانەوە گرێدراون وەکو چینی سەروو باڵا هەڵسەنگێنن، ئەوا هەرچەندە لاوازیش بێت چینی بازرگان و پیشەکاران کە ئیتر پەیوەندییان لەگەڵ تیرە بەرەو دابڕان دەچێت (چینی ناوەڕاسته، ناوین)، چینی کۆیلەش کە بەرفراوانترن و پەیوەندییەکانی تیرەگەرییان بەرەو دابڕان چووە، کارەکتەری کۆمەڵگای چینایەتی ئەم قۆناخە دیاری دەکەن. بێگومان ئەم جیابوونەوە نوێیەی چینایەتی زۆر روون و یەکلا نەبۆتەوە. بەڵام ئەمە شتێکی مسۆگەرە کە زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی ماددی هاتۆتە ئاراوە کە لەنێو ئەنجامدان و پێکهاتنی کردەوە و چالاکییە مێژووییەکان، بەرژەوەندی چینەکان نیشان بدات.

یەکێك لە کێشە سەرەکییەکانی مێژووی ئەم قۆناخە کە پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی گرنگ هەیە، دواترین قۆناخی بەربەریەت یاخود بەدەربڕینێکی دیکە دیاردەی کۆنفیدراسیۆنی تیرەکانە کە دەتوانین وەکو قۆناخی سەرەتایی دەوڵەتی شار هەڵیسەنگێنین، بەرلە قۆناخی بە شارستانیبوون ئەم قۆناخە لەنێو ئەو تیرە بە توانایانەدا پێشکەوتووە کە خزمی یەکترن. لێرەدا روون دەبێتەوە کە دوو هۆکاری سەرەکی رۆڵ دەبینن. لەلایەکەوە هەروەکو ناکۆکییە نێو خۆییەکانی نیمچە دەوڵەتەکانی ـ شار بۆ بەلاوەنانی ئەو پێکدادان و جیاوازیەی نێوان تیرەکان، بەڵام زیاتر بۆ ئەوەی بەرامبەر بە پەلامارەکانی هێزەکانی شارستانییەت خۆیان بپارێزن و دەسکەوتی بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانیان بەدەست بێنن، پێویستی یەکبوون دێتە ئاراوە. دەتوانرێ ئەمە بە قۆناخی ئامادەکاری دەوڵەت بوون ناوزەد بکرێت. ئەمە شێوەگرتنێکی کاتییە. هێشتا لەناوەندی شارێکدا ئەرتەشێکی چڕکراوە نییە، پەرستگا و بیرۆکراسییەتی خۆی ئاوا نەکردووە. چینی ناوینی نەخوڵقاندووە. بەرامبەر بە هەڕەشەی ناوخۆ و دەرەوە هەرساتێك شیمانەی پەرتەوازە بوونی هەیە. ناوێکی دیکەی ئەم قۆناخەی مێژووش قۆناخی قارەمانێتییە. ماوەیەکی کورت بەرلە پێکهاتنی دەوڵەتی ناوەندی کۆیلەداری ئەم قۆناخە هاتۆتە ئاراوە، لەلای سۆمەری و میسریەکان لەساڵانی ٣ هەزار پ.ز، لە سەردەمی پێگەیشتنی سیستەمی کۆیلەداریشدا لەلایەنی هیتیت و هۆرییەکانی بەڕەچەڵەك ئاریان لەماوەی نێوان ٢٥٠٠ تا ٢٠٠٠ پ.ز، لە کەنعانی و ئامۆریتەکانی بەرەچەڵەك سامی لەساڵانی ٢٠٠٠ تا ١٠٠٠ پ.ز روویداوە. وەکو قۆناخی ئامادەکاری و بەرایی سیستەمی کۆیلایەتی یۆنان ـ رۆما و هیندستان و چین لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٥٠٠ تا ١٠٠٠ پ.ز لەژێر سایەی شێوەی بەهێز و کاریگەردا ژیاون.

پێویست دەکات بە شێوەیەکی قووڵ دەرك بە قۆناخی فیدراسیۆنی تیرەکان بکرێت. تیرەگەرێتی و خێڵایەتی کە تاوەکو ئێستاکەش لەم جوگرافیایە (رۆژهەڵاتی ناوین) بەهێزە، هێزی خۆی لەم مێژووەوە دەگرێت. نەك سەدان بەڵکو هەزاران ساڵ لەژێر ئەم شێوەبەندیە (فۆرماسیۆنە) تێپەڕیوە و قارەمانێتی مەزن نیشاندراوە. لە راستیدا بەواتایەکی دیکە ئەم قۆناخە مێژووی خێڵەکان یاخود بەگوزارەیەکی دیکە مێژووی "**پێکهاتە ئەتنیکیەکانە**".

قەوم، زۆر بەر لە مێژووی خانەدان، ئایین و چینەوە دێت. بۆ گەیشتن بە چەمکێکی راستی مێژوو، پێویستە کێشەی مێژووی پێکهاتە ئەتنیکیەکان چارەسەر بکرێت. ئەگەر چەرخی سەرەتایی بێت یاخود چەرخەکانی ناوین و نزیکەکان بێت، ئەو وەکو چەرخی خانەدان و ئایین و قەوم سەپاندوویانە و رەوایەتیان پێداوە. ئەو چەمکانەی کە چەرخی سەرەتایی بەچەرخی خانەدان و هی ناوینیش بە چەرخی ئایین و چەرخە نزیکەکانیش بە هی نەتەوەپەرستی دادەنێت و دەخوازێت فەرمییان بکات، زۆر لەوە دوورە کە مێژووی ئاڵۆزی کۆمەڵگاکان بەشێوەیەکی بەرجەستە نیشان بدات. هەربۆیە مێژوو تا ئەو رادەیە چەواشەکراوە کە زۆر ئاستەمە بتوانێ بە شێوەیەکی راست و واقیعی مۆرکی خانەدان و ئایین و قەوم لەشوێنی خۆیدا دیار و جێگیر بکەیت. وەکو دیارە ناچارییەکی مەزنە **دەبێ سەر لەنوێ مێژووی مێژوو بنووسرێتەوە**. تاوەکو تەواوی زێدەڕۆیی بە هیچ دانان، ناتەواو و بچووك بینین و نووسینە چەواشەکاریەکانی بە ئەنقەست نووسراون و تا دەگاتە چەوتی نزیکبوونەوەکان لەمێژوو، یەکلا نەکرێتەوە و هەموو لایەنەکانی ئاشکرا نەکرێت، ناتوانرێ راستییەکانی ببینرێ و مافی خۆی پێبدرێت.

هەرچەندە بنەمایەکی نووسراوە بەردەست نەکەوێت بەڵام "**مێژووی ئەتنیك**" واتایەکی بەمجۆرە دەبەخشێت کە لە مێژووی ئایین، خانەدان و قەوم واقیعیتر و خاوەنی رۆڵێکی درێژخایەنترە. مەزنترین پێشکەوتنی پێکهاتە خۆیی و بابەتییەکانی ئەتنیك (سیستەمەکانی تیرە و خێڵ) لە سەردەمی شوانکاری و کشتوکاڵی نئۆلیتیك هاتۆتە ئاراوە. "**قلان**" (کۆمەڵەی تیرە بەرایەکان) کە ناوەندی سەرەکی یەکینەی بنچینەیی کۆمەڵگای بیانییە (هۆڤێتی) هیچ کاتێك ژمارەی لەچەند سەدێکەوە تێپەڕی نەکردووە. شێوازی ژیانی ئەشکەوت و گەڕۆکی زاڵە. لە وەرز و کەش و هەوا دژوارەکاندا لەمیانەی نێچیرکردنی ئاژەڵ و کۆکردنەوەی دانەوێڵە گوزەرانیان دەکرد. ئەم کۆمەڵگایانەی لەقلان پێکهاتوون و تاوەکو کۆتایی دواترین قۆناخی سەهۆڵ بەندی (٢٠٠٠ ساڵ پ.ز) ژیاون بە یەکتری دەچن و سیستەمێکی سنووورداری دەنگیان هەیە و لەقۆناخی زمانێکی سەرەتایی ئەوتۆدان کە لایەنی هێما (ئیشارەت) تێیدا باڵادەستە. رۆحانیەك (ئانی میست) و پەیڕەوکارێکی تەوتەم خاوەنی چەمکێکی هزری ئایینین، ٩٨٪ ی مێژووی مرۆڤایەتی بە ژێر ئەم شێوەیەی پێشکەوتنی کۆمەڵگادا تێپەڕیوە. تایبەتمەندێتی و مێژووی هیچ ئایین، خانەدان، قەومێك پێك نەهاتووە. نزیکەی ٢٠ تا ١٠ هەزار ساڵ پ.ز لەدوای قۆناخێکی تێپەڕ بوون (قۆناخی مەزۆلیتیك) دەربازی قۆناخی نئۆلیتیك (تیرە بەربەرەکان) بوون. کشتوکاڵ و ماڵداری کردنی ئاژەڵ سەرچاوەی سەرەکی گوزەرانن و سیستەمی گوندی جێگیر بە بنەما دەگیردرێت. کۆچبەری سنووردار کراوە. وەکو تیرەی دایکسالاری خزمی یەکتر دەژین. هەندێ جار ژمارەیان دەگات بە هەزاران. بەڵام ئەوە نابینرێ کە پێنج هەزاریان تێپەڕاندبێت.

ئازادی تیرە هەستێکی زۆر بەهێزە. پەرستگای ئەو ئایینانە پێشدەخرێت کە مۆرکی خوداوەندی ژنی پێوەیە. لەم قۆناخەدا لەهەموو شوێنەکانی نیشتەجێ بووندا پەیکەری بچووکی خوداوەندە ژنە سەرەکییەکان لەزۆر شوێن دانراوە و هەیە. ژن لەمیانەی ئەستێرە و مانگەوە نوێنەرایەتی دەکرێت، بەڵام زیاتر خاوەن گرانییەکی بەمجۆرەیە کە بەدایکی سروشتی هێزە سروشتییەکان دادەنرێت. تێگەیشتنی ئەمە زەحمەت نییە. لەمیانەی رەنجی خوڵقاندنی کشتوکاڵ و ماڵیکردنی ئاژەڵ، هەروەها وەکو دایکی ئەو منداڵانەی دەیانهێنێتە دونیاوە، لەمێژوودا بەگەورەترین شێوە پیرۆز دەکرێت. لەواتایەکدا هێزی خوڵقێنەری ژیانە. سروشت و خاك دایکە. ئەو هێزەی سروشت و بەروو بوومی دانەوێڵە و دارەکانی دۆزیەوە، دەبێتە نوێنەری خوداوەندە ژنەکان و وەکو کارەکتەرێکی سروشتی، واتابەخش دەبێت. گرنگی ژن ــ دایك کە بە شێوەیەکی نائاسایی زیاد دەکات، بەرامبەر بەپیاو رێگا لەپێش باڵابوونێکی زەق و بەرچاو دەکاتەوە.

لە کاتێکدا نێچیرگرتن ئامرازی گوزەران و ژیان بوو، رۆڵی پیاویش هێندە بەهێزبوو، وەلێ کاتێ نێچیروانی دەکەوێتە پلەی دواوە بۆیە پیاو یەکجار لاواز دەبێت. مێژووی ژن واتای مێژووی دانەوێڵە، وڵاخی کورتە باڵا، دارەکانی میوە، خانوی گوند، دروومان، قازمە و دەستاڕە؛ دەبێ بگوترێ سیستەمێکە تێیدا رێزگرتن لەسەر بنەمای رەنج و بەرهەمە: واتای مێژووی ئەو بەرهەمانەی لەمیانەی رەنج خوڵقێنران و ئەو منداڵانەی گەورەکراون و ئەو سیستەمەی ماڵ و شوێنی حەوانەوەیە. هەروەها بە واتای مێژووی گواستنەوە لە یەکگەیشتن بە هێمای سەرەتایی بۆ زمانێکی دەوڵەمەندە، کە تێیدا لە رێگای ئامێرە بە واتاکانی بەرهەم هێنان زاراوە دادەهێنرێت، هەربۆیە مێژووی دەربازبوونی مرۆڤایەتییە بەرەو پێکهاتەی هزری. بەم شێوەیە دەستنیشانکردنی بیرۆکە و زاراوەکانی مێژووی ئەتنێك واقعی و گرنگە. کاتێك  لەساڵانی ٤ هەزار پ.ز قۆناخی گاسن بۆ کێڵگەکان دەستپێکرد و شوانکاری گرنگی پێدرا، جێگای ژن لەقۆناخی بەرهەم هێناندا تەنگ کرایەوە. بەپێی دەربازبوونی کات لەماڵدا دەمێنێتەوە و ئەمەش قووڵ دەبێتەوە تادەگاتە رۆژگاری ئەمرۆمان. هەربۆیە شتێکی مسۆگەر و حاشاهەڵنەگرە کە لەکاتی نووسینی مێژوودا شوێنگەی ژن بە گوێرەی ماف و راستی خۆی دیارنەکراوە و زۆر دووری ئەم راستییەیە. لەگەڵ قۆناخی شارستانیبووندا باڵادەستی پیاو پتەوبوو ئیتر لەگەڵ دەربازبوونی کات ژن لەنێو دام و دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگای چینایەتی بەدەرنرا و ئەمەش بووە بناخەی نووسینی پەرتووکەکانی "**مێژووی بەدەر لە ژن**". لە ئەنجامی ئەو نایەکسانییەی لە نێوان رەگەزەکاندا هەیە چەواشەکارییەکی مەزن بەناوی مێژوو پێشکەش دەکرێت.

شانبەشانی ئەم هەڵسەنگاندنە گشتی و کورتەی دەرهەق بەپێکهاتەی ئەتنیك ئەنجامماندا، هەوڵدەدەین وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزینەوە: ئایا کۆنفیدراسیۆنی خێڵەکان چ کاتێك و لەکوێ بەرامبەر بەپێشکەوتنەکانی شارستانی پێکهاتووە و پێگەیشتوون؟ تا رادەیەکی مەزن مێژووی رۆژهەڵاتی ناوین گرێدراوی وەڵامێکی راستی ئەم پرسیارەیە. ئەم لایەنە، واتە وەڵام لەنێو تاریکاییدا شاردراوەتەوە. دیسانیش دەتوانرێ قۆناخە سەرەکییەکانی سیستەمی تیرەکان بۆ سێ قۆناخ جیابکرێتەوە.

**١ ـ ئەو قۆناخەی کە کشتوکاڵ و شوانکاری پێشکەوت: ١**

لە عەرەبستان و باکووری ئەفریقیا وەکو گروپی زمان و کولتووری سامی بە شێوەیەیکی گشتی پەسند دەکرێت کە لە ماوەی نێوان ٩٠٠٠ تا ٦٠٠٠ پ.ز شانبەشانی بڵاوبوونەوەی کاریگەری کۆمەڵگای نئۆلیتیك لەناویاندا هاتوونەتە ئاراوە و پێشکەوتوون. بە پشت بەستن بەزنجیرە چیای تۆرۆس و زاگرۆس لەدۆڵ و دەشتەکاندا بەشێوەیەکی ناوەندیش لەو گۆڕەپانە جوگرافییەی بە کەوانی بەپیت و بەرەکەت ناودەبرێت، لە ماوەی نێوان ١٠٠٠٠ تا ٦٠٠٠ پ.ز وەکو گروپە داهێنەرەکانی نێچیرگرتن و کشتوکاڵی نئۆلیتیك. گەلانی بە رەچەڵەك ئاریان گرنگی و رۆڵیان زیادبووە. کاتێك لێکۆڵینەوە ئەتیمولۆژییەکان (زمان زانی) لەگەڵ ئەرکۆلۆژی (شوێنەوارناسی) یەکانگیر بکرێت، ئەوا مسۆگەر دەبێت کە گروپەکانی ئەم گەلە خولقێنەرەی کشتوکاڵ و نێچیروانین. بۆ ناولێنانی هەردوو گروپیش قەرزاری سۆمەریەکانن.

**٢ ـ دەربازبوون بەرەو دەزگابوون و سیستەمی خێڵایەتی:** لەو قۆناخەی کە کۆمەڵگای نئۆلیتیك لە کەوانی بەپیت دا لەژێر ناوی کولتووری **"تەل خەلەف"** رێگایان لەپێش بە دەزگابوونێکی هەمیشەیی و جێگیر کردەوە، بەواتای قۆناخێك دێت کە گروپەکانی عەشیرەت **"خێڵ"** شێوەیان گرتووە. ئەم قۆناخەی کە لەماوەی ٦٠٠٠ تا ٤٠٠٠ پ.ز نزیکەی ٢ هەزار ساڵ بەردەوام بوو هەروەکو قۆناخی **"داهێنانە بنەڕەتییەکان"** ئامادەکاری شارستانییەت رۆڵێکی یەکجار گرنگ دەبینێ.

ئەوەی بە شێوەیەکی بنچینەیی سۆمەری ئامادە کردووە ئەم قۆناخەیە. لەو بوارانەی کە گشتگیریەکی ئابووری لە نێوان گروپە ئاری و سامیەکان دروست کردبوو جیاوازی دەردەکەوێت و لەتیرە هاوشێوەکان دەربازی خێڵی لەیەك جودا دەبن. هەر چەندە تێگەیشتن و هزرێکی بەهێزی خێڵایەتی پێك نەهاتبێت، وەڵێ لە رێگای قەوارەی هەبوونی بابەتییانەیانەوە توانیویانە ببنە کۆمەڵگای هەڵگری کارەکتەری ئەتنیکی. هەروەکو چۆن جیابوونەوەی چینایەتی و هەلومەرجە ماددی و ئابوورییەکانی سەردەمی نەتەوەییبوونی، کە قۆناخەکانی دواتر دەرکەوتن رۆڵێکی دیاریکراویان بینیوە، هاوکات هەلومەرجە ماددییەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی پێکهاتە خێڵایەتییەکانی دیاری کردووە و هێناوەتە ئاراوە.

**٣ ـ قۆناخی شێوەگرتنی شارستانییەت تاوەکو چەندین شێوەی سەرەکی چینایەتی و رۆژگاری ئەمرۆمان:** ئەو قۆناخەی دەتوانین بە قۆناخی بەرخودان و بە شارستانی بوونی خێڵەکانی ناو ببەین؛ ئاستی تێگەیشتنی خێڵایەتی بەشێوەیەکی بەهێز پێشدەکەوێ، خۆدانانی بەئەندامێکی خێڵ بۆتە مەرجێکی دەست لێبەرنەدراوی ژیان، دەتوانرێت وەکو **"سەردەمی شیعر و داستان"**یش هەڵسەنگێنرێت. قۆناخێك جێگای باسە کە پڕە لەو شەڕ و پێکدادانانەی لە ئەنجامی زیادبوونی گرنگی کوێستان و خاك لەنێوانیان دەردەکەوێت، یاخود لەئەنجامی ئەو بەرخودان و دژە هێرشانە دێتە ئاراوە کە بەرامبەر هێزەکانی شارستانییەت نیشانی دەدەن. بۆ درێژەدان بەژیان پێویستە عەشیرەت بەهێز بێت. لەنێو خێڵیشدا پێویستە تیرە و بنەماڵەکان بەهێز بێت. بەڵێ ئەم واقیعە ماددییەیە کە هزری نوێی هێناوەتە ئاراوە. ئەوەی تاوەکو ئێستا لەچەندین کۆمەڵگادا بەهێز و کاریگەرە لە**"داستان و چیرۆکەکان"** بۆتە زمانی شیعر و چیرۆکەکانیان. قارەمانێتییەکانی شەڕی عەشیرەتی بێ کۆتایی و بەرخودان بەرامبەر هێرشەکانی دەرەوەدا لەمێژووی هەموو گەلێکدا جێگایەکی گرنگی گرتووە. گرێدراو بەهەلومەرجی گروپە کۆمەڵایەتییەکانی هەر پێکهاتەیەکی ئەتنیکی ئەم مێژووە، بەبێ ئەوەی گرنگییەکەی کەم بێتەوە مۆرکی خۆی لە چەرخەکانی ناوین و نزیکەکان داوە ـ واتە مۆرکی خۆی لە قۆناخی قەوم و نەتەوەکان داوە ـ ٤ هەزار ساڵ پ.ز لە ئاکامی پێشکەوتنی وشیاری عەشیرەتی، هەم هێرشەکانی هێزە جیاوازەکانی دەوڵەت و هەم عەشیرەتە خزم و دراوسێکان، هێزی پێکهاتەی ئەتنیکی رۆژهەڵاتی ناوینی هێناوەتە ئاراوە. ئەو راستینە مێژووییەی تا ئەم رادەیە بناخەی بەهێزبوون و لەسەر پێ مانەوەی ئەم پێکهاتانەیە لە رۆژهەڵاتی ناویندا، ئەم تایبەتمەندێتییە. هەروەکو بڵێی هەر گروپێکی ـ عەشیرەتێك، نەتەوەیەکە خانەدانێکە، تەنانەت لەلایەنی هزردا وەکو ئایینێکن و لە بواری یەك زاراوەییدا خاوەنی زمانێکە. شانبەشانی لاوازی شۆڤینیزمی نەتەوەیی بەهێزبوونی شۆڤێنیزمی عەشیرەتیش ـ هزر و سۆزداری ـ سەرچاوەی خۆی لەم راستینەوە وەردەگرێت.

کاتێك لە بواری هەڵوێستی سەبارەت بە شێواز و وەکو زانیاریەکی پێویستی لەپێشینە تەماشا بکرێت، ئەوا دەبینین کە رۆژهەڵاتی ناوین لە ٢ هەزار ساڵ پ.ز تاوەکو سەدەی پێنجەمی پ.ز رۆڵێکی گرنگ و دیاریکراوی بینیوە لەپێگەیشتنی کۆمەڵگای کۆیلەداری و بوونی بە سیستەمێکی دونیا. تەنیا رۆڵی پێشەنگایەتی لە بواری ئاواکردن و بەدەزگاکردنی سۆمەر و میسر نییە. لەقۆناخی کامڵ بوون و پێگەیشتنیدا مسۆگەر پێشەنگایەتی لەجوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوینە. بەرلەوەی ئەم بابەتە هەڵسەنگێنین با تەماشایەکی ئەو پێشکەوتنە شارستانیانە بکەین کە لەسەردەمی یەکەمین شەپۆلی بڵاو بوونەوە هاتۆتە ئاراوە.

ـ **هیتیتەکان:** وەکو ئەنجامێکی پەلهاوێشتنەکانی کۆلۆنییەکانی سۆمەریەکان کە لە ناوچەکانی ئاسیای بچووك لە ناوەوەی ئەنادۆڵ پێشکەوت، شارستانیەتێکە لە ماوەی ١٩٠٠ تا ١٢٠٠ پ.ز حوکمی کردووە و مۆدێلی سۆمەری بەبنەما گرتووە. بە ئەندازەی ئەوەی ناوەندێکی گرنگی بازرگانییە، ئەوا پشت بەو توانستە دەبەستێت کە لە رێگای هەبوونی سەرچاوەیەکی زۆری کانزا، بەدەستی هێناوە و بەرەنگاری بابلی و ئاشووری و میسریەکانیش دەبێتەوە. لە ساڵی ١٥٩٥ پ.ز بابلی داگیر کردووە، لە ١٢٤٣ پ.ز پەیمانی کادەشی لەگەڵ میسریەکان ئیمزا کردووە. سەرەتا بە شێوەی کۆنفدراسیۆنی عەشیرەتەکان بوو، دوایی بۆتە خاوەنی پێکهاتەیەکی ناوەندی کۆیلایەتی. هەنگاونان و بوونی ئەنادۆڵ بەشوێنی شارستانییەت، بە رادەیەکی مەزن شوێنەواری سیستەمی هیتیتەکانە. ئەو گروپە ئەتنیکیانەی لەخۆوەی گرتووە لە باکووری رۆژهەڵاتدا **خالیدییەکان** (باپیرانی ئەرمەنیەکان)، لە باشووری رۆژهەڵات **هۆریەکان** (باپیرانی کوردەکان)، لە باشوور و رۆژئاوای ئەنادۆڵیش لەوییەکان. هەرسێ گروپە ئەتنیکیەکەش خاوەنی پێکهاتەی کولتووری و زمانی ئاریانین. پاوانخوازی لەسەر سەرچاوەکانی کانزا گەوهەری هێز پێك دێنێت. چەمکی پاراستنیان، پاراستنی سەرچاوەکانی کانزا بە بنەما دەگرێت. بابلی و میسر و تەنانەت ئیمپراتۆری **"هێلینی"** تازە پێگەیشتوو، بەهۆی ئەوەی پێویستییەکی یەکجار زۆریان بە گەوهەری کانزا هەیە، بەردەوام لەگەڵ کۆنفیدراسیۆنی ئیۆن و میتانی لەنێو شەڕدان. بە تایبەتیش ئەو پێشکەوتنانەی لەبواری زیو و ئاسنەوە دێتە ئاراوە کە باب و باپیرانی ئەرمەنیەکان بەکاریدێنن، گرنگترین دەسکەوتە کە بۆ شارستانییەت زیاد کراوە و بەرهەم هێنراوە. لێرەدا پێکهاتەی سێکوچکەیی خوداوەندی بە بنەما دەگیردرێت، ئەویش نوێنەرایەتی هێزی ئاسمان، زەوی و خاك دەکات و پشت بە میتۆلۆژیای سۆمەریەکان و گروپە ئەتنیکیەکان دەبەستێت. پێکهاتەی میتۆلۆژیا لەسەرەتا پشتی بە فرەخوداوەندی دەبەست، بەڵام لەگەڵ پەرەسەندنی پادشایەتی ناوەندی ژمارە کەم دەبێتەوە و هەروەکو لەنموونەی سۆمەریەکان دەردەکەوێت، دادەکەوێتە ژێر تا دەگات ئەو پێکهاتە سێ گۆشەییەی گوزارشت لەرێککەوتن دەکات. هێشتا بەچەمکی یەك خواوەندی نەگەیشتوون. شەڕی خوداوەندەکان بۆ ماوەیەکی درێژتر دەخایەنێ. لەمیانەی رێککەوتنیشدا هێشتا شوێنگەی خوداوەندی ژن بەهێزە. بەڵام لەمێژە رۆڵی یەکەمینی لەدەستداوە و پێ بەپێ گرنگی خۆی لەدەست دەدات. دەتوانرێت ئەمە بەکولتووری خوداوەندی ژن **کیبەلە** (کوپاپا) ناوزەد بکرێت.

هەروەکو چۆن لە ئاوا کردنی رۆما پێویستیان پێی هەبوو، ئەوا چەمکی ئاراستەی نوێژکردن، کە لە عەرەبستان بە قیبلە ناوزەد دەکرێت، پاشماوە و شوێن پەنچەی گرێدان بەم خوداوەندە ژنەیە. هەروەکو چۆن شارستانییەتی سۆمەری شارستانییەتی هیتیتی ئەنادۆڵی دیاریکردووە، ئەوا شارستانییەتی هیتیت لە رێگای ئییۆنای رۆژئاوای ئیگە و بەشێوەیەکی سەرەکیش لەمیانەی گەرووی چانەقەلا و لە رێگای شارەکانی تەروادە، کاریگەری لەسەر شارستانییەتی یۆنان کردووە. لەم چوارچێوەیەشدا بە پشت بەستن بە تەروادە **"سەردەمی قارەمانێتی"** رۆڵێکی مەزن دەبینێ. گرنگی و رۆڵی مێژوویی تەروادە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە تاوەکو ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز پایگەیەکی لەپێشی هیتیتەکان و بە گشتی دەرگای سەرەکی و ناوەندی بڵاوبوونەوەی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین بوو. هەروەکو چۆن کانەش دەرگای گواستنەوەی شارستانییەتی میزۆپۆتامیایە بۆ ئەنادۆڵ، ئەوا تروداە رۆڵی ئەو پرد و ناوەندە

گرنگە دەبینێ کە شارستانییەت بەرەو بەڵکان و نیمچە دورگەی یۆنان و تەنانەت بەرەو ئەوروپا دەگوازێتەوە. بەناوبانگی "**ئیلیادە**"ی **هۆمیرۆس** کە بەشێکی گرنگی شەڕەکانی تەروادەی خستۆتە ناوەندی چیرۆکەکەیەوە، بۆ ئەم رۆڵەی دەگەڕێتەوە کە مێژوو و شارستانییەت بۆ ئەوروپا دەگوازێتەوە. کەوتنی تەروادە (دۆڕاندنی شەڕ) واتای دەستپێکردنی سەرەتایەکی نوێی مێژووە.

**٢ـ هۆریەکان، گۆتیەکان، میتانیەکان، ئورارتوو و مادەکان:** هەبوونی سەرچاوەی دەوڵەمەندی کانزا لە میزۆپۆتامیای سەروو و ناوین کە دەکەوێتە نێوان ئیمپراتۆرییەتی هیتیت و ئیمراپۆرییەتەکانی بابلی ـ ئاشووری و خاڵی دەربازبوونە بەرەو رۆژهەڵات و رۆژئاوا و هەروەها خاوەنی بەرهەمدارترین گۆڕەپانی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵە و خاوەنی کەش و هەوایەکی وەهایە کە ئاودێریەکەی سروشتییە، ئەمەش وایکردووە خاوەنی رۆڵی "**دایکی زایینی**" مێژوو و لانکەی بەخێوکردنی بێت.

لەهەمانکاتدا ئەم تایبەتمەندێتیە بۆتە هۆکاری ئەوەی لەهەر چوار لاوە هێرشی بکرێتە سەر و ببێتە گۆڕەپانی تالانکاری و داگیرکاری. سەرەڕای ئەوەی شوێنێکی سەرەکی لەدایک بوونی شارستانییەتە، هاوکات بە خاوەن نەبوونی پێکهاتەی ناوەندی و دەزگای هەمیشەیی و جێگیر لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم تایبەتمەندێتیەیەتی. لە رەوشی ناوچەیەکی پشتێنەی دەرباز بوون رزگاری نەبووە. تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان شارستانییەتێك نییە کە لەلایەن ئەم ناوچەیە تێر و بەخێو نەکرابێت. ئەم تایبەتمەندێتیە هۆکاری ئەمە روون دەکاتەوە کە لەرۆژگاری ئەمرۆماندا ناهێڵن تەنانەت وەکو دەنگی ئاژەڵیش بە شێوەیەکی ئازادانە زمانی خۆی بەکار بێنێ.

بەر لە ٦٠٠٠ ساڵ پ.ز پێکهاتەی ئەتنیکی ئەم ناوچەیە دەناسرێت. ناوەندەکانی شۆڕشی کشتوکاڵی لە خاڵ و شوێنی بە یەکگەیشتنی دەشت و ئەو چیایانەی لەگەڵ لقەکانی دیجلە ـ فورات درێژ دەبنەوە. ئەو لێگەڕین و شوێن هەڵکەندنانەی دەرهەق بە سەدان گرد ئەنجامدراوە مسۆگەر ئەم رەوشە دەسەلمێنێ. لەمیانەی لێگەڕینە ئەتیمۆلۆژی و ئەرکۆلۆژییەکان سەلمێنراوە کە بنەماکانی زمانی گروپی هیندۆ ـ ئەوروپی لە ناوەندەکانی ئەم گوندە کشتوکاڵیانە پێکهاتووە. کاتێك بوونی بە ناوەندی پێشکەوتنەکان، لەگەڵ تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی ناوچەکە یەکانگیر بێتەوە، ئەم رەوشە وایکردووە سیستەمی تیرە و خێڵەکان بە شێوەی پێکهاتەی زۆر بەهێز شێوە بگرێت. کاتێك ئەم تایبەتمەندێتیانەی پێکهاتە ئەتنیکیەکان لەگەڵ جموجۆڵ و پەلهاوێشتنی هێزەکانی شارستانییەت یەکانگیر بێت، کە بە ئامانجی تالان و داگیرکاری بوو، ئەمە دەرفەت بەوە نادات وەکو ناوچەیەکی شارستانییەت ببێتە ناوەندێك.

لەژێر رۆشنایی ئەم نزیکبوونەوەدا دەردەکەوێت کە عەشیرەکانی لەژێر ناوی "**هۆری**"ن و لە یەك دەچن و پەیوەندی خزمایەتیان هەیە لەماوەی ٢٠٠٠ تا ١٥٠٠ پ.ز کۆنفدرسیۆنێکیان پێکهێناوە، بەڵام نەیانتوانیوە ببن بە ناوەندێك و بە ئەندازەی هیتیتەکان پێشکەوتن بەدی بێنن. هوریەکان بەردەوام لەگەڵ هیتیتەکان و گروپە ئەتنیکیەکانی لوویی و خالیدی لە پەیوەندیدا بووە، کە بنەما کۆمەڵایەتییەکانی پێکهێنابوو، لە رێگای بازرگانییەوە رۆڵی یەکەم ئەڵقەی گواستنەوەی کاریگەریەکانی سۆمەر و بابل و ئاشوور دەگێڕن بەرەو باکوور و رۆژهەڵات. بەهۆی ئەوەی دراوسێی شارستانییەتی سۆمەر و خاوەنی قۆناخی نئۆلیتیکن، خزمایەتییەکی نزیکیان لە نێواندا هەیە. لە چەندین وشە و پێکهاتەی زماندا هاوبەشێتی جێگای باسە. تێڕوانینێکی پەسندکراوی بەمجۆرە هەیە کە ئەمەش لەقۆناخێکی یەکجار زووە و دواتر لە سەردەمی ئاوا کردنی سۆمەردا پێشدەکەوێت. لە بوارێکەوە ناوچەکانی شارە سۆمەریەکان و ناوچە کشتوکاڵییەکانی هۆریەکان لەنێو رەوشی رێکەوتنێکی سروشتیدا ژیاون. لە میتۆلۆژیای خوداوەندی ژن **ئینانا** و داستانی **گلگامێش** بە شێوەیەکی بەهێز راستی شوێن پەنجەی ئەم راستینەیە دێن. واتە سۆمەر ناوەندی شارستانییەتی هوریەکانە. پێویستی ئەوە نابینێت ناوەندێکی جیاوازی شارستانییەت ئاوا بکات. چونکە چەمکێکی بەمجۆرە تا دواڕادە بەهێزە کە دەڵێ: لەکاتێکدا ناوەندێك لە تەنیشتمانە و پێویستییەکانمان جێبەجێدەکات، پێویستی ئاواکردنی یەکێکی نوێ ناکات. شوێن پەنجەکانی ئەم چەمکە بەشێوەیەکی زۆر بەهێز تارۆژگاری ئەمرۆمان هاتووە و بەردەوامە. ئەو رۆڵەی بینراوە بەواتای هەرێم و ئۆتۆنۆمی و فیدراسیۆنی ئەو هێزە سیاسیانەیە، کە لە تەنیشتیان بەسەنتەر بوونە. لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە ئەوەی لە رۆژگاری ئەمرۆماندا لەم ناوچەیە لەئارادیە و رووددەدات، بناخەکەی بۆ راستینەی ساڵانی سەرەتاکانی مێژوو دەگەڕێتەوە.

گۆتیەکان گروپێکی دیکەی ئەتنیکی بەرەچەڵەك ئاریانە و بە شێوەیەکی زیاتر لەرۆژهەڵاتی سۆمەریەکان لەبنارەکانی زنجیرە چیای زاگرۆس دەژیان. لەو قۆناخەی کە دەوڵەتی ـ شاری سۆمەریەکان دووسەرە بوون، وەکو هاوپەیمانی لایەنێك جوڵاونەتەوە. ئەو رێککەوتنەی لەگەڵ بەشێکی بەڕێوەبەرانی دەوڵەتی ـ شاری سۆمەری ئەنجام دراوە، رۆڵێکی سەرەکی بینیوە لەڕووخانی خانەدانی ئەکەدی سامی. تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆشمان مێژوو دەبێتە شایەدی رێککەوتنی بەمجۆرە. واتای وشەی گۆتی "Gud = Ga, Gameş" وشەی "گا ـ Ga" رۆژگاری ئەمرۆمان بە واتای گەلی خاوەن رەشەوڵاخ دێت. بەردەوام پێکهاتەی زمانی سۆمەریەکانی بەمجۆرە لەئارادایە کە زاراوەکان بەم شێوازە بەکار دێنن.

خانەدانی گۆتی لە دەوروبەری ساڵانی ٢٢٥٠ تا ٢١٥٠ پ.ز حوکمڕانێکی خانەدانی سەدساڵەیان ئاوا کردووە. ئەم خانەدانە حوکمڕانی لەسەر خاکی سۆمەریەکان بەڕێوە بردووە. ماوەیەك دوای ئەوە، کاتێك بەشێکی بەڕێوەبەرایەتی شارە سۆمەریەکان رێککەوتنیان لەگەڵ گروپە ئامۆریتەکانی بە رەچەڵەك سامیەکان بەست، ئەم خانەدانەیان رووخاند و دەربەدەریان کردن (وشەی ئامۆریت کە سۆمەریە بەواتای رۆژئاواییەکان دێت).

کاسیتەکان (کاسیەکان) ئەو توێژە هەژار و رەش و رووتانە بوون کە لە شارەکانی سۆمەریەکان دەژیان و زۆربەیان لە ناوچە شاخاوییەکانی باکوور و رۆژهەڵاتەوە هاتبوون. ناوە ناوە هێزەکانی خۆیان کردووە بە یەك و رۆڵێکی گرنگیان لەگۆڕینی خانەداندا بینیوە. لەکاتی داگیرکردنی بابل لەلایەنی میتانی و هیتیتەکان لە ١٥٩٥ پ.ز، دەشێ باسی رۆڵی کاسیتەکانیش بکرێت. لەبوارەکانی کولتوور و بیروکراسییەتدا رەوتێکی بەگوێرەی خۆیان ئاوا کردووە. لەسەردەمی ئیمپراتۆرییەتی عەبباسی لەو وەزیرە بەرەچەڵەك ئێرانیانەی بەرمەکیەکان و لەسەردەمی ئیمپراتۆرییەتی سەلجۆقیش لە نموونەی وەزیرێتی "**نظام الملك**" شوێن پەنجەی ئەم راستینەیە دەبینرێت. ئەم شێوازەی بیروکراسییەت تاوەکو سەردەمی کاسیتەکان درێژ دەبێتەوە. میتانیەکان، لەدوای ئەزموونی کۆنفدراسیۆنی هوری ئاواکرا و لە رەوشی فیدارسیۆنێکی بەهێزدایە. لەو تابلێتانەی دۆزراونەتەوە روون دەبێتەوە کە لەو شوێنەی رووباری خابووری لێ هەڵدەقوڵێ، خاوەنی شارێکە بەناوی "**واژوکانی.**" گروپە زمانی هوری بەکاردێنن، بەشێوەیەکی زیاتر لەمیزۆپۆتامیای ناوین لە ناوچەکانی ئورفا، ماردین و شرناخی رۆژگاری ئەمرۆمان حوکمڕانیان کردووە. لە ماوەی نێوان ١٥٠٠ تا ١٢٥٠ پ.ز لەئارادا بووە. ئاسنی خستۆتە ژێر رکێفی خۆیەوە. لە بەخێوکردن و پێگەیشتنی ئەسپ بە ناوبانگن. لەگەڵ ئاشووری و هیتیتەکان بەردەوام لەنێو رەوش و هەلومەرجی پێکدادانێکی دژواردا بووە. هەرە دوایی لەلایەنی ئیمپراتۆری ئاشووری "**سەلماناسار**" بە شێوەیەکی کاتی کۆتایی بەهەبوونی هاتووە.

**ئورارتوو** (بە سۆمەری واتای وڵاتی شوێنە بەرزەکانە) پارچەیەکی گرنگی شارستانییەتە کە لەلێواری دەریاچەی وان بەسەنتەر بووە. پشت بە گروپە ئەتنیکیەکانی خالیدی و هۆری دەبەستێت. بەپێی دەربازبوونی کات خالیدییەکان تێیدا بە کاریگەر بوون. شیمانەی هەرە لەپێش ئەوەیە خالیدییەکان باپیرەگەورەی ئەرمەنیەکان بن. بە شێوەیەکی زیاتر لە ناوچەکانی باکووری دەوڵەتدا دەژیان. ئەوە دەبینرێ کە پشتیان بە سەدان خێڵی بەرەچەڵەك هوری بەستووە، فیدراسیۆنە لاوازەکەی سەرەتایان بەهێز کردووە تاوەکو کردوویانە بەدەوڵەتێکی ناوەندی. لە ماوەی نێوان ١٠٠٠ تا ٧٠٠ پ.ز ژیاون. هەر لەبەر ئەوەی خاوەنی سەرچاوەکانی کانزا و ناوەندی تەختە و بەخێوکردنی ئەسپ بوون دووچاری هێرشە دژوارەکانی ئاشووریەکان هاتن. پادشا ئاشووریەکانی خاوەنی هێزێکی چەکداری بە تەکنیکی ئەو سەردەمە بوون و هەروەکو چۆن نەیاندەهێشت هیچ گەلێك ئۆقرە بگرێت، هەروەها لەبەر ئەوەی یەکەمین هێزبوون لەبەرامبەریاندا بەرخودان بکەن، هەربۆیە بە شێوەیەکی سەرتاپایی خالیدییەکان بوونە ئامانجی هێرشە نەبڕاوەکانیان. بۆ یەکەمجار لەمێژوودا درێژترین جۆگەلەی ئاوەڕۆیان دروست کردووە (بە درێژایی ٥٦ کم) و وەستایەتی دروستکردنی بەنداویان نیشانداوە. زمانی چینی هەڵبژاردە تێکەڵاوە. مەتنە پیرۆزەکانی سۆمەریەکان لە سیستەمی قۆنابخانەدا

دەخوێنن. زمانی ئاشووری جێگای خۆی لەنێو زمانی دەوڵەتدا دەگرێت. هەروەکو لە هەموو شوێنێك بەمجۆرەیە، پێکهاتەی زمان و کولتووری شارستانیەتی سۆمەری بە گرانی کاریگەری خۆی بەردەوام دەکات. زمانی عەشیرەتەکان جیاوازە و نەبۆتە بابەتی نووسین. ئەم مەسەلەیەش یەکێك لەو راستینانەی ناوچەکەیە کە تا رۆژگاری ئەمڕۆشمان بەردەوامە.

لە کاتێکدا بەڕێوەبەرە باڵادەست و نۆکەرەکانیان خاوەنی زمان و کولتووری زاڵ و باڵادەست بوون، ئەوا عەشیرەتەکان خاوەنی زمان و کولتووری گەلی خۆجێی بوو.

ماوەیەکی کورت دوای ئورارتوویەکان ئەمجارە لە رۆژهەڵات وەکو بەردەوامی گۆتیەکان، فیدراسیۆنی عەشیرەتەکانی مادی بەرەچەڵەك ئاریان رێککەوتن لەگەڵ بابلیەکان دەبەستن و لە ساڵانی ٦٢٥ پ.ز ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری دەرووخێنن. جارێکی دیکە بابل بۆ جاری دوایی باڵادەست دەبێت. فیدراسیۆنی سست و لاوازی میدیەکان بۆ خانەدانی ئەخمینیەکانی بەرەچەڵەك ئاریان ـ پارسن و تازە هەڵدەکشێن رۆڵی دەربازبوون (پرد) دەبینن. لەمیانەی کودەتای **"کیرۆس"**ی خوشکەزای پادشای ماد **"ئەستیاك"** دەسەڵاتی سیاسی بۆ یەکەمین جار دەکەوێتە دەستی ئەرۆستۆکراتەکانی پارسەکان کە لە رۆژئاوای باشووری ئێران چڕبوونەتەوە و دوای ماوەیەکی کورت لە دەوروبەری ساڵانی ٥٥٠ پ. ز بەدامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتێکی بەهێزی پارس ئەنجامگیر دەبێت.

**٣ـ شارستانییەت لە رۆژهەڵاتی دەریای سپی؛** ئەو ناوچەیەی بەر لەهەموو شوێنێکی دیکە کاریگەری هەردوو سیستەمی سۆمەر و میسری کراوەتە سەر.

لێرەدا بناخەی مەزۆلیتیك و نئۆلیتیك بەهێزە. جێگای خۆی لەرۆژئاوای بە پیت دەگرێت. لە ساڵانی ٤٠٠٠ پ.ز بەدواوە چڕبوونەوەی تیرە سامیەکان دەبینرێت. سەرچاوەی دەوڵەمەندی کە هەم میسریەکان و هەم سۆمەریەکان پێویستیان پێیەتی دارستانەکانی داری ئەرزە لە لوبنان. لە سێ گۆشەی میسر، ئەنادۆڵ و گریت دەتوانێ رێگای گواستنەوەی دەریایی بەکاربێنێ. خاوەنی زەویەکی کشتوکاڵی بەپیتە. هەر لەبەر ئەوەی جێگای کەوتۆتە سێ گۆشەی ئەنادۆڵ، میزۆپۆتامیا و میسر، بۆیە شوێنەکەی هەم بۆ بازرگانی رێگای دەریا، هەم بۆ بازرگانی رێگای وشکانی گونجاوە. فینیقی وەکو شارستانییەتی چینی بازرگان بەرئەندامی پێشکەوتنە. ئەمانە هەلومەرجە سەرەکی و دیاردەکانی ئافراندنی شارستانییەتی مێژوویی فینیقیەکانە. ناوە گشتییەکەی وڵاتی کەنعانیەکانی پێدەگوترێت.

هەروەکو کۆلۆنی کاناش لە ئەنادۆڵ، شارستانییەتی فینیقی پشت بەو کۆلۆنیانە دەبەستێت کە لە شارەکان، لەسەرووی هەمووشیانەوە لە بیبلۆس، تیر و لە باکوریش لەشاری ئۆگاریت، ئاواکران. کۆلۆنیەکانی ئەم ناوچەیە لەگروپی ئەتنیکی تێکەڵاو پێکهاتوون. هەروەکو لەلوبنانی رۆژگاری ئەمڕۆماندا دەبینین، ئەوا هەر لەسەرەتاوە کولتوورێکی تێکەڵاو زاڵە. بەڵام لەنموونەی فینیقیەکاندا تایبەتی بوونێك لەئارادایە. بەگشتی خەریکی بازرگانین و بەتایبەتیش لە بازرگانێتی دەریای سپیدا وەکو قەومێکی دەریایی چاونەترس و لێهاتوو دەناسرێن. لە سەرەتاکانی ٢٠٠٠ پ.ز بوونەتە خاوەنی نیمچە دەوڵەتی ـ شاری تایبەت بەخۆیان. ئەم دەوڵەتە کە چواردەورەی بە سور (دیوار) ئابلۆقە دراوە بەگرانی خەریکی بازرگانین و بە پلەی دووەمیش پیشەکاری، بە تایبەتیش لە بواری دارتاشییەوە گەشەیان کردووە. کەشتی و کەشتیوانی فینقییەکان بەناوبانگە. تەنانەت لەقۆناخەکانی ئاواکردندا لەگەلێك ناوچەی کەنارەکانی دەریای سپیدا کۆلۆنی پابەند بەخۆیان ئاواکردووە. گرنگترین دەسکەوتەکانی بۆ مێژوو ئەلف و بێی فینیقییە. زۆربەی زۆری ئەم ئەلف و بێیانەی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بەکار دەهێنرێن، ئەم ئەلف و بێیە بنەما و نموونەی سەرەتاییان پێکدێنێ. لەگەڵ ئەوەی بەشێوەیەکی سەرەکی ئەفسانەی سۆمەریەکان کاریگەری کردۆتە سەر، ئەوا تایبەتبوونێکی جێگای بایەخیان هەیە. مەزنترین خوداوەندیان **"ئەل"**ە (الله لێرەوە هاتووە). لەژێر ئەویشیانەوە خوداوەندی هێز **بال** و خوداوەندی مردن **مۆد** (MOD) هەن. عەشتار بەناوی ئاستارتا لەئارادایە. بەشێوەیەکی بەربڵاو منداڵان وەکو قوربانی پێشکەش دەکەن. ئەفسانەی قوربانیکردنی ئیسماعیل لەلایەن حەزرەتی ئیبراهیمەوە گرێدراوی ئەم داب و نەریتەیە.

لە دوای میسری و سۆمەریەکان، کولتووری فینیقیەکانیش لەمیانەی پەسندکردنی یەکتر لەگەڵ یۆنان، رۆما، بێزەنت و ئیسلامییەکان و پاراستنی رەسەنایەتی خۆی، کاریگەرییەکانی تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمانی هێناوە. تایبەتمەندێتیەکانی شارستانییەتی فینیقی لەژێر کولتووری علمانی لوبناندا شاراوەیە. بەئەندازەی ئەوەی خاوەنی رۆڵێکی گرنگە لە پێکهاتەی شارستانییەتی قەرتاجە و یۆنانی لە مێژوودا، ئەوەی بە رادەیەکی هەرە زێدە کولتووری یۆنانەکانی تێر کردووە، فینیقیەکانن. دیسان فینیقیەکان رۆڵێکی دیاریکراویان هەبووە لە گواستنەوەی ئەفسانە و ئەلف و بێی رۆژهەڵاتی ناوین بۆ یۆنان (گریك).

لە ناوچەکانی ناوەوەی رۆژهەڵاتی دەریای سپی، لەسەرووی هەمووشیانەوە لەشاری وەکو قودس، شام، حەلەب، دووەمین قۆناخی دروستکردنی شار دەستپێدەکات. ئەم باژێڕانەی پشت بە بازرگانی دەبەستن، لەنێوان میزۆپۆتامیا، دەریای سپی، ئەنادۆڵا و نیمچە دورگەی عەرەب وەکو ناوەندی بازرگانی بەرز دەبێتەوە، هەروەها دەوروبەرە نزیکەکانیش بڵێی بۆ کشتوکاڵ لەبارە. ئەم شەپۆلەی شارستانییەت چەندین کاروانی مێژوویی بەخۆوە بینیوە. وەکو ناوەندی گواستنەوە و پەسندکردنی کولتوورەکان خاوەنی جێگایەکی دیار و بەرچاوە. بە شێوەیەکی زیاتر پێکهاتەی زمانی تیرە سامیەکان زاڵە. ناسین و دانان بە پێکهاتەیەکی هەمەڕەنگی کولتووری لە سایەی ئەم هەلومەرجە گونجاو و لەبارەیەتی. هەروەکو چۆن لەساڵانی ١٥٠٠ پ. ز لە رۆژهەڵاتی ناویندا بەگشتی بەمجۆرە بوو، ئەوا لەم سەردەمەشدا جوڵانەوەی بە شارستانی بوون بە شێوەی نیمچە دەوڵەتەکانی ـ شار لەقۆناخی هەرە بەرزدایە. بەهۆی هەلومەرجی جوگرافیەوە دەسەڵاتی هیچ یەك لەبابلی، ئاشووری، هیتیتەکان **(الحیثیین)** و میسریەکانیان نەناسیوە. تا رادەیەك لەسایەی دیپلۆماسیەتەوە توانیویانە لەنێو هەرسێ ناوەند یاری بکەن و درێژە بەسەربەخۆی خۆیان بدەن. هەر تیرەیەکی تەنگەتاو بوویێت، بەهۆی ئەم تایبەتمەندێتیەیەوە بۆ ئەم ناوچەیە چوون. تا رادەیەك توانیویانە رەسەنایەتی و ئازادی خۆیان بپارێزن.

یەکێك لەو تیرانەی لە ئەنجامی گەوهەرێکی بەمجۆرە، لە لایەن حەزرەتی ئیبراهیمەوە بۆ ئەم ناوچەیە گواستراپەوە و رۆڵی گرنگ لە مێژوودا دەبینێ، تیرەی عیبرانیەکانە. لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ریشەی عیبرانیەکان لە ئورفا **(ئور = تەپە، لوتکە)** و حەران (بە سۆمەری = دەروازەی چوار رێگا)ی رۆژگاری ئەمڕۆمان دێت، کە ئەو کاتە وەکو کۆلۆنی سۆمەریەکان بەکار دەهێنرا. کاریگەری هۆریت و ئامۆریت هەردووکیان بە یەکەوە لەم ناوچەیەدا دەبینرێت. شوێن پەنجەی ئەم تایبەتمەندێتیانە لەکولتووری عیبرانیەکاندا دەبینرێت. ئەم موغامەرەیە شیمانە دەکرێت لەساڵانی ١٨٠٠ پ.ز لەسەردەمی پادشای بابلی حامورابی روویدابێ، لە بەسەرهاتی ئەم تیرەیە دەچێت کە بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ نەمروودی پادشای شارێك تێکدەچێت. کاتێك توانستەکانی نیشتەجێ بوون لەناوەندی ئەم شارانەدا سنووردار بوو کە فشار تێیدا توند بوو، لە لایەکی دیکەش لەبەرئەوەی جێگای خۆیان لەهێڵێکی بازرگانیدا دەگرت، ئەوا جوڵانەوەی بەمجۆرەی تیرەکان زۆر دەبێت و دەشێ ببینرێت. لە دۆکۆمێنت و بەڵگەکانی ئۆگاریت دەرهەق بەم سەردەمە، هەروەکو کۆچی حەزرەتی ئیبراهیم لە باکوورەوە بۆ باشوور، جوڵانەوەی بەمجۆرەی گەلێك تیرەی بازرگان جێگای باسە. ئەم تیرانەی کە بازرگانی و شوانکاری نیوەچڵ بوون بە شێوەی نیو رەوەندی ـ نیو جێگیری لەنێو جموجۆڵێکی بەردەوامدا بوونە. شیمانەیەکی بەهێزی بەمجۆرە هەیە کە حەزرەتی ئیبراهیم کاریگەری کولتووری شاری ئوری سۆمەریەکانی کراوەتە سەر و پێکهاتە فرەخوداوەندییەکەیانی ناسیوە و وەکو سەرۆکی تیرەیەکی باوکسالاری لەمیانەی بە بەبنەماگرتنی تەوتەمی خۆی و یەکانگیرکردنی لەگەڵ ئەو لایەنانەی لە کولتووری ئایین و خوداوەندی قۆناخ وەریگرتووە، بەزاراوەی خوداوەندی یەك تیرە گەیشتووە.

بەرزکردنەوەی تەوتەمی تیرەکەی بۆ ئاستی خوداوەند و بەکارهێنانی ئازادی تیرەکەی وەکو زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی وەرچەرخانی بەرەو تاکخودایی، هەروەکو چۆن گەورەترین شۆڕشگێڕێتی حەزرەتی ئیبراهیم لەبواری ئایینەوە دەردەخات، هاوکات گەوهەری ئەم وەرچەرخانەش نیشان دەدات. وەکو ئەنجامێکی کاردانەوە لە سیستەمی سۆمەریەکان دابڕاوە. بێگومان چەندین تیرەی ئامۆریت بەردەوام لەنێو ئەم کاردانەوەیەدا ژیاوە، لەگەڵ ئەمەشدا تەوتەمی تیرە سەرەتاییەکان وەڵامی پێویستییە ئایینیەکانی قۆناخ ناداتەوە. ئەمە مۆدێلێکە پێویستە بەلاوە بنرێت. ئەم هەلومەرجە مێژووییە، دوو لایەنە بناخەی ئایینی ئیبراهیم پێکدێنێت. وەکو هەنگاوێکی بچووك و بێ بایەخ دیار دەبێ، بەڵام لەلایەنی مێژووییەوە رۆڵی گەورەترین

شۆڕشی ئایدیۆلۆژی بینیوە. نازناوی پێغەمبەر و باپیر و دامەزرێنەری ئایینی تاکخودایی لەخۆڕا نییە کە لە هەرسێ پەرتووکی پیرۆزدا (تەورات، ئینجیل و قورئان) باسی لێوە دەکرێت، بەڵکو بەهۆی ئەم ڕۆڵە ستراتیژییەیە کە گێڕاویەتی. ئیتر بە گوێرەی قۆناخی شارستانییەتی پێگەیشتوو، ئایینە فرەخوداییەکان، خەیاڵ و ناسنامەی پاشکەوتوون. ئەم شۆڕشە ئایدیۆلۆژیایەی کە خوداکەی نادیارە و ناکرێت بە بت، باشتر خزمەتی یەکێتی سیاسیانە دەکات و گوزراشت لە لۆژیك و پێشکەوتنی پێکهاتەی هزری مرۆڤ دەکات و پێشکەوتووخوازترین و باشترین وەڵامە کە لەکاتی خۆیدا دەرهەق بە قۆناخێکی مێژوویی دراوەتەوە.

ئەوەی لە داب و نەریتی حەزرەتی ئیبراهیم دا دەبینرێت، واتە دەست بەردانی لە بە قوربانیکردنی کوڕەکەی ئیسماعیل، کردەوەیەکە گەوهەری شۆڕشێك لەخۆوە دەگرێت. بەگوێرەی باوەڕی فینیقیەکان پێشکەشکردنی منداڵەکان وەکو قوربانی بۆ خوداوەند **بال**، عیبادەتێکی بەربڵاوی ئایینیە. تەنیا دەتوانن بەمجۆرە ڕێ لەکارەسات و خراپیە مەزنەکان بگرن. هەڵوێست نیشاندان بەرامبەر ئەو داب و نەریتە بەربڵاوە کە هەم زۆر دڕندانەیە و هەم ناچارییە، بەگوێرەی هەلومەرجەکانی ئەم قۆناخە وەکو شۆڕشێکی ئایینیە. ڕێگرتن لەبەقوربانی کردنی منداڵان، بوویەرێکی ئاسایی نییە و بەرامبەر بە سەرەتاییترین فەناتیزمی ئایینی، کە سەرەتاییە و بەربڵاو و ریشەییە، وەکو چالاکی وشیاربوونەوەی ویژدانی مرۆڤ، بەهایەکی مەزنی هەیە. ئەمە بەرامبەر بە پاشڤەڕۆیەتی چالاکیەکی مەزن و پڕ واتادارە. هەروەکو دیارە حەزرەتی ئیبراهیم تەنیا بە پێشخستنی ئەم دوو شۆڕشە ناوەستێ. واتە تەنیا بە ڕەتکردنەوە و هەڵوێست نیشاندان بەرامبەر پەرستنی بتە سەرەتاییەکان و بەقوربانی کردنی منداڵان ناوەستێ. "**ئەل**"ی کەنعانیەکان وەکو "**ئەل**"ی خوداوەنی ئاسمان پەسند دەکات.

لە تەواوی نیمچە دورگەی عەرەبی **ئەل** دەبێتە "**ئەللا**" هەروەها شکاندنی داب و نەریتەکانی تەوتەمی تیرەکانی بیابانی عەرەبی و دەربازبوونیان بۆ قۆناخی تاکخودایی، گرنگترین قۆناخی شۆڕشی ئایینی تاك ـ خودایيە. ئەمە بەسانایی روو نادات، ماوەیەکی درێژ دەخایەنێ موساش ئەم ئەلە وەکو تاکخودا بە بنەما دەگرێت، بەڵام بەتایبەتی خوداوەندی تیرەی عیبرانیەکانە. لە کتێبی موقەدەس ئەم بابەتە بەم شێوەیە تێدەپەڕێ: "**ئێوەم لە خۆم مارە کرد و لە تەواوی مرۆڤەکان پایەدارترم کردن**". ئەمە حوکمێکی گرنگە و ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێ لە پێکهاتنی ئەو داب و نەریتەی کە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان گەوهەری تایبەتی کۆمەڵگای یەهودی هێناوەتە ئاراوە. هەروەها ناوەکەشی دەگۆڕن. موسا ئەمە ئەنجام دەدات. ئەو ناوەی سەرەتا "**ئەلۆهیم**"ە، دواتر لە ئەنجامی کردنی بە قەومێکی تایبەتی خودا، ناوی **Yehova** ی لێدەکرێت (ناوی **Yehudi** لێرەوە دێت). مانای وشەی ئیسرائیل "**ئەوەی لەگەڵ ئەل زۆرانبازی دەکات**"؛ واتە تیرەی عیبرانی بە ئەندازەی خوداوەند ئەل بەهێزە، ئەم تیرەیە هێندە بە شان و شەوکەتە دەتوانێ زۆرانبازی لەگەڵ خوداوەندی خۆی بکات.

ئەم وەرچەرخانانەی حەزرەتی ئیبراهیم لە ناوچەکانی کەنعانیەکاندا تێیدا ژیا لەکتێبی پیرۆزدا لەمیانەی شێواز و زمانێکی تایبەت وەکو فەرموودەی خودا دانراوە. ئیتر لەگەڵ مەزن بوونی تیرە، گرنگی و بایەخەکەشی زیاد دەبێت. ـ لەکاتی دەرکەوتن لەمیسر باس لە ٧٢ تیرە دەکرێت ـ کاتێك ژمارەیان زیاد دەبێت دەگەنە پایەی میرنشینی. سوود لە یەکێتی تیرە خۆجێییەکان و ناکۆکی نێوان نیمچە دەوڵەتەکانی ـ شار دەبینن. هەندێ جار لەگەڵ یەکتردا ناکۆك دەبن. هەروەکو ڕەوشی پێکدادانی ئەمڕۆی عەرەب ـ ئیسرائیل، هەر لەسەرەتاوە لەنێو ڕەوشێکی بەمجۆرەدا دەژین. ئەم ناکۆکی و پێکدادانە لەمیانەی هەمان کارەکتەرەوە تاکو ئێستا بەردەوامە. لەهەمان شوێن بەردەوامە، لەدەورووبەری قودس!

هەڵسەنگاندنێکی تایبەتی ڕەوشی تیرە عیبرانیەکان لەماوەی نێوان سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم تاوەکو قۆناخی دەرکەوتن لە میسر و پەیوەندی نێوان ئەم دوو قۆناخە و پێکهاتەیان زۆر گرنگە. ئەمە شتێکی سەیرە لە کتێبە ئایینیەکاندا بەشێوەی فەرموودەی خودا باس لەوە دەکرێت کە لەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیمیش کۆچبەری نەوەستاوە و تاکو میسر ڕۆیشتووە. هەروەکو چۆن تیرە هەژارەکانی ئاریان لەهەمان سەردەمدا لە ناوچە و شارە دەوڵەمەندەکانی سۆمەر لەژێر ناوی **کاسیتەکان** (لە زمانی سۆمەری، کاسۆ = هەژار، کاسیت = گەلی هەژار) نیشتەجێ بوون، ئەوا پێشکەوتنێکی هاوشێوەی ئەوەش بەرەو ناوەوەی میسر روویدا. چەندین تیرەی هەژاری بیابانەکان بەرەو میسر کۆچ دەکەن. هەروەکو ڕەوشی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان کە لە هەموو لایەکەوە لێشاوی کۆچبەری بەرەو ئەمریکا و ئەوروپا دەچێت. میسریەکان ئەم کۆچانە بە "**ئابیرو**" ناودەبەن (واتای وشەی **Abiru**، مرۆڤی تۆزاوی بیابانە). زاراوەی عیبرانی لەم وشەیە دروست کراوە. کاتێك تیرە لە ئورفا ـ حەڕان دەردەکەوێت، ناو و تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرەی نییە. لەمیسر هەژارن بەڵام بەشێوەی ئازادییەکی نیوەچڵ درێژەیان بەژیانی خۆیان دەدا. هەروەکو لەنموونەی یوسف دا دەبینرێ، بەدەگمەن جێگای خۆیان لەناو بیروکراسییەت دەکەنەوە. چیرۆکی یوسف شێوەی ئەو فەرموودە پیرۆزەی خودایە سەبارەت بەو ڕووداوەی لەنێو بیروکراسییەتی میسر پێشکەوت. نموونەیەکی هاوشێوەی ئەوە لەچیرۆکی سەرجۆنی ئەکەدی سەر بە تیرەی ئامۆریت دەبینین کە بەشێوەی ئەفسانەیەکی تایبەت باسی کراوە. هەروەکو دیارە پێشخستنی چیرۆکی بەمجۆرە لەسەر ئەوەی یەکێك لە تیرەیەکی نەناسراو و بێ ناو و دەنگ، هەڵسێ خانەدانێك ئاوا بکات یاخود ببێت بە پیاوێکی دیاری کراوی دەوڵەت، بۆ مێژوو رابردوویەکی درێژخایەن دەگەڕێتەوە.

قۆناخی میسر بۆ عیبرانییەکان نزیکەی سێ سەد ساڵ بەردەوام دەبێت. شیمانەی هەرە لەپێش ئەوەیە کە لە یاخیبیوونێکی ناوخۆی میسردا دەبن بەلایەنێك و یەکێکی بەناوی **موسا**، وەکو یوسف لەناو بیروکراسی دەوڵەتدا جێگای خۆی گرتووە و جێگای خۆی لە نێو ئەم ناکۆکییەدا دەگرێت، ڕەوشی مەترسی و پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ عیبرانییەکان ئەمانە هەمووی سەرەداوی دەستپێکردنی کۆچبەریەکی دیکە دەدەنە دەست. خوڕەوشتی ژیانی سەر بەستانەی تیرەکانی بیابان، ڕۆڵ لەم ڕەوشەدا دەبینین. هەم لەدەستدانی متمانە لەلایەن فیرعەونی میسر، هەم ئەو داخوازی و تامەزرۆیەی سەبارەت بە ژیانی کۆنی تیرە هەیانبوو، هەلومەرجی ماددی ئەم پێهەڵگرتنەن. وەکو شیمانە دەکرێت ئەو کۆچبەریەی لەساڵانی ١٣٠٠ پ.ز دەستپێکردووە ژمارەیان نزیکەی ٢٥ هەزار کەس بووە. بەشێوەی ٧٢ تیرە پارچە ببوون. شیمانەی مەزن ئەوەیە کە تیرەی ئیبراهیم ژمارەیان چەند سەدێکی دەرباز نەکردووە. خێڵێکی مەزن یاخود قەومێك لەتیرە پێکهاتووە. (**هجرە**) کۆچبەری کە بابەتێکی سەرەکی نێو تەوراتە، هەروەکو دەزانرێ شوێن پەنجەکانی بەشێوەیەکی زەق لە مێژووەوە دیارە. هەروەکو بانگەشە دەکرێت ئەمە یەکەمین "**کاروانی درێژی ئازادی**" مێژووە، کە نزیکەی چل ساڵی خایاندووە، زۆر بەدژواری ئەنجامدراوە. بەبیابانی سینادا دەرباز دەبن و دوایی لەگەڵ ئەو تیرە نیشتەجێ و گەڕۆکانەی دەکەونە سەر ڕێیان، یان ئەوەتا لەگەڵیان دەکەونە نێو پێکدادان یان پەیوەندی دەبەستن.

موسا کاتێك لە میسر بوو لەلایەنی راهیبێکی بیر و باوەڕی تاکە خوداوەندی خۆر "**Aton**" کاریگەری دەکرێتە سەر. لە ناوچەی **Midyan** ی ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی دەریای سووریش دەکەوێتە ژێر کاریگەری راهیبێکی بە توانا کە ناوی **Yerto** یە. کاریگەری ئەو کێشە ئاستەمانەی بەڕێوەبەرایەتی کە لەناویدا ژیا و کاریگەری ئەم بیر و باوەڕانە بەیەکەوە ڕێگا لەپێش دووەمین قەڵەمبازی مەزن و پێشکەوتنی "**موعجیزەیی**" چەمکی ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم دەکاتەوە. موعجیزەکان بە واتای قەڵەمبازەکانی چارەسەری کێشەکانی ئەم قۆناخە دێت. نەدۆزینەوەی ڕێگاچارەی کێشەکان لەمیانەی ڕێگە و شێوازەکانی پێشوو چەمکەکانی پێویستی چەمك و کرداری نوێ نیشان دەدات. گوتەی پەرجوو (**معجزە**) ناوێکە لەم چەمك و کردارە نوێیانە نراوە. هەوڵیاندا ئەو گۆڕانکارییە هزرییە مەزنەی قۆناخی نوێ کە زوو بەزوو و بەسانایی پەسند و هەرس ناکرێت، بە موعجیزە ناوزەدی بکەن. گەلێك قۆناخی بەمجۆرە لە مێژوودا دەرباز بووە و خواستراوە کە قەڵەمباز و دەرکەوتنی پێغەمبەرەکان لەمیانەی ئەم زاراوانە واتادار بکەن و ئەمەش داب و نەریتێکی ناسراوە.

کێشەکانی سەردەمی دەرکەوتنی موسا زۆر دژوارن و گەلێك لایەنی شاراوە لەخۆوە دەگرێت. لەمیانەی چەمکی تەسکی بەڕێوەبردنی چەند تیرەیەکی سنوورداری کۆن و پێکهاتە هزریەکەی بەڕێوەبردنی ٧٢ تیرە ئاستەمە کە گەیشتوونەتە ئاستی بە قەوم بوون و لەنێو یاخیبوون دان. تەنیا بەهۆی کێشە ماددییەکانیان خێزانەکان (بنەماڵە) بەردەوام لەنێو کاردانەوەیەکدان کە دەگاتە ئاستی یاخیبوون. هەوڵەکانی تیرەکان بۆ گەیشتن بەئاستی باڵابوون و پایەداری کەم نابێتەوە. هەلومەرجی کۆچبەرێتیان سەختە و کاتێك بەو زەویانەدا دەرباز دەبن کە موڵکی خۆیان نییە، بەردەوام لەگەڵ خەڵکە نیشتەجێکان دەکەونە نێو پێکدادانی خوێناوی. لەهەرێمەکەدا بت پەرستی زۆر زیندووە و تیرەکانی خۆشیان تەڤلی ئەم ڕێ و ڕەسمانە

دەبن و جێگای خۆیانی تێدا دەگرن. لە رووی ئەوانەی"**گۆلکی زێڕینیان دەپەرست"موسا** ناچاردەبێ سزای مردنیان بەسەردا بدات. ناشێ و ناتوانرێ بەکۆنفیدراسیۆنێکی ئاسایی تیرەکان قۆناخ دەرباز بکرێت و لەژێر باری دەربکەون. پێویستی بە گۆڕانکاری یاخود شۆڕشێکی ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی و بەڕێوەبردن هەیە.

هەروەکو لە دەرکەوتنی پێغەمبەرەکانی دیکەشدا دەبینرێ، موساش لەژێر باری ئەم کێشانەدا، پەنا دەباتە بەر سروشت و ئەشکەوت و بەتەنیا دەمێنێ و قاڵدەبێتەوە. داب و نەریتی شامانیزم سەبارەت بە کۆمەڵگا بوون هەنگاوێکە. لە قۆناخی تیرە و بنەما لەسەرەتاییەکان نوێنەرایەتی زانا و رێبەری مەعنەوی لەجۆری (راهیب و شێخ) دەکات کە چالاکییەکی تێکەڵاو و ئەفسووناویە و بە تایبەتیش بە ئامانجی یەکانگیرکردنی لاوەکانە لەگەڵ باوەڕی و داب و نەریتەکان و هەرسکردنیان، دەرکەوتووە. شامانیزم هەروەکو بڵێی شێوەیەکی داب و نەریتی شێخی عەرەبستانە کە بەگوێرەی ناوچەکە رێکخراوە. بەڵام دەزگای پێغەمبەرایەتی زۆر لەدەزگای شێخایەتی باڵاتر و پایەدارترە. داب و نەریتی شێخایەتی ئەرکەکەی ئەوەیە کە داب و نەریتە خوڵقێنراوەکە پەسند و زاڵی بکات و بەمجۆرە سیستەمی تیرە بەڕێوە ببات. بەڕێوەبەری داب و نەریتەکانە. رۆڵی زۆر نزیکی شامانیزمە. تەنیا بە لایەنی داب و نەریتی ئایینی سنووردار نییە، فێری تەواوی داب و نەریت و بەتایبەتیش بەکارامەیی فێری شێوازەکانی گەیشتن و بەدەست هێنانی هەلومەرجەکانی ژیانی ماددی دەبێت و بەڕێوەیان دەبات. پێغەمبەرایەتی زۆر لەمانە جیاوازترە. پێغەمبەرایەتی پێهەڵگرتنێکی نوێیە، یۆتۆپیای ئایندەیە. ئیلهام و فەرمانی ئەوەی لەئەستۆیە کە کۆن و رابردوو رەت بکاتەوە و بەلاوە بنێت و سەرلەنوێ لەمیانەی زاراوە و بەرنامەڕێژی نوێ، ئاییندە ئاوا بکات. پێغەمبەر وەکو راهیبیش نییە. راهیبەکان زیاتر بە نوێنەرایەتی کردنی ئایینێکی جێگیر بەرپرسیارن. بەڵام پێغەمبەر، ئەرکی بەلاوەنانی داب و نەریتی ئایینی کۆن و ئاواکردنی نوێترە.

لە کاتێکدا هەوڵدەدەم لەبەشەکانی دیکەدا هەڵسەنگاندنێکی بەرفراوان سەبارەت بە زاراوەی خودا بکەم، زۆر بەکورتی ئاماژە بەوە دەکەم کە ناسنامەی "**خودا**"ش بە گەلێك وەرچەرخانی جیاوازدا دەرباز بووە. زاراوەی "**ئەڵلا ـ Allah**" ی ئیبراهیم جیاوازە و گەلێك لایەنی نوێ لەخۆوە دەگرێت. لەنێو هەلومەرجە واقعییەکانی ئەم قۆناخە موسا، نەدەتوانێ وەکو میرێکی میسری بمێنێ و نەدەتوانێ ببێتە شێخێك یاخود راهیبێك. هەموو شتێك ناچاری قەڵەمبازێکی پێغەمبەرانەی دەکات. ئەگەر بە رادەیەکی سنوورداریش بێت کاریگەری داب و نەریتی ئیبراهیمی بێگومان لە مێژووی ئایینە تاکخوداییەکاندا موسا ناچاری قەڵەمبازێکی مەزن و دانانی بناخەکانی ئایینی "**موسەوی**" دەکات. ئەڵلا ناوی تایبەتی دەبێتە "**یەهوە ـ Yehova**"، پێویستی بەڕێوەبەرایەتیەکی توند وەك گوتنی "**ئێوەم لەخۆم مارە کرد، نابێ بچنە لای خودایەکی دیکە**" بە ئیرەیی لە دەمی **یاهۆڤا** دەردەخات. مرۆڤ دەتوانێ ئەم تایبەت بوونە لە راستینەی یەهودیەکاندا وەکو میللیکردنی ئایین ناوزەد بکات. نەتوانەوە و بەردەوام رووبەڕووبوونەوەی هەڕەشە و مەترسی مەزن بنەمای چەمکی ئایینی قەومی یەهودیەکانە. لەمیانەی سرووشە (وەحی) بەناوبانگەکەی لەچیاوە بۆ هات و لەگەڵ "**دەفەرمان**" لەدوا قۆناخەکانی کۆچبەری قۆناخی نوێی ئایینی کەمێکیتر شێوە دەگرێ. لەم قۆناخەدا موسا گەلێك تەگبیری یاسایی، دارایی و رێکخستنی پێشدەخات. نوێنەرایەتی و رێبەرایەتی ئایدیۆلۆژی و دارایی ئایینی نوێ بە براکەی، بە هارون دەبەخشێ. دەستەیەکی کاروباری یاسایی پێکدەهێنرێت. **یەشووع ـ Yeşu** ی بەناوبانگ دەکات بە فەرماندەی سەربازی. ئەنجوومەنێکی راوێژکاری لەسەرۆك تیرەکان پێکدێنێت. هەندێ رکەبەران زۆر بە توندی سزا دەدات، دەیانکوژێت. هەنگاو بە هەنگاو لەرێی پێکدادان دەگاتە نزیکی قودس. وا شیمانە دەکرێت کە ئەم پێهەڵگرتنە ٤٠ ساڵی خایاندووە. نیشتەجێبوون، ئەو خاکە پیرۆز و میوەدارە بوو کە **یاهۆڤا** بەڵێنی پێدا بوون؛ دوور بوو لەوەی میوانە نوێکان بە رەزامەندی پەسند بکات. هەندێ خزمی بەرەچەڵەك عیبرانی کە لەمێژە لەوێ ماونەتەوە بەکەڵك نایەت. بەکارهێنانی زەبر ئەنجام دیاری دەکات. هەروەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان! پیرۆزی و نەفرەت چەندە تێکەڵ بەیەکتر بوون! بەر لەوەی لە خاکی پیرۆزدا نیشتەجێ بن، وەکو فەرمانی خودا موسای کە زۆر ماندوو بووە، یەکێك لەگەڵ خۆی دەباتە چیای "**Nebo** " **نەبۆ** و دەکەوێتە خەوی مردن. لە کاتێکدا تەورات ئەم چیرۆکە بە شێوازی تایبەتی خۆی بە شێوازێکی سەرنج راکێشانە دەگێڕێتەوە، لەڕاستیدا بناخەی شێواز و تەرمۆنۆلۆژی ئایینە تاکخوداییەکان دادەنێ. لەوانەیە ئەم رووداوە بەشێوەیەکی دیکە بووبێت. بەڵام گرنگی مێژوویی و ئەنجامەکانی پێهەڵگرتنەکە بەرچاو و سەرنج راکێشە و چەندین پێشکەوتن لەخۆوە دەگرێت.

رووداوەکانی دوای ئەم قۆناخەی کاروانی عیبرانییەکان لەمیانەی ئەفسانە بەشێوەیەکی تێکەڵاو باسی کراوە. تاوەکو ساڵانی ١٠٠٠ پ. ز قۆناخێك بەڕێوە دەچێ کە بە قۆناخی حاکمەکان ناو دەبرێت. لەڕێگای ساول لەڕاهیبێتیەوە قەڵەمبازێك بەرەو پادشایەتی ئەنجام دەدرێت. واتە دوای قۆناخێکی درێژی کپ بوونی ئایینی، دەربازی بەدەزگابوونی سیاسی دەبن. لەمیانەی داود و سولەیمان قۆناخی قارەمانێتی دێتە ئاراوە. لە ئەنجامی هێرشی ئاشووریەکان پادشایەتی قودس نابێتە خاوەنی شانسی ژیانێکی درێژخایەن. لەئەنجامی رووخاندن و سووتاندنی قودس لەلایەن ئاشووریەکان لە سەدەی ٧ پ.ز، بابلیەکان لە ساڵی ٥٨٥ پ.ز کۆتایی بە هەبوونی سیاسی یەهودیەکان دێت. بەشێکی مەزنیان بەرەو بابل ناچاری کۆچ دەکرێن. لەقۆناخی بابل ئەفسانەی سۆمەریان پەسند کرد. توێژێکی نوێی نووسەر و رۆشنبیران دەردەکەوێت. لەگەڵ پێغەمبەرەکان ئیتر نووسەر و رۆشنبیرەکانیش جێگای خۆیان لە پەروەردە و بەڕێوەبردن دەگرن. لەگەڵ دەست بەسەرداگرتنی بابل لەلایەن ئیمپراتۆری پارسەوە ئازاد دەبن و دووبارە دەگەڕێنەوە قودس. قودس سەر لەنوێ بونیاد دەنرێتەوە. لەگەڵ هاتنی ئەسکەندەر قۆناخی هێلینی دەستپێدەکات، ئەسکەندەرییە پەیوەندی بە راستینەی هەبوونی یەهوودییەکانەوە هەیە و نەوەیەکی زمانی یۆنانی پێدەگەیەنرێت. دوای ئەوەی لەلایەن ئەم دوو سەرچاوەیە تێر دەکرێت واتە سەرچاوەی زمانی بابلی و یۆنانی، بەو بچمەی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەناسرێت و وەکو تەورات شێوە دەگرێت.

لە قۆناخی داگیرکاری هێلینی بۆ چەند ئایینزایەك پارچە دەبن. ئەمەش بەشێوەی موحافەزەکار و بەکرێگیراوە سادقیەکان، فەریسییەکان (کاریگەری پارسیان لەسەرە) ماکابییە رادیکالەکان (یاخیبووەکان). لەگەڵ داگیرکاری رۆما لە ٦٣ پ.ز ئەم یاخیبوون و پێکدادانانەی نێوان ئایینزاکان کۆتایی پێنایەت، کاهینەکانی نۆکەری رۆما ناتوانن ببنە کۆسپ تاوەکو قۆناخ لەدەرەوەی کۆنترۆڵیان نەبێت. جوڵانەوەی ئەسەنیە هەژارەکان و یەحیای واعیزکار، نوێنەری قۆناخی نوێن. بەرامبەر بە سیستەمی کۆیلەداری رۆمای گشتگیر بوو هەلومەرجەکانی ئایینی مرۆڤایەتی بەخێرایی پێدەگات. نەتەوەپەرستی کاهینەکان و زمانی فەرمی یەهودی ناتوانێ وەڵامی ئەم زەمینەیە بداتەوە. لە کاتێکدا پڕوپاگەندەی یەحیا رێگای لەپێش عیسا خۆشدەکرد، لەهەمانکاتدا بووە بەڵای سەری خۆی و لەناو چوو. لە خاچدانی عیسا، لە ساڵی ٧٠ زایینی دووبارە رووخاندنی قودس لەلایەن رۆما و پەرتەوازەکردنی یەهودییەکان بۆ هەر چوار لای جیهان، رێگا لەپێش قۆناخێکی نوێی مێژوویی دەکاتەوە.

هۆکاری بەدرێژایی باسکردنی چیرۆکی عیبرانییەکان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێناسەیەك بۆ ئەو رۆڵەیان بکرێت کە دەرهەق بە راستینەی دەرکەوتنی ئایینی تاکخودایی و سیستەمی کۆیلەداری بینیویانە و واتایەکی پێببەخشرێت. لە بەشی دوای ئەمەدا دەبینرێ کە لەلایەکەوە کلاسیکیە مەزنەکان و ئەو "**ریفۆرم**"انەی لەمیانەی فەلسەفەوە دەستپێکردووە، لەلایەکی دیکەشەوە جوڵانەوەکانی ریفۆرم و سەرهەڵدانە ئایینیەکان سەرەتا لەبواری ئایدیۆلۆژی، دواییش لەلایەنی دەزگای سیاسییەوە سیستەمی کۆیلەداری ناچاری وەرچەرخان دەکات.

**٤ـ شارستانییەتی گریگ (یۆنان):** لە دەوروبەری ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز دا دەبینرێ لە نیمچە دورگەی یۆنان شارستانییەتێك شێوە دەگرێت کە لایەن و رەسەنێتی تایبەت بەخۆی هەیە. لەنزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ میسر و فینیقیەکان هەیە. نوێنەرایەتی لوتکەی رۆژئاوای شارستانییەت دەکات. سێیەمین سەرچاوەی تێرکردن و بەخێوکردنی نیمچە دورگەی یۆنانە. لەدروست کردن و بەرهەم هێنانی گڵکاری زۆر لەپێشە و بۆ هەموو شوێنێکی دەنێرێت. سیستەمێکی شکۆداری کۆشکی ئاواکردووە. لەمیتۆلۆژیا لەقۆناخەکانی دەستپێك دایە. **زیۆس** و **دەمەتەر** لەبەر لێواری زایینن. خاوەنی نووسینێکی سەرەتاییە کە لە نووسینی فینیقیەکان دەچێت. زیاتر گرێدراوی میسرە. لە ساڵانی ١٥٠٠ پ.ز یۆنان دووچاری داگیرکاری **میکان** دەبێتەوە و بۆ چەند سەدەیەك سەربەخۆییەکەی لەدەست دەدات. لەلایەنی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوینەوە ئەوکاتە یۆنان بەواتای دواترین خاڵی جیهان دەهات، واتای ئەوپەڕی گۆشەی رۆژئاوا بوو. نۆرەی خوڵقاندنی شارستانییەتی یۆنانە. لەژێر کاریگەری و سایەی هەر چوار سەرچاوەی فینیقی و میسر و ئەنادۆڵ و گریت، ئەم شارستانییەتە لە دایك دەبێت کە دەبێتە تۆو و

چەکەرەی شارستانییەتی ئەوروپا. لە دایکبوونی زایینە خوداییەکانی میتۆلۆژیای یۆنان، بە تایبەتیش ئەم زایینانەی (ئافراندن) لە زیۆسەوە سەرچاوە دەگرێت هەمەجۆری و ئاڵۆزییەکەی لەنزیکەوە پەیوەندی بەو راستینە ئاڵۆز و تێکەڵاوەوە هەیە. رووبەڕووی زایینێکی لەجۆری هورمزی حەوت مێرد دەبینەوە. سەرباری ئەو هەوڵانەی بۆ تایبەت بوونی ئەم شارستانییەتە دەیدەن و لەنێو چاوان و ران و هەموو شوێنێکی زیۆسەوە بەشێوەی جیاواز خوداوەند دەخولقێنن، بەڵام ناتوانن خۆیان لەم کاریگەریانە رزگار بکەن، شتێکی روون و ئاشکرایە کە لەهەر چوار لاوە شارستانییەتی خۆرهەڵاتی ناوین بۆ یۆنان گواستراوەتەوە. کاتێك مەسەلە "**ئەوروپا چۆن لە دایك بوو قەرزاری کێیە؟**" لەبەشی پەیوەندیداردا روون دەکەینەوە، پێویستە بە شێوەیەکی بەرفراوان شارستانییەتی یۆنان بگرینە دەست.

٥ ـ **شارستانییەتەکانی سۆمەر و میسر:** لە دەوروبەری ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز بە نێو وەرچەرخانێکی گرنگدا دەرباز دەبن. قۆناخی لەدایکبوونی بە شکۆ و دەزگابوون لەدواوە بەجێماوە. سۆمەریەکان لەدەوروبەری ساڵانی ٢٠٥٠ ـ ١٩٥٠ پ. ز لەرێگای خانەدانی ئور دوای خۆکۆکردنەوەیەکی کورت خایەن لەسەر شانۆی مێژوو دوور دەکەوێتەوە. نووسەرە سۆمەریەکانی هەستیان بە قووڵایی ئەم راستینەیە کرد و گەلێك لاوك و سەردوولکەو داستانیان دەبینرێت کە لەم بارەیەوە نووسیویانە. باسکردنی و گێڕانەوەی ئەو شارستانییەتەی مێژووی ئافراندووە زمانە ئەدەبیەکەی زۆر سەرنج راکێشە. ئەوە سەلمێنراوە کە نووسراوەکانی سۆمەریەکان سەرچاوەی سەرەکی تەواوی دراما کۆمیدیا و تراژیدیاکانی کتێبە پیرۆزەکانە. هەروەها ئەمەش سەلمێنراوە کە سەرچاوەی سەرەکی میتۆلۆژیا تازە پێکهاتووەکانی ئایینە تاکخودا پەرستەکان لەسۆمەریەکاندا شاراوەیە. یەکەمین نموونەی تەواوی دەزگا سیاسییەکانیش وەکو گەوهەر و بنگە رەسەنەکەی لەسۆمەر دەرکەوتووە و شەپۆل بە شەپۆل بەهەموو لایەنێکی جیهاندا بڵاو بۆتەوە. سۆمەر گرنگترین سەرچاوەی ئامێرەکانی ژێرخان و زانیارییەکانی سەبارەت بەو ئامێرانەیە؛ بەدرێژایی سەدان ساڵ هەوڵدراوە لەم سەرچاوەوە بۆ هەموو شوێنێکی بگوازێتەوە.

رۆڵی مێژوویی بابل و ئاشووریەکان بەم گواستنەوەیە سنووردارە. ئەم دوو خانەدانەی بەرەچەڵەك ئامۆریت ـ سامین لە ماوەی ١٩٠٠ پ.ز تاوەکو سەرەتاکانی زایین خەریکی سەرلەنوێ رێکخستنەوەی میراسی سۆمەریەکان و خواردن و بڵاو کردنەوەی بوون. رۆڵی تایبەتیان سنووردارە.

بابلیەکان هەوڵێکی زۆریان داوە تاوەکو میراسی سۆمەریەکان بنووسنەوە. بۆ ئەوان سۆمەریەکان بەواتایەکی پیرۆز دێت. قۆناخی شکۆداری بابلیەکانیش لەسەر بنەمای ئەم میراسە هەڵکشاوە. بابل لەدەوروبەری ١٨٠٠ پ. ز لەلایەن پارسەکانەوە دەستی بەسەردا گیرا و بۆ ماوەیەکی درێژ تاوەکو ساڵانی ٥٥٠ پ. ز پایتەختی جیهان بوو. منارەی بابل نوێنەرایەتی گوزارشتی هەرە کۆسمۆپۆلۆتیکی ئەم قۆناخەیە؛ خاوەنی رۆڵێکی مەزنە لە پێکهاتنی هزری ئایینی و ئەدەبی مرۆڤایەتی. بابل رۆڵێکی دیاریکراوی لە کامڵ بوونی سیستەمی کۆیلەداری و وەرگێڕانی بنەماکانی بۆ زمانی نووسین و گواستنەوە و ناساندنی بەجیهان بینیوە. قۆناخی ٢٠٠٠ ساڵی رەسەنێتی سۆمەر، قۆناخی ٢ هەزارساڵی وەرگێڕان و نووسین و وەرچەرخان و گواستنەوەی بابلیەکانی بەدوادا هات، لە کاتێکدا ئەم قۆناخە ٤ هەزار ساڵییە خاوەنی رەسەن و بەرپرسیاری بەدەزگاکردن و کامڵ بوونی پێکهاتەی شارستانییەتی مرۆڤایەتییە، هەڵسەنگاندنی لایەنە باش و خراپەکانی ئەم رۆڵ و دەسکەوتانە ئەنجام نەدراوە. لەم بوارە مەودایەکی زۆر هەیە پێویست دەکات مێژوو بیبڕێت.

ئاشووریەکان کردەوەی بڵاوبوونەوە و پەلهاوێشتن لەمیانەی سەفەربەری سەربازی دژوار و بازرگانی ئەنجام داوە. ماوەی نێوان ١٣٠٠ تا ٦٥٠ پ.ز سەردەمی راستەقینەی ئاشووریەکانە. لە مێژوودا رۆڵێکی مەزنیان بینیوە لەسەراوژێر کردنی شوێنی هەبوونە ئەتنیەکیەکان و وشککردن و قڕکردنی بزووتنەوە ئەتنیکیەکان وەکو ئامانجێکی سەرەکی دەستنیشان کردووە. هەربۆیە لەگەڵ دەرکەوتنی ئاشووریەکان باڵادەست بوونیان بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی مێژوو بۆ شێوەی بیروباوەڕی و ئایینی و ئایینزاکان دەگۆڕێ. لەجیاتی مێژووی دەرکەوتن و کاروانی نەژادەکان، مێژووی رۆژهەڵاتی ناوین دەبێتە مێژووی دەرکەوتن و بەڕێوەچوونی ئایینزا و ئایینەکان. ئاشوور ئیمپریالیزمێکی سەربازییە. ئاشووریەکان لەسەردەمی خۆیاندا لەمیانەی توند و تیژی باڵاتربوونی سەربازی خۆیان بەسەر هەموو لایەکدا سەپاندووە. ئەمەش میسر، ئەنادۆڵ، رۆژهەڵاتی دەریای سپی، میزۆپۆتامیای سەروو و ئێران دەگرێتەوە. بە بەراوردکردن لەگەڵ بابل رۆڵ و جێگایەکی لەپاشتری هەیە. پشت بە میراسی سۆمەریەکان دەبەستێ. کاری نووسین و بڵاوکردنەوەیان بەڕێوەبردووە. لەبواری بیناسازیدا پێشکەوتوون. دواترین هێزی هەڵگر و راستەوخۆی سۆمەریەکانە.

ناتوانرێ رۆڵی پادشا ئاشووریەکان لە باڵادەست بوونی هزری کۆیلایەتی لەهزر و کردەوەی مرۆڤ لەبیر بکرێت و بچووکبکرێتەوە، لەپێشکەوتن و بەدەزگابوونی بازرگانیشدا رۆڵێکی دیاریکراویان هەیە. لەکاروانێکی نزیکەی هەزاری ساڵی شارستانییەتی کۆیلەدارێتی لەگەڵ بابلیەکانەوە پێشەنگایەتییان جێگای باسە. هەروەها ئەو سەرهەڵدانانەی ناوەندەکەی لە میزۆپۆتامیای سەروو بوو لەمیانەی رێککەوتنەکانی هیتیتەکانی ئەنادۆڵ و میدیای باکووری رۆژئاوای ئێران و بەشێکی هێزەکانی رۆژهەڵاتی دەریای رەش بەرامبەر بەم رێبەرایەتییە ئەنجامدرا. رووەکەی دیکەی مێژوو بەرەی بەرخودان پێك دێنێ. مەزنترین هەوڵ و کۆشش لەلایەن میتانی و ئورارتوو بەرەچەڵەك ئاریان نیشاندراوە، بەڵام لەکۆتاییش لەپەرتەوازەبوون رزگاریان نەبوو. ئەفسانەی کاوەی ئاسنگەریش سەرچاوەی خۆی لەم قۆناخە درێژخایەنەی بەرخودان وەردەگرێت. لەکۆتاییدا لەئەنجامی رێککەوتنی هێزە بابلی و میدیاییەکان لەدەوروبەری ساڵانی ٦٢٥ پ.ز و لە ئاکامی رووخان و سووتاندنی نەینەوای پایتەختی ئاشووریەکان، کۆتایی بە ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری هاتووە و نەیانتوانیوە بۆ جارێکی دیکە پشتی خۆیان راست بکەنەوە. بەڵام کار و چالاکییەکانی راهیب و نووسەری ئاشووریەکان بەردەوام بووە . مەزنترین پەرتوکخانەی نەینەوا، توانیویەتی تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان بێت. زمانی ئارامی ئاشووریەکان هەروەکو زمانی یۆنانی و لاتینی، بەدرێژایی ٢٥٠٠ ساڵ وەك زمانی شارستانی رۆژهەڵاتی ناوین رۆڵی دان و ستاندن و پەیوەندی گێڕاوە. یەکێك لە گەلە یەکەمینەکان کە دوای عیسا بوو بەمەسیحی، ئاشووریەکانن کە لەبڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە لە رۆژهەڵات و تێکۆشان دژی شارستانییەتی کۆیلەداری رۆڵێکی بەرچاویان بینیوە.

شارستانییەتی میسر لە ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز لە قۆناخی خانەدانە ناوینەکان درێژەی بە پێشکەوتنی خۆی داوە. لەساڵانی ١٨٠٠ پ.ز دووچاری داگیرکەری هیکسۆسەکان (عیبرانییەکانی سەرەتا، بە شێوەیەکی رێژەیی ئاریانین) هاتوون. لەدوای تێپەڕبوونی تەمەنی چەند خانەدانێك لەنێو خۆیاندا هەرسیان دەکەن و ئەوانەی دەمێننەوە دەربەدەر دەکرێن. لەدوای دەستپێکردنی قۆناخی خانەدانە نوێیەکان لەساڵانی ١٥٠٠ پ.ز، میسر دەکەوێتە ژێر باڵادەستی ئاشووری و پارس و یۆنانیەکان و جاری هەرەدواییش لە ساڵانی ٣٠ پ.ز دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی رۆماییەکان و بەمجۆرە رەسەنایەتی خۆیان لەدەست دەدەن. قۆناخی کلیۆپاترا رووی خەمناکی مێژووی ئەم چیرۆکە نیشان دەدات. هەروەکو چۆن کلیۆپاترا نوێنەرایەتی بەرخودان و خۆبەدەستەوەنەدان دەکات واتە گوزارشت لە خۆکوشتنی (**انتحار**) ژن دەکات، هەروەها گوزارشتی هەرەمەزن و شکۆداری ئەو شارستانییەتەیە کە ناتوانرێت لەبیر بکرێت.

## ز ـ ریفۆرم و بەرخودان بەرامبەر شارستانییەتی کۆیلەداری

کاتێك چۆنێتی دەربازبوون بەرەو شارستانییەتمان هەڵسەنگاند هەوڵماندا بەشێوەیەکی زیاتر هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە دەرهەق بە دوو بابەت بکەین. یەکەمیان ئامرازە کەڵەکە بووەکانی بەرهەمهێنان، بەتایبەتیش ڤەبوونی خاکە بەپیتەکان بۆ ئاودان. ئەو تەکنیکەی لە مس دروستکرابوو بەشە بەرهەمی هەر تاکە کەسێکی زیاد کرد و رێگای لەبەردەم پێشکەوتنی پیشە و زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان کردەوە و شوێنی نیشتەجێی هاوشێوەی شاری هێنایە ئاراوە. جگە لەواتای (شێوەی کۆمەڵگا) جەستەیی، لەنێو تەواوی پێکهاتەی کۆمەڵگادا واتای شۆڕشێکی مەزنە. بەڕێوەبەرێتی رەچەڵەك و تیرەگەری کە لە یەکینەی بچووك پێکهاتبوو، نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ لەناو شار بەردەوامی بەهەبوونی خۆی بدات. شێوازی بەرهەم هێنان بۆ ئەمە گونجاو و لەبار نەبوو. جیابوونەوە و جیاوازی قۆناخی کار بڵاوبوونەوەی رێکخستنی (رەچەڵەکی) لەگەڵ خۆیدا هێنا. شێوەی رێکخستنی تیرە کە بە گوێرەی کشتوکاڵ و شوانکاری بوو، ناچار بوو بەرامبەر بە دابەشکردنی کاری کشتوکاڵ و پیشەکاری بەلاوە بنرێت و، ئیتر سەردەمی بەسەر چوو بوو. ئەمە گەوهەری راستینەی ماددی شۆڕشی شارە.

دووەمین بابەتی گرنگ کێشەی ئامادەکاری هزرییە بەرامبەر ئەو گۆڕانکارییەی بەسەر شێوەی بەرهەمهێنانی مادددیدا هات. نەدەتوانرا ئەم شێوازەی بەرهەمهێنان لەهەلومەرجی شاردا درێژەی پێبدرێت، چونکە بەگوێرەی گونجاو و لەباری ناوچە شاخاوییەکان و سەربەست گەڕان بوو. لەبەر ئەوەی پەرستگا لەهەمانکاتدا خاوەنی رۆڵی ناوەندێکی بەرهەمهێنان بوو، ناچار بوو هێزی بەڕێوەبەرێتی خۆی بەسەر کارکەرەکان ئاوا بکات. لەبوارێکی دیکەوە چینی رەنجدەری خۆی دەخولقێنێ و تەواوی کاتەکەی بەرنامەڕێژ دەکات و لەپێناو ئەو کارەی ئەنجامیدەدات پەروەردەی دەکات. ئەم رەوشە پێویستی بەشۆڕشێکی هزری هەیە. هەروەکو چۆن ئەوکەسەی لە شێوازی ژیانی تیرە دابڕێنراوە لەنێو هەلومەرجی شاردا دەکەوێتە نێو بۆشاییەکی تەواو، بۆ ئەوەی درێژە بەهەبوونی جەستەیی خۆی بدات دەبێ قایل و ئیقناع بکرێت. تەنانەت لەمیانەی زەبرێکی رووت و رەها ناتوانرێ ئاژەڵیش بۆ دەمێکی درێژ لە ئاخوڕ بهێڵدرێتەوە. رازیکردنی یەکێك بە بەردەوام پێدانی ژیان لەنێو هەلومەرجەکانی شار کە لەنێو هەبوونی ئازادی تیرەدا ژیاوە، تەرخان کردنی تەواوی کاتەکانی بۆ بەرهەمهێنان، پێویستی بە رازیکردنێکی تەواو و گۆڕانکاری ئایدیۆلۆژی و شۆڕشی هزری هەیە. رەوش و هەلومەرجە واقعییەکانی کارکردن و ژیان ئەوە روون دەکەنەوە کە بۆچی راهیبی پەرستگاکان ناچار بوون هەم بەڕێوەبردنی بەرهەم و هەم ئایدیۆلۆژیە نوێیەکە بەیەکەوە لەناو یەکتردا بەڕێوە ببەن. شێوەگرتنی یەکەم شارستانییەتەکانی سۆمەر و میسر لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم راستینەیەیە. ئەم راستینەیە زۆر بەباشی ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە بەرلە بەدەزگابوونی زاراوەی سیاسی و دەرکەوتنی پادشایەتی، هەبوونی راهیب مەرج بووە، چونکە راهیب ناچار بووە ئایدیۆلۆژیا بئافرێنێ و کوششێکی مەزن لەپێناو پەروەردەکردن بکات. پێویستە سیستەمی بیر و باوەڕییەکی بەمجۆرە پێك بهێنرێت کە بە یەکجاری باوەڕی پێ بهێنرێ و بەشی ناڕازیبوون نەهێڵێتەوە. بەبێ ئەوەی سیستەمی باوەڕیەکی بەهێزی بەمجۆرە هەبێت، سیستەمی نوێی بەرهەمهێنان بەڕێوە نابردێت، توند و تیژی تەنیا مردن لەگەڵ خۆیدا دێنێ. مەزنایەتی میتۆلۆژیا و ئایینی سۆمەریەکان سەرچاوەی خۆی لەهێزی رازیکردنی ئەو مرۆڤە وەردەگرێت کە بۆ یەکەمجار کرایە "**کۆیلە**". ئەو ئایدیۆلۆژیایەی راهیبەکان ئافراندیان، یاخود بە گوزارشتێکی دیکە سیستەمی میتۆلۆژی و ئایینی هێندە بەهێزە کە خاوەنی رۆڵێکی مەزنە لەگواستنەوەی تەواوی فۆناخەکانی شارستانییەت بۆ رۆژگاری ئەمڕۆمان. ئەگەر تیۆلۆژی (زانستی خوداناسی) سۆمەریەکان نەبوایە ئەوا نەئایینە تاکخوداییەکان و نەمیتۆلۆژیا و ئایینی یۆنان ـ رۆماییەکان بەو شێوەیەی کە هەیە دەردەکەوتن. چونکە لەم بوارەشدا مێژوو بە سۆمەریەکان دەست پێدەکات و هەلومەرجی فۆناخەکانی دواتر بەخۆیەوە گرێدەدات. بە شێوەیەکی گشتی لێکۆڵینەوەی پێشکەوتنی رۆح و هزر و بە تایبەتیش لێکۆڵینەوە سەبارەت بە پێکهاتەکانی میتۆلۆژیا و ئایین، زانستێکە هێشتا پێش نەکەوتووە. لەبەر ئەوە ئایین بە پەسندکردن و رەتکردنەوەی ئایینێك سنووردار کراوە، لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بێبەرهەمە. سۆسیۆلۆژی وشك کە لەجێگای ئەمە دەخوێندرێت لە سۆفیتیکە (زانیاری بێ کاریگەری) کردنی راستی بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. هەرچیەك تاوەکو قوڕگ بکەوێتە نێو میتافیزیا یان بەپێچەوانەی ئەوە واتە تەنیا ئەنجامدانی شیکردنەوەی هەلومەرجە ماددیە رەهاکان، لەچەواشەکردنی راستیدا بەرەو هەمان رەوشی بێ بەرپرسیارێتی دەچێت. پەروەردەی هزری، فەلسەفی و تەنانەت پەروەردەی زانستی رۆژگاری ئەمڕۆمان لەنێو قووڵایی ئەم نەخۆشیەدا دەژین. ئەم دەستنیشان کردنە بۆ ئەوە ئەنجام دەدەم: چونکە بەبێ ئەوەی رووداوەکانی نێو پەرستگای سۆمەریەکان تێبگەین، ناشێ لەڕۆژگاری ئەمڕۆمان تێبگەین. ناتوانرێت لە مزگەوت، کلێسا، حەورا و تەواوی ناوەندەکانی هونەر و تەنانەت زانکۆش بناسین و لێیان تێبگەین. بەگوێرەی ئێمە دەشێ **زیگورات** بە سیستەمێکی کۆن و پێوانەکانیشی بەگوێرەی رۆژگاری ئەمڕۆمان پێکەنیناوی ببینرێ. بەڵام نابێ لەبیر بکرێت کە چاوگی (هێلکەدانی) هەزاران دەزگای شارستانییەتە، سەنتەری دروستکردنی بۆهێڵی ـ جینی هزرە. یەکەم شوێنی عیبادەتە کە "**بەندەی خودای**" تێدا دروستکرا؛ سەنتـەری یەکەمین فێرگەی مۆسیقا و ئاهەنگە، یەکەم زانکۆیە، یەکەمین ماڵی خوداوەندی ژن و پیاوە، یەکەمین ماڵی تایبەتی و گشتییە. بە کورتی سەنتەری پێکهاتن و خولقاندن و ناسنامە و ناولێنانی دەزگا سەرەکییەکان و هەڵبژێردراوەکانی شارستانییەتە. تەواوی ئەو پەرستگا، فێرگە و هۆڵانەی دواتر ئاواکران تەنانەت ئەوانەی میسریش، شێوەی پێشخراوی ئەم مۆدێلەن. لەمیانەی ئەو بەڵگە و بیانوانە بۆمان دەردەکەوێت کە بە بێ ئەوەی بەشێوەیەکی قووڵ ئەو رووداو و بویەرانەی لەپەرستگاکانی سۆمەریەکان ئەنجام دراوە، لەوانە و پەروەردەکانی زانستی مێژوو و کۆمەڵگا نەگیردرێتە دەست، ئەوا بە وشیارییەکی راستەقینەی مێژوو و کۆمەڵگا ناگەین.

هەروەکو چۆن ئەم هەڵسەنگاندنە کورتە پێناسەی سۆمەرلۆژی (سۆمەرناسی) نییە، بەتایبەتیش بە هیچ شێوەیەك باسکردنێکی بەرفراوان نییە؛ تەنیا بۆ بەبیرهێنانەوەی پێویستییەکەیەتی. لەفۆناخەکانی دواتر لە زانکۆکانی ئەمریکا بۆتە بابەتێکی سەرنج راکێش و پەیوەندیدار، چونکە هەستیان بە پێداویستی کردووە.

خولقاندنی "**بەندە**" لەلایەن سیستەمی خوداوەندەکانی میتۆلۆژیای سۆمەری، یەکێکە لە داهێنانە مەزنەکانیان، چونکە سەرەکیترین ئامرازی بەرهەمهێنان ئەم کۆیلەیەیە. کاتێك ئەوە بێنینە بەرچاوان  کە چەرخێك و تەورێك چەندە بە زەحمەتی و لەوانەیە لەئەنجامی ئەزموونی هەزاران ساڵەی مرۆڤ دروست کرابێت، ئەوا پەسند دەکرێت کە چیرۆکی خولقاندنی ئامرازی "**کۆیلە**" بابەتێکی شایستە و بە بایەخی لێکۆڵینەوەیە. کاتێك ئەمە بێنینەوە بیری خۆمان کە گوندییەکی رەنجدەر و کارکەرێکی کارگە بە چ واتایەك دێت و چی لەژێر ئەم ناوانە ئەنجامدراوە، ئەوا باشتر لەواتای"**سیستەمی بەندە**" دەگەین کە درێژ خایەنترین و بە ئێش و ئـازار و زەحمەتترین سیستەمە. ئەگەر تەنیا ئاواکردنی ئەهرامێك یاخود شارێکی کۆن بێنینە بەرچاوان ئەوا باشتر هەست بە مەزنایەتی و سەرسووڕهێنەری کارەکە دەکرێت. ئەرکی راستەقینەی زانستی مێژوو و کۆمەڵگا "**دەرك کردن**" و "**هەست کردنی رۆحی**" ئەم راستینەیە.

هەروەکو چۆن ئافراندن و بەڕێوەبردنی هزری بەندایەتی لەگەڵ دەرکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی واتادارتر بوو، ئەوا لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەم کارە لەمیانەی گەیشتن بە ئەندازیاری و کارامەییەوە بەتۆکمە کراوی بەڕێوە دەچێت. لێرەدا شیکردنەوەی هزر، رۆح، وشیاری ئەنجام نادەم. بەڵام بە بێ ئەوەی ئەم لایەنانەی کۆمەڵگاکان ئاشکرا نەکەین، ئەوا روون کردنەوە و خستنەڕووی فۆناخەکانی مێژوو بە شێوەیەکی راست، سانایی و بەجێ نابێت. ئەو باسانەی پێشتر سەبارەت بەو بابەتە ئاماژەمان پێکردووە، بە ئامانجی ئەوە بوو بەلایەنی کەم ئەم پێویستییە لە ئاستی "**پێناسەکردن**" جێبەجێ بکرێت.

هەروەکو لەهەموو شێوەگرتنە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکاندا بینراوە، ئەوا بە دەزگابوونی کۆمەڵگای چینی کۆیلەدار کە لەئەنجامی رەنجی مرۆڤەوە  پێکهات و دوای ئەوەی بەنێو هەلومەرجی هەمەجۆردا تێپەڕی، هاوکات بە ناچاری ئەنجامدانی گۆڕانکاری و وەرچەرخان پێویستییەکی سروشتەکەیەتی. ماتریالیزمی دیالەکتیکی ئەوەی فێر کردووین کە هیچ ماددەیەك (شتێك) وەکو خۆی نامێنێ و "**بە چەقۆی تیژی رۆژگار ماددەکەی پارچە دەکرێت**" و هی نوێ دەخولقێنرێت. ئـەمـە لـەولاوە بمێنێ کە زانست بە تەواوەتی ئەرکەکانی خۆی سەبارەت بەو بابەتە جێبەجێ نەکردووە، تەنانەت چەواشەکارییە مەزنەکانیشی دەرباز نەکردووە و تەنیا کەرەستەکانی زانیاری بەسەر یەکدا کەڵەکە کردووە، بۆیە شتێکی روون و ئاشکرایە ئەوەی ئێمە بتوانین سەبارەت بەم بابەتە ئەنجامیبدەین، ئەزموون و تاقیکردنەوەیەکی پێناسەکردن دەرباز ناکات. بەڵام لەبەر ئەوەی وەکو ئەرکێکی گرنگی خۆمم بینی، هەموو کاتێك پێیەوە خەریك بووم؛ راست یان هەڵە، ئەوەی باسم کرد بەگرنگم بینی و هێنامە زمان.

بەڕێوەچوونی سیستەمی شارستانییەتی کۆیلەداری لەلایەن سێیەمین خانەدانی ئور و خانەدانەکانی ناوین لەدەوروبەری ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز بەمانای ئەزموونی سەرلەنوێ ئاواکردنەوە دێت. ناکۆکییەکانی سیستەم وەکو کارەکتەرێکی ناوخۆ و دەرەوە بەردەوام مەزن دەبێت. ئەزموون و پراکتیکی توند و تیژی و بێ رەحمانەی سەرجۆن و هەوڵەکانی لەپێناو بڵاوکردنەوەی سیستەمەکە لەدەرەوە دەرفەت و تواناکاری ئەوەی نەداوە بەرەباب و نەوەکانی لەسەد ساڵ زیاتر بەردەوام بکات، لەوە رزگاری نەبووە کە لەڕێگای هەمان ستەم و زۆرداریەوە پاکتاو نەکرێن. تەمەنی خانەدانی ناوینیش زۆر کورتە. ئیتر سیستەم بە شێوازی کۆن ناتوانێ بەڕێوە بچێت، هەروەها لەبەر ئەوەی سەرلەنوێ ئاواکردن لەلایەنی گەوهەرەوە ئەنجام نادرێت، تەمەنی درێژخایەن نابێت. فۆناخی پادشا ـ خوداوەندەکان لەبەردەوامکردنی باوەڕ پێهێنان و پیرۆزیەکەی جاران زەحمەتی دەکێشێ. سەرچاوەی زەحمەتی بینین هەم لەناوەوەیە و هەم لەدەرەوەیە. لەبەر ئەوە بەڕێوەبەرانی هـەرێـم و شـارەکـان بـە گـوێـرەی مـۆدێـلـی پـادشـا مەزن کراون ـ بەخێوکراون بەردەوام هەوڵی سەربەخۆ بوون دەدەن و لەم پێناوەشدا لەدەرەوە

ژمارەیەکی زۆری ڕێککەوتن لەگەڵ هێزە جۆربەجۆرەکانی پێشدەخەن. لەمیانەی ئەزموون و تـاقـیـکـردنـەوەیـەکـی درێـژخـایـەنـدا هـەسـت و دەرك بـەوە دەکـرێـت کـە سـیـسـتـەمـی **"پادشای ـ خوداوەند"**سیستەمی مرۆڤە. هەنگاو بە هەنگاو گۆڕانکاری هزر پێشدەکەوێت. هەر لە دەستپێکەوە ناکۆکی نێوان ڕاهیب ـ پادشا لەئارادایە. گۆڕینی چەندین خانەدان لەلایەن پەرستگای ڕاهیبەکانەوە ئەنجامدراوە.

ئەو شار و هەرێمانەی گرنگیان زیاد بووە بەردەوام بەدوای داخوازی و زیادکردنی هێزدا گەڕاون. تەنیا ئەو گۆڕە زەبەلاحانەی دروست کراون و زیندە بەچاڵ کردنی تەواوی ماڵ و موڵکی (خزمەتکار و نزیکەکانی پادشا) لەگەڵ تەرمی پادشا، زەمینەی مەزنترین شۆڕشی هزری و باوەڕی ئامادە کردووە و ڕێگای لەپێش کەڵەکە بوونی وشیاری کردۆتەوە. ئەو تەکنیکەی پێشکەوتووە و ڕێ لەپێش بەرهەمێکی زێدە دەکاتەوە تەنیا بەهۆی هەبوونی کۆیلە بەکار ناهێنرێ و لەکەنارێك دانراوە. بێگومان لەدوای ئەوەی پەیوەندی باڵادەستی بەسەر تەواوی ئەو ئامرازانەی بەرهەمهێنان زاڵکرا کە نئۆلیتیك خوڵقاندوویەتی، قۆناخێکی موحافەزەکاری دەستپێکردووە، تاڕادەیەکی مەزنیش ئازادی پیشەکاران سنووردار کراوە. لەنێو هەلومەرجی تایبەتی خۆیدا، ئەویش یان ئەوەتا موڵکی کۆشکە یان هی پەرستگا. بەمجۆرەش تا ڕادەیەکی مەزن لە ئازادیەکەی ڕۆژانی ڕابردوو دوورکەوتۆتەوە. لەپێناو خۆی کار ناکات. لەکاتێکدا ژمارەی ئەوکەسانە لەزیابووندایە کە بەرهەم ناهێنن، بەرهەم هێنەرەکانیش لەدەسکەوتی بەرهەمەکانیان بێ بەش دەبن. فراوانبوون و ڤەبوون لەسەر بنەما چینایەتییەکانی ڕاپەڕین و شۆڕشی هزریدا دەبینرێت. ئەو ترس و فشارەی خراوەتە ناویەوە ڕۆژبەڕۆژ لەقۆناخی گرنگ بەشێوەیەکی زیاتر تەنگەتاوی دەکات و گومان سەبارەت بە بنەماکانی باوەڕی زیاد دەکات. لەنێو ڕۆح و هزردا ئەوە دەنگ دەداتەوە کە پێویست بوو خوداوەندەکان هێندە بێ ویژدان نەبن. ئیتر هەستەکانی **"پاڕانەوە و یاخیبوون"** و ناڵین بەدەست ئێش و ئازاراوە گەیشتووە بە ئاست و ڕەوشێك تەحەمول ناکرێت **"ئەیوبەکان"**ی سیستەم ژمارەیان لەزیادبووندایە. ئەیوبی پێغەمبەری سەبر و ئێش، پێغەمبەری ئەو گۆڕانکارییە مێژووییەیە کە لەپێکهاتەی ڕۆح و هزردا هاتۆتە ئاراوە. نوێنەرایەتی ئەم قۆناخە دەکات.

لە دەرەوە دەرفەت و تواناکارییەکانی سەرهەڵدان و هێرش دژی سەرهەڵدان لەزیاد بووندایە. بەر لەوەی شارستانییەتی سۆمەر و میسر شێوە بگرن تیرە سامیەکانی بیابانی عەرەبی لەدوو قۆڵەوە، کەنعانی و ئامۆریتەکان لەرۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لێشاوی کۆچکردنیان بەرەو ئەم ناوچەیە بەردەوام بووە. ئاریانەکان لەتەواوی ناوچە شاخاویەکانی باکوور و دەشتە بەپیت و دارستانەکانی، بەردەوام دژی هێرشەکانی ئیمپریالیزم بەرخودانی کردووە، بەمجۆرەش لەمیانەی ئەو ئاکامانەی لێیان فێربوون و ئەو چەکە زۆرانەی لەسەرچاوە کانزاییەکانی خۆیان دروستیان کرد ئیتر گەیشتنە هەلومەرج و ڕەوشێك کە بتوانن خۆیان بپارێزن و هێرش ئەنجام بدەن؛ لەگەڵ هاوپەیمانەکانی ناوخۆ بەردەوام لەگۆڕینی خانەدان ڕۆڵ دەبینن و تەنانەت خانەدان لەخۆشیان پێك دێنن. گۆتی و ئەکەدی و کاسیتی و هیکسۆسەکان ئەو نموونانەن کە شوێن پەنجەیان لەمێژووی ئەم پێشکەوتنانەدا بە جێماوە. بە شێوەیەکی گشتی بەرەی **"فیدراسیۆنی تیرەکان"** لەهەموو شوێنێك ئاوا دەکرێت، بەرخودانێك بەرامبەر بە ئیمپریالیزمی کۆیلەداری بەڕێوە دەبردرێت. ئەم قۆناخەی بەرخودان ڕێگا لەپێش پێکهاتنی چەندین نیمچە دەوڵەتی نوێ دەکاتەوە. لەکاتێکدا ئەم ڕەوشە ڕێگا لەپێش لاوازبوونی سیستەم دەکاتەوە، ئەوا لەهەمانکاتدا لەپێناو پاراستنی خۆی بەرەو هێرشکاری و دڕندەیی ئاراستە دەگرێ. لەمیانەی ڕەوشی هێرشکاری بابلیەکانی ساڵانی ١٩٠٠ تا ٦٢٥ پ.ز کە لەگەڵ حامورابی دەستپێدەکات و ئاشوورپانیپاڵ کۆتایی دێت و فشار و توند و تیژی سەرجۆنی قۆناخی ئاشووریەکانی دەرباز کردبوو. تەواوی پێکهاتە نەژادییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوینی لەنێو ترس و تۆقاندن خنکاندبوو. هیچ پێکهاتەیەکی نەژادی نەما کە سەراوبن نەبووبێت. هەموو لایەك لەنێو ترس و تۆقاندندایە و بەدەست ئەشکەنجە و ئازارەوە دەناڵێنێ. لەگەڵ ئەوەی لەمیانەی مەزنترین سەردەمی بیر و باوەڕی زەمینەی کۆمەڵایەتی سەردەمی هزر تاوەکو بڵێی بەرفراوان بووە و کراوەتەوە، ئەوا بە پێی دەربازبوونی کات قۆناخی ئایینە تاکخوداییەکان و پێغەمبەران پێشەنگی سیستەمی باوەڕییە مەزن و یاخیبوونە ڕۆحییەکان خۆی دەسەپێنێ. بیری **مەسیح** (فریادڕەس) ڕۆژ لەدوای ڕۆژ وەکو چاوەڕوانییەك لە هزردا جێگیر دەبێت. ئەمە تەنیا گۆڕانکاری بیر و باوەڕ نییە، بەڵکو ئیتر زۆر بەباشی پادشا ـ خوداوەندەکان دەناسن و دەرك بەوە دەکەن کە ئەوانیش وەك خۆیان مرۆڤن، بەمجۆرە هەنگاو بۆ نێو قۆناخێکی مێژوویی ئەو هزرە دەهاوێژرێت کە بە میتۆلۆژی و تیۆلۆژی سنووردار و تێر نابێت و لێیان دادەبڕێت و ئیتر بیرکردنەوەی فەلسەفی خۆی دەسەپێنێ.

## I ـ لەدایکبوونی ئایینی تاکخودایی و جێگەی لەنێو شارستانییەتدا

دەرکەوتنی ئایینە تاکخوداییەکان سەبارەت بە پێکهاتەی ڕەوشت، مۆراڵ و هزری مرۆڤایەتیدا بەواتای شۆڕشێك دێت. گرێدانی بابەتەکە بە گفتوگۆی لەشێوەی **"خودا هەیە یاخود نا؟"** بەواتای شێواندن و چەواشەکاری دێت. بەمجۆرە باسکردنی کێشەکە گەوهەرەکەی پەردەپۆش دەکات و ڕۆڵە گرنگەکەی لەتاریکاییدا دەشارێتەوە. ئەوەی تاوەکو ئێستا ئەندام و زانایانی ئایینی تاکخودایی ئەنجامیان داوە لە پاراستنێکی ڕووت و وشکی خۆیان بەولاوە شتێکی دیکە نییە. ئەم زانا ئایینیانە هێندەی ئەوەی لە شیکردنەوەیەکی قووڵی کۆمەڵایەتی دوورن، ئەوا لەمەش گرنگتر زۆر لەوە دوورە کە ڕۆڵی پێشکەوتنی هزری مرۆڤ و پێکهاتەی لۆژیك و بیرکردنەوەی فەلسەفی لە دەرکەوتن و سەرهەڵدانی زانستەکان دیاری بکات. لەکاتێکدا سەرهەڵدانیان لە گرنگترین قۆناخە ڤەیراناوییەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، کارەکتەری شۆڕشگێڕانەیان نیشان دەدەن، یەکێك لەو بابەتە سەرەکییانەی کە پێویست دەکات وەڵامی ئەوە بداتەوە ئەوەیە کە دەبێ چی بەلاوە بنرێت، داهێنانە نوێیەکە زەمینە بۆ کام هزر و بەدەزگابوون دەرەخسێنێ.

تایبەت بوونیان لەنێو جیابوونەوەی چینایەتی و بە سیاسی بوون، گرنگییەکی زیاتری دەبێت. لەهەندێ شوێنی بەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان بەو بابەتە کردبوو. لەبەشەکانی داهاتووش ئەگەر پێویست بوو هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی قووڵ و بەرفراوان هەڵوەستەی سەبارەت بکەین. لەم بەشەدا پێناسەی کۆمەڵگای چینایەتی ـ کۆیلەداری و ڕۆڵی لەپێشکەوتنی شارستانییەتدا دەستنیشان دەکرێت.

ێ ـ خاڵی هاوبەشی شیمانە و دەستنیشان کردنی زانستی ئەم قۆناخانەی دوایی ئەوەیە کە سەرەکیترین بناخەی دەزگای شارستانییەت، سەرچاوەی خۆی لەشارستانییەتی سۆمەرەوە دەگرێت. میتۆلۆژیای سۆمەریەکان بە شێوەیەکی زۆر ڕوون و سەرنج ڕاکێش مەسەلەی هزری ـ **ئادەم یەکەمین پێغەمبەرە** ـ شیدەکاتەوە. تەنانەت چیرۆکی دروستکردنی حەوا لە پەراسووی ئادەمەوە، جێگای خۆی لە میتۆلۆژیای سۆمەریشدا گرتووە؛ لەبەر ئەوەی هەر تایبەتمەندێتیەك لای سۆمەریەکان خوادوەندێکی تایبەت بە خۆی هەبووە، ئەوا لەمیانەی بەڵگەوە سەلمێنراوە کە هەر کەسێکی نەخۆش دەکەوت لەلایەنی خوداوەند ئەنکییەوە چۆن دەخوڵقێندراوە. هێزی خوڵقاندنی لەپێشە و لە پەراسووی خۆیەوە خوداوەندی ژن ئینانا دەخوڵقێنێت. لەوەش گرنگتر چیرۆکی **"لە بەهەشت بەدەرکردن"** لە میتۆلۆژیای سۆمەریەکاندا بەشێوەی سەرنج ڕاکێش و بە زمانێکی شیعر ئامێز باسی لێوە دەکرێت.

بەهەشت وەك زاراوەیەك پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی هەمە لایەنە هەیە. بەڵام ناتوانرێت نکۆڵی لەوە بکرێت کە وەسفکردنی بەهەشت وەك شوێنێك کە ڕووداوەکانی سیستەم و توندوتیژی تێدا نییە و مرۆڤ وەك دۆست و پارچەیەکی سروشت تێیدا دەژی و یەکسانییەکی گشتی بەسەر پەیوەندییەکاندا زاڵە، وەك شوێن پەنجەیەکی هزری و ئومێدێکی گرێدراو بە قۆناخەکانی سەردەمی نئۆلیتیك پێش خراوە. شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە بۆ چینی کۆیلەداری تازە هەڵکشاو، بەهەشت بە واتای جیابوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی و دونیایەك دێت کە بە بێ ئەوەی کار بکەن ڕزگاریان دەبێت و ژمارەیەکی یەکجاری مرۆڤ وەك خزمەتکار لەژێر فەرمانی خۆیان بەکار دێنن. بەهەشت وەك زاراوەیەك دێتە ئاراوە کە خەیاڵی چینی ژێرەوەی کۆمەڵگای چینایەتی سۆمەر و ژیانی چینە هەڵکشاوەکە یەکانگیر دەکات. ڕۆڵی یەکەمین جیابوونەوەی چینایەتی کۆمەڵگا بە زمانێکی شیعر ئامێزانە و زیندوو لەخوڵقاندنی میتۆلۆژیاکاندا باس دەکرێت. مسۆگەر دوورگەکانی کەنداوی بـەسـرە و کۆشـك و پـەرسـتـگـاکـانـی کـەنـارەکـانـی دیجلە ـ فورات بوونەتە سەرچاوەی ئیلهامی ئەم بەهەشت و میتۆلۆژییانە.

لەو تابلێتانەی کە دۆزراونەتەوە و لێکۆڵینەوەیان دەرهەق کراوە، ناوی چوار خوداوەندی خوڵقێنەر (**ئان، ئەنلیل، نین هورساك، ئەنکی**) دەرباز دەبێت کە لە هەندێ بوارەوە وەك چاوگ لە پێکهاتنی ئایینە تاکخوداییەکان بەکار هێنراون.

ئەو چیرۆکانەی بە "**دیلمۆن**" ناوزەد کراون و تایبەت بە بەهەشتن، بە زمانێکی شیعرئامێزانە باسی زاراوە سەرەکییەکانی ئەو رووخسار و دیمەنانە دەکات کە دواتر دەرهەق بە بەهەشت پێشکەوتن. کۆشکی خوداوەند **ئەنکی** شاری ئەریدۆ کە ناوی "**ئابزوو**"ی لێنرا بوو، گوزارشت لە شێوە بەرجەستەکراوەکەی ئەم خەیاڵە دەکات (ئابزوو: سەرچاوەی وشەی حەوزە، نموونەی یەکەمین کۆشکی حەوزدارە) باخچە هەڵواسراوەکانی بابل و تەواوی کۆشکە پێشکەوتووەکان و کولتووری باخ، سەرچاوەکەی بۆ ئەم مۆدێلە سەرەتاییە دەگەڕێتەوە.

لە چیرۆکەکانی میتۆلۆژیای سۆمەریەکان سەرەتا **نین هورساك** دواتریش **ئینانا** کە  لە سەرەتا وەکو خوداوەندی ژن رۆڵی خۆیان دەگێڕا لەگەڵ بەردەوام بوون و درێژبوونەوەی مێژووی شارستانییەت گرنگییەکەیان لەدەست دەدەن، تا ئاستی مەریەمی دایکی عیسا دێن. ئەم خستن و بێ رۆڵکردنە تاوەکو دوایی لەکەسایەتی حەوادا پێشکەوتووە. هەروەکو چۆن دەگوترێ لە پەراسووی دەرداری ئەنکی دروست کراوە، ئەمە بەهەمان شێوە لەئەفسانەی ئادەم ـ حەواش بەجێ کراوە. کاتێك نین هورساك خوداوەندە ژنی ناوچە شاخاوییەکانی زاگرۆس بوو، بەگوێرەی ئەنکی خاوەن شوێنگەیەکی باڵاتر بوو (بە زمانی سۆمەری، نین واتای ناوونیشانی خوداوەندی ژنە، هور = شاخ، لوتکە، ساك واتای پارچەیە) ئەم ئەفسانە میتۆلۆژییە بە شێوەیەکی بەرچاو رۆڵی لەپێشینەی ژن لەقۆناخی شۆڕشی کشتوکاڵی و نوێنەری خوداوەندی ژن لەسەرچاوەکانی میتۆلۆژیای سۆمەریدا دەستنیشان دەکات، کە بەر لەوەی دابەزنە دەشتەکانی دیجلە ـ فورات بەگوێرەی پێکهاتەی زمانی ئاریان ناوی "**ستار**" بوو (دواتر بە زمانی ئەکەدی بووە عەشتار) بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا ئاماژە بەهێزی کولتووری خوداوەندی ژن دەکات، کە بەرهەمی شۆڕشی کشتوکاڵی نئۆلیتیکە و چۆنێتی وەرچەرخاندنی لەلایەن سۆمەریەکانەوە دیاری دەکات.

قۆناخی خوڵقاندن و دروستکردنی مرۆڤ لە قوڕ لەلایەن ئەنجوومەنی خوداوەندەکانی سۆمەر زۆر سەرنج راکێشە (لە زمانی یۆنانی ناوی "**پانتائۆن**"ی لێنراوە) دیسان لە بەشەکانی دیکەی ئەم میتۆلۆژییە پەیوەندیدارەدا بە زمانێکی پیرۆز و تەواو شیعرئامێزانە باس لەوە دەکرێت، چۆن خوداوەندەکان لەکارکردن ماندوو بوون و ئیتر پێویستیان بەخزمەتکار دەبێت. خوداوەندەکان تەنانەت بڕیار لەسەر چۆنێتی تایبەتمەندێتی خزمەتکارەکانیشیان دەدەن. شتێکی روون و ئاشکرایە کە سیستەمێکی چوارچواری "**بەندەی خودایی**"یان بەرنامەڕێژ کردووە وبەمجۆرە خوڵقاندوویانە. ئەمەش زۆر ئاشکرایە: کە ئەم قۆناخە باس لەپێکهاتنی توێژی سەروو و بیرۆکراسییەتی سەربازی، سیاسی، راهیبی سۆمەریەکان دەکات. لەکاتێکدا راهیب و توێژە رۆشنبیرییەکانی دیکە ئایدیۆلۆژیا دەئافرێنن و بڵاوی دەکەنەوە، هەڵبەتە زۆر باش دەزانن ئەگەر بەخەڵك بڵێن:"**وەرن ئێوە دەکەین بە خزمەتکار**" لەم کارەیان سەرکەوتوو نابن. زۆر باش دەزانن لەجیاتی بەکارهێنانی یەکینەی زەبر لەمیانەی زاڵبوون بە سەر پێکهاتەی رۆحی و هزری ئەوکاتەی مرۆڤ دەتوانن ئەم کارەی خۆیان جێبەجێ بکەن. کاری سەرەکییان ئافراندنی وەهمی میتۆلۆژی و ئایینیە. بەدیهێنانی سەرکەوتن لەم بوارەدا گرنگییەکەی لەو شەڕەی ناو زانکۆکانی ئەوروپا  و ئەمریکا کەمتر نییە کە لەپێناو ئاواکردنی باڵادەستی ئەنجامی دەدەن. بە پێچەوانەوە بەگوێرەی ئەو سەردەمە هەمیشەیی و زانستی و سەرکەوتووانەترە. هەرچینێکی باڵادەست و هەڵبژێردراو بخوازێ بە شان و شەوکەت بێت، یەکەمین کاری ئەنجامی دەدات ناچارە خەڵکە پەیوەندیدارەکان رازی بکات و بیانکات بەخاوەن باوەڕی و ئاستی وشیارییان بەرز بکاتەوە. ئەگەر ئەمە بەسەرکەوتووانە ئەنجام نەدرێت و تەنیا بخوازن لەمیانەی ستەمکاری و تەڵەکەبازی و درۆ بەڕێوەیان ببەن، ئەوا لە ئەنجامی ئەزموونە لە ژمارە نەهاتووەکان سەلمێنراوە کە پێشکەوتن بەدی نایەت. پێویستە سەرەتا باوەڕی و وشیاری بخوڵقێنرێ و لەم پێناوەدا شەڕ بەڕێوە ببرێت.

لێرەدا مەبەستمان ئەو بیر و باوەڕییە ئایدیۆلۆژی و زانستییە نییە کە پێشتر هەن. ئەمە کێشەیەکی سادەی پەروەردەکردنە. هەروەکو نموونەی سۆمەر، پێویستی ئاواکردنی تەواوی پێکهاتەی سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگای چینایەتی، وەك پێویستییەك و ناچارییەك خۆی دەسەپێنێ و بەگوێرەی ئەو سەردەمەش واتای لەدایکبوونی میتۆلۆژیایەکی مەزن و خوڵقێنەرە.

راهیبە سۆمەریەکان خەریکی ئەم کارە مەزن و مێژووییەن و ئەمەش سەرکەوتنێکە کاریگەری لەسەر تەواوی تەمەنی شارستانییەت دەکات. ئەم سەرکەوتنە تەنیا لەپێناو ئەو چینە باڵادەست و چەوسێنەرە ئەنجام نادەن کە لەبەرچاویان باڵا دەگرن. بەڵکو بۆ تەواوی کۆمەڵگای چینایەتی، بە گوزارشتێکی دیکە ئەم سەرکەوتنە بەناوی ئەو هێزانە تۆمار دەکەن کە نوێنەرایەتی شارستانییەت دەکەن. گرنگییەکەیان لێرەدایە. شتێکی هێندە زەحمەت نییە کە لێرەدا لەمیانەی پشت بەستن بەبەڵگەوە باس لەوە بکەم چۆن ئەم کارەیان ئەنجام داوە، بەڵام جێگەکەی ئێرە نییە. بەڵام ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێت کە بابەتێکی سەیر و گرنگە سەبارەت بە یەکلاکردنەوە و پاککردنەوەی مێژووی رۆژهەڵاتی ناوین لەکاریگەری دۆگماکان.

چۆنێتی خوڵقاندنی ئادەم لەقوڕ، لەتەواوی کتێبە ئایینیە پیرۆزەکاندا باس دەکرێت. بەڵام سەرچاوەی سەرەکی ئەم باسکردنەش میتۆلۆژیای سۆمەرە. هەروەها لەگێڕانەوە و چیرۆکە شیعرئامێزەکەیدا باس لەوە دەکات کە ئەم قوڕە لەکەناری کام هەڵدێر هاتووە و کام خوداوەند خوڵقاندوویەتی (لەمیانەی زایین). بێگومان لەبەر ئەوەی مرۆڤ وەکو خزمەتکار دەبینن، بۆیە هەروەکو بڵێی لەپاشماوە و پیسایی خۆیان دەیانخوڵقێنن، گوزارشت و دەربڕینی بچووك بینینیان لەباسەکانی چیرۆکەکەدا زۆر بەسانایی دەبینرێت.

شتێکی بەمجۆرەش بەرچاو دەکەوێت کە ناوە ناوە تاکە تاکەی خزمەتکارە بژاردراوەکانی تەڤلی یەکینەکانی خۆی کردووە. دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە ئەم بابەتە یەکەمین چیرۆکی خودایی نووسراوی گۆڕانکاری چینەکانە. لەکاتێکدا بەخۆیان لەئاسمان، مانگ، خۆر، ئاگر و هەوا دەخوڵقێنرێن، ئەوا مرۆڤ لەقوڕی پیسایییەکانی ئەوان دەخوڵقێنرێن. چینی باڵادەست و چەوسێنەر دەتوانێ هێندەی بەئاقڵمەندی و ئاشکرا جیاوازی خۆی بخاتەڕوو.

هەروەها دەتوانرێ زاراوەی "**لە بەهەشت بەدەر کردن**" بە سانایی شیبکرێتەوە کە لە تەواوی پەرتووکە پیرۆزەکاندا باسکراوە. ئەمە لە نزیکەوە پەیوەندی بەو یەکلابوونەوانەی کۆمەڵگای چینایەتی سۆرمەییەکانەوە هەیە. ئەمە لەلایەکەوە گوزارشت لەدابڕانی چینی سەرووی دەکات، لەو هاوتەمەنانەی خۆیان کە پێشتر لە رێی رەچەڵەك بەیەکەوە گرێدراو بوون، لەلایەکی دیکەشەوە گوزارشت لەخستنی ئەو خزمەتکارانە دەکات کە کەوتوونەتە نێو رەوشی کۆیلایەتی و باڵادەستی چینی سەروو. زاراوەی "**میوەی گوناه**" وەکو بانگەشەیەك وایە کە ئیتر لەدەورووبەری سوفرەی کۆشکەکانیان جێگەی ئەو مرۆڤانە نەماوە، پەیوەندی خۆی بەهێرشێکی دیکەی ئایدیۆلۆژیەوە هەیە. واتە ئیتر جێگەی مرۆڤە خزمەتکارەکان لەو شوێنانەدا نابێت کە خۆیان تێیدا دەژین و وەك بەهەشت وایە. ئەم زاراوە نوێنەرایەتی رەنگدانەوەی جیاوازی چینایەتی چینی سەردەست دەکات کە خواستی بەهانەی جیاوازی خۆی بەدرێژایی مێژووی شارستانییەتی لەمیانەی هێڵێکی سوور، پەردەیەکی ئەستوور و دیوارێکی پۆڵایین نیشان بدات.

ئەفسانەی پێغەمبەر نووح، واتە هەروەکو چۆن رووداوی تۆفانیش جێگای خۆی لەنێو هەموو پەرتووکە پیرۆزەکاندا گرتووە، لەگەڵێك داستانی سۆمەریەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە لەداستانی گلگامێش باسکراوە. بەشێوەیەکی زانستییانە دەستنیشان کراوە کە لەدەورووبەری ساڵانی ٣هەزار ساڵ پ.ز کە هەڵکشان و زیادبوونی ئاستی ئاوی ئۆقیانووس لەئارادا بووە. لەبەر ئەوەی هەڵکەوتی دەریای بەسرە لەنزیك ئاستی زەویدایە، بۆیە لەسەردەمی سۆمەریەکاندا بووە هۆکاری چەندین لافاو و، ئاو چەندین شوێنی نیشتەجێبوونی لەگەڵ خۆیدا بردووە. ئەم ئەفسانەیە لەگەڵ زەمینەیەکی ماددی و رۆژگارێکی بەمجۆرەدا یەکتری دەبڕێ. ئەم رەوشە هۆکاری گواستنەوەی شوێنی نیشتەجێ بوونی سۆمەریەکانە بەرەو باکوور. بە ئەندازەی ئەوەی هۆکارەکانی ئەم گواستنەوەیە بەنەفرەت لێکردنی مرۆڤ لەلایەن خوداوەندەکانەوە گرێ دەدرێت، شیمانە دەکرێت وەك کاردانەوەیەك بەرامبەر بەزیادبوونی ژمارەی دانیشتوان لەنێو میتۆلۆژیادا باسکرابێت. وەکو کردەوە و چالاکییەکی سزادان دەمامکێکی ئایدیۆلۆژییان بەسەردا کێشاوە.

چیای جودی شوێنی گیرسانەوەی ئەم کەشتییەیە کە بۆ رزگاربوون لەتۆفان جووتێکی "**نێر و مێ**" و  هەر زیندەوەرێکی لێ سوار بووە. هەروەها لەبەر ئەوەی جوودی چیایەکی هەرەبەرزی نزیکی میزۆپۆتامیای خوارووە، ئەم مەسەلەیە پشت راست دەکات. تاوەکو ئێستاکەش لەهەرێمەکەدا وەکو شوێنی کەشتی نوح باسی لێوە دەکرێت. وشەی NUH و CUDI

لەزمانی کوردی رۆژگاری ئەمرۆمان واتای NWE و CiHDi دێت (di=dit و cu=ce و nuh=nwe). ئەم سێ وشەیە ریشەی زمان ناسییان زۆر کۆنە، وشەی بنچینەیی تەواوی زمانە هیندۆ ـ ئەوروپییەکانە، ریشەکانی "deus، cih و nuh" بە روون و ئاشکرایی ئەمانە دەسەلمێنێ. هەبوونی ئەم رەگ و ریشانە بەلگەی سەلمێنەری پەیوەندی زمانی ئارییە بەو شۆڕشە کشتوکاڵییەی لە ١٠ هەزار ساڵ پ.ز لەم هەرێمەدا رووی داوە. لەهیندەوە تاوەکو ئەوروپا سەرچاوە گرتنی گەلێك وشە لە کەوانی بەپیتەوە بەشێوەیەکی گشتی ئەمە پشت راست دەکات. پێشکەوتنی زمانی سەدان گروپ لەسەر بنەمای رەگ و ریشەی ئاریان، مەزنایەتی سەردەمی نیۆلیتیك و، لەبواری راستینەی ئەو رۆژگارەش دوورییەکەی سەلمێنەری هێزەکەیەتی.

ئەفسانەی پێغەمبەر ئەیوبیش بەرهەمی ئەو قۆناخەی سۆمەریەکانە کە تێیدا ئێش و ئازار و بێ ئومێدی بالای گرت و قەیراناوی بوو. خوداوەندەکان وەڵامی پاڕانەوەی مرۆڤایەتییان نەدایەوە کە رووبەڕووی راستینەی ژیانێکی بێ ئومێدی و بە ئێش و ئازار ببوەوە. لەساڵانی دەورووبەری ٢هەزار پ.ز ئەم تەنگژە و قەیرانانە زیادی کردووە. شتێکی روون و ئاشکرایە کە پێغەمبەر ئەیوب کە تا ئێستا گۆڕەکەی لەئورفا ماوەتەوە، سەرچاوەکەی بۆ ئورفا دەگەڕێتەوە (هەموو ئەو وشانەی ـ ئور ـ یان پێوەیە سۆمەرییە **"شوێنەکانی نیشتەجێبوونی سەر کردەکان"**). ئورفا و هەرێمی دەوروبەری کە بە شاری پێغەمبەران ناودەبرێت، شوێنێکە کە سۆمەریەکان لەساڵانی ٢ هەزار پ.ز کۆلۆنییەکانی خۆیان تێدا دامەزراندووە. لەهەمانکاتدا شوێنی رووبەڕوو بوونەوە و پێکدادانی هەردوو کولتووری مێژوویی گروپە گەڕۆك و شوانکارییەکانی ئامۆریتی ـ سامی ـ (بەردەوام لەبیابانەکانی عەرەبستانەوە بەرەو باکوور، بۆ میزۆپۆتامیا کۆچ دەکەن) و هوریەکانی باکوور کە بەکشتوکاڵەوە خەریکن و ریشەیان بۆ ئاریان دەگەڕێتەوە، لەوەش زیاتر هەرێمێکی سەرەکی مێژووی بازرگانی کردنی کۆلۆنییە سۆمەریەکانە. پێشکەوتن و پەرەسەندنی ئۆپۆزیسیۆن بەرامبەر بە سیستەمی سۆمەر گرێدراوی ئەم زەمینە و راستینە ماددییەیەتی.

فرە کولتووری واتای هەمەڕەنگی هزرییە. لەبەر ئەوەی سنوور و خاڵی هەرە سەرووە، بۆیە کۆنترۆڵیان هێندە بەهێز نییە. شتی هەرە گرنگ ئەوەیە کە هەبوون و پەرستنی هزرە جێگیرەکان بەعینادەوە بەردەوامە. لەئەفسانەی حەزرەتی ئیبراهیمیشدا دەردەکەوێت کە لەسەردەمی قەیرانە گشتییەکان بەرامبەر نەمروودی ئورفا (بە سۆمەری، نەمروود= نازناوی پادشایە) سەرهەڵدان زیاد دەکات. ئەفسانە و شوێنی چەندێن پێغەمبەری دیکە لەئورفا هەیە. بەمجۆرە روون دەبێتەوە کە هەم کۆلۆنی ئیمپریالیستی سۆمەری لەدەرەوە و چیرۆکەکانی نەمروود کە نوێنەرایەتی دەکات، هەم ئەفسانەکانی دەرهەق بەپێغەمبەرەکان کە یەکەمین رکەبەر بوون، ئاماژە بەوە دەکەن کە ئورفا وەك شوێنی ململانێیەکی درێژخایەن رۆڵی بینیوە. جوگرافیای ئورفا، بەپیتی خاکەکەی، ئاو و هەواکەی، ناسنامەی کولتووری و پێشکەوتنی مێژوویی ئەم شیمانەیە بەهێز دەکات. کەمێکی تر باس لەوە دەکەین.

هەرێمی قودس رۆڵێکی هاوشێوە دەبینێ. لەکاتێکدا ئورفا بەشێوەیەکی زیاتر ئەم رۆڵە بەرامبەر ئیمپریالیزمی سۆمەر دەبینێ، بە هەمان شێوە قودس بەرامبەر ئیمپریالیزمی کۆیلەداری میسر دەیبینێ. هەردوو شوێنیش سەرچاوەی دەرکەوتنی پێغەمبەرانن. هەردوو شوێن وەکو ناوەندی ئۆپۆزسیۆنن. لە ساڵانی ٢ هەزار پ.ز بەدواوە دەرکەوتنی ئەم شار و هەرێمانە وەك ناوەندی ئایینە تاکخوداییەکان، سەرچاوەی خۆی لەم شوێنگەیانەوە دەگرێت. لە کۆچکردنی حەزرەتی ئیبراهیم بەرەو قودسەوە تاوەکو دەرکەوتنی عیسا بەمجۆرەیە.

ب ـ (باس لەوە دەکرێت کە "ئەبگەر"یەکانی ئەو سەردەمە کە بەسەر ئورفادا دەسەڵاتدار بوون، عیسایان بانگهێشتی ئورفا کردووە.) ئەو هاتوچۆیانەی بە درێژایی دوو هەزار ساڵی رابردوو لە نێوان ئەم دوو شوێنە ئەنجامدرا، بەهۆی ئەم شوێنگە مێژووییە بووە. ئەم دوو ناوەندەی ئایینە تاکخوداییەکانی لێ هەوێن کرا، نوێنەرایەتی ئەو زەمینە کولتوورییەش دەکەن کە ئەو سەردەمە لە ئاستی پیرۆزبووندا ئومێدی ئازادی لێدەکرا. لە رۆژگاری ئەمرۆشماندا پێناسە کردنی ئەم دوو شارە بە پیرۆزی، سەرچاوە و بناخە سەرەکییەکەی بۆ ئەو شوێنگەیان دەگەڕێتەوە کە ئەو کاتە بەرامبەر توندڕەوترین کۆیلەداری نیشانیان داوە. لەبەر ئەوەی رۆڵەکەیان زۆر مەزنە، بۆیە لە هزر و مێشکی مرۆڤایەتیشدا جێگایان مەزنە و لە بیر ناکرێن. ئەگەر بێتو رەوشی پێغەمبەرایەتی لە دەمامکە ئەستوورەکەی ئایین دوور و جیا بکەینەوە و هەوڵبدەین پەیوەندی و ناکۆکییەکانی لەگەڵ کۆنترین شارستانییەتی کۆیلەداریدا دیاری بکەین، ئەوا دەتوانرێت پێناسەیەکی نزیك لە راستی پێشبخرێت. دەتوانین وەکو بیرۆکەیەك تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەرایەتی بەمجۆرەی خوارەوە هەڵسەنگێنین.

ا ـ بە شێوەیەکی بەرچاو لە باوەشی کۆنترین دوو سیستەمی کۆیلایەتیدا پێشکەوتووە: هەم کاریگەری ئەو دەزگا ئایدیۆلۆژیانەی لەسەر کراوە کە یەکلابوونەوەی کۆمەڵایەتی هێناویەتە ئاراوە، هەم کاریگەری ئەو ئاڵۆزی و تەنگژانەی لەسەر هەبووە کە سیستەم خولقاندوویەتی. وەکو یاخیبوونەوەیەکی مەحشەر ئاسای ویژدان بەرامبەر بەو فشارە تۆقێنەرە سەر هەڵدەدات کە سیستەم دەیخاتە سەر پێکهاتەی هزری و شێوەگرتنی نەتەوەیی مرۆڤایەتی.

ب ـ لە شێوەگرتنێکی ئایدیۆلۆژی سەربەخۆ زیاتر، هەوڵدەدات سەرلەنوێ شێوە بدات بەو لایەنانەی میتۆلۆژیا و چەمکە ئایینیە باوەکان کە بە شێوەیەکی بەرچاو و رووت لەگەڵ راستیدا ناکۆکن. هێزێکی ئەوتۆیان نییە دەزگا و چەمکە فەرمییەکان تێپەڕ بکەن. هەر چەندە لایەنی شۆڕشگێڕیان هەبێت، بەڵام تایبەتمەندێتیە زاڵ و باوەکانیان گەوهەری ریفۆرم لە خۆوە دەگرن. لە ئەنجامدا سیستەم نوێ دەکەنەوە و دەیگەیەننە رەوشێك کە توانای تەڤلی بوون و جێگرتنی تێدا هەبێت.

ج ـ توێژی هەژاری ئەو چینە کۆمەڵایەتییانەی بنەما کۆمەڵایەتییەکەیان یەکلابۆتەوە، ئەو بەشەی دەرەوەی توێژی باڵادەستی پێکهاتە ئەتنیکییە هەڵوەشاوەکان بە بناخە دەگرێت. بەردەوام کارەکتەرێکی بەمجۆرەشیان بەرچاو دەکەوێت کە لە کاتێکی کورت و بە خێرایی ئەو کەسانە بۆ خۆی رادەکێشێ کە بە تەواوەتی ناکۆکییان لەگەڵ سیستەمی رێبەرایەتی تیرەکان هەیە و لە دەزگا کۆمەڵایەتییەکان دابڕاون و بە تەنیا ماونەتەوە.

د ـ زیاتر لەوەی کە وەکو هێزێکی ماددی، سیاسی بجولێنەوە، بە شێوەی رێبەرایەتییەکی ئایدیۆلۆژی دەردەکەون، کە لایەنی مەعنەوی و ئەخلاقیان لەپێشە.

ئەم بابەت و تایبەتمەندێتییانەی دەتوانین زیاتر باسی بکەین، تاوەکو بڵێین ناوەڕۆکی بە دەزگا بوون روون دەکاتەوە. ئەگەر بێتو لەگەڵ تایبەتمەندێتی هەر سێ پێغەمبەرە مەزنەکە بەراوردی بکەین، ئەوا تا رادەیەك لە واتاکەی تێدەگەین. هەروەها ئەگەر بێتو لەسەر بنەمای ئەم تایبەتمەندییانە تەماشای جوڵانەوە بەرچاوەکانی پێغەمبەرانی جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوین بکەین ئەوا دەتوانین بەمجۆرە پێشکەوتنەکانیان ریزبەند بکەین:

١ ـ ئیبراهیم سەبارەت بە چەمکەکانی ئایین لە ژێر ناوی تەوحید (یەکبوون) بناخەی سیستەمێکی داناوە کە پشت بە تاکخودایی دەبەستێت. خودای حەزرەتی ئیبراهیم خاوەنی تایبەتمەندێتی گرنگە. بەر لە هەموو شتێك لە یەکینەی خوداوەندکانی سۆمەر و میسر دابڕاوە. بە واتایەکی دی لە بواری خوداوەندی، سەربەخۆیی بەدەست هێناوە. ئەمەش وەکو **"سەمبۆڵ"**ێك بە شێوەیەکی گشتی ئاماژە بە ئازادی مرۆڤ دەکات و بە تایبەتیش ئاماژە بە ئازادی مانەوەی پێکهاتەی ئەتنیکی و تیرەکان دەکات. مسۆگەر بە گوێرەی پێکهاتەی ئایینی و میتۆلۆژی هەردوو سیستەمە کۆنەکە ناسنامەی خوداوەندی نوێ لە بواری ئازادیدا بە واتای هەنگاوێك دێت.

٢ ـ ناسنامەی خودایی بە تەواوی لە مرۆڤ جیاوازە، گەوهەرێکی بەمجۆرەی هەیە کە ناکرێت بە بت و نەمرە لە ئاستی ژووردا داڕنراوی (**مجرد**) جێگای باسە. هەم چەمکی ئایینی تەوتەمی تیرەکان، هەم چەمکی ئایینی چینایەتی کە رەنگدانەوەی پادشایەتی سیستەمی کۆیلایەتییە، بەلاوە دەنرێن. ئەمەش پێشکەوتنێکی ئایینی بەمجۆرە لە خۆوە دەگرێت کە موخاتەبەی تەواوی خەڵك دەکات و قۆناخێکی پێشکەوتووتری هزری بە بنەما دەگرێت.

٣ ـ لەمیانەی ئەم رەوشەشدا نوێنەرایەتی قۆناخێکی پێشکەوتووتری لۆژیکی هزری مرۆڤ دەکات. زاراوەی فرە خوداوەندی تەوتەمی بە شتێکی منداڵانە دەبینرێ و بە گوێرەی لۆژیکیش پاشکەوتووە. لە خۆوە گرتن و کۆکردنەوەی هەر کەسێك کە هزر و ویژدانی وشیار بۆتەوە بۆ ئەم تایبەتمەندێتیە دەگەڕێتەوە.

٤ ـ ئایین زیاتر لە نێو زەمینە و هەلومەرجی ئەو تیرانە دەردەکەوێ کە بە رەچەڵەك ئاری و سامین و لەگەڵ سیستەمدا نابن بە یەك و دەستیان لە فێربوون و خوورەوشتی گەڕۆکی ئازادانە بەرنەداوە، هەروەها لە نێو ئەو زەمینانە دەردەکەون کە پیشەکار و کەسایەتی وەکو مەجنون و دەروێشی تێدا دەرکەوت. بە تایبەتیش تەنگژەی سیستەمی کۆیلەداری کە دوای ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز پێشکەوت، رێگا لەپێش هەڵکشانی شەپۆلە یەك لە دوای یەکەکانی پێغەمبەرایەتی دەکاتەوە و ئەمەش گرنگترین لایەنی جوڵانەوەی کۆمەڵایەتی پێك دێنێت.

٥ ـ جگە لەو دەوڵەتانەی ناوەندەکەیان سۆمەر و میسرە، ئەوا ئەو ژمارە زۆرەی نیمچە دەوڵەتی شارەکان کە لە نزیکەوە پەیوەندییان بە جوڵانەوەی پێغەمبەرایەتییەوە هەیە. بەرچاوترین نموونەش پادشایەتی عیبرانییە.

٦ ـ هەم بەهۆی کارەکتەری سیستەمی کۆیلەداری باڵادەست، هەم بەهۆی پێکهاتەی تیرەی باوکسالاری، باوەڕی ژن و خوداوەندی ژن بە تەواوەتی کۆتایی پێهاتووە. بە تایبەتیش لە دوای ئەوەی سۆمەریەکان لەلایەن گروپە ئامۆریتەکان لە سیاسەت دوور خرانەوە و قۆناخی ئیمپراتۆرییەتی بابل دەستیپێکرد. ئەم مەسەلەیە یەکلابۆوە و مسۆگەرکرا. داستانی خوڵقاندنی بابل (ئەنوما ئەلیش) گوزارشتی روون و ئاشکرایەتی. حەزرەتی ئیبراهیم و تەواوی خوداوەندەکان پیاون و جێگای ژن لە نێو سیستەمەکانیاندا نییە. جێگای ژن لە شەیتان نزیك کراوەتەوە. کاریگەری بابل لەسەر حەزرەتی ئیبراهیم و کاریگەری میسر لەسەر حەزرەتی موسا، رۆڵێکی بە کاریگەریان لە دوور خستنەوە و بەلاوەنانی ژن هەیە، لە نێو پێشکەوتنی کۆمەڵگادا. راستتر بڵێین لە قۆناخی شارستانییەتدا لە دوای ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز ژن بەردەوام ستاتۆیخۆی لەدەستدەدات. بەمرِەنگە شانبەشانی جیابوونەوەی چینایەتی گشتی، جیاوازی رەگەزیش پێشدەکەوێت.

٧ ـ دواتر هزری تاکخودایی دەبێت بە ئامرازێکی ئایدیۆلۆژی کە بە شێوەیەکی فراوان لەپێناو تۆکمەکردنی دەسەڵاتی پادشا بەکاردەهێنرێت. یەك خودا = یەك پادشا وەکو (فۆرمیلەیەکی) هاوکێشەیەکی بەڕێوەبردن بەکاردەهێنرێت. هەروەکو چۆن لە قۆناخی سەرەتادا ئەم هزرە لە بواری پێشکەوتنی ئازادیدا وەکو هەنگاوێکی گرنگ رۆڵی بینی، لەهەمانکاتدا خاوەن گەوهەری لۆژیکی دارِنراوی (**مجردیە**) بوو. بە واتایەکی دی چینی دەسەڵاتدار خوداوەندی باشەی ئایینە نوێیەکەی پەسند کرد و بە گوێرەی خۆی گونجاندووە.

هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە دەزگای پێغەمبەرایەتی رۆڵێکی دیاریکراوی لە نەرمکردنی سیستەمە کۆیلەدارییە کۆنەکاندا بینیوە. ئەو لێشاوە ئایینیەی لەگەڵ بەلاوەنان و تێپەڕاندنی قۆناخی پادشاکان دەستیپێکرد، کە یاساکانی سروشتیان بەسەر رۆح و هزری مرۆڤایەتیدا پیادە دەکرد و بانگەشەی مەزنایەتی تاکخودایی دەکرد و پادشاکانیش ناچار بوون حیسابی خۆیانی تێدا بدەن، دووەمین جوڵانەوەی مەزنی شارستانییەتە کە لە رۆژهەڵاتی ناوین خوڵقێندرا. هەرچەندە دووچاری لادانیش هاتبێت، وەلێ یاساکانی تاکخودایی لە بواری پێکهاتەی لۆژیکی مرۆڤ و بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتدا گوزارشت لەپێشکەوتن دەکات. بە تایبەتیش بەستنەوەی پێکهاتەی سیاسی لەلایەن یاسا ئایینیەکانەوە، بەکارهێنانی بێسنووری هێزی وەستاندووە. گۆڕانکاری ریشەیی پێکهاتەی هزر، راستی قۆناخێکی گرنگی پێشکەوتنی لۆژیك هات. قۆناخی ئیلاهییات هاوکات جیابوونەوەی "**شیعر، ئیلاهییات، فەلسەفە و پەخشان**" دێت کە شاعیر و فەیلەسوفی ئەڵمانی بەناوبانگ "**گۆتە**" سەبارەت بە بانگەوازییەکانی رۆح کە پێشیخست، ئەمەش بە تەواوی لەگەڵ هەڵکەوتی ئەو قۆناخەدا یەکانگیرە کە ئایینە تاکخوداییەکان تێیدا باڵادەستن و دەزگای پێغەمبەرایەتی شکۆمەند و بەرز کراوەتەوە. ئەو تێکۆشانانەی لەژێر ناوی ئایینە تاکخوداییەکان بەڕێوەچووە، رۆڵێکی سەرەکییان بینیوە لە بەلاوەنانی هەر سێ ئیمپراتۆرییەتە مەزن و درێژخایـەنـەکـانـی مـێـژوو (سۆمەر ـ ئاشوور، میسر و رۆما).

## ـ بەرخودانی پێکهاتە ئەتنیکییەکان و شارستانییەتی کۆیلەداری

جۆرێك لەو جوڵانەوە مێژووییانەی کە لەسەرەتای لە دایکبوونیانەوە تاوەکو دوایی، سیستەمی کۆیلایەتی لەگەڵیاندا لە نێو شەڕ و پێکدادان بووە، ئەو یەکێتیە ئەتنیکییانەن (تیرە، خێڵ) کە وشیاربوونەتەوە. هەبوونە ئەتنیکییەکان کە لەسەردەمی نئۆلیتیکدا بە شێوەیەکی خۆخۆیی (**عفوی**) بوونە خاوەن پێکهاتەیەك، گوزارشت لە چینێکی وەکو چینی کارکەر دەکەن. بۆ درێژەدان بە هەبوونی خۆیان پێویستییان بە ئاستی تێگەیشتنی بەرخودان نییە. چونکە دوژمنێکی هێرشکار لە ئارادا نییە، هێشتا ئەم ناکۆکییانە دروست نەبوون کە رێگا لەپێش وشیاری ئەتنیکی دەکاتەوە. بەرخودان و یەکێتی ئەتنیکی پێویستی بە ئامانج هەیە. لەبەر ئەوەی ئەم ئامانجە ریشەکەی لە دەرەوە هاتووە، هەروەها لەبەر ئەوەی لەلایەن کۆمەڵگایەکی چینایەتییەوە ئاراستە دەکرێت، بۆیە پێویستی سروشتی ئەو ناکۆکییە رێگا لەپێش وشیاری دەکاتەوە. واتا ئەو کۆمەڵگا سیاسییە ـ چینایەتییە نوێیەی لە ئامێز و تەنیشتییانەوە گەشەی کرد، ئەم ناکۆکییە دەخوڵقێنێ. لە کاتێکدا توێژی سەرەوەی پێکهاتەی ئەتنیکی تەڤلی کۆمەڵگای نوێی چینایەتی دەبێت و جێگای خۆی تێدا دەگرێت، هاوکات توێژی ژێر، خۆی لە بەرامبەر هەڕەشەی هەمەجۆر دەبینێتەوە. لە سەرەتادا یەکینەکانی کۆمەڵگای چینایەتی لە رەوشی دوورگە جیاجیاکانی ئۆقیانووسی جیهانی نئۆلیتیك دان. هەڕەشە لاوازە. بەڵام کاتێك لەهەر چوارلاوە دوورگەکانی شارستانییەت گەشە دەکەن، ئەمجارە بۆ خۆیان دەبن بە دوورگەی بچووك. بۆ ئەوەی بە تەواوەتی قووت نەدرێن، لە بەرخودان و وشیاربوون بەولاوە هیچ بژارێکی دیکەیان نییە. بەهێزبوونی وشیاری ئەتنیکی لە رۆژهەڵاتی ناوین و هەرێمی دیکەش سەرچاوەی خۆی لەم پەرەسەندنە مێژووییەوە دەگرێت. لەگەڵ گەیشتنی شارستانییەتی کۆیلەداری بە قۆناخی ئیمپریالیستی، سەبارەت بە قەوارە ئەتنیکییەکان واتای هاتنی قۆناخی "**بوون بە گروپی ئەتنیـکی وشـیـار**" دێت. لەلایەنی پێشکەوتنی مێژووییەوە دەشێ بەمجۆرە بەدواداچوونی ئەم قۆناخە ئەنجامبدرێت.

ا ـ جموجۆڵەکانی کۆلۆنیکردن لە ساڵانی ٣٠٠٠ پ.ز بە پشت بەستن بە شارستانییەتی شەڕ ئەنجامدرا، ئەمە رێگای لەپێش وشیاری پێکهاتە ئەتنیکییەکان کردەوە تاوەکو خاوەنداریێتی لەسەرچاوەکانی کەرەستەی خاوی ناوچەکەیان بەرژەوەندی خۆیان بکەن. کاتێك دەسەڵاتدارانی کۆلۆنییەکان لەمیانەی توند و تیژیەوە دەستدرێژیان بۆ سەر توانستەکانیان کرد، ئەمە دەستپێکردنی قۆناخی خوێناوی و وشیاری بەرخودانی لەگەڵ خۆیدا هێنایە ئاراوە.

ب ـ کاتێك بەرژەوەندی گرنگی ماددی کەوتە ناو مەسەلەکەوە، ئەوا هەم لە ناوخۆ، هەم بەرامبەر بە دەرەوە پێویستی سەرلەنوێ رێکخستنەوەی پێکهاتەی ئەتنیکی پێشکەوت، بە تایبەتیش بە دەستهێنانی هێزی پاراستن و هێرشکردن قۆناخێکی نوێیە. هەربۆیە لەمیانەی ئەو ئامرازانەی چەك کە لە کۆلۆنییەکان و لە قۆناخی شەڕی دژی ئیمپریالیستەکان فێربوون، پێکهێنان و ئاواکردنی فەرماندارییەتێکی سەربازی بۆتە ناچارییەك. ئیتر لەسەر پێ مانەوە و پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان گرێدراوی هێزە سەربازییەکانیانە.

ج ـ بۆ گەیشتن بە هاوسەنگی هێز، رێککەوتن لەگەڵ ئەوانەی رووبەڕووی هەمان چارەنووس و ناکۆکی بوونەتەوە بۆتە ناچارییەك. لە مێژوودا ئەم رێککەوتنە بە شێوەی "**فیدراسیۆنی تیرەکان**" رووبەڕوومان دەبێتەوە. یەك بوونی ئەم رەوشە لەگەڵ ناکۆکییەکانی ناو سیستەم و رێگاکردنەوەیان لەپێش گۆڕانکاری چەندین خانەدان، لە نزیکەوە پەیوەندی بەم قۆناخەوە هەیە. هەروەها ئەم قۆناخە هاوکاتی ئەو قۆناخەی خێڵەکانە کە بە "**قۆناخی قارەمانێتی**" ناودەبرێت.

د ـ دوو ئەنجام چاوەڕوانی ئەم فیدراسیۆنانە دەکات: یا ئەوەتا سەردەکەون و زیاتر ناوەندیبوون پێشدەخەن و دەبنە خاوەنی ناوەندی شار و دەبن بە دەوڵەت، یان ژێر دەکەون و پەرتەوازە دەبن و پەنا دەبەنە بەر چیا و بیابانەکان و هەوڵدەدەن خۆیان بپارێزن، یاخود وەکو دیلە نوێیەکانی کۆمەڵگای چینایەتی باڵادەست، دەتوێنەوە و لەناودەچن. بەرامبەر بەم راستینە بەردەوام رەوڕەوەی مێژوو بەمجۆرە دەسووڕێتەوە. ئەمە تا رۆژگاری ئەمرۆمان هاتووە و بەردەوامە.

هـ ـ ئەم شێوازەی وشیاربوونەوەی خێل وشیارییەکی سنوورداری سەرەتایی قەوم لە ناواخنی خۆیەوە دەگرێت (قەوم = نەتەوە نەك میللەت.) وشیاری قەوم دوای وشیاری خێل دێتە ئاراوە و لەگەڵ بەلاوەنانیشی پێشدەکەوێت. لەو پێکهاتانەی کە وشیاری خێلەکی تێیدا بەهێزبێت و رەگ و ریشەی خۆی داکوتابێت، وشیاری قەوم بە سانایی گەشە ناکات. لەو قۆناخانەی کە پێکهاتەی خێڵایەتی بەش ناکات، ئەمە دەبێتە کۆسپ لەپێش قۆناخ و چارەسەری کێشەکاندا، بەمرەنگە وشیاری و پێکهاتەی نەتەوە هەنگاوێکی دیکە دەهاوێژێ. ئەم هەنگاوانە زیاتر خاوەن گەوهەرێکی سیاسی ـ سەربازین. لە ژێر رۆشنایی ئەم شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنانەوە دەتوانین ئەم پێشکەوتنانە لە مێژوو و جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناویندا ببینین:

١ ـ لێشاوەکانی تیرە سامیەکان لە سێ قۆناخی مەزندا رۆڵی گرنگیان بینیوە. تەڤلیبوونیان و رۆڵیان لە پێکهاتنی شارستانییەتی میسر و سۆمەر دیاریکراوە. لە قۆناخی دووەمدا زیاتر بەرخودانیان نیشانداوە. بە شێوەیەکی زیاتر رێبەرایەتییەکەیان لە رێگای پێغەمبەرایەتیەوەیە. لە رۆژهەڵات ئامۆریتەکان دژی سۆمەریەکان راوەستان و هێرشیان کرد، لە رۆژئاواش کەنعانی و عیبرانییەکان بەرامبەر میسر بەرخودانیان کرد و لە ناوەوەش هێرشیان کرد، ئەم دوو قۆناخە پێکدێنن. قۆناخی دەرەبەگایەتی ـ ئیسلامییەت، قۆناخی بڵاوبوونەوەی عەرەبە سامیەکانە. قۆناخی کۆتاییە. تاوەکو ئێستاش عەرەبەکان درێژە بە بڵاوبوونەوە دەدەن.

٢ ـ دووەمین گروپی مەزن ئەوانەن کە بە ریشە ئاریانین. ئاریەکان لە ساڵانی ٣٠٠٠ پ.ز وشیاری ئەتنیکییان زیادی کرد، لەلایەن سۆمەریەکانەوە گەلێك ناوی جیاوازیان لێنراوە. لەمیانەی وشەی "**هۆریت**" کە بە مانای **(خەڵکی وڵاتە بەرزاییەکان)** دێت ناوێکی گشتی لەو لێشاوە دەنرێت. گۆتییەکان، کاسیتەکان، میتانییەکان، ئورارتوویەکان و ماددەکان کە لقی هۆریتەکان بوون، یەکەمین نەوە پێك دێنن. بە هێزی وشیاری خێڵایەتی لە ناوچەکەدا سەرچاوەی خۆی لەم بەرخودانە درێژخایەنانەوە دەگرێت کە بەرامبەر دەستدرێژییەکان پێشکەوت. وای لێهاتووە کە خێڵایەتی ببێتە ئامرازی سەرەکی لەسەرپێمانەوە و لە لوتکەی چیاکانەوە درێژە بە هەبوون و بەردەوامی خۆیان دەدەن.

٣ ـ لقەکانی ئاریەکان کە لە هیندستان و ئەوروپا بڵاوبوونەتەوە (بڵاوبوونەوە جەستەیی نییە زیاتر کولتوورییە) بە شێوەیەکی زیاتر پێکهاتەکانی پالیۆلیتیك (چاخی کۆنی بەردین) دەڕوخێنن، قۆناخی سەرەتایی شۆڕشی کشتوکاڵی و دەزگاکانی نئۆلیتیك پێشدەخەن. ئامانج کۆمەڵگای چینایەتی نییە، بەڵکو پێکهاتە کۆمەڵایەتییە سەرەتایی و پاشکەوتووەکانە. لە ماوەی ساڵانی نێوان ٢٠٠٠ تا ١٠٠٠ پ.ز لەسەر بنەمای کولتووری ئاریان، لە زەریای مەزنەوە تاوەکو زەریای ئەتڵەسی پێکهاتە شارستانییەکان لەسەر بنەمای رەچەڵەکی چین، هیند، تورك و کات، لەمیانەی کاریگەرییەکانی سۆمەر و میسر دەرکەوتن و شێوەیان گرت. قۆناخی دووەمین شەپۆلی مەزنی بڵاوبوونەوە جێگای باسە. جموجۆڵی مەزنی پێکهاتە ئەتنیکییەکانی گروپە بە رەچەڵەك ئاری، کە نوێنەرایەتی کولتوور و شۆڕشی کشتوکاڵ دەکەن، رۆڵێکی دیاریکراو لە پێکهاتنی شارستانییەتەکانی ئاسیا و ئەوروپا دەبینن.

٤ ـ گەورەترین هێزی جیهان کە لەم سەردەمەدا، ئاوا بوو لە میزۆپۆتامیای خواروو بەرەو باکوور بڵاوبۆوە و دواتر کولتووری سۆمەریەکانی پەسندکرد و پەرەی بە زمانی ئەکەدیدا و کردی بە زمانێکی فەرمی، ئیمپراتۆرییەتی **بابل ـ ئاشوورە**، کە نوێنەرایەتی چینە دەسەڵاتدارەکانی ئامۆریتەکان دەکات. ئەم قۆناخە کە لەنزیکەی ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز دەستپێکرد، لەگەڵ ئاواکردنی ئیمپراتۆرییەتی پارس هەبوونی سیاسی خۆی لەدەستدا. ئەم قۆناخە بە تایبەتی بەمجۆرە دەناسرێت کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری بە شێوەیەکی خوێناوی دەسەڵاتی بەسەر تەواوی رۆژهەڵاتی ناویندا گرت. ئەزموونەکانی ریشەکێش کردن و لە ناوبردنی پێکهاتە ئەتنیکییەکان لە بەڵگەکانی ئاشووریەکاندا بە شێوەیەکی شەرەفمەند و سەرفرازانە باس دەکرێت. پێغەمبەرەکان رێبەرایەتی جوڵانەوە ئازادیخوازەکانیان دەکرد و زیاتر لەسەر بنەمای پشتبەستن بە گروپەکانی تیرە سامیەکان دەرکەوتن و بە شێوەی ئەو ئایینە تاکخوداییانە بوون کە حەزرەتی ئیبراهیم بە باپیرەیان دادەنرێت، هەروەها بەرخودانی فیدراسیۆنە خێڵە بە ریشە ئاریەکان، کە راستەوخۆ پشتی بە وشیاری و رێبەرایەتی خێڵایەتی دەبەست، رۆڵی گرنگیان لەپێشکەوتنی مێژووییدا هەیە.

وەکو ئەنجام، ئەو پێشکەوتنە سیاسییەی لە بەرامبەر ئیمپریالیزمی سیاسی پێشکەوت و لە نێو رەوشێکی تێکچڕژاویدا ژیا و لە ژێر شێوەبەندی ئایینی تاکخودایی شێوەی فیدراسیۆنی تیرە و ئایدیۆلۆژیای وەرگرت، ناوەندەکانی کۆیلایەتی کلاسیکی رووخاند و هەرچەندە نەیتوانیبێت بگات بە سیستەمی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی، بەڵام رۆڵێکی دیاریکراوی لە هەژاندن و گەیشتنی بە شێوەیەکی نوێ بینیوە. رۆڵی ئەم بەرخودانانە لە نەرمکردن و ریفۆرمکردنی سیستەمدا مسۆگەرە. گرنگی ئەم جوڵانەوە مەزنانە لەپێشکەوتنی پێوانەکانی ئازادی و رزگاری و لە پێکهاتەی رۆحی و هزری مرۆڤدا ناتوانرێت بچووك بکرێتەوە. قۆناخی یاخیبوون و گەڕان بە دوای فریادڕەسێك بۆ درکاندنی ئێش و ئازارەکان، لەلایەن ئەو گروپانەوە دەستپێکردووە کە وەك کاڵا و سێبەرێکیان لێکراوە و دەچەوسێنرێنەوە و ئاراستەدەکرێن. ئەمە قۆناخی لێگەڕینێکی مەزنە. لەگەڵ پێکهاتە ئەتنیکییەکان قۆناخی دەرکەوتنی پێکهاتە سۆفیگەراییەکانە (میستیك) لە جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوین. ئەمە جۆرێکی نوێی پێکهاتەی کۆمەڵایەتییە؛ ئەمەش وەرچەرخانێکی کۆمەڵایەتی وەهایە کە بەبێ ئەوەی پێکهاتە ئەتنیکییەکەی بەرچاوبگرێت، لەسەر بنەمای تەریقەتی نهێنی، یەکتری وەکو برا پەسند دەکات. هەربۆیە جیا لە کۆمەڵگای چینایەتی و کۆیلەداری، هەم جیا لە کۆمەڵگای ئەتنیکی وەکو سێیەمین شێوەبەندی کۆمەڵایەتی تەڤلی کاروانی مرۆڤایەتی بوو. لەمیانەی جوڵانەوەی ئەمجۆرە گروپە کۆمەڵایەتییانە هەروەکو بڵێی مێژوو بووە بە"**مێژووی ئایین و ئایینزاکان**". گوتنی مێژووی ئایینەکان کە دواتر دەبێتە شێوەی سەرەکی گوتنەوە، بەرهەمی ئەم پێشکەوتنەیە. ئیتر مێژووی رۆژهەڵاتی ناوین سەرتاسەر مێژووی شەڕی ئایینی و ئایینزاییە و لە چەرخی ناویندا دەگات بە لوتکە. ئەم وەرچەرخانانەی ئەم گروپانە پێیدا دەربازبوون شێوەی بەرایی گروپە خاوەن گەوهەرە فەلسەفییەکانە. پێبەپێ لێگەڕینەکان لە بواری ئایین بەرەو بواری فەلسەفییەوە دەڕۆن. هەروەکو چۆن پێشکەوتنە ئایینیەکان بە تایبەتیش ئایینە تاکخوداییەکان لە نێو بونیادی میتۆلۆژیاکانەوە پێشکەوت، نزیکبوونەوە فەلسەفییەکانیش لەلایەن زەمینەی ماددی شارستانییەت و جموجۆڵە دەرك پێکراوەکانی گروپە سۆفیگەرییەکان کاریگەری کراوەتە سەر و هاتوونەتە ئاراوە. پێویستی سیستەمی کۆیلایەتی بە ریفۆرم و پێشکەوتنەکانی لە پێکهاتە رۆحی و هزرییەکانی مرۆڤ هاتە ئاراوە، ئەوەی کرد بە ناچارییەك کە لە بواری هزردا هەنگاو بۆ قۆناخی فەلسەفە بهاوێژرێت.

## ٢ ـ پێشکەوتنی بیری فەلسەفی و شارستانییەت

### (پوختەی مێژووی پێشکەوتنی رۆح و هزر)

پێشکەوتنی پێکهاتەی هزری مرۆڤ پەیوەندی بە ئاستی کۆمەڵگاوە هەیە. بێگومان بۆ گەشەکردنی مێشکی مرۆڤ و گەیشتنی قورگ بە ئاستێکی دیاریکراوی فیزیۆلۆژی، مەرجێکی لەپێشینەیە. بەڵام هەرچەندە ئۆرگانەکانی بیرکردنەوە و دەنگ پێشکەوێت، ئەگەر نەگەنە ئاستی بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و بێکارمانەوە، ئەوا لەمیانەی ئەزموونەکاندا ئاشکرا بووە کە رەوشی پریماتیکی (بوونەوەرە سەرەکییەکانی پێش بوون بە مرۆڤ، کە جۆرێکی پێشکەوتووی مەیموونە ـ و) پێشکەوتوو تێپەڕ ناکەن. مسۆگەر دەربازبوون لە بیر و دەنگەوە بۆ زمان لەمیانەی ژیانێکی بە کۆمەڵ پێشدەکەوێت و هەنگاوی گەوهەری بە خۆیەوە دەبینێ. ئەو شێوازی لەمیانەی چەند هێمایەکی سنوورداری بیر، کە هاوکاتی ئاستی بەرتەسکترین و سەرەتاییترین شێوەی کۆمەڵگا تیرە (قڵان) دێت، هێما و ئیشارەتە. یەکەمین شێوەی زمان پشت بە ئیشارەتدان دەبەستێت. هێشتا هێما و رەمزەکان زۆر لەوە دوورن کە دەربازی سیستەمی دەنگی (درکاندنی) وشەکان بن. کاتێ ئەو هێز و پێویستییە ژیانییەی کە ژیانی کۆمەڵایەتی هێناویەتە ئاراوە خۆی دەسەلمێنێ و پراکتیزەکردنی لە مێشکدا رەنگدەداتەوە، ئەوا زۆرباش دەزانرێ کە پێشکەوتنی هزر بەرەو زمان خێرا دەبێت. دەتوانرێ ئەمە بە یەکەمین و گەورەترین شۆڕشی مێژوویی مرۆڤایەتی دابنرێت. "**هەبوونی کولتووری**" بە هەموو شتێك دەگوترێت کە بەرهەمی پێشکەوتنی کۆمەڵگا بێت، لە دوای دیاردەی بێ گیان (جامد ـ و)، گیا، ئاژەڵ، وەکو دیاردەیەکی چوارەم مسۆگەرکرا، واتایەکی بەمجۆرە دەبەخشێ کە بنەمای پێویستی زەمینەی ماددی زمان و هزر هاتە ئاراوە.

گەشەسەندنی هزر و زمان لەم پێکهاتەیەدا ڕەنگدانەوەیەکی پاسیف نییە. بەردەوامبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی لەمیانەی پەیوەندییەکی پتەوی دیالەکتیکییانە پشت بەم یەکەمین شۆڕشە دەبەستێت. دیالکیتکی کۆمەڵایەتی لەلایەن ئەو پەیوەندییەوە دیاریدەکرێت کە لە نێوان هەبوونی کولتووری و هێزی مێشکدا هەیە، وەکو یاساکانی پێشکەوتن حوکم دەکات و لەمیانەی پراکتیزەبووندا نوێ دەبێتەوە و بەردەوام دەبێت. ئەگەر ئەم هێزەی نیشاندا لە نێو نزیکترین هێزی کۆمەڵایەتیدا دەتوێتەوە و پەرتەوازە دەبێت کە حوکم و یاسای تێدا پەیڕەو دەکرێت. ئەمە بۆ تەواوی کۆمەڵگاکان دەبێت یاسای پێشکەوتن و بە ماتریالیزمی دیالەکتیکی مێژوویی ناودەبرێت. لەم چوارچێوەیەدا دەبینرێت کە پێشکەوتنەکانی هزری مرۆڤ بە چەند قۆناخێکی گرنگدا تێپەڕیوە.

ا ـ ئەو شێوازە بیرکردنەوەیەی لەسەر بنەمای پێکهاتەی هزر بۆ ماوەیەکی هەرە درێژخایەن بەردەوام بووە ئەو قۆناخەیە کە مرۆڤ هەموو شتێکی وەکو خۆی بە بوونەوەری زیندوو لە قەڵەم دەدا. وەها باوەڕدەکات و مەزەندە دەکات کە هەر ماددەیەکی سروشت جەستە، گیایی، گیانلەبەر بوونەوەرێکی زیندووە و بیردەکاتەوە. کاتێك بابەتی باوەڕ پێهێنان شتی (بێگیان) بێت، بەرەو "**فەتیشیزم**" دەچێ و لە یەکەم قۆناخیشیدا رۆحانییەتێك جێی باسە کە تەواوی بوونەوەرەکان دەگرێتەوە و بڵاوبوونەوەیەکی گشتی نیشان دەدات. لە تەواوی گروپە سەرەتاییەکاندا ئەم شێوازەی بیرکردنەوە دەبینرێ، بە کورتی سروشت بە زیندوویی دەبینرێت. لە راستیدا ئەم شێوازەی بیر کردنەوەی یەکەمین مرۆڤ هەڵە نییە. بەڵام کاتێك بە شێوەیەکی خۆخۆیی (**عفوی**) گشتگیر دەبێت بە واتای کەوتنە نێو هەڵەیەکی مەزن دێت. بێگومان، زیندوویی ئەنجامێکی پێشکەوتنی سروشتی یاخود دەرئەنجامی ئۆرگانیزاسیۆنی ئاڵۆزی ژێر هەلومەرجەکانە. بەم واتایە، مرۆڤ ماددەیەکە بیر دەکاتەوە. بەڵام گەیشتنی بە سیستەمێکی ئۆرگانیك (ئۆرگانیزاسیۆن) بە گەلێك قۆناخدا دەرباز دەبێت، لە بچووکترین ماددەکانی وزە تاوەکو پێکهاتنی پارچە ئەتۆمییەکان و سیستەمی خۆر و تاوەکو ئەستێرەکان، لە ئەستێرەکانەوە تاوەکو پێکهاتنی هەسارەکان، لە هەسارەکان تاوەکو پێکهاتنی کەش و هەوای گونجاو و توخمەکانی خاك و ئاو، لەوێوە تاوەکو پێکهاتنی جیهانی زیندەوەری یەکخانە و گیا و گیانلەبەرەکان و تاوەکو پێکهاتنی دوا بەرهەمی ئەو پێشکەوتنەی ملیاران ساڵ بەردەوام بوو، کە ئەویش ئەو بوونەوەرەیە کە بیر دەکاتەوە "**مرۆڤ**" ماوەیەکی زۆر درێژ دەخایەنێ. بەم واتایە مرۆڤ ماددەیەکە بە هێزی بیر کردنەوە و گیان گەیشتووە. ناگوترێت مرۆڤ تەنیا ماددەیە، بەڵکو دەگوترێت ماددەیەکە بیردەکاتەوە. کەواتە یەکەمین مرۆڤ بە هەڵەدا نەچووە، لەبەر ئەوەی بۆ خۆی گیانلەبەرە و بیردەکاتەوە، پرەنسیپەکەی وەها پێویست دەکات هەموو شتێك بەمجۆرە وەکو خۆی ببینێ. لە راستیدا ئەم پرەنسیپە رووکاری خۆی دەگۆڕێت و بەردەوام دەبێت. ئەم پرەنسیپە کە دەتوانین پێی بڵێین پرەنسیپی "**خۆ بە سەنتەر زانین**" بە شێوەی "**بنەماڵەگەرێتی**" ، "**تیرەگەرێتی**" ، "**سەرۆك تیرە، خێڵ**" ، "**خانەدانێتی**"، "**دەوڵەتگەرایی**" ، "**موڵکایەتی تایبەت**" ، "**ئایین گەرایی**" ، "**هەموو جۆرەکانی تاکڕەوێتی**"، بەردەوام دەکات.

ئەم شێوازەی بیرکردنەوە "**شامانیزم**" سیحربازی دێنێتە ئاراوە. گەوهەری شامانیزم و سیحربازی ئەو ئەزموونەیە کە لەمیانەی رێکخستنی هەندێ رێوڕەسمی، بە پشتبەستن بە (ماکێت) کۆکڵەی ئەو دیاردانە پێشدەخەن کە دەخوازن کاریگەری لەسەر بکەن و بخوازن بیخەنە نێو ئەو رەوشەی کە مەبەستیانە. ئەو گۆڕانکارییانەی زانست کە بە پێی یاساکانی ماددە پێکدێت ئەم شامان و سیحربازانە دەخوازن لەمیانەی رێوڕەسمی ئەم یارییانەوە ئەنجامی بدەن کە لەمیانەی ساکارییەکی منداڵانە رێکیدەخەن. دەشێ شێوەکانی پراکتیزەکردنی ئەم شێوازانەی بیرکردنەوە (بێواتا) بێت، بەڵام سەبارەت بە نیشاندانی ئیرادەی گۆڕانکاری، قۆناخێکی مەزن و سەرەتای پێشکەوتنە. بەر لە هەموو شتێك بیر لە پەیوەندی نێوان دیاردەکان دەکاتەوە، موداخەلە دەکات و لەو باوەڕەدایە ئەنجام بە دەستدێنێ. کاتێك ئەوە بێنینە بەرچاو کە لەو کەسانە پێکهاتووە، لەو سەردەمەدا خاوەنی پێشکەوتنی هزر و رۆحن و لە بواری پراکتیکیشدا بە تایبەتی لە بواری نێچیرگرتن و کۆکردنەوەی بەروبووم خۆیان سەلماندووە، ئەوا بۆمان روون دەبێتەوە ئەم شامان و سیحربازانە رووبەڕووی رۆڵێکی چەندە گرنگ و زەحمەت بوونەتەوە. نابێ بە گوێرەی خۆمان ئەمە راڤەبکەین، بەڵکو ئەگەر ئەمە پێوانە بکەین کە لە نێو ئەو هەلومەرجە سەختەی ژیانی ئەو سەردەمە، هەبوونی ئومێدێك تا چ رادەیەك رۆڵێکی گرنگی لەسەر پێ مانەوەی کۆمەڵگادا دەبینێت، دەتوانین واتایان پێبدەین. بە واتایەك ئەمانە رۆڵی یەکەمین زانا و پراکتیك زان دەبینن.

تایبەتمەندییەکی دیکەی ئەم شێوازەی بیر کردنەوە ئەوەیە کە هێشتا نەگەیشتۆتە قۆناخی خوداوەندی و ئایین. راستتر بڵێین ئەم شێوازە، پێکهاتەی هزر و باوەڕی ئەو بنەماڵە و تیرە سەرەتاییانە پێکدێنێت کە ٩٨٪ تەمەنی مرۆڤایەتیان پڕ کردۆتەوە، واتا یەکەمین ئایین پێکدێنێت. هەربۆیە دەشێ شامانیزم و سیحربازی بە یەکەمین دەربڕینی خاوەن دەزگا و رێکخراوی پێشکەوتنی هزر دابنرێت. لە نوێبوونەوە و بەردەوامکردنی ئەم دەزگایانەدا رۆڵێکی هاوشێوەی پێشەنگایەتی دەبینێت. شامانەکان پێبەپێ لە ناو ئەو گروپانەی جێگای خۆیان تێداگرتووە، بوونەتە بنەماڵەی لەپێش و گرنگییان پەیداکردووە، ئەمە هۆکارێکی لەپێشینەی دەربازبوونە بەرەو سیستەمی تیرەیی باوکسالاری و دایکسالاری. ئاستی یەکسانی نێو کۆمەڵگا و هەلومەرجەکانی بەرهەمهێنان دەرفەت بەوە نادات لە پەیوەندی نێوان ژن ـ پیاو باڵادەستی پلەداری دەربکەوێت. ئەو ماددە، گیا، یاخود ئاژەڵانە دەکەن بە سەمبۆڵ کە بە رادەیەکی هەرە زیاد لە نێو ژیاندا پێیانەوە پەیوەندیداردەبن. ئەم رەمزانەی کە دەکرێن بە نازناو و ناسنامەی تیرە بە تەوتەم ناودەبرێت. ئەو رێز و باوەڕییەی بەرامبەر بە تەوتەم نیشاندەدرێت، لە راستیدا دەربڕینی سەمبۆڵی پابەندبوونیانە بە باپیرانیان و هەبوونی خۆیان؛ واتای هەستکردنە بە هێز و ناسنامەی خۆیان. لە پێکهاتەی باوەڕی ئەم قۆناخە درێژخایەنە وەکو گەوهەرێك باوەڕی بە زیندوویی هەموو شتێك دەکرێت، پیرۆزی بەو ماددە، گیا و ئاژەڵانە دەدرێت کە لەگەڵیاندا پەیوەندیدارن. ئەمەش بە "**مانا**" ناو دەبرێت. بە واتایەکی دیکە "**مانا**" دەبێتە بەهای ئەو رەنجەی کە بۆ ئەم ماددەیە خەرج دەکرێت کە پێیەوە پەیوەندیدارن. ئەمە لە رێگای تەوتەمەوە دەکەن بە رەمزێك و لێی بە خاوەن دەردەکەون و دەیپەرستن. لەدوای تەوتەم هەنگاو بۆ ئایینە فرە خوداوەندییەکان دەهاوێشترێت.

ب ـ شۆڕشی کشتوکاڵی وماڵیکردنی ئاژەڵ رێگا لەپێش تەشەنەکردنی شێوەی بیرکردنەوەش دەکاتەوە. خاك، دانەوێڵەی چاندن، دارەکانی میوە و ئەو ئاژەڵانەی لە زۆر لایەنەوە سودیان لێدەبینرێت، دەردەکەونە پێش. سەرنجی مرۆڤ دەکەوێتە سەر ئەو بوونەوەرانەی کە زۆرترین توانستی ژیانیان پێشکەش دەکات. مرۆڤ دەخوازێ بیانناسێت و لەپێناویاندا رەنجدەدەن و بە پیرۆزیان دەبینێ، باوەڕی بە هەبوونی تایبەتمەندێتی نائاساییان دێنێ. کاتێك لە رۆڵی ژیانی وەرز و خۆر و باران تێدەگەن کە بۆ کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ هەیانە، زیاتر پابەندی ئەوانە دەبن و بە پیرۆزیان دادەنێن. ئەم دیاردانەن کە بوونی کۆمەڵایەتی مرۆڤی واتادار و دەوڵەمەند کردووە. بەهۆی گرنگییە ژیانییەکەیان بە بەراورد لەگەڵ بوونەوەرەکانی دیکە، ناوی تایبەت لەم دیاردانە دەنێن و پێبەپێ دەکرێن بە خوداوەند. لە تەوتەمەوە دەربازبوون بۆ خودا لەمیانەی پەیوەندییەکی قووڵ بە نئۆلیتیکەوە روودەدات و قۆناخێکی مەزنی پێکهاتەی هزر و باوەڕییە. سەبارەت بە هزری مرۆڤ و پێناسە کردنێکی نزیك لە راستی سروشت و دەرككردن بە تایبەتمەندێتیەکانی، بەرهەمدارترین قۆناخە.

گروپە مەزنەکانی زمان کە لە مێژەوە تا رۆژگاری ئەمرۆمان هەن، بەرهەمی ئەم قۆناخەیە. گروپی زمانی سامی عەرەبستان و باکووری ئەفریقیا، گروپی هیندۆ ـ ئەورووپی بە ریشە ئارین کە لە هیندستانەوە تاوەکو ئەوروپا و ئەمریکا درێژدەبنەوە، لە باکووری ئەم هێڵەش گروپی فین ـ ئەویگار یاخود اورال ـ ئالتای گروپی قەفقاس باسك ـ دەریای سپی بە گرانی لەم سەردەمەدا پێکهاتوون. لەبەر ئەوەی کولتووری ئاریانی شۆڕشی کشتوکاڵی ئەنجامداوە، بۆیە گروپێکە خاوەن زیاترین و بەرفراوانترین کاریگەرییە. چەندە زاراوەی هزری سەرەکی هەن کە گرێدراوی ژیانی کشتوکاڵین، سەرچاوەی خۆی لەم گروپە زمانە وەردەگرێت.

لەبەر ئەوەی هێزی پێشەنگی قۆناخی کشتوکاڵ و ماڵیکردنی ئاژەڵ ژن بوو، بۆیە شێوازێکی ژنان مۆری خۆی لەپێشکەوتنەکانی هزر و زمان داوە. تاوەکو ئێستا لە چەندین زماندا ئەم پاشگر و پێشگرانە بە کاردەهێنرێت. هەروەها لەبەر ئەوەی پێگەیاندنی دانەوێڵە و ماڵیکردنی ئاژەڵەکان بە گرانی گرێدراوی هزر و پراکتیکی ژن بوو، ئەمە رێگای لەپێش ئەوەدا کردەوە ببێتە خوداوەندە دایکی تەواوی ئەم بەرهەمانە. لەمیانەی ئەو پەیکەرانەی ژنان کە لەو سەردەمە ماونەتەوە و لە هەموو شوێنێکی نیشتەجێی نئۆلیتیك دانراون، ئەم راستییەمان

بۆ ڕووندەبێتەوە کە ژن وەکو خوداوەندێکی دەسەڵاتدار و بەربڵاو بۆتە خاوەن گرنگی و ڕۆڵ. ژن، هاوشێوەی خاکە بە پیتەکان و دایکە خوداوەندی زایینە **(ولادە)**. ژن دەبێتە خاوەنی پیرۆزییەکی مەزن، ئایینی کۆنی تەوتەم دەخاتە پلەی دووەم، بیر و باوەڕی خۆی زاڵدەکات، وەکو خۆر، مانگ، ئەستێرە و بەها ئاسمانییەکان بەهای پێدەبەخشێت. لە زمانی ئاریان"**ستارك**" هەم بە واتای خودا، پیرۆزی مەزن، هەم بە واتای ئەستێرە دێت. بە تەنیا زاراوەی ستار بە شێوەیەکی گرنگ پێناسەی ڕاستینەی ئایینی ئەو قۆناخە ڕووندەکاتەوە. لەبەر ئەوەی ئاژەڵی وەکو گامێش، چێڵ، بزن و بەراز بایەخداربوون، دەگەیەنرێنە ئاستی خوداوەندی و دیمەنەکانیان بە کاردەهێنرێت. هەر شوێنێکی خوداوەندە ژنەکانی لێبێت، ئەوانیش هەن، لە گەلیاندا هاوبەشن. گامێشی بە ناوی ئاپیس یەکێك لە گرنگترین خوداوەندەکانی میسرە. "هۆرۆس" واتە بزن بوونەوەری پیرۆزن. تاوەکو ئێستا چێڵ لە هیندستان دەستی لێنادرێت.

دانەوێڵەی وەکو گەنم و گەنمەشامی، داری وەکو مازوو، دارمێو لە نێو ئەو بوونەوەرانەدا جێگای خۆیان دەگرن، کە خاوەنی پیرۆزییەکی خودایین و وەکو نیعمەتی سەرەکی دەبینرێن. هێزی "**مانا**" لە ئایینەکانی پێشودا بەربڵاوبوو، بۆ ژمارەیەکی کەمی بوونەوەرەکان گواستراونەوە، بەڵام گرنگییەکانی لە ڕیزی پێشەوە دێت و، ئەو ژمارە زۆرەی کە لە تەوتەمەکاندا هەبوو داخراوەتە نێو خوداوەندە سنووردارەکان و، گەورەترین بوونەوەریش سەمبۆلی هێزی زایین خوداوەندی دایکە. لە ئاستی هەرێمەکاندا ناوی خوداوەندە ژنەکانیش دەردەکەوێت. تەنانەت یەك پەیکەری پیاو بوونی نییە و نابینرێت. پیاو لە باوەشی خوداوەندی ژن ـ دایك وەکو کوڕ ـ یاخود مێرد گرنگی خۆی هەیە. دووانەکانی عەشتار ـ دوموزی، ئیسیس ـ ئۆسیریس، ئافرۆدیت ـ ئادۆنیس، کیبەلە ـ ئادیس میتۆلۆژیاکان، نوێنەرایەتی کولتووری خوداوەندی ژن ـ دایك دەکەن کە سەرچاوەکەی لە قۆناخی نئۆلیتیك دێت و بناخەی کولتووری تەواوی مرۆڤایەتی پێکدێنێت. لێرەدا گرنگترین مەسەلە کە پێویستە لێی تێبگەین، ئەوەیە کە قۆناخێك بەر لە مێژوو هەبووە کە پیرۆزی و پێشەنگایەتی ژن لە ئارادابووە و پیاویش وەکو منداڵێکی هەژار گرێدراوی ژن بووە.

ج ـ هەروەکو چۆن شۆڕشی شار ڕەنگدانەوەی لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵگا هەبوو، ئەوا ڕێگای لەپێش گۆڕانکاری بنچینەیی پێکهاتەی هزردا کردووە. مەزنترین نوێبوونەوە تێگەیشتن و دەرککردن بەوەیە کە کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان یاساکانی قۆناخە سروشتییەکان و هێزە کۆمەڵایەتییەکاندا نییە. ئاستێکی هزری بەمجۆرە بەدیهاتووە کە لەمیانەی چالاکییە تاکەکەسییەکان کاریگەری لەسەر قۆناخە ئاساییەکان ناکات. ئیتر شامانیزم و سیحربازی گرنگی پێشوویان لەدەستداوە.

فاکتەری نوێی ئایینی ئەو پەرستگایەی لە دەوری شار دا ئاوا کراوە و ڕاهیبەکەیەتی. ئەگەری ئەوەش هەیە کە کاریگەری شامانیزم و سیحربازی لە ڕاهیبدا کۆبووبێتەوە. سیستەمێکی نوێ و خاوەن دیسپلین بۆ ئەو کۆمەڵگایە پێویستە کە دووچاری ئاڵۆزی هاتووە. سەرچاوەیەکی دیکەی پیرۆزی بۆ سیستەم پێویستە کە بەردەوام بایەخێکی خاوەن پیرۆزی پێدراوە. ڕاهیبە سۆمەریەکان ئەم سیستەمەیان لە هێمنی و جموجۆڵە ڕێکوپێکەکەی ئاسمانی میزۆپۆتامیا دۆزیوەتەوە. سیستەمێکی سەرسووڕهێنەر لە ئاسمان بەڕێوەدەچێ. لەبەر ئەوەی پیرۆزترین سیستەم، سیستەمی ئاسمانە، ئەو سیستەمەی لەسەر زەوی بە بنەما بگیردرێت سیستەمی ئاسمانە. ناچارن سیستەمی ڕێکوپێکی تەنە ئاسمانییەکان بۆ جوڵانەوەکانی مرۆڤ لە ناو کۆمەڵگا بە بنەما بگرن. کەس ناتوانێ دژی بوەستێ و شتێکی بەمجۆرە بە خەیاڵی کەسیشدا نایەت. بیر و باوەڕییەکی بە هێز و جددی ئەمەش جێگای باسە. واتا ژمارەی خوداوەندەکان تا ڕادەیەك کەم دەبێتەوە و لە ئاسمان و ئەو بوونەوەرانە ڕەنگدەداتەوە کە نوێنەرایەتی ئاسمان دەکەن.

هاوکاتی ئەمەش قۆناخێکی زاراوەکان لە هزری مرۆڤدا دێتە ئاراوە. هزری مرۆڤ بەهێز بووە. شێوازی نوێی بەرهەمهێنان تا ڕادەیەکی مەزن ڕێگای لەپێش بەرهەمی زێدە کردۆتەوە. ئەو کەسانەی تەنیا کاتی خۆیان بە خۆ خەریککردن بە خەیاڵە هزرییەکان بەسەر دەبەن، زۆر بە سانایی بەشیان لەو بەرهەمە زیادە جیادەکرێتەوە. کۆکردنەوەی ئەم بەرهەمە زیادانە لە عەمبارەکانی پەرستگاکان، لەگەڵ خۆیدا باوەڕییەکی مەزن بۆ ڕاهیبەکان دێنێ کە لەم شۆڕشەدا ڕۆڵی پێشەنگایەتی دەگێڕن. بەرهەمی زیادە بۆ ئەم چینە نوێیەش گەرەنتییە کە لە دەوروبەری ڕاهیبدا کۆبوونەتەوە. ئەمە ئەو چینەیە کە ڕۆڵی بەڕێوەبەرایەتی دەگێڕێت و پێبەپێ دەبێتە خاوەنی موڵك. ڕەنگدانەوە ئایدیۆلۆژیاکەی نوێنەرەکانی هێزە خوداوەندییە ئاسمانییەکانە لەسەر زەوی. **زیگوراتەکان** (زەقورەکان) وەکو ئەو بڕیارگایە وایە کە یەکینەکانی خوداوەند و نوێنەرەکانیان دەگەیەنێتە یەکتری. لە نهۆمی سەروو ڕاهیب بەردەوام خەریکی کارەکانی خوداییە و لەمیانەی سەیرکردنی هەسارە و تەنە ئاسمانییەکان ئیلهام دەگرێت و پێشبینییە نوێیەکانی دەئافرێنێ. لە ژێرەوەش ئەو حوکمە خوداییانەی بۆ بەندەکانی ڕوونکردۆتەوە کە مسۆگەر پێویستە جێبەجێ بکرێت و ڕەوشێکی عیبادەت کردنیانی بۆ ڕەخساندووە. شۆڕشی نوێی ئایینی بە شێوەیەکی ڕێکوپێك لە بڕیارگەدا سەرکەوتووە. بە ئەندازەی ئەوەی نوێنەرایەتی هێزە سروشتییەکان دەکات، لەهەمانکاتدا بە شێوەیەکی تۆکمە جیهانی خوداوەندەکان ئاواکراوە کە کۆمەڵگا لە ژێر ناوییەوە بەڕێوەدەبن.

ئەو سیناریۆیەی بەر لە دەرکەوتن و لەگەڵ چینی باڵادەست نووسرا، دوای ئەوەی شانۆگەرییەکەی لەمیانەی شێوەیەکی پیرۆزی عیبادەت کردن لە تەواوی ڕۆح و هزرەکاندا نەخش کرا، ئیتر چینی باڵادەست بە مەزنایەتی ڕووخسارێکی خودایی خۆی نیشانی خزمەتکارەکانی دەدات کە بوونەتە بەندە. بە ئەندازەی ئەوەی لەمیانەی دووڕوویییەکی مەزن ئەنجامدراوە، ئەوا ئەو هزر و میکانیزمە نوێیەی ئایین کە لەمیانەی باوەڕهێنان بە باوەڕپێهێنانێکی مەزنەوە تەواوی ڕۆح و هزرەکانی بەکارهێناوە و تەسلیمیگرتوون. هەروەکو قاڵبی وەرزی ساڵ دووبارە دەبێتەوە و لەمیانەی گۆڕانکاری و وەرچەرخان تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوام دەبێت. ئەوەی بە شێوەیەکی بەهێز لە بۆهێڵەکانی (جین) مرۆڤەکانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا جێگیر کراوە و بە ئەندازەی بەهێزیمان بناخەی لاوازیمانە، ڕاستینەی بیر و باوەڕی سیستەم و داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانە. ناوی کامە ئایین و هێزێکی لێبنرێت، ئەوەی بناخەکەی بە شێوەیەکی پتەو دانراوە و وەکو بەرداشە کۆنەکان تاوەکو ئێستا هزر و ڕۆحمان دەهاڕێت، چەرخی ئەم هزر و باوەڕییەی سیستەمە.

هەرچەندە هەستی پێنەکرێت، بەڵام شێوازی باوەڕی و بیرکردنەوەی سۆمەر ئەگەر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بێت تاوەکو ئێستا کاریگەری لەسەر پێکهاتەی هزری و ڕۆحی مرۆڤایەتی بەهێزە و سیستەمێکە بایەخێکی جیهانی هەیە. سۆمەریەکان چەندین شێوەی هزر و ئایینیان لە ژێر گۆڕانکاریدا تێپەڕاندووە، بە گوێرەی هەلومەرجەکانی خۆیان گونجاندووە و گۆڕیویانە. هەروەها دیسان بە گوێرەی سەردەم ئەوەی لە هزری فەلسەفییەوە تا دەگاتە هزری زانستی لەمیانەی بەکارهێنانی پەیوەندی دیالەکتیکی، سەرچاوەی سەرەکی دەستپێکردنی ئەوجۆرە وەرچەرخانانەیە.

سیستەمێکی بەهێزی پێوانەکان لە پێکهاتەی هزری و ئەخلاقی مرۆڤدا جێگیرکراوە. بە گوێرەی سیستەمەکانی پێشوو ئەو هێزەی شارستانییەتی هێناوەتە ئاراوە، قاڵبەکانی سیستەمە. لەبەر ئەوەی دەزگای نووسین و ئەدیبەکانی بە شێوەیەکی بە توانا بەڕێوە بردووە، توانیویەتی پایەداری و باڵابوونێکی بێچەند و چوون ئاوابکات. لەمیانەی ئاواکردنی هەماهەنگییەکی تەواو لەگەڵ هونەر بە تایبەتیش لەگەڵ مۆسیقا، لەم بوارەدا خاوەنی شێوازێکی بەمجۆرەیە کە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بە باشترین شێوە گوزارشت لە هەماهەنگی نێوان مۆسیقا و ژیان دەکات. ئایین سەرچاوەی سەرەکی مۆسیقاشە.

مەترسیدارترین لایەنی ئەم شێوازەی باوەڕی و بیرکردنەوە، بەهێزی تایبەتمەندێتی دۆگماتیکییە. ئەم دوگماتیزمەی لەسەر بنەمای هزری مرۆڤ ئاواکراوە، بناخەی تەواوی ئەو باوەڕی و هزرە دۆگمایانەیە کە لەمیانەی گۆڕانکارییەوە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. لە سەردەمی جێگیربوون و بە دەزگابوونی کۆیلایەتیدا، زۆر زەحمەتە ئەم شێوازەی باوەڕی و بیرکردنەوە، بە واتایەکی دیکە لە ژێر کاریگەری چەمك و پراکتیزەکردنی ئاییندا زۆر زەحمەتە. لە زانیارییەوە بۆ زانست و فەلسەفە هەنگاو بهاوێژرێت. لە مێژووی شارستانییەتدا یاسایەکی گشتی بەمجۆرە هەیە: ئەو کولتوورەی بە شێوەیەکی هەرە زۆر شێوازی کۆمەڵایەتی پەرەپێبدات، ئەو کولتوورەیە کە هەرە زێدە بەرامبەر گۆڕان بەرخودان دەکات، بە سانایی دەست لە کولتووری خۆی بەرنادات، ڕۆژهەڵاتی ناوین ئێشی ئەم یاسایە دەکێشێ. تا چ ڕادەیەك ئەمە ڕاستە کە هۆی بڵاوبوونەوەی شارستانییەتی سەرمایەداری ئەورووپا بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بە شێوازی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین نەژیاوە، ئەوا پێچەوانەی ئەمەش هێندە ڕاستە. واتا کاریگەری قووڵی شارستانییەتی کۆیلایەتی لەسەر

رۆح و هزر، وایکردووە هەرسکردن و دەزگابوونی رۆح و هزری سەرمایەداری لە رۆژهەڵاتی ناوین ئاستەنگ بێت. هەروەکو چۆن قەد و رەگی دار رێگا لەپێش چەکەرە کردنی چرۆی نوێ دەکەنەوە، ئەوا بە پێچەوانەوە لقێکی نوێ سەر بە رەگ نەبێت خۆی ناگرێت و دەهەژێت. ئەمە بۆ کولتووری ناوچەی کەوانی زێڕین کە شۆڕشی کشتوکاڵی هێناوەتە ئاراوە، بابەتێکە کە کاریگەرییەکی قووڵی بەجێهێشتووە. تاوەکو ئێستا ئەو ناوچەیە لە ژێر کاریگەری بەهێزی کولتووری نیۆلیتیك و خوڕەوشت و داب و نەریتەکانیدا دەژیت.

بەڵام ئەوەش مسۆگەرە هەروەکو چۆن ئەگەر شۆڕشی گوندی کشتوکاڵی نەبێت، ناشێ شۆڕشی شار و شارستانییەتی کۆیلەداری بێتەئاراوە، ئەوا بە پێی هەبوونی فاکتەرە ئایدیۆلۆژیاکانی شار و پێکهاتەی کۆمەڵگای چینایەتی و شارستانییەتی کۆیلەداری بە شێوازی هزری فەلسەفیش ناگەن. بە گوێرەی یاساکانی دیالەکتیکی ئەو شێوازە هزرییەی لە ئەنجامی شەڕی شێوازی فەلسەفی دێتە ئاراوە شێوازی کۆیلەدارییە. لێرەدا ناکۆکی فەلسەفە لەگەڵ کولتووری نیۆلیتیك نییە، بەڵکو لەگەڵ کولتووری کۆمەڵگای چینایەتییە. هەروەها فەلسەفە دەتوانێ پێویستی کات و خۆشگوزەرانی لە نێو سیستەمی کۆیلایەتیدا ببینێتەوە کە لەسەر بنەمای ئەو بەرهەمە زیادە دێتە ئاراوە کە کۆمەڵگای چینایەتی رێی لەپێش کردۆتەوە. لەمیانەی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ یاسا و بەهاکانی سیستەمی کۆیلایەتی هێزی ناکۆکی جەمسەری دژ پێشدەخات.

**د ـ هزری فەلسەفی:** بەبێ ئەوەی پشت بە میتۆلۆژیا و دۆگما ئایینیەکان ببەستێ، هەوڵی روونکردنەوەی راستینەکانی کۆمەڵگا و سروشت دەدات. گەیشتنی هزری مرۆڤ بەم ئاستە، بەرهەمی گەشە کردنی کۆمەڵگایە. بوێری هزری تاکەکەس بۆ هەنگاو هاوێشتن بەرەو هزری فەلسەفی هەنگاوێکی مەزنی ئازادییە. بۆ یەکەمین جار مرۆڤ لەسەر بنەمای پشت بە خۆبەستن روونکردنەوە سەبارەت بە هەبوونی خۆی دەکات. خودی ئەم نزیکبوونەوە هەنگاوی پارچەکردنی قاڵبە جێگیرکراوەکانە. هەروەکو چۆن ئایینی تاکخودایی بتە تەوتەمییەکان و ئەنجوومەنی خوداوەندەکانی بەلاوەنا و رێگای لەپێش گۆڕانکاری بنچینەیی پێکهاتەی هزر کردەوە، هزری فەلسەفیش بەبێ خودا، یاخود بەبێ ئەوەی خودا بخاتە ناو مەسەلەکان، سەلماندی ئەم گۆڕانکارییە روودەدات و گەورەترین شۆڕشی لە مێژووی هزردا ئەنجامدا. ئەو هزرە کۆمەڵایەتییەی کە پشت بە میتۆلۆژیا و قالبە ئایینیەکان دەبەستێت باوەڕی بە کۆیلەبوون یاخود پشتبەستن بە لایەك و خۆ گونجاندن بە گوێرەیان وەکو پێویستییەکی ژیان و گوزەران دەبینێ. لەم پێکهاتە هزرییەدا دوورکەوتن یاخود دەرکەوتن لە دۆگما و باوەڕ و شێوازی عیبادەتەکەی، یەکسانە بە مردن و لە ناوچوون. ئەمە مەزنترین سزایە. بەهێزی و بێهێزی ئایدیۆلۆژییە دۆگماتیکەکان لەم تایبەتمەندێتیەوە سەرچاوە دەگرێت. تاك وەکو پەیڕەوکارێکی رەهای بێ‌چەندوچوونی کۆمەڵگایە و پێیەوە گرێدەدرێت. لە بونیادێکی ئایدیۆلۆژی بەمجۆرەدا کۆمەڵگا لەمیانەی ئەو سەمبۆلانەی باوەڕی پێهێناوە و ئەو هێزەی بە بەهاکان دەبەخشرێت، دەتوانێ هەست بە بەهێزی خۆی بکات. بەڵام لەبەر ئەوەی لە قۆناخی تەنگژە و قەیراندا پێکهاتەیەکی هزری سەربەخۆ لە ئارادانییە کە ئەلتەرناتیف بخوڵقێنێ، ئەم کۆمەڵگایە یان دەڕووخێ، یاخود خۆی دەخاتە باوەشی کۆمەڵگای پاشکەوتووتر، یان ئەوەتا لەلایەنی هێزێکی باڵادەست و پێشکەوتووتر دووچاری توانەوە و سڕینەوە دەبێت.

پێکهاتە بەهێزەکەی هزری دۆگماتیکیانەی رۆژهەڵاتی ناوین تەواوی ئەم ئەنجامانەی هێناوەتە بەرچاوان. بۆ نموونە کۆمەڵگای سۆمەر سەرەڕای ئەوەی خاوەن پێکهاتەیەکی نا ئاسایی بوو، لەسەردەمی قەیراندا لە شکستهێنان بەرامبەر تیرە بچووکەکانی چیا و بیابان رزگاری نەبووە. میسریش دووچاری هەمان چارەنووس هاتووە. سەرەڕای ئەوەی یۆنان و رۆما خاوەنی بنەمایەکی دیاریکراوی فەلسەفی بوون، بەڵام لە ئەنجامی ئەو داخراوییەی هزری کۆمەڵگای کۆیلایەتی، رێگای لەپێش هەڵوەشانەوە و رووخان و پەرتەوازەبوون کردەوە. بێگومان کاریگەری پەیوەندییەکانی موڵکایەتی کۆیلایەتی لەسەر شێوازی بەرهەمهێنان بناخەی ئەم رەوشە پێکدێنێ. بەڵام لە رێگای بەرخودانی پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی، کە بەسەر تەواوی پێکهاتەکانی کۆمەڵگادا زاڵە، کۆسپی خستۆتە پێش کە لەسەر بنەمای تێپەڕاندنی قۆناخ قەڵەمبازێك ئەنجامبدات. ئەنجامنەدانی قەڵەمباز لە پێکهاتەی ئایدیۆلۆژیدا بێچارەیی و پەرتەوازەبوونە. پێکهاتەی دۆگماتیکی کە لە ناوەوە بەسەر هزردا زاڵە، وەکو کۆسپ و ئایدیۆلۆژیای بێچارەیی لە ناو کۆمەڵگاکاندا رۆڵ دەبینێ. درێژخایاندنی کۆیلایەتی چاخی دێرین لە نزیکەوە پەیوەندی بە زاڵبوونی هزری دۆگماتیکییانەیە بەسەر پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی کۆمەڵگا. هەروەها لەبەر ئەم هۆیە دەرکەوتنی پێغەمبەرەکان بەهایەکی مەزنی پێدرا و هەر یەکە و بە هەڵمەتێکی شۆڕشگێڕی لە قەڵەمدراون، چونکە چەندین درزیان لەو پێکهاتە دۆگماتیکانە کردەوە کە دژی دەرکەوتبوون. پابەندبوونی شۆڕشی حەزرەتی ئیبراهیم بە شکاندنی بتێك، یەکەمین ئامانجی حەزرەتی مەحەمەد بەرەو بتەکانی کەعبە بوو، تەنانەت نیشاندانی گەورەترین نەفرەتی موسا بەرامبەر **"ئەوانەی گۆلکی زێڕین دەپەرستن"**. هەر لەبەر ئەم هۆیەیە لەسەردەمی خۆیاندا گرنگییەکی دیاریکراویان هەیە. بە ئامانج گرتنی سروشت و پارچەکردنی بۆ ئەم سەردەمانە، بە واتای شۆڕشێك دێت.

هەروەکو دەبینرێ قەیران و بێچارەیی ناوەندەکانی لە دایکبوونی شارستانییەتی کۆیلایەتی، لە لایەك رێگا لەپێش نیمچە دەوڵەتەکانی دەوروبەر دەکاتەوە کە نەرمتربووە و وشیاری ئەتنیکییەکەی بەهێزبووە، لە لایەکی دیکەوە لە بواری ئایدیۆلۆژیدا هەوڵدەدات لە رێگای لێگەڕینەکانی ئایینی تاکخودایی و سۆفیگەرایی رێگای دەربازبوون بدۆزێتەوە. دەرفەتی پێشکەوتنی فەلسەفە لەو هەلومەرجانەدا گونجاوترە کە گروپە رۆحانی و سۆفیگەرایییەکانی تێدا زۆرە. دەرفەتی بیرکردنەوەی سەربەست لای ئەم گروپانە زیاترە کە دەتوانین وەکو ئەزموونی ئەو گروپانە ناویان ببەین کە بە نهێنی دژی ئایدیۆلۆژی فەرمی کۆیلەداری سەرهەڵدەبڕن. لەوە زیاتر کە ببن بە خاوەنی دۆگمای دیاریکراو، لە نێو لێگەڕینێکدان تاوەکو سیستەمێك بدۆزنەوە خۆیان پێیەوە گرێبدەن و هزر و رۆحیان تێربکات و ترسەکانیان بڕەوێنێتەوە. ئەم گروپە رۆحی و سۆفیگەرایانە هەروەکو بڵێی تەریقەتی چاخە دێرینەکانن.

فاکتەرێکی دیکەی گرنگ کە رێگای لەپێش هزری فەلسەفی کردەوە، پێشکەوتنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانە. شارستانییەتە یەکەمینەکانی کۆیلایەتی بە شێوەیەکی سەرەکی لەسەر بنەمای سەردەمی دۆزینەوەی مسی بەرزبوونەتەوە. بە موڵککردنی مس، ئامرازەکانی کشتوکاڵ و پیشەکاری و ئامرازی سەربازی کە لەم کانزایە دروستکران، توانایەکی مەزنی بەهێزبوونی داوەتە دەست چینی کۆیلەدار. نەبوونی ئەم ئامرازانە و سنووردار‌بوونی بە ناوەند، پێکهاتە ئەتنیکییەکانی بە لاوازی دەهێشتەوە؛ بە ئەندازەی ئەوەی ئەم ئامرازانەیان بەدەست دەهێنا، بەرخودانەکانیان سەردەکەوت. بەڵام بڵاوبوونەوەی ئامرازەکانی ئاسن لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز کاریگەرییەکی مەزنی دیموکراتییانەی کرد و بە جۆرێك بڵاوبۆوە کە گەیشتە دەستی زۆرترین خەڵك و تەنانەت کەوتە دەست هەژارانیش. لەمیانەی ئامرازەکانی ئاسن، بەرهەمهێنان و پاراستن گەیشتە بەرزترین ئاست. ئەمە هەم بە مانای دەوڵەمەندی، هەم بە مانای ئاسایش دەهات. ئاسایش و دەوڵەمەندی هەم رێگای لەپێش خۆشگوزەرانی، هەم رێگای لەپێش زیادبوونی کاتی بێکاری و دەستبەتاڵی دەکردەوە. هەروەها فەلسەفەش زەمینەی کۆمەڵگایەکی بەمجۆرە دەکاتە مەرجێکی لەپێشینە. دەرکەوتنی کلاسیکییە مەزنەکانی فەلسەفە لە سەدەکانی ٥ ، ٦ ی پ.ز شتێکی لە خۆڕانییە، گرێدراوی پارچەبوونی پێکهاتە ئایدیۆلۆژییەکانی کۆمەڵگای کۆیلایەتی چاخە دێرینەکان و شکاندنی پاوانکاری سەر ئامرازە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنانە. **"چاخی کلاسیکی"** سیستەمی کۆیلایەتی (ماوەی نێوان ٥٠٠ پ.ز تاوەکو ٥٠٠ زایینی) کە دەتوانین بە دوا قۆناخی کۆتایی چەرخە سەرەتاییەکان ناوزەدی بکەین، لەهەمانکاتدا بە واتای **"سەردەمی فەلسەفە"** دێت کە فەیلەسوفی مەزنی تێدا دەرکەوت و فەلسەفەی خۆیان بڵاوکردەوە و گەیاندیانە ئاستی بە دەزگابوون.

کاتێك لە نزیکەوە ئەو فەیلەسوفانەمان ناسی کە قۆناخێکی نوێیان کردۆتەوە و قوتابخانە لە ژێر ناویان ماوەتەوە، ئەو کاتە باشتر لەوە تێدەگەین کە قۆناخی هزر و رۆحی نوێ بۆ مرۆڤایەتی چ واتایەك دەبەخشێت.

**١ ـ زەردەشت و زەردەشتی:** هەرچەندە زەردەشت وەکو پێغەمبەرێك هەڵسەنگێنـدرێت، بەڵام هەڵوەستەی زیاتر نزیکی فەیلەسوفە. شیمانەی ئەوە دەکرێت لە ساڵانی نێوان ١٠٠٠ تا ٦٠٠ پ.ز دا ژیابێت. ئەوە پەسند دەکرێت کە لە باکووری رۆژئاوای ئێران هاتۆتە دونیاوە کە شۆڕشی کشتوکاڵی تێدا بەهێزبوو. تاوەکو ئاستی ئاشق بوون پابەندی ئابووری کشتوکاڵە. لە بوارێکەوە دەتوانرێت پەیوەندی لە نێوان هەبوونی کاریگەرییەکانی کولتووری نیۆلیتیك و کەسایەتییەکەیدا دابنرێت. رەنج و بەرهەم و قازانجی حەڵاڵ بە بنەما دەگرێت. سەوزایی بە

پیرۆز دەبینێ، پاراستنی ئاژەڵ بە بنەمادەگرێت. قوربانیکردنی ئاژەڵی قەدەخەکردووە، بەکارهێنانی توانستەکانیانی لە کێڵگە و سوود وەرگرتن لە شیر و بەروبومی دیکەی بە بنەما گرتووە.

زەردەشت سیستەمی سەرەتایی باوەڕی ئاریەکانی بە ریفۆرمێکی بنچینەییدا تێپەڕاندووە. بەو رادەیە پێغەمبەرێکە لە سیستەمی سێ خوداوەندی بەرەو سیستەمی تاکخودایی هەنگاوی هاوێشتووە. چونکە ئەویش وەکو حەزرەتی ئیبراهیم لە ئایینی فرە خوداییەوە بەدوای ئایینی تاکخودایی دەگەڕێت. لە کاتێکدا حەزرەتی ئیبراهیم زیاتر ئەمە لە ناو تیرە سامیەکان پێشدەخات، زەردەشت لە ناو تیرە ئاریەکان پێشیدەخات. لە **ئیندرا، میترا، ڤارونا** کە خوداوەندە ژنە سەرەکییەکانی ئەم قۆناخەی ئاریەکان بوون، بۆ تاکخودایی بەناوی ئاهورامەزدا هەنگاوی هاوێشتووە؛ بە واتایەکی دیکە قۆناخی تاکخودایی لە ئێران، میدیا، ئەنادۆڵ دەستپێکردووە. لە پێکهاتنی گەلێك زاراوەی وەکو بەهەشت، دۆزەخ، سیرات، فریشتەکان، نهۆمەکانی ئاسمان، مەعشەر، دادگای مەزن، تەرازووی باشی ـ خراپی، بە خاوەن رۆڵ دادەنرێت. بایەخێکی بەهاداریش بە ژن دەبەخشێت. هەروەها پاك و خاوێنیش بابەتێکە کە گرنگی پێدەدات. لەلایەنێکەوە پێغەمبەری کشتوکاڵ، قازانجی حەڵاڵ، خێزانی شەرەفمەندانە، ماڵێکی باش رێکخراو، جگە لە خۆپاراستن دژی توند و تیژییە.

پرەنسیپی دیالەکتیکی یەکێتی دژەکان لە بنەمای لایەنە فەلسەفییەکەیدا شاراوەیە کە بە شێوەی پایەدارکردنی بەها ئەخلاقییەکانە و ململانێی نێوان **تاریکی ـ رووناکی** و **باشە ـ خراپە** لەخۆوە دەگرێت. بۆ یەکەمین جار دانی بە ئازاد بوونی ئیرادەی مرۆڤ داناوە. تاوەکو ئەو کاتە خوڵقاندن، تایبەت بە خوداوەند دەبینرا، بەڵام لەگەڵ ناسینی ئازادی ئیرادەی مرۆڤ، بەو واتایە دێت کە مرۆڤیش بۆتە خاوەنی هێزی خوڵقاندن. داهێنانی تاکە کەسی کە گەوهەری هزری رۆژئاوایە، گرنگترین لایەنی فەلسەفی زەردەشتە. بە بنچینەگرتنی ئیرادەی ئازاد سەرەتای فەلسەفە و رەتکردنەوەی چەمکی کۆیلایەتی (بەندە)یە. لەو خاڵەدا هزرەکەی بە واتای پەڕینەوە دێت لە نێوان ئایین و فەلسەفە، بە واتای دووڕیانی نێوان فەلسەفە و ئایین دێت، ئەمەش واتای پێشکەوتنێکی مەزن دەگەیەنێت. ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەنجامدراون ئاماژە بەوە دەکەن کە لە پێکهاتنی فەلسەفەکانی رۆژهەڵات (هیند، چین) و رۆژئاوا و پێشکەوتنی دوو لایەنەدا وەکو سەرەتا و دەستپێکێك رۆڵی بینیوە. هەروەکو دیارە ئەو سەنتێزەی لە ئاستێکی بەرزدا لە نێوان کولتووری سۆمەری و ئاریانی پێکهاتووە بە قووڵایی سەرچاوەی بناخەی ئەم پێشکەوتنە پێکدێنێت. وڵاتی میدیا یاخود زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و تۆرۆس کە لەمیانەی دۆڵە بەپیتەکان یەکانگیردەبن، خاڵی بە یەکگەیشتنی شۆڕشی شاری سۆمەریەکان و شۆڕشی گوند ـ کشتوکاڵی نئۆلیتیکە. بە ئەندازەی ئەوەی زەردەشت خوڵقێنەری سەنتێزی ئەم میراسەیە، لەهەمانکاتدا نوێنەرایەتی رۆڵێکی بەمجۆرە دەکات کە لە ئاستێکی بەرزدا وەرچەرخان و ریفۆرمێکی مەزنی لەبارەیەوە ئەنجامداوە و کۆیلایەتی سەردەمە سەرەتاییەکانی نەرم کردۆتەوە و دەستپێکردنی قۆناخی چەرخی کلاسیکی لەگەڵ خۆیدا هێناوە کە زیاتر لەگەڵ لۆژیکدا دەگونجێ، ئیرادەی کۆمەڵگای کشتوکاڵی ئازادکردووە و رێگایەکی کراوەی بەرەو فەلسەفە هێشتۆتەوە.

بە ناو یەکداچوونی تایبەتمەندێتی پێغەمبەرایەتی ئایینی تاکخودایی و فەیلەسوفێتی کە پشت بە ئیرادەی ئازاد دەبەستێ، بۆ هەبوونی دوو کولتووری مێژوویی دەگەڕێتەوە کە لەم جوگرافیایەدا یەکانگیربوون. شتێکی رێککەوت نییە فەیلەسوفی مەزنی ئەڵمانی نیتشە زۆرچاك دەرکی بە گرنگییەکەی کردووە و دەرهەق بە زەردەشت ڤاڵبۆتەوە و لێتوێژینەوەی کردووە. لە کاتێکدا رۆژهەڵاتی ناوین، میزۆپۆتامیا بە دوای سەرچاوەی ئەو ئیرادە و بەها ئەخلاقیانەیدا دەگەڕێت کە وونی کردوون، رووکردن لە زەردەشت لە مەراقێکی رەها بۆ زانست بەولاوە، بۆ گەیشتن بە فەلسەفەی کۆمەڵگایەکی ئازادە کە گرنگترین لایەنیشی گەیشتنە بە سەرچاوەی چەمکی رەوشتی زیندووکردنەوە، سەرلەنوێ دۆزینەوەی گەوهەری خۆی لە مێژووودا دێت و لەمیانەی رەخساندنی لەگەڵ هەلومەرجی ئەو سەردەمەدا بە واتای ژیانەوەی دێت.

۲ ـ **بودیزم:** بودا رۆڵی ریفۆرمخوازی مەزنی لە دەوڵەتی راهیبی (براهمانی) هیندستان بینیوە. خۆی شازادەیەکی نێو ئەم سیستەمەیە. شیمانە دەکرێت لە دوای شکست و دۆڕاندنێکی مەزن کە دووچاری هاتووە، کەوتۆتە نێو شێوازی ژیانێکی پڕ لە ئێش و ئازاری مەزن. ئەو رەوشەی کە وەکو لە بەهەشت کەوتنە نێو دۆزەخ وابووە، بەرەو ڤاڵبوونەوەیەکی مەزنی بردووە. ئەم ئەزموونەش بە شێوەیەکی زۆر روون و بەرچاو ئەنجامەکانی جیاوازی چینایەتی و لایەنی ستەمکاری سیستەمی کۆیلەداری راهیبەکانی بۆ روون کردۆتەوە. سیستەمی کاستی هیندییەکان هێندە توند و زۆردارانەیە کە تاوەکو سەدەکانی دواتر، بەردەوامییان بە قوربانیکردنی مرۆڤ دەدا و تاوەکو ئێستاکەش گەلێك تایبەتمەندێتی لە ئارادان کە جیاوازی کولتووری لە نێوان کاستەکان دادەنێ. ئەم شێوە تایبەت و توندەی کۆمەڵگای چینایەتی بە سەدان ساڵ وەکو خۆی بەردەوام بووە.

بۆ تێگەیشتنی بودا، هەڵسەنگاندنی رەنگدانەوەی ئەم نموونەیەی کۆمەڵگای چینایەتی بەسەر پێکهاتەی رۆح و هزری مرۆڤ زۆر گرنگە. لە لایەکەوە توێژێك لە نێو ژیانێکی خۆش و گوزەرانی بێوێنە دایە، لە لایەکی دیکەشەوە چینی هەرە ژێر لە ئارادایە کە وەکو ئاژەڵ بۆ قوربانی بەخێودەکرێن و دەفرۆشرێن. روون و ئاشکرایە سیستەمێکی بەمجۆرە بناخە و سەرچاوەی ئێش و ئازار و تراژیدیایەکی مەزن پێکدێنێت. بودا بەرهەمی ئەم سیستەمەیە. هەروەکو چۆن جێگای خوداوەند لە فەلسەفەکەیدا نییە سروشتیش بە بنەما ناگرێت. هێندە بە خوڵقێنەر و خوڵقێنراوەکان پەیوەندیدار نابێت. کێشەی سەرەکی کە بە دوای چارەسەریەکەیدا دەگەڕێت، راستینەی دونیای بە ئێش و تایبەتمەندێتیە بە ئێش و ئازارەکانی ژیانە. ئەم هزرەی کە دواتر لە زۆربەی زۆری کۆمەڵگاکانی باشووری رۆژهەڵات لە ژێر ناوی بوودیزم تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان هاتووە و بۆتە فەلسەفەی ژیان، سەبارەت بە تایبەتمەندێتیە کۆمەڵایەتییەکانی فەلسەفەیەکی ئەخلاقە، ریفۆرمێکی ئەخلاقییە. هاوکێشە سەرەکییەکەی بەمجۆرە دانراوە:

ا ـ دونیا و کۆمەڵگا پڕن لە ئێش

ب ـ ئارەزووی بەهێز و ترس و نەزانی سەرچاوەی ئێش و ئازار پێکدێنن

ج ـ دەشێ لە ئێش و ئازار رزگاربیت. ئەم هەوڵدانانەش لە نیرڤانا دەگاتە بەرزترین پایەی پیرۆزی

د ـ رێگای ئەمەش یوگایە (رۆشنبوونەوە لەمیانەی زانیاری، ڤاڵبوونەوەی ناوخۆیی و رێچکە و شێوازەکانی)

لێرەدا شتێکی روون و ئاشکرایە هەروەکو لە نموونەکانی پێشوودا بینرا ـ میسر، سۆمەر ـ دەخوازرێت باڵادەستی سیستەمی کاست لەسەر پێکهاتەی رۆحی و هزری مرۆڤ نەرم بکرێتەوە. ململانێی بودا لەگەڵ راهیبەکان پەیوەندی خۆی بەم لایەنەوە هەیە. ئەڵقەیەکی ئەو ریفۆرمە کۆمەڵایەتییە پێکدێنێت کە لە سەدەی ۵ ، ٦ می پ.ز لە یۆنان تاوەکو "چین" پێشکەوت. هەروەکو چۆن کاریگەری داب و نەریتەکانی زەردەشتی لەسەر هەبووە، کاریگەری لەسەر هەردوو لایەنی رۆژهەڵات و رۆژئاوا کردووە. لەمیانەی شێوازەکانی خەڵوەت، خۆدابڕین لە هەوەس، ژیانی بە تەنیایی تەکییەکان، دەخوازێ سنوور بۆ خۆ زل دانانی چینی باڵادەست ـ چەوسێنەر دابنێت و لە راستی خۆی بگەیەنێ. هەروەکو چۆن ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی بەمجۆرەی ژیان نەفس پەروەردە دەکات، ئەوا پێشبینی و دیدگای عاریفی و گەڕانەوە بۆ ئەو ویژدانەی کە کوێرکرابوو لەگەڵ خۆیدا دێنێ و رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە کە هاوسەنگی خۆرسکی و تێڕوانینی واقعبینانە فێرببن و ئەمەش ئاسوودەیی ویژدان لەگەڵ خۆیدا دێنێ.

هەروەکو چۆن لە شارستانییەتی کۆیلەداری باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بودا باڵادەستی خودایی براهمانی تێکشکاند، لە پێکهاتنی سیستەمێکی گونجاوتردا رۆڵی بینیوە. لە کاتێکدا رۆڵی دۆگماکانی سنووردار کردووە، کاریگەری و رۆڵی مێشك و ویژدانی بۆ ناو سیستەم گواستۆتەوە. وەکو ریفۆرمخوازێکی مەزنی ئەخلاقی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا رۆڵی گێڕاوە.

۳ ـ **کۆنفۆشیۆس:** هەمان رۆڵی بودای لە چیندا بینیوە. شیمانەی ئەوە دەکرێت لە هەمان قۆناخی بودا واتە لە سەدەی ۵ و ٦ ی پ.ز دا ژیاوە. لەگەڵ پەرتەوازەبوونی سیستەمی مۆنارشییەتی چین، لەم ساڵانەدا ئاڵۆزییەکی مەزن دێتە ئاراوە. یادگارییەکانی قۆناخە پرشنگدارەکانی پێشوو (ماوەی نێوان ۱۵۰۰ تا ۷۰۰ پ.ز) دەبووە هۆکاری بیرکردنەوە لەسەر هۆکارەکانی پەرتەوازەبوون. لێپرسینەوە دەرهەق بەوە دەکرێت کە چۆن بۆ جارێکی دیکە رێبازی سروشتی (TAO) ئاوابکرێتەوە. لێرەدا دەخوازم ئاماژە بەوە بکەم کە ئەو زاراوەیەی

هەرە زێدە لەم سەردەمەدا بە کاردەهێنرێت (یاسا، رێگا، بە واتای شەریعەت) بە زمانی چینی (TAO) بە هیندی (دارما)، لای سۆمەریەکان "**ما**"، لە میسر "**مات**"، لە یۆنان "**مۆیرا**" ئەم گوتانە بە واتای تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی شارستانییەت دێت. بڕای بڕ پێویستە ژیان بە گوێرەی ئەم تایبەتمەندێتیانە بێت. ئەگەر بەمجۆرە نەبێت، ئەوا تێکچوونی ئەم سیستەمە دەبێتە ناچارییەك. رەوشێکی بەمجۆرە لەم سەردەمەدا لە ئارادایە. ئەم سەردەمەی لەگەڵ یاسا بنچینەییەکانی سیستەم ناگونجێت، بە واتایەکی دیکە ئەو قۆناخەی کە نموونە سەرەتاییەکان (ئایدیۆلۆژیای رەسمی) بەلاوەنراوە و هێشتا ئەلتەرناتیفی نوێی لە شوێن دانەنراوە ریفۆرم دەکات بە راستیەکی دەست لێبەرنەدراو. ئیتر لەمیانەی دۆگماکان دەوڵەتی راهیبەکان سیستەم بەڕێوە ناچێت. ئەو وەڵامەی دراوەتەوە، بە شێوەی دەوڵەتی بچووك (قۆناخی پارچەبوونی میرنشینە کۆیلایەتییەکان) و گرووپی سۆفیگەرایی و هزری فەلسەفی بووە.

ئەو ناوە دیارەی دەبێتە بەشی شارستانییەتی چین کۆنفۆشیۆسە. پێنج پرەنسیپە سەرەکییەکەی ئەمانەن:

ا ـ بەڕێوەبەر، پێویستە پێداویستییەکانی بەڕێوەبەرێتی پێکبێنێ.

ب ـ پێویستە ژن بە گوێرەی پێویستییەکانی ژنایەتی بژیت.

ج ـ پێویستە کوڕ پێداویستییەکانی پابەندبوون بە باوك جێبەجێ بکات.

د ـ پێویستە برای بچووك لەگەڵ برای گەورەدا کۆك بێت.

هـ ـ دەبێ هەموو کەسێك پێداویستییەکانی هاوڕێیەتی رەچاوبکات.

لە ریفۆرم زیاتر لە سەرلەنوێ ئاواکردن دەچێ (رستوراسیۆن = سەرلەنوێ ئاواکردنی کۆنەکە). بە هیچ شێوەیەك ئایین لەلایەن کۆنفۆشیۆسەوە نییە. تەنیا کێشەی کۆمەڵگا و سیستەمی سیاسی لە ئارادایە. سیستەمی تێکچووی سیاسی و کۆمەڵگا چۆن سەرلەنوێ ئاوادەکرێتەوە؟ لێرە ئەو مەسەلەیەی زیاتر تاوتوێ دەکرێت لە سەرلەنوێ ئاواکردنی پەیوەندییەکانی نێوان دەزگاکان زیاتر، تەنیا خەریکی تاکە کەس دەبێت. واتە لەلای کۆنفۆشیۆس "ئەخلاق" کێشەی سەرەکییە. لەمیانەی ئاواکردنی سیستەمی ئەخلاقیدا هەوڵدەدرێت سیستەم جێگیربکرێت. هەوڵدەدات چۆنییەتی یاساکانی نێوان تاکەکان تاوەکو دوایی بە شێوەیەکی یەکجار ورد دەستنیشان بکات، هەروەکو بڵێی تاڵی موو دەکات بە چل پارچە. ئەم هزرە تاوەکو ئێستا کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر کۆمەڵگای چین هەیە و گەوهەری کارەکتەر و ژیرێتییان پێکدێنێ. رەوتێکی کارەکتەری سۆفیگەراییە و لەپێشکەوتنی گشتی شارستانییەتدا نکۆڵی لە رۆڵەکەی ناکرێت.

**٤ ـ سوقرات و قۆناخی فەلسەفی کۆمەڵایەتی:** سیستەمی کۆیلایەتی چاخە سەرەتاییەکان کە میزۆپۆتامیا و میسر ناوەندەکەی بوون، سنووری شارستانیۆەتیان لە رۆژهەڵاتی ئاسیا تاکو ئەو پەری رۆژئاوای بڵاوکردۆتەوە. لەسەر بنەمای ئەم میراسە دەوڵەمەندەوە. سیستەمی کۆیلەداری یۆنان و رۆما لە هەڵکشان دابووە، ئاسن وەکو (تەکنۆلۆژیا)یەکی سەرەکی بەرهەمهێنان رۆڵێکی مەزنی لە بەدیهێنانی خۆشگوزەرانیدا دەبینێت، رێگا لەپێش فراوانبوونی چینی ناویندا دەکاتەوە، رێگاکانی گەیاندن و خوێندەواری لە زیادبووندا بوو. خاوەنی هەلومەرجێکی بەمجۆرەبوون کە مرۆڤەکان تێیدا هەستیان بە ئاسایش دەکرد. لە شاری (سارد)ی رۆژئاوای ئەنادۆڵەوە بە سانایی بەرەو پرس پۆلیسی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی ئێران هاتوچۆ دەکرا. دەیانتوانی توانستی ئایدیۆلۆژی و کولتووری چاخە دێرینەکان لە راهیبەکانی میسر و بابل وەربگرن. رەوشێکی پێچەوانەی رۆژگاری ئەمڕۆمان لە ئارادابوو کە لە رۆژهەڵاتەوە دەچنە ناوەندەکانی رۆژئاوا بۆ ئەوەی فێری زانست و کولتوور ببن. ناوەندی کولتوور و زانستی باڵا بابل و میسر بوو. ئەوانەی ئایدیۆلۆژیایان بۆ یۆنان و رۆما گواستەوە ئەو سۆفی و پاڵێوراوە راهیبانە بوون کە لەم ناوەندانەدا پەروەردەیەکی بەرفراوانیان بینیوە. بە ئەندازەی شێوازی بەرهەمهێنانی رۆژهەڵات لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز بە شێوەیەکی چڕوپڕ لە نێو بەرهەمی ئایدیۆلۆژیدا دەبێت، ئەزموونە زانستییەکانی خۆی پێشکەش دەکات و، سیستەمی ئەلف و بێی خۆی فێردەکردن. بە کورتی هەردوو نیمچە دوورگەی ئەوروپا، یۆنان و ئیتالیا کە لە ئاسیاوە نزیکن رۆڵی ئەو پردەیان دەبینی کە بەهاکانی دەگواستەوە، وەکو ناوچەی نوێ و دەستلێنەدراو بە رووی شارستانییەتدا کرانەوە.

هەروەکو چۆن ناتوانرێت لە ئاستی ئایدیۆلۆژیدا کردارەکانی ئەفسانە و ئایینی میسری و سۆمەری لەم گواستنەوەیەدا جیابکرێتەوە، ئەوا درێژەیان بە رۆڵی پێشەنگایەتی دەدا. تیۆلۆژی (زانستی خوداناسی) یۆنانی وەکو چەشنێکی خراپبووی ئەفسانەی سۆمەری پێشدەکەوێت. هەروەها لەبەر ئەوەی تیۆلۆژی یۆنانی لە ژێر کاریگەری بەردەوامی میسر و فینیقی و لاسایی کردنەوەی "گریت"ەوەیە، لە پێکهاتەیەکی پارچە پارچەیی رزگاری نابێت. بەڵام بۆ ئەوەی بیکات بە موڵکی خۆی، بە نێو تواندنەوەیەکی بەرفراوانیدا تێپەڕ دەکات. لە کاتێکدا **زیۆس** کۆپیەیەکی تەواوی مەردۆکی خوداوەندی بابلیەکانە، کرۆنۆسیس لاسایی ئەنکی دەکاتەوە. بێگومان کاتێك لە خاڵی سەرەکیدا گواستنەوە دەستپێکرد دواتری بە سانایی دێت. تەواوی زاراوە ئایینی و میتۆلۆژییەکانی نئۆلیتیك و کۆمەڵگای چینایەتی کۆیلەداری لەمیانەی گۆڕانکاری ناوی زاراوەکانی خۆجێیی دەکرێت. میتۆلۆژیای یۆنان کە تاوەکو ساڵانی ١٥٠٠ پ.ز ناوی نەبووە، میتۆلۆژیایەکی دەوڵەمەندی تێدا پێشدەکەوێت. بە دەستەوەخستنی بەهای مەعنەوی کە لە بەهای ماددی گرنگترە، زۆرگرنگە و تێیدا سەردەکەون. رۆژ بە دوای رۆژ روونەبێتەوە کە ئەو میتۆلۆژیایەی یۆنان کە هەوڵدەدەن وەکو پرشنگدارترین و خوڵقێنەرترین میتۆلۆژی بیسەپێنن، کۆپیەیەکی دووەمین و سێیەمی میتۆلۆژیای سۆمەرە. ئەنجامی دوایی ئەو لێکۆڵینەوەی لەم ساڵانەی دوایی ئەنجامدران و پێیگەیشتوون بەمجۆرەیە. بێگومان ئەگەر مێژوو تەوژمی رووبارێك بێت، ئەوا لەم ساڵانەدا لقێکی خۆی بۆ ئەم ناوچەیە درێژکردۆتەوە؛ هەروەکو چۆن ئەم خاکەی لەمیانەی لێشاوەکانییەوە تێرئاوکردووە، ئەوا زێ و گۆلە بچووکەکانی ئەوێشی بە لێشاوی سەرەکییەوە گرێداوە. هەروەکو میتۆلۆژیای یۆنان ئەوا پێشکەوتنی فەلسەفییەکەشی کە لەوێوە سەرچاوە دەگرێت لەمیانەی سوود وەرگرتن لەو کەڵەکە بوونە زانستییەی رووبارە سەرەکییەکە لە خۆیەوە دەگرێت قۆناخی خۆی دەستپێدەکرد.

کاتێك فەیلەسوفەکانی یۆنان قۆناخی فەلسەفەیان دەستپێکرد، پشتیان بە سەرچاوەکانی توانستە مەزنەکانی کۆمەڵگای چینایەتی و کولتووری سەردەمی نئۆلیتیك دەبەست، کە بە لایەنی کەم لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز لە میزۆپۆتامیا قووڵبۆتەوە و شەپۆل بە شەپۆل بڵاوبۆتەوە. سیستەمی بیرکردنەوەی رۆژئاوا ئەم راستینەیە تاوەکو دوایی بە شتێکی بچووك و بێواتا نیشاندەدات. رووی ئیمپریالیستی شارستانییەتی رۆژئاوا بۆ ئەوەی بناخەیەکی رەوایەتی بەمجۆرە بخوڵقێنێ کە هیچ کاتێك نەهەژێ، لەهەموو شتێکدا "**خۆ بە سەنتەربینین**" بە بنەما دەگرێت. کاتێك مەزنایەتی بەهاکانی شارستانییەت و کولتووری گەلانی دیکە ئاشکرا بکرێت، بە ئەندازەی ئەوەی بانگەشەکانیان بێواتا و پووچەڵ دەبێتەوە، ئەوکاتە ناچار دەبن پەسندی بکەن کە ئەوان هێزێکی پێشەنگایەتی ٥٠٠ ساڵی دوایین کە تەڤلی رووباری مەزنی شارستانییەت بوون. هەر لە سەرەتای چاخی دێریندا یۆنانییەکان ئەم چەمکە شۆڤێنییەیان نیشانداوە. بە گوێرەی ئەوان تەواوی ئەو گەلانەی لە دەرەوەی ئەم نیمچە دوورگەیە بوون تەنیا نوێنەرایەتی بەربەرییەتیان دەکرد. هەروەکو مێژووش روونیکردۆتەوە بە خۆیان لە نێو رەوشی بەرەڵایی ئەم قۆناخەدا بوون. کاتێك کولتووری پەرستگا و بیناسازی میسر، ئەلف و بێی و کەشتیەوانی فینیقیەکان، ئاسنگەرێتی فریگاییەکان، تەواوی ئامرازە تەکنۆلۆژییەکانی شۆڕشی کشتوکاڵی کەوانی بەپیت و میتۆلۆژیا و تیۆلۆژیای سۆمەریەکانیان بۆ خۆیان برد، هێشتان لەسەردەمی سەرەتایی و کۆچبەرییەکی نیوەچڵدا دەژیان و تەنانەت کولوبەشیان ئاوانەکردبوو. تەواوی ئەوروپا لە قۆناخی کۆمەڵی هۆڤێتیدا بوو. هۆکاری سەرەکی تەواوی هەڵوێست و تێروانینە چەوتەکان، چەواشەکردنی مێژووە کە رێگای لەپێش بێدادییەکی مەزن کردۆتەوە. چەمکی راست سەبارەت بە مێژوو بۆ بە دیهێنانی سیستەمێکی دادوەرانەی نێونەتەوەیی بنەمایەکی دەست لێبەرنەدراوە. ئەگەر پێویستیمان بە باوەڕی یاسا و دادپەروەری هەبێت، بەر لە هەموو شتێك پێویست دەکات ئەمە بە چەمکێکی مێژوویی بەمجۆرە ببەستێتەوە کە راست و دادوەرانە بێت.

سەرەڕای ئەم راستینەیەی شارستانییەت، بەڵام مسۆگەرە کە تایبەت بوون و داهێنانی یۆنانیەکان پێشکەوتووە. نیمچە دوورگەی یۆنان و دراوسێ نزیکەکانی، ئەنادۆڵی رۆژئاوا و باشووری ئیتالیا و لە باکووریش مەکەدۆنیا لە دوای میزۆپۆتامیا کەوتوونەتە نێو ئەزموونی گەورەترین شارستانییەتی جیهان، تەنیا بە شێوەکانی میتۆلۆژیا، تیۆلۆژی و ئایدیۆلۆژیاکانی پێشوو سنووردار نەمان، کە بەهرە و ئیلهامیان لێگرتوون. دیاردەیەك کە رۆڵێکی گرنگتری لە رۆڵی جیاوازی جوگرافیا و ئاو و هەوا گێراوە، ئەوەیە کە ئایدیۆلۆژیای سۆمەری هەم لە میدیا لەمیانەی داب و نەریتی زەردەشتی هەم لە هیندستان لە رێگای داب و نەریتەکانی بودا تێپەڕکراوە و شێوەیەکی نزیکی فەلسەفەی بە خۆوە گرتووە. **تالاس و فیساگۆرس** کە یەکەمین فەیلەسوفەکانی نیمچە دوورگەن سالآنێکی درێژی تەمەنی خۆیان لە میسر و میزۆپۆتامیا بەسەربردووە، لە سەدەی شەشەمی پ.ز گەیشتوونە ئاستی گواستنەوەی نوێکاری و درکاندنیان. هەروەکو چۆن لە رۆژگاری ئەمرۆماندا گەنجانی وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان تێروانینەکانی شارستانییەتی ئەوروپا لە وڵاتی خۆیان بڵاودەکەنەوە، ئەم دوو بەرئەندامە فەیلەسوفەش سەردەمی لاوێتی خۆیان بە تایبەتی لە بابل بەسەربردووە کە ئەو سەردەمە ناوەندی کولتوور بوون و لە دوای دەربازبوونیان بە ناو ئەزموونێکی پراتیکیدا، دوای فێربوون و گرتنی پێشکەوتووترین زانیارییەکانی ئەم قۆناخە و (بە تایبەتی بیرکاری و پزیشکی لە سەرووی هەموویانەوە) بناخە میتۆلۆژی و تیۆلۆژییەکانیان دەگەڕێنەوە؛ بنەما هزرییەکانی هەڵمەتێکی مێژوویی یۆنانەکان لە چاخی دێرین دادەنێن.

دیالەکتیکی هزری ئەم قۆناخە خاوەنی تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرەی بڵاوبوونەوە بوو. لە سفرەوە دەستپێکردن لەملاوە بمێنێت، ئەم زانیارییانە بە قۆناخێکی پێگەیشتن و ریفۆرمدا دەرباز دەبن و دەگوازرێنەوە و رەنگی خۆیانی پێدەدەن؛ بە گوتنی، ئەم سەردەمە بۆ هەلومەرجە واقعی و بەرجەستەکانی وڵات دەگوازرێتەوە و بە شێوەیەکی خوڵقێنەرانە بە گوێرەی خۆیان دەیگونجێنن و هەوڵدەدەن بەمجۆرە پراکتیزەی بکەن.

کاتێك ئەو قۆناخە هزرییانەی رۆڵیان لە رۆشنگەری یۆنان بینیوە یەك لە دوای یەك بگرینە دەست دەتوانین ئاماژە بەوانە بکەین:

ا- یەکەمین قۆناخی کە بە هۆمیرۆس و هیۆدۆس دەستپێکردووە، قۆناخی گێڕانەوەی میتۆلۆژیا و تیۆلۆژی یۆنانەکانە. **هۆمیرۆس** گەورەترین هۆزانی چاخی کلاسیکە. بە واتایەکی دی نوێنەرایەتی قۆناخی شیعری سالآنی ١٠٠٠ پ.ز دەکات، شیعری مەزن نیشاندەدات. ئەم قۆناخە سالآنێکە "**ڤەداکان**" لە هیندستان، "**ئاڤێستا**" لە ئێران، داستانی خوڵقاندنی بابل "**ئەنومائەلیش**" لە میزۆپۆتامیا، لە کەنعان "**یاهۆڤا، ئەلۆهیم**" بە واتایەکی دیکە "**تەورات**" بە شێوەیەکی زارەکی و نووسراوە مۆرکی خۆی لێداوە. زمانی هەموویان، زمانی شیعرە. ئەمانە داستانی کۆنفیدراسیۆنی تیرە و خێڵەکان و ئاواکردنی خانەدانەکان پێکدێنێ. دەشێ ئەمانە بە داستانی قارەمانێتیش ناوببرێت. رەنگدانەوەی ئارەزوو و ئیرادەی ئەو کەس و چینانەیە کە خۆیان وەکو نیوخودا نیشاندەدەن.

ئەوەی هۆمیرۆس باسی دەکات، پراکتیزەکردنی چیرۆکێکە بە گوێرەی قۆناخی قارەمانێتی یۆنان کە ماوەیەکی درێژ بەر لە دەرکەوتنی ئەو لە جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوین بۆتە داب و نەریتێك. ئەو شەڕەی کە بە درێژایی ١٨٠٠ تاوەکو ١٢٠٠ پ.ز بەردەوامبووە و لەگەڵ کەوتنی شاری "**تەروادە**"ی مێژوویی ئەنجامگیر بووە و ئەمجارە دەرگای ئەنادۆڵ بە پێچەوانە بە لای ئاکالاکان و دۆراکان کرایەوە، ئەم لێشاوە بەربەریانە بە زمانێکی داستان ئامێزانە باسی لێوەدەکرێت. رۆڵی مێژوویی شاری تەروادە مەزنە، کە دەکەوێتە نزیك گەرووی چانەقەڵای ئەنادۆڵ. بە لانی کەمەوە لە سالآنی ٤٠٠٠ پ.ز بەدواوە ئەم ناوچەیە (تەروادە) رۆڵی پرد و دەرگای گواستنەوەی کولتوور و بەهاکانی شارستانییەتی ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا بۆ نیمچە دوورگەی یۆنان و بەلکان دەگێڕێت. یۆنان و بەلکان تێر دەکات و بەسەریاندا زاڵە، لەمیانەی ئەمەشدا تەروادە لە نێو قۆناخی زێرینی خۆیدا دەژیت و جێی سەرنج راکێشانی هەموو لایەکە. هەربۆیە کەوتنی ترواداە پێچەوانەکردنەوەی مێژوویەکی مەزن و درێژخایەنە. داستانی "**ئیلیادە**"ی هۆمیرۆس کە دوای داستانی **گلگامێش** بە پلەی دووەم دێت، قۆناخی دە ساڵی ئەم مێژووە مەزنەی کردووە بە داستان، واتە شەڕێکی دوای کۆتایی سالآنی ١٢٠٠ ی پ.ز کردۆتە داستان. لەبەر ئەوەی لەم قۆناخەدا بەهەمان شێوە شەڕی بەرخودان و هێرشی گەلانی دیکەش دەکرا بە داستان، هەربۆیە ئیلیادە بۆتە خاوەنی بەهایەکی گەردوونی. لە قۆناخی بەربەرییەتدا، بە گوتنێکی دیکە لە نێو یەکینەکانی شێوازی فیدراسیۆن کە بە یەکینەکانی رەچەڵەك و ئەتنیکی بە شێوەیەکی کاتی و ئاستەم بەڕێوەدەچێت رۆڵی نائاسایی سەرۆك تیرەکان بە شێوەیەکی زێدەرۆیی باس دەکرێت. پێویستی بەوە هەیە، چونکە ئەم چڕبوونەوەی هێز نەبێت ئەوا قۆناخی دواتر قۆناخی کۆمەڵگای چینایەتی و بە دەوڵەتبوون پێکنایەت. ئەم گێڕانەوە داستان ئامێزییانەی تاوەکو ئێستا لە هزری هەر گەلێکدا دەژیت، گرنگی و زەحمەتییەکانی گەیشتن بە هێزێکی شارستانییەت نیشاندەدات و گوزارشت لە وەرچەرخانی قۆناخی مێژوو دەکات.

گەیشتنی ئیلیادە بە نووسراوی بە رۆژگاری ئەمرۆمان بایەخێکی مێژوویی مەزنی بەمجۆرەی هەیە. کاتێك ئیلیادە ئاماژە بە یەکەمین "**هێلین**" خەیاڵی یەکێتی یۆنانییەکان دەکات، دەرك بە بایەخ و بەهای مەزنی کەوتنی تەروادە دەکات. هەروەکو دەزانرێ دوای کەوتنی ترواداە لە سالآنی ١٢٠٠ پ.ز بەدواوە قۆناخێکی بڵاوبوونەوەی پێچەوانەی بە ناو "**قەومە دەریاییەکان**" لە ئەنادۆڵی رۆژئاواوە دەستپێدەکات. لە کاتێکدا رەنگی ئیۆن لە رۆژئاوای ئەنادۆڵ جێگیردەبێت، ئەم شەپۆلە بەرەو میزۆپۆتامیا، رۆژهەڵاتی دەریای سپی، باشووری دەریای رەش، باشووری ئیتالیا، مەکەدۆنیای رۆژگاری ئەمرۆمان و بەدرێژایی دەریای رەش بڵاودەبێتەوە. دووەمین داستانی گەورەی هۆمیرۆس "**ئۆدیسە**" باس کردنی ئەم بڵاوبوونەوەیە بە رێگای دەریاوە، بە داستانی کردنی موغامەرە و کردنەوە (فەتح)ی دەریاییە. لەبەر ئەوەی بۆ یەکەمین جار بە شێوەیەکی نووسراوە بڵاوبوونەوەی رێگای دەریایی بۆ رۆژگاری ئەمرۆمان گواستۆتەوە، هەم بەهۆی گەوهەری بەڵگە مێژووییەکەی و هەم لەبەر ئەوەی زمانی ئەدەبی میتۆلۆژی قۆناخ نیشاندەدات گرنگییەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. لەبەر ئەوەی خاوەنی گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی ئەو گەڕانەی گلگامێشە کە لە ئاوەکانی ژێرزەویدا بەدوای "**گیای نەمریدا**" گەڕا، بەهۆی پەیوەندییەکەی لەگەڵ داب و نەریتەکان، بە بایەخ و بەهاداردەبینرێت.

"**تیۆلۆگیا**"ی هیسۆدۆس کە لە سالآنی ٨٠٠ پ.ز بە زمانێکی شیعرئامێزانە نووسراوە، ئیلهامی خۆی لەو میتۆلۆژیایەوە دەگرێت کە بە گوێرەی هەلومەرجەکانی قۆناخ رێکخراوە. میتۆلۆژیای سۆمەریەکان لە رێگای ئەنادۆڵەوە وەرگیراوە و بە تایبەتیش لەسەر بنەمای کۆپیەکردنی شێوازی هیتیتەکان لە بەرزکردنەوەی قۆناخی قارەمانێتی یۆنانیەکان بۆ ئاستی خوداوەندەکان بە کارهێنراوە. تەواوی چالاکییە قارەمانێتییەکانی ئەم قۆناخە مێژووییە و هەوڵەکانی بە دەوڵەتبوون کە لەسەر بنەمای خانەدانی بەرزبوونەوە و یەك لە دوای یەك هاتن، ئیلهامی خۆیان لە میتۆلۆژیای سۆمەر و میسریەکان وەرگرتووە بۆ ئایدیۆلۆژیای بچووکی یەکێتی خوداوەندەکان "**پانتائۆن**" دەگۆڕێت و دەکرێت بە ئایین، واتا دەکرێت بەو قالبە باوەڕیانەی پەیڕەوکردنیان ناچارییە. چەمکی خودای مەزن کە بە ناوی"**تەشوب**" لەلای هیتیت و هۆریەکان، "**بال**" لە لای فینقیەکان، "**یهوە، ئەلۆهیمە**" لەلای عیبرانیەکان، "**براهما**" لەلای هیندیەکان،"**ئاهورامەزدا**"لە ئێران بەرز دەبنەوە، ئەوا هەوڵەکانی بە ئایین کردنی ئەم چەمکە بە شێوەیەکی درەنگ لە لای یۆنانیەکان لە ژێر ناوی یەکێتی خوداوەندەکان "**پانتائۆن**" شێوە دەگرێت، کە لە خوداوەندەکانی ئۆلۆمپیا پێکدێت و زیۆس سەرۆکایەتیان دەکات. ئەو کۆمەڵگایەی بە قۆناخێکی قارەمانێتی دەربازبووە و بۆ دەربازبوون لە یەکینەکانی رەچەڵەك و پێکهاتە ئەتنیکی و پەڕینەوە بەرەو یەکینەی سیاسی و دەوڵەت بوون ئاواکردنی پێکهاتەی سەرخانی ئایدیۆلۆژی لە بنەماکانیدا شاراوەیە. واتا پێویستی بە زۆر ئاواکردنی یەکێتی سیاسیانە، بە بەهانەیەکی ئایدیۆلۆژیەوە گرێدەدرێت. خوڵقاندنی ئایدیۆلۆژیا بۆ هەموو ئۆرگانیزاسیۆنێکی سیاسی نوێ ناچارییەکە.

دەتوانرێ ئەم قۆناخە لە هەموو سەردەمەکانی مێژوو و کۆمەڵگاکاندا ببینرێت. لە بناخەی هەمووشیاندا هەوڵەکانی گەیشتن بە وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی و جیابوونەوەی چینایەتی و بە دەوڵەتبوون هەیە کە لە قۆناخی قارەمانێتی سۆمەریەکان لە ماوەی نێوان ٤٠٠٠ تا ٣٠٠٠ پ.ز پێشکەوتن. لە ئەنجامی ئەو هەوڵانەشدا خوڵقاندنی ناسنامەی خوداوەندەکان لەلایەن راهیبەکانی سۆمەر بە بنەمادەگیردرێت کە خودای ئاسمان "AN" **ئانە**، خودای ئاو و هەوا "**ئەنلیل**" خوداوەندە ژنی شاخ"**نین هورساك**"(دواتر ئینانا، عەشتار)، خوداوەندی ئاو و زەوی "**ئەنکی**" بە بناخە دەگیردرێت. ئەوەی کە بناخەی تەواوی "**تیۆلۆژیا**"کانی تا رۆژگاری ئەمرۆمان پێك دێنێت و رۆڵی سەرەکی لە شێوەگرتنیدا بینیوە ئەزموونی سۆمەریەکانە.

هەڵبەتە هەر ناوچەیەکی جیاواز داب و نەریتە کولتوورییەکانی خۆی تەڤلیکردووە و وەرچەرخان و توانەوەی پێویستی ئەنجامداوە و بە گوێرەی خۆی گونجاندوویەتی. هیسۆدۆس ئەمە لەپێناو نیمچە دوورگەی یۆنان ئەنجامدەدات. ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم بوارەوە ئەنجامدراون توانیویانە پەیوەندی زانستی نێوان "**ئەنکی = کرونۆس**" ،"**ئەن = ئۆرانۆس**"، "**مەردۆك = زیۆس**" دابنێین. لەبەرئەوەی تیۆلۆژیای هیسۆدۆس تایبەتە و خاوەن سیستەمە و بە شێوەیەکی نووسراو گەیشتۆتە رۆژگاری ئەمڕۆمان گرنگییەکی مەزنی هەیە. ئامادەکردنی پارچەیەکی گرنگی داب و نەریتی کولتووری مرۆڤایەتی بچووك ناکرێتەوە. بەڵام بە بێ ئەوەی سەرچاوەکەی ئاشکرا نەکرێت ئەنجامی راست و دروست بەدەست ناهێنرێت. بە تایبەتیش کاتێك لە دایك بوونی ئایینە تاکخوداییەکان هەڵدەسەنگێنین، مسۆگەر لە بەرچاوگرتنی لێشاوی کولتووری دێرین و شیکردنەوەی گرنگییەکی مەزن لەخۆوەدەگرێت.

ب ـ ئیتر داستانەکانی ڤارەمانێتی و دەربڕینەکانی تیۆلۆژیا لە سەدەی شەشەم پ.ز بەدواوە ناتوانن وەڵامی قۆناخ بدەنەوە. ڤالبە ئایدیۆلۆژییەکانی کۆیلەداری چاخی دێرین بەشی بەردەوام کردنی شارستانییەتی کۆیلایەتی ناکات، کە دووچاری قەیران هاتووە و ناتوانێ رێگای دەربازبوونی بۆ ببینێتەوە. مسۆگەر لەم قۆناخەدا پێویستی بە تەڤینەوەیەکی نوێی ئایدیۆلۆژی و هەڵمەتێکی هزری و رۆحی هەیە. هەم گەیاندنی دیاردەکانی سروشت و کۆمەڵگا بە روونکردنەوەی نوێ، هەم دۆزینەوەی چارەسەری بۆ ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی پێبەپێ خۆی دەسەپێنێ. پێویست دەکات ریفۆرمەکانی زەردەشت و بودا بە تایبەتیش ئەو ریفۆرمانەی لە بواری ئەخلاقیدا رێگایان لەپێش کردەوە گشتگیربکرێت و بەسەر تەواوی پەیوەندییەکانی سروشت و کۆمەڵگادا رەنگبداتەوە. شارە تازە ئاواکراوەکانی یۆنان، باشووری ئیتالیا، رۆژئاوای ئەنادۆڵ زەمینەیەکی لەبار بۆ ئەم کارە پێشکەش دەکەن. کولتووری ئایینی خاوەن فشاری دەوڵەتی ناوەندی میسر و سۆمەر هێشتان لەم ناوچەیەدا بناخەیەکی بەهێزی نییە. سیستەمی تازەی کۆیلایەتی هەروەکو چۆن پێویستی بەو ئایدیۆلۆگانە هەیە کە لە خزمەتیدا بن، لە رەوشێکی بەمجۆرەشدا نییە کە دووچاری تەنگەتاوی بێت و فشار پیادە بکات. قۆناخێکی بەرهەمداری بەرزبوونەوەی شار لە ئارادایە. هەوڵە شکۆدارەکانی ئایدیۆلۆژیا کۆسپ نییە، بەڵکو لەمە زیاتر دەسکەوت لەگەڵ خۆیدا دێنێ. ئەم راستیە ماددییە لە بنەمای رۆشنگەری یۆنانییەکاندا شاراوەیە.

ناوچەکانی "**ئیۆنیا**"ی رۆژئاوای ئەنادۆڵ و "**ئەلەیە**"ی باشووری ئیتالیا کە بۆ یەکەم جار فەلسەفەی تێدا پێشکەوت، لەبەر ئەوەی لە ناوەندی یۆنان دووربوون، دەرفەتیان بە رەخساندنی زەمینەیەکی ئازاد داوە. رۆڵ و دەسکەوتی فەلسەفی تالاسی میللەتە کە لە مێژوودا وەکو یەکەمین فەیلەسوف ناودەبرێت، لەو هەوڵەیدا دەبینرێ کە بەبێ تەڤلیکردنی خوداوەند بۆ ناو مەسەلەکە سروشت لەمیانەی پەیوەندییەکانی خۆی روون بکاتەوە. کاتێك گوتویەتی"**گەردوون لە ئاو دروست کراوە**"، لەوانەیە بەگوێرەی پێوانەکانی  ئەم رۆژگارە بگوترێ شتێکی ئەوتۆی دیارینەکردووە. بەڵام بەر لەوەی سێبەری خوداوەندی لە هزری مرۆڤدا بکەوێت درکاندنی ئەمە بە شێوەیەکی سەربەخۆ، لە مێژووی هزری مرۆڤایەتیدا بەهایەکی شۆڕشگێڕی هەیە. پێویستە لەبیرنەکرێت کە لە ژێر ئەم هزرەشدا بۆچوونی سۆمەریەکان شاراوەیە کە دەڵێ خوداوەندی سۆمەریەکان سەرەتا ئاوی خوڵقاند یاخود خوداوەند لە ئاو خوڵقێنرا. هەروەکو دەزانرێت "**ئەتلەس**" هەم لە میسر، هەم لە بابل پەروەردەی بینیوە. هەروەها بۆچوونی"**خودا لەهەموو شوێنێکە**" دەکرێت بە موڵکی ئەتلەس. لێرەدا رووکردن لە فەلسەفەی ئایین جێگای باسە. پەیوەندی نێوان خوداوەند و سروشت نەپچڕێنراوە. بە ناویەکداچوونی هەردوو فاکتەر جێگای باسە، رێگە لەپێش یەکەمین شێوەگرتنی چەمکی "**وحدە الوجود**" دەکاتەوە.

دووەمین هەنگاوی گرنگ هیرۆکلۆتیس ئەنجامیدەدات؛ بەبێ ئەوەی باسی خوداوەند بکات، ئاماژە بەوە دەکات کە بنەماکانی سروشت لە خۆیەوە دەجولێتەوە، ئەوە دووپات دەکاتەوە کە سروشت لەمیانەی سیستەمی یاساکانی نێوخۆی دەجولێتەوە، بەبێ پێویستی هیچ کاریگەرییەکی خودایی بەردەوام لە گۆڕاندایە؛ بۆچوونەکەی بەشێوەی"**دووجار لە ئاوەرۆی رووبارێکدا خۆ ناشۆرێت**" فۆرمیلەدەکرێت. شێوازی هزری بەمجۆرە بناخەی بۆ دادەنرێت کە بۆ یەکەم جار بە شێوەیەکی ئاشکرا ماددە بە بناخە دەگرێت. هیرۆکلۆتیس لە مێژوو بە بناخەی ماددییەت دادەنرێ کە دواتر وەکو هزری پێشخراوی "**ماتریالیزمی مێژوویی**" دەگۆردرێت سەرچاوەی سەرەکی خۆیان لەم شێوازەی هزر وەردەگرێت.

لە لایەکەی دیکەوە، لە باشووری ئیتالیا ڤیساگۆرس بنەماکانی فەلسەفەی ئایدیالیستی دادەنا. ئەویش وەکو ئەتلەس ماوەیەکی درێژخایانی لاوێتی خۆی (٢٥ ساڵ) لە ڤوتابخانەکانی راهیبەکانی میسر و بابل بەسەربردووە و پەروەردەی بینیوە، رەوشی شارستانییەتی ئەو سەردەمەشی بە چاوان بینیوە. گرنگی راستەڤینەی ئەم فەیلەسوفە کە لە ماوەی نێوان سەدەکانی پێنجەم و شەشەمی پ.ز ژیاوە ئەوەیە کە بیرکاری لەسەر پەیوەندییەکانی سروشت پەیڕەوکردووە. ژمارەکان بە پیرۆز دەبینێت، باوەڕی بەوە هەیە لەمیانەی تایبەتمەندێتیەکانی ژمارەکان دەکرێ هەموو شتێك روون بکرێتەوە. ئەوە دەردەخاتە پێش کە لەمیانەی مۆسیقاوە دەشێت گوێڕایەڵی زمانی تەبایی بکرێت، سیستەمی هەماهەنگی (ARMONYA) دەپارێزێت. بنەما رۆحییەکانی لە بناخەی هەموو شتێکدا بە مەرج دادەنێ، راستینەی ماددە و جەستە وەکو قەفەسی بەندکردنی رۆح دەبینێ. بە شێوازی سۆفیگەرایی هزری خۆی بەڕێوەدەبات، پەروەردەیەکی چڕوپڕ بە بنەمادەگرێت. کۆمەڵگای چینایەتی کە لە یۆنان و ئیتالیا لە دایکبووە بەڕێوەبەرایەتی فەیلەسوفانەی بەر لە ئەفلاتوون ئامادە دەکات. لە راستیدا ئەوەی ئەنجامیان داوە گونجاندن و رێکخستنی پرەنسیپە سەرەکییەکانی بەڕێوەبەرایەتی سۆمەر و میسرە بە گوێرەی هەلومەرجەکانی ناوچەی خۆیان، شتێکی روون و ئاشکرایە کە بە شێوەیەکی بەرفراوان کاریگەری ئەم دوو ناوەندەی لەسەرە. بەڵام پێشبینی ئەوەی کە هەر شێوەگرتن و فۆرمێکی سروشت پشت بە رێژەی ژمارەکان دەبەستێت و دۆزینەوەی ئەم رادەیە لەهەر شتێکدا گرنگە، ئەمەش دەسکەوتێکی گرنگە. دیاریکردنی ئەم رێژەیە گرنگییەکی مەزنی هەیە لەپێشخستنی مۆسیقا، بیناسازی و پزیشکی. جێگرتنی ژمارە و پێوانە و سنوور لە پەیوەندییەکاندا پێشکەوتنێکی گرنگە. گەیشتنی پێکهاتەی هزری و رۆحی مرۆڤ بە لۆژیك خاوەنی رۆڵێکی گرنگە.

گرنگترین فەیلەسوفی لە ماوەی نێوان سەدەی ٦ ـ ٥ پ.ز لە ناوچەکانی ناوەندی یۆنان ژیاوە (**پارمەنیدس**)یە. بایەخەکەی لەوەدایە کە هەبوونی لۆژیك، تێگەیشتن و ژیری لە بنەمای هەموو شتێکدا بە مەرج دادەنێ. لە کاتێکدا ئەوە پێشدەخات کە باوەڕی بەم فێربوونە ناکرێت کە لە رێگای سۆزەکانەوەیە و ئەو زانابوونانە بە خەڵەتاندن دادەنێت کە لەڕێی سۆزەکانەوە بەدیدێت. باوەڕ بەوە دەکات فێربوون لە رێگای مێشك بە بناخە دادەنرێت و لەمیانەی ئەو شێوازەی فێربووندا بە راستی دەگەیت. لە راستیدا گرنگی پارمەنیدس لەوەوە دێت بەهایەکی مەزن بەو مێشکەی مرۆڤ دەدا کە ژیر و وشیاربۆتەوە. بەڵکو زێدەرۆیی کردووە لەمیانەی دوورکەوتنەوە  لەسەرچاوەکانی زانیارییە بەرجەستەکان، کەوتۆتە نێو هەڵەیەکی مەزنی پێڕەوی کە هەزار ساڵی خایاندووە. بەڵام دەرهەق بە دانانی بناخەی بیری لۆژیکیانە و دەستنیشان کردنی گرنگییەکەی رۆڵێکی گەردوونی گێڕاوە.

ئەو رەوشە ئاستەمانەی دەوڵەتی ئەتینا بەرامبەر پارسەکان دووچاری هات، ئەو زیانانەی بەریکەوت، پێشبڕکێی لەگەڵ ئەسپارتا، زیادبوونی جیاوازی چینایەتی، لە سەدەی ٥ پ.ز بەدواوە رێگا لەپێش قۆناخێکی قەیراناوی دەکاتەوە کە هەنگاو بە هەنگاو قووڵدەبێتەوە. بە پێی دەربازبوونی کات کێشە کۆمەڵایەتییەکان خۆی دەسەپێنێ. زەمینە بۆ ئاقڵمەندەکان پێگەیشتووە. ئەم رەوشەش رێگای لەپێش کاریگەرییەکی دوولایەنە کردۆتەوە. لە لایەکەوە وشکە باوەڕە ئایینیەکان باوەڕی لەدەستدەدەن و باوەڕی بە خوداوەندەکان لاوازدەبێت. لە لایەکی دیکەشەوە ڤوتابخانە فەلسەفییە دژبەیەکەکان بەردەوام سەر لە مرۆڤ دەشێوێنن. ئاقڵمەندەکان ئەم زەمینە دەڤۆزنەوە لەژێر دروشمی "**هەر کەسە و بە گوێرەی خۆی خاوەن هزرێکە**" رێگا لەپێش رەوشێکی نزیك بە ئازادی تاکە کەس دەکاتەوە؛ بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڤاڵبە سەرەکییەکانی هزر دوورکەوتوونەوە دەبوونە هۆی بە رووکەشی مانەوەی زانیارییەکان و ژێرپێکەوتنی ئەم هزرانە. رەوشێکی خراپ ببوون و ئیستسمار جێگای باسە. لە ئایین و فەلسەفەش شتێك بە ناوی پێوانە نەما. "**هەر کەسە و پێوانەی بە گوێرەی خۆی**" واتای دووبارە گەڕانەوەی حوکمڕانی یاساکانی دارستان و زاڵکردنی دەسەڵاتی سەرەڕۆییە بەسەر کۆمەڵگا. رێگا لەپێش بێواتابوون و لەرێلادانی بەهاکانی کۆمەڵگا و ساختەکاری دەکاتەوە. سنووردانان بۆ ئەم رەوشە ناچارییەکە.

ج ـ سوقرات وەكو بەرهەمێكی ئەم قۆناخە سەریهەڵداوە كە هەموو شتێك تێكەڵ بە یەكتری ببوو. كاتێك كێشە كۆمەڵایەتییە گران بووەكان بە دوای روون كردنەوە دەگەڕان، ئەوا چۆنێتی شێواز و ناوەڕۆكی ئەم كێشەی سەرەكی بوو. تاقمە ئاقڵمەندەكان لە مەزنكردنی ئاڵۆزی بەولاوە رۆڵێكی دیكەیان نەدەبینی. سیستەم لەپەلوپۆ دەخەن، دەیهەژێنن، بەڵام خۆیان لە بەرپرسیارێتی دانانی ئەلتەرناتیف بەلاوەدەنێن. رێگایان لەپێش دەركەوتنی نەوەیەكی بێ رۆحی بەرپرسیارێتی دەكردەوە. ئەم لاوانە دەرهەق بە هیچ بەها و بیر و باوەڕییەك خۆیان بەرپرسیار و خاوەن ئەرك نەدەبینی. كاریگەری مەزنی ئەم مەترسییە لێرەوە سەرچاوەی دەگرت. سوقرات (لە ساڵی ٤٧٠ تا ٣٩٩ پ.ز) بەرامبەر بەم رەوشە لەمیانەی دانانی بناخەكانی هزرێكی ئەخلاقی و ریشەیی رۆڵێكی مێژوویی دەبینێ. ئەم پرسیارەی سوقرات بە شێوەیەكی بنچینەیی وەڵامی بداتەوە؛ هەموو شتێك، بە تایبەتیش هەموو كارێك پێوانە و یاسای كامڵ بوونی خۆی هەیە. كاتێك زیاتر روون بكرێتەوە؛ بە واتای زانینی بنەماكانی ئەو بابەتە و كارە دێت كە دەخوازیت ئەنجامی بدەیت یان پێیەوە خەریكی. "خۆت بناسە" پارۆلای بەناوبانگی ئەم بابەتەیە. واتا هەر یەكێك دەرهەق بە مەسەلەیەك یان كارێك خاوەنی زانیارییەكی پێویست تەنانەت زانیارێكی تەواو نەبێت، مافی قسەكردنیان نییە، نابێ خۆیان بخەنە ناو ئەم كارە. نەزانی دایكی تەواوی ئاڵۆزی و هەڵە و خراپییەكانە. ئەوەی بخوازێ رێگای باشە بكاتەوە، دەبێ دەرهەقی بزانێ و خاوەن زانیاری بێ.

ئەم زانیارییەش پێوانەی گشتی خۆی هەیە. نابێ هەر كەسە بە گوێرەی خۆی خاوەن پێوانە بێت. هەموو پیشە و دەزگایەك پێوانە و یاسای خۆی هەیە. ئەم پێوانە و یاسایانەش بۆ هەمان ئەو پیشە و دەزگایانەش پەیڕەودەكرێت كە لق و پۆپی ئەم پیشە و دەزگا سەرەكییانەن. تەواوی دەزگا كۆمەڵایەتییەكانی وەكو باوەڕمەندی، پیشەكاری، جووتیاری، سیاسەت، سەربازی، پیوانی تەواوی خۆیان هەیە كە پشت بە زانیاری دەبەستێت. كاتێك ئەم پیوانانە پەیڕەوبكرێت ئەم دەزگا و پیشەیە بە تەواوەتی رۆڵی خۆی دەبینێ. بۆیە ئەو شتەی هەرە زێدە پێویست دەكات؛ هەر هەوڵێكی سەبارەت بە كارێك، پیشەیەك دەدرێت دەبێ پشت بە زانیاری ببەستێ. یەكێك بخوازێ كارێك بكات كە زانیاری لە بارەیەوە نییە ئەوا لە دواییدا دەكەوێتە رێگایەك دەركەوتنی بۆ نییە. بە واتایەكی دیكە ئاماژە بە بناخەی پرەنسیپی"**پراكتیكێكی دروست، لە تیۆرییەكی دروستەوە سەرچاوە دەگرێت**". ئەگەر سەرنج بدرێت ئەم هەڵوێستە هەمان ئەو نزیك بوونەوەیە كە **بودا و كۆنفۆشیۆس و زەردەشت** بە دوایدا گەڕاون.

پەڕاوێك یاخود تێروانینێكی بەرفراوانی سوقرات دەرهەق بە بابەتێك نییە. ئەو زیاتر خەریكی شێواز و پرسیاری"**چۆن بژین؟**"ە. ئەگەر پەیڕەونەبێت ئەوا تەواوی ئەم زانیارییانەی كۆدەكرێتەوە وەكو ئەو  كتێبانە وایە كە لە پشتی كەر باردەكرێت؛ بەڵكو لەمەش مەترسیدارترە. چونكە زانیارییەكی مرۆڤ بە شێوازێكی هەڵە بەكاربیبێنێ بەرامبەر بە رەوشی بەلەنگازی كەر، هەزاران جار مەترسیدارترە و دەشێ رێگا لەپێش رەوشێكی هەڵەدا بكاتەوە. سوقرات بە شێوەیەكی مافدار و رادیكاڵانە بەرامبەر ئەم كێشە سەرەكییە دەوەستێ و هەڵوێست نیشاندەدات. بێگومان مەراقی ئەوە نییە ببێتە خاوەنی زانیارییەكی زۆر، بەڵكو ئەوەیە كە بۆچی و چۆن زانیاری بە دەست هێناوە. هیچ باوەڕ بەو زانیارییانە ناكات كە هۆكارەكە و چۆنێتی بە دەستخستنی دیارنییە. لەهەمانكاتدا كاتێك وەڵامێكی راستی پرسیاری زانیاری بۆ چییە، بدرێتەوە، ئەوا ئەو زانیارییە و ئەوكارەی زانیاری دەرهەق وەرگرتووە بە شێوەیەكی راست ئەنجامگیردەبن. بە گوێرەی سوقرات بیركردنەوەیەكی راست ئەنجامدانی كرداری چاك لەگەڵ خۆیدا دێنێ. ئەوكارەی بە باشی كرابێت، كاری هەرە جوان و رێك و پێكە. پرەنسیپی"**راست بیربكەوە، باش كاربكە، جوان بە**" گەوهەری ئەخلاقی سوقراتە. ئەم  پرەنسیپە بە شێوەی"**بیری چاك، وتەی چاك، كرداری چاك**" لەلای زەردەشت فۆرمیلە كراوە. لایەنی هاوبەشی ئەم هزرە لەیەكچووانە، ریفۆرم كردنی سیستەمە تێكچووەكەیە. ئەوەی یەكەمین دامەزرێنەرەكان ئەنجامیان داوە سەپاندنی ئەم پێویستییەیە.

بێگومان ئەوانەی بەرژەوەندییان گرێدراوی رەوشی قەیراناوی كۆمەڵگایە، بە دڵخۆشییەوە پێشوازی لەم هەڵوێستە توند و بە پرەنسیپە ناكەن. هەروەكو لە هەموو قۆناخێكدا دەبینرێ ئەوانەی بەرژەوەندییان لە رەوشی قەیراندایە، ئەو كەسانەن كە لە یاسا و دادپەروەری دابڕاون، دەستپۆت و دیكتاتۆرەكانن. گەورەترین چەكەكانیان دیماگۆجییەتە و زۆرداریيە. هۆی سەرەكی دادگایی كردنی سوقرات ئەوەیە كە خواستی لەسەر بنەمای پرەنسیپی راست ئەخلاقی لاوان بە ریفۆرم و وەرچەرخانێكی ریشەییدا تێپەڕ بكات. بەڵام كاتێك بەهانەی دادگایكردنی لەژێر ناوی"**نكوڵی لە مەزنایەتی پرەنسیپەكانی یەكێتی ئەتینا و خوداوەندە دامەزرێنەرەكانی دەكات**"رێكخرا، ئەوا ئەو وەڵامەی سوقرات و ئەو هەڵوێستەی بەرامبەری نیشاندا بێهاوتایە و بە هیچ جۆرێك لە بیرناكرێت، سوقرات گوێڕایەڵیكردنی یاساكان وەكو **(فەزیلەت)** ئاكاری چاكە پەسنددەكات، بە گوێرەی ئەم پرەنسیپەش دەژیت. كاتێك قوتابییەكانی باسی راكردن دەكەن، ئەمە بەبێ پێوانەیی (بێیاسایی) لە قەڵەم دەدات و پەسندی ناكات. بە شێوەیەكی سانایی و هێمنی بەرداخە پڕ لە ژەهرەكە (باڵدێران) دەخواتەوە و لەمیانەی شەهادەتێكی شەرەفمەندانە لە نێو نەمراندا لە رێزی یەكەمدا جێگای خۆی دەگرێت.

د ـ لەگەڵ ئەفلاتوون و ئەرستۆ چەرخی فەلسەفەی دێرین دەگاتە لوتكە. هەردووكیان لە فەلسەفەی كۆمەڵگا، بە قوتابی سوقرات دادەنرێن. ئەفلاتوون وەكو پابەندبوون بە یادی مامۆستاكەی و بۆ ئەوەی زاراوەكانی راست و باش و جوان لە رزگاربوونی دەوڵەتی ئەتینا و بەڕێوەبردنی لەلایەن فەیلەسوفانەوە بگات بە مۆدیلێك، پەرتووكی بە ناوی "**دەوڵەت**" دەنووسێت. لە جیهانی ئەفلاتووندا "**گەوهەر**" بە بنەمادەگیردرێت. دونیای ماددی لە جیهانی گەوهەردا بە واتای بیرەوەرییەك دێت كە بە كزی یادی دەكرێتەوە. سەرەتا گەوهەر لە ئارادایە. دوایی بنیانی قاڵبوونەوە رێگا لەپێش هەبوونی ماددی هەمەجۆر دەكەنەوە. مادده بەشێوەیەكی جیا بیری لێناكرێتەوە. ئەمە شێوازی پێشخراوی چەمكی عەقڵی پارمەنیدسە. ئەفلاتوون بە گەورەترین فەیلەسوفی ئایدیالیزم دادەنرێت. پلە و پایەیەكی نزیك پێغەمبەرایەتی هەیە. لەمیانەی ئەم تایبەتمەندێتیەی تا رادەیەك لە زەردەشت دەچێ. دەشێ بەمجۆرەش بیربكرێتەوە كە كۆی سوقرات و ئەفلاتوون وەڵامێكی نزیك بە هزری زەردەشتی لێدەكەوێتەوە. بەڕێوەبەرێتی بلیمەتانە، دیمەنێكی هونەرمەندانە، جەستەیەكی لێوەشاوە تایبەتمەندێتیە سەرەكییەكانی فەلسەفەی ئەفلاتوونە. كاتێك كەسایەتی هەڵبژاردە (بەڕێوەبەران) بەمجۆرە پێگەیێندران، دەوڵەت بە شێوەیەكی دروست بەڕێوەدەبرێت. لەبەر ئەوەی بۆ یەكەم جار لە مێژوودا وانەكانی خۆی لە شوێنێكی نزیكی ئەتینا بە ناوی ئەكادیمیا داوە، لەمیانەی ئەم ناوە یادیدەكرێتەوە. داب و نەریت و بە دەزگابوونی ئەكادیمیا گرێدراوی شێوازی ئەفلاتوونە. فەیلەسوفی كۆمەڵگای چینایەتییە. بیر لە یەكسان بوونی هەموو مرۆڤەكان ناكاتەوە. شارستانییەتی كۆیلەداری وەكو سیستەمێكی سروشتی و هەمیشەیی دەبینرێت. هێڵە سەرەكییەكانی سیستەمی سروشی دەوڵەتی ئەتینا بەهێزترین گەوهەرەكەی لە رێگای پەرتووك، دیالۆگی بە ناوی "**دەوڵەت**" دادەنرێت.

بچووك بینینی هەموو كەسێك لەلایەن یۆنانییەكانەوە گرێدراوی ئەم شێوازەی بیركردنەوەیە. گەلێك فەیلەسوفی دوای ئەو هاتن، لەمیانەی گەلێك رێچكەی جیاوازدا هەوڵدەدەن پێشیبخەن و هزری خۆیان لە رێگای ئەفلاتوونەوە روون بكەنەوە. ئەفلاتوونگەری نوێ، بە گشتی بە واتای یەكانگیر كردنی هزری ئایینی و هزری فەلسەفی دێت. بە تایبەتیش ئەو بە شێوەیەكی بەرجەستە لە مەسیحییەتدا ئەنجامدەدرێت. كاریگەرییەكی قووڵی لەسەر ئایین و فەلسەفەی ئیسلامیش هەیە. ئەم كاریگەرییە رۆڵێكی سەرەكی لەسەر تەواوی چەمكە ئایدیالیستییەكانی چەرخی نزیك هەیە.

ئەرستۆ دواترین داهێنەری مەزنی هزری فەلسەفی چەرخی كلاسیكە. مامۆستای ئەسكەندەرە. ئەتینیاییەكان خۆشیان ناوێت. رەوشێكی بەمجۆرەی هەیە كە لەگەڵ قالبەكانی یۆنان ناگونجێت. لەمیانەی مێشكێكی ئەنسیكلۆپاتی ئاسا، لێكۆڵینەوەی سەبارەت تەواوی هزرە ئایینی و فەلسەفییەكانی تاكو سەردەمی خۆی كردووە و فێربووە. چاودێرێكی بە توانا و قووڵی سەر سروشتە. بە یەكسانی جێگا بە ئەقڵ و سۆز دەدات. هەوڵدەدات پەیوەندی ئەقڵ و سۆز لەگەڵ رووداوەكان بە شێوەیەكی پتەو دابنێت. لەبەر ئەوەی زۆر بە مەراقە بۆ فێربوونی تەواوی زانیارییەكانی قۆناخ، بەبێ ئەوەی جیاوازی لە نێوان سروشت و كۆمەڵگا بكات، هەوڵی كۆكردنەوەیان دەدات. ئەم هەوڵە گشتگیر دەكات. بەرەو میتۆدی (گشتگیری بەرەو پارچە)ی دەبات. ئەمەیە كە بە لۆژیكی ئەرستۆ ناودەبرێت. لە راستیدا هەوڵی ئاواكردنی بناخەگشتییەكانی لۆژیكە لەمیانەی ئەو زانیاری و هزرانەی تا ئەم قۆناخە كەڵەكە ببوون. بەم واتایە دەتوانرێت ئەرستۆ وەكو كۆی هزری مرۆڤی ئەو قۆناخە و هێزە گشتییەكەی پێناسەبكرێت. بەردەوام كردنی بە سەمبۆلی لوتكەی زانیاری و هزری سیستەماتیك، ئەنجامێكی ئەم

تایبەتمەندێتیەیەتی. گوزارشت و پراکتیزەکردنی هەرە بەرجەستەش، ئاواکردنی ئیمپراتۆریەتی مەزنی جیهانییە لەلایەن ئەسکەندەری مەزنەوە. پراکتیزەکردنی مەزنی ئەم هزرە مەزنە، بە واتای دەسەڵاتی گەردوونی ئەم هزرە گەردوونییە دێت.

خودا رەت ناکاتەوە. خودا وەکو فاکتەری بەرایی دەبینێت، قۆناخەکانی دواتریش وەکو ئینسیاتیفی سروشت دەزانێ لەپێشخستنی خۆیدا. لەمیانەی گوتنی هەموو شتێك لە ئەنجامدا لەگەڵ فاکتەری یەکەم واتە لەگەڵ خودا دەبێتە یەك، چەمکی خۆی سەبارەت بە گەردوون ئاشکرا دەکات. دەستووری **"هەموو شتێك هۆکار و ئامانجێکی خۆی هەیە"** هاوکێشەیەکی ئەرستۆییە. هەربۆیە هاوکێشەکە خودایە. هەروەکو چۆن  لەم لایەنەوە کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر ئایینە تاکخوداییەکان هەیە، ئەوا کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر فەلسەفەی مەسیحی و ئیسلامی سەدەکانی ناوین هەیە. شتی راستتر ئەوەیە لەمیانەی بەکارهێنانی هزری ئەفلاتوون و ئەرستۆ، فەلسەفەی ئیسلامی و مەسیحییەت پێشخراوە.

تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان بۆچوونی ئەرستۆ بەسەر پێکهاتەی لۆژیکی مرۆڤدا زاڵە. هێشتا لۆژیکی دیالەکتیکییانە بەسەر هزری مرۆڤدا زاڵ نییە و لە رەوشێکی بەمجۆرە دوورە. بەهۆی ئەم تایبەتمەندێتیەوە ئەوەی تاوەکو ئێستا بە شێوەیەکی بەهێز لە نێو **(منطق)** لۆژیکدا دەژیت ئەرستۆیە. ئەوەی لە فەلسەفەی باوەڕی مۆئمندا دەژیت هەر ئەرستۆیە. هەربۆیە ناتوانرێ بچووك بکرێتەوە، بەڵام بە بێ ئەوەی بەلاوەبنرێت، ناشێ فێری شێوازی راستی هزری ئەم چەرخە و زانستەکەی ببین. هەڵسەنگاندنی شێوازی هزری فەلسەفی ئەرستۆ وەکو قۆناخێکی مەزن لە جێگای خۆی دایە؛ بەڵام هەر لە زووەوە دەربازکردنی ئاستی زانیارییەکانی و بە تایبەتیش لەمیانەی پێشکەوتنە مەزنەکانی بوارەکانی فیزیا، کیمیا، زیندەوەر زانی و زانستە کۆمەڵایەتییەکان، ئیتر بینینی وەکو لوتکەی موحافەزەکاری باوەڕ و لۆژیك گرنگە. وەستان لەم لوتکەیەدا لە رۆژگاری ئەمرۆماندا بە واتای پاشڤەڕۆیەتی دێت. لەسەر ئەم بنەمایە تێپەڕکردنی ئەرستۆ پێویستییەکی دەست لێبەرنەدراو و گرنگی رۆژگاری ئەمرۆمانە بۆ ئەنجامدانی وەرچەرخان و پێشکەوتن.

دواتر لە پێکهاتەی هزری یۆنان بە پشتبەستن بە شرۆڤە جیاوازەکانی ئەم فەیلەسوفە مەزنانە، چەندین قوتابخانەی جیاواز پێشخرا. تاوەکو چەرخە نزیکەکان **"رێنسانس"** لە سەرووی هەموویانەوە ئیسلامییەت و مەسیحییەت، لە لایەکەوە فەلسەفە ئایینی و هەمەجۆرەکان، لە لایەکی دیکەشەوە بە پێشکەوتنی چەندین قوتابخانەی فەلسەفی دەرەوەی ئایین، بە شێوەیەکی راستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ بوونەتە سەرچاوە و رۆڵێکی سەرەکییان بینیوە.

لێشاوی هزری مێژوویی شارستانییەت وەکو رووبارێکە. لە کاتێکدا سەرچاوە سەرەکییەکەی بنارەکانی چیاکانی کەوانی بەپیت، لەمیانەی ئەو لقانەی لەوێوە پێیدەگات. لە سۆمەر دەبێە لێشاوی شەپۆلێکی سەرەکی. لەمیانەی ئەو لقانەی لە میسر، ئەنادۆڵ، هیتیت، چین و ئێران وەریدەگرێت لە گەرووی تەنگی یۆنان وەکو بەنداوێکی فەلسەفە دەبێتە سەرچاوەی وزە. دووبارە دەبێتە هەڵگری هێزی لێشاو. سەرەڕای کۆسپەکانی وشك کردنی چەرخەکانی ناوین، لەچەرخە نزیکەکان دیسان لە ئەوروپا دەبێتە خاوەنی هێزێکی مەزن و لە رۆژگاری ئەمرۆمان وەکو لافاوێکی لێهاتووە کە وەستاندنی ئاستەمە.

## خ ـ لوتکەی شارستانییەتی کۆیلەداری

کاتێك شیکردنەوەکانی خۆم دەرهەق بە شارستانییەت پێشخست، هەوڵمدا سەرنجی ئەو پەیوەندییانە بدەم کە لە نێوان بابەتەکاندا هەیە. ئەوەی لە ژێر ئەم هەڵوێستەمدا شاراوەیە ئارەزوو و ئومێدەکانمە سەبارەت بە سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی ئەو پەیوەندییەی لە نێوان زانست و ئەخلاقدا پچڕابوو لە رۆژگاری ئەمرۆمان شێوەی ئافاتێکی وەرگرتووە. دووبارەکردنەوەی بەهۆی ئەم هەست و داخوازییەمە و دووبارەکردنەوە و جەخت کردن شتێکی دەست لێبەرنەدراوە.

لەمیانەی شیکردنەوەی شارستانییەتی کۆیلەداریدا بە هیچ شێوەیەك ئەو ئامانجەی خۆم بەلاوە نانێم: شیکردنەوەی سەرمایەداری بە شێوەیەکی جیاواز و سەربەخۆ، ئەم لێکۆڵینەوە چی بۆ بەرژەوەندی یاخود لە دژی سیستەم بێت، ئاکامەکەی لە بواری پێڕەودا کەموکوڕی مەزن لەخۆوە دەگرێت. ئەوەی لە سەرمایەداری، تەنانەت لە **"سۆسیالیزمی بونیادنراو"**دا روویداوە و کراوەتە موڵکیان، شێوەی گشتی و گەوهەری داهێنانەکانی پێکهاتەکانی سەرخان و ژێرخانی پێکهاتەی کۆمەڵگای کۆیلەدارییە. هەڵبەتە زیادبوون و پێشکەوتنی لێهاتوویی لە پێوانە و شێوەکاندا سەرنج راکێشە. تەنانەت دەتوانرێ بگوترێ جیاوازی هێندە مەزنە پێویستی بە بەراوردکردن نییە. بەڵام دیسان یەکەمین شێوەگرتنی شارستانییەت و گەوهەرەکەی رۆڵێکی دیاریکراوی هەیە.

پەیڕەو نەکردن و بێتوانایی کۆمەڵناسی سەبارەت بەو پەیڕەوانەی بەردەوام زانست پیادەی دەکات دەشێ تەنیا بە بەهێزی زاراوەی باڵادەستی چینایەتی روون بکرێتەوە. زاراوەکانی بابەتی و دیاریکراوی کە بەردەوام دووبارە دەکرێنەوە، بە هیچ جۆرێك سەبارەت بە زانستی کۆمەڵگا پەیڕەونەکرا. هۆی سەرەکی ئەمە، بە تایبەتی بە ئەندازەی ئەوەی لە بواری بابەتی و خۆییەوە توند و وشك کراوە، ئەوا ئەوەی لەمیانەی دیمەنی ئایدیۆلۆژی خۆپیشاندان و پڕوپاگەندەی سەرسووڕهێنەر لە ئارادایە، ئیرادەی باڵادەستبوونی رەهایە. **"رۆڵی دیاریکراوی"** زانست کە خواستم باسی بکەم: واتا لەبەرچاو ونکردنی کاتی گەیشتن بە یاسای گشتی و گەوهەرەکەی؛ بەمجۆرە گەوهەرەکە وون دەکرێت و وەکو زانیارێکی رووکارانە و پارچە پارچە دەمێنێ، تەنانەت دەگۆڕدرێت بۆ شێوازی ونکردن و لەدەستدانی واتای هەردوو شێواز. ئەنجامدانی ئەم چەواشەکارییە مەزنە دەرهەق بە چەمکەکانی زانستی کۆمەڵناسی لەلایەن ئەوروپا و بە تایبەتیش لەلایەن ئەمریکاوە، لە نزیکەوە پەیوەندی بە باڵادەستی چینایەتی و پێویستی باڵادەستی ئیمپریالیستیانەیەتی بەسەر جیهان، کە گەیشتۆتە ئاستێکی بێسنوور. ئامانج ئەوەیە، ئەگەر لە ژێر ناوی **"سۆسیالیزمی زانستی"** گەوهەرێك هەیە و داخوازی تێگەیشتن لە ئارادایە، ئەوا هیچ نەبێت گەیشتن بە شێوازی راستە. دەشێ هەندێ لەوانەی خۆیان بە **"چەپڕەوی"** توندڕەو دادەنێن ئەمە زۆر واتادار نەبینین. بەڵام بانگەشەی ئەوە دەکەم ئەگەر بە شێوەیەکی راست رەخنەنەکرێت و راست نەکرێتەوە ئەوا هەروەکو چۆن **"مارکسیزم"** لە بواری ئەخلاقی لە ئایدیۆلۆژی راهیبی سۆمەر پاشکەوتووتر دەبێت و لە رەوشی لەیستۆکێکی هەرزانی دەستی سەرمایەداری بەولاوە رووبەڕووی هیچ ئاکامێکی دیکە نابێتەوە. ئەوە تیۆری و کرداری **"دیکتاتۆریای پرۆلیتاریا"** لە مۆدێلی حوکمڕانی ئیمپریالیزمی رەهای و سەرجۆنی سۆمەری و رەوشی ئامرازێکی دەستی سەرمایەداری بەولاوە رزگاری نابێت. ئەم راستینە تاڵە لە ژێر داڕووخانی **"سۆسیالیزمی بونیادنراو"**دا هەیە کە لە ژێر هیچ مۆدێلێکدا روون ناکرێتەوە، ئەمەش دەبێتە نموونەیەك بۆ ئەوەی کە خواستم ئاماژەی پێبکەم. بە ئەندازەی پرسیارکردنی ئەم هەڵە و کەموکوڕی و خیانەتانە لە کوێ و چ کاتێك و لەلایەن کێ و چۆن ئەنجامدرا؟ ئەوا چۆنێتی ئەنجامدانی راستی لە کوێ، کەی، لەلایەنی کێ و چۆن ئەنجامدەدرێ، گرێدراوی شیکردنەوەی ئەم پرسیارەیە. کاتێك گەیشتینە بەشی **"دووڕوویی سەدەی بیستەم"** ئەم مەسەلانە روونەدکەمەوە کە گرنگترین لایەنی ئەم بەشەی بەرگرینامەکەم پێکدێنێ.

## ١ ـ شارستانییەتی گریك (یۆنان)

گرنگترین کێشەی زانستی مێژوو، پێناسەکردنێکی راستی شێوەگرتنی یۆنان ـ رۆمای شارستانییەتی کۆیلەدارییە. دەستنیشان نەکردنی ئەمە بە شێوەیەکی راست بناخەی ئەو هەڵە و کەموکوڕی و چەواشەکارییانە پێکدێنێ کە دەرهەق بە زانستی کۆمەڵگا کراوە. گەورەترین چەواشەکاریش، مەزنکردنێتی بە شێوەیەکی بێسنوور و دانانێتی بە بناخەی دەرکەوتنی شارستانییەت. ئەم بابەتەش وەکو تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی چەمکی سانترالیزمی ئەوروپا رووبەڕوومان دەبێتەوە و دەسەپێنرێ. چەمکی سەرەکی دژی ئەمەش، چەمکی رۆژهەڵاتییە، بە تایبەتیش ئەو بۆچوونانەی کە پشت بە تێڕوانینی ئیسلامییەت دەبەستن و بەرامبەر بچووك دەبینن و وەکو کافر هەڵیاندەسەنگێنێ و هەڵوێستێکی پڕوپاگەندەییە و

بایەخێکی زانستی ئەوتۆی نییە. لە لایەکەوە شێوازی هزری فەلسەفی و میتۆلۆژیای یۆنان، لە لایەکی دیکەشەوە هزری ئایینی رۆژهەڵاتی ناوین کە گەیشتۆتە ئاستی فەناتیزم و خۆ بە سەنتەر دەبینێ، بناخەی هەردوو چەمك پێکدێنێ.

کاتێك لە ژێر رۆشنایی دراوە (**معطيات**) زانستییەکان هەڵسەنگاندن ئەنجامبدەین، ئەوا زۆر بە سانایی دەبینرێ کە شارستانییەتی یۆنان ـ رۆما لە رێگەی دوو سەرچاوەی سەرەکی و قۆناخی مێژوویی تێرخۆراك کراوە.

ا ـ **تێربوون لەمیانەی سەردەمی نئۆلیتیك:** ئەوە سەلێنراوە شۆڕشی کشتوکاڵی نئۆلیتیك کە لە کەوانی زێرین سەرچاوە دەگرێت لە ساڵانی ٥٠٠٠ ی پ.ز لە رێگای بەلقان و باشووری روسیا گەیشتۆتە ئەوروپا. ئەوەش روونبۆتەوە کە لە ساڵانی ٤٠٠٠ پ.ز بەدواوە، تەواوی ئەوروپا شۆڕشی کشتوکاڵی ناسیوە. ئەمە لە مێژوودا بە شەپۆلی **"هیندۆ ـ ئەوروپا"** ناودەبرێ کە سەرچاوەکەی لە ئاریانەوەیە.

بۆ ئەوەی هەر لە ئێستاوە رێ لەپێش تێگەیشتنێکی هەڵە بگیرێت، روونکردنەوەی واتای وشەی **"ئاریان"** گرنگە. هەروەکو چۆن سۆمەریەکان لە چەندین ناوی زاراوەی رۆژهەڵاتی ناوین خاوەن رۆڵن، ئەوا لەم زاراوەشدا رۆڵیان سەرەکییە. **"ئار ـ AR"** و **"ئارد ـ ARD"** لە زمانی سۆمەری بە واتای گاسن و شوێنی کێڵان، واتا بە واتای کێڵگە دێت. کاتێك بنارەکانی چیاکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس بوونە سەرچاوەی لە دایکبوونی شۆڕشی کشتوکاڵی، یەکەمین خاکی کە کراوە بە کێڵگە سۆمەریەکان بە "ARD" ناویان دەبرد، واتا خاك. شیمانەیەکی مەزن ئەوەیە کە ئەوانیش ئەم ووشەیە لە خاوەن زەوییەکان، لەو تیرانەیان وەرگرتووە کە بە **"هۆری"** ناودەبرێن. ئەوەش لەلایەنی مێژووە دەزانرێ کە سۆمەریەکان وشەی هۆریتیان بە واتای **"خاوەنی وڵاتی بەرزاییەکان"** بەکارهێناوە. هەرچی واتای وشەی "AR"ە، لەبەر ئەوەی زۆر نزیکی وشەی "ARD"ە، وەکو پێویستییەکی زمانناسی بە واتای گاسن دێت. دواتر عەرەبەکان وەکو (**ارج**) بەکاریان هێنا، لە زمانی کوردی ئەمڕۆشماندا "ARD" بە واتای خاك دێت، وەکو کێڵگە بەکاردەهێنرێ (لە کرمانجی ژوور). لە رەوشێکی بەمجۆرەدا کەواتە وشەی "ARYEN" بە واتای ئەو گەلە دێت کە خاك، کێڵگە دەکێڵێت. هەربۆیە تەواوی ئەو گەلانەی بە شۆڕشی کشتوکاڵی و کێڵگەدا دەرباز بوونە ناوی ئاریانیان لێنراوە، ئەمەش دەرکی پێدەکرێت. بەڵام نزیککردنەوەی لە جۆرەی ئاری = شکۆمەند، ئار = ئاگر، شتێکن بە زۆر لکێنراون و بە شتێکی واقیعی ناچێ. بەڵام دیسانیش بە گوێرەی سەردەمی خۆیان وەکو کۆمەڵە بەراییەکان شکۆمەندبوون و هەڵسەنگاندنی ئەمە وەکو نەژادپەرستی شتێکی راست و بەجێ نییە. چەواشەکردنی ئەم زاراوە لەلایەن فاشیزمی ئەڵمانی شتێکی زانستی نییە، بەڵکو ئامانجی ئایدیۆلۆژی و پروپاگەندەیە. بە بایەخەوە داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەم ئیتر کاتێك ئەم زاراوە بەکاردێنین پێویستە بە گوێرەی گەوهەری خۆی لێی تێبگەن.

مەسەلەیەکی کە مێژوو بە شێوەیەکی تەواو دەستنیشانی کردووە ئەوەیە لەسەردەمی بەخێوکردن و تێربوونی ئەوروپا لەمیانەی شۆڕشی کشتوکاڵی، بەردەوام داهێنانەکانی رۆژهەڵاتی ناوین و ئامراز و زاراوەکانی بە کارهێناوە و سوودی لێوەرگرتوون. هەڵوێستەکانی GORDON CHIDE گەوهەرێکی بەمجۆرەی هەیە و بە شێوەیەکی زانستی دەیسەلمێنێ و رێگا نیشان دەکات. لەم قۆناخەدا پێشکەوتنی بەرەو بوون بەگەل و بە قەومبوون لەسەر بنەمای پشتبەستن بە گەوهەری بڵاوبوونەوەی شۆڕشی کشتوکاڵی دەبەستێت و کولتوورەکەی بە بنچینە دەگرێت و بە شێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندی بە بە کارهێنانی هێز و فشارەوە نییە. پێکهاتنی ئەو گروپە ئەتنیکییانەی لەسەر بنەمای تایبەت بوون لە ساڵانی ٦٠٠٠ پ.ز لەنێو تیرە و هۆزەکانی رۆژهەڵاتی ناوین پێکهاتبوو، لە ئەوروپا هەزار، دوو هەزار ساڵ دواکەوت و دووبارە بۆوە و بە گوێرەی ئەوروپا رێکخرا. باکووری ئەفریقیا، هیندستان و چین لە قۆناخی نزیك ئەم ساڵانە پێشکەوتنێکی هاوشێوەی بەخۆوە بینیوە. رووداوی تێربوون لەمیانەی شەپۆلەکانی کولتووری سەرچاوەی دایك کە لەهەر قۆناخێکی مێژوودا رووبەڕوومان دەبێتەوە، ئەمجارە رووبەڕووی سەرەکیترینیان بووینەتەوە. تێگەیشتنی بڵاوبوونەوەی هیند ـ ئەوروپا بەمجۆرە، رۆڵێکی بەرچاوی دەبێت لە تێگەیشتنێکی راست دەرهەق بە مێژوو.

کاتێك بەرەو ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز دێین، دەبینین ئەم گەل یاخود گروپە ئەتنیکییانەی لەمیانەی ئامرازەکانی ئاسن گوزەران دەکەن، بوونەتە خاوەنی هەندێك ناوی سەرەکی. لە روسیای رۆژگاری ئەمرۆمان و دراوسێکانی **"سلاو"**، لە باکووری ئەوروپا **"نۆرمان"**، **"تۆتۆن"**، بەرەو ئەڵمانیا **"گێرمەن"**،**"گۆت"**، بەرەو باشووریش **"کەلت"** و **"لاتینییەکان"**، بوونەتە خاوەنی ئەم ناوانە. لە قۆناخی دووەمدا لە جوگرافیایەکی تەسکدا ئەم گروپە ئەتنیکییانە وەکو گروپی تایبەتی گەل، قەوم یاخود هەروەکو بە نەتەوە ناویان دەبەین پێکدێنین و شێوەدەگرن. بە گەلبوونی **"هێلین"** لە نیمچە دوورگەی یۆنان، **"لاتین"** لە ئیتالیا بەرهەمێکی ئەم قۆناخەن. لە کۆتایی قۆناخی نئۆلیتیکدا دەبینرێ کە گروپە ئەتنیکییەکان لە ژێر ئەم ناوە گشتییانە چڕبوونەتەوە.

ب ـ **تێربوون لەمیانەی سەردەمی شارستانییەت:** سەرچاوەیەکی دیکەی نزیکی کە کاریگەری لەسەر شێوەگرتنی شارستانییەتی یۆنان کردووە سۆمەر و میسر و تەواوی شارستانییەتی کۆیلەداری رۆژهەڵاتی ناوینە، کە کاریگەری سۆمەر و میسریان لەسەربوو. بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەخێوکردنی شارستانییەتی یۆنان لەلایەن ئەم چاوگەوە، لە ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز لە چوار قۆڵەوە چڕدەبێتەوە. لە رێگای ئەنادۆڵەوە لە تەرواده، لە رۆژهەڵاتی دەریای سپی لە فینیقیەکان، لە میسر و گریت هێزی شارستانییەتی کە لەم سەرچاوانەی وەرگرتووە لەگەڵ ئەو بەهایانەی نئۆلیتیك یەکانگیردەکات کە پێشتر وەریگرتبوون و پەسندی کردبوون، دەتوانێ بەرەو سەنتێزێکی دەوڵەمەند هەنگاو بهاوێژێ. وا بیر دەکرێتەوە بەر لە نئۆلیتیك و شارستانییەت، لە نیمچە دوورگەی یۆنان کۆمەڵی هۆڤی تیرە سەرەتاییەکانی دەریای سپی هەبوون، بەڵام شیمانەی ئەوە دەکرێت لە رێگای شەپۆلی نئۆلیتیك توێنراونەتەوە. زمانی یۆنانی کە تایبەتمەندێتی ئاریانی لەخۆوە دەگرێت بەڵگەی سەلمێنەری ئەمەن. گەرچی بەر لە سەردەمی نئۆلیتیك لە قەفقاسیاوە تاوەکو باسك لەسەردەمی بنەماڵەکانی کۆمۆنی سەرەتایی، گروپی زمانی دەریای سپی (قەفقاسیا ـ باسك) کە نزیکەی ٢٠ تا ٢٥ هەزار ساڵ پ.ز پێکهات، پێکهاتەیەکی جیاوازی هەیە. لە نیمچە دوورگەی ئیتالیاش پێشکەوتنێکی هاوشێوەی ئەمە جێگای باسە.

بێگومان تایبەتمەندێتیەکانی جوگرافیای یۆنان رێگای لەپێش کاریگەری تایبەت بە خۆی کردۆتەوە لە شێوەگرتنی شارستانییەتدا. ئەم یاسایە بۆ هەموو ناوچەیەك بەمجۆرەیە. سەبارەت بە رەسەنێتی یۆنان رۆڵێکی دیاریکراو نابینێ. پێشکەوتنی ئەم رەسەنایەتیە بە شێوەیەکی دەوڵەمەندانە لە نزیکەوە پابەندی سەرچاوەکانی تێربوونێتی. یەکانگیرکردنی تەواوی دەسکەوتەکانی سەردەمی نئۆلیتیك لەگەڵ ئەو دەسکەوتانەی هەر چوارلقە پێشکەوتووەکەی شارستانییەت، لەبەر ئەوەی جوگرافییەکەی خاڵی بە یەکگەیشتنی ئاسیا، ئەفریقیا و ئەوروپایە، ئەمەی کردووە بە سەنتێزێك و تایبەت بە خۆی کردووە، روونکردنەوەی راستەقینەی دەوڵەمەندی و نوێبوونەوەیە. چۆن پێکهاتنی هەمەڕەنگی و دەوڵەمەندی لەگەڵ ئەو بەهایانە پێوانە دەکرێت کە لە رێگایانەوە بەخێوکراوە، پێکهاتنی شارستانییەتی یۆنانیش لەمیانەی ئەو سەرچاوانەی لە بونیادی خۆیدا کۆیکردوونەتەوە و یەکانگیری کردوون تێر دەبێت و شێوە دەگرێت و دەگاتە ئاستێکی بەمجۆرە کە رۆڵێکی گرنگ لە قۆناخێکی سەرووتردا وەربگرێت. سەنتێزێکی دەوڵەمەندی دێنێتە ئاراوە. دەسکەوتی یۆنان پێکهێنانی ئەم سەنتێزەیە بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە. هەروەکو دروستکردنی عاشوورە (خواردنێکە) وایە کە چەندە کەرەستەی زۆر بێت باشتر دروست دەبێت. ئەم رۆڵەی بچووك ناکرێتەوە، بەڵام ناتوانرێ وەکو داهێنانێکی نوێ و رەسەنیش هەڵسەنگێنرێت. بە کورتی باسی ئەم قۆناخە کرابوو. ئەگەر خۆمان لە دووبارەکردنەوە بپارێزین، بە کورتی دەتوانین ئەمانە بڵێین:

١ ـ میتۆلۆژیاکەی بە شێوەیەکی سەرەکی لە سۆمەر و تا رادەیەکی سنووردااریش لە میسر دزراوە. سەرچاوەکانی سۆمەری لە رێگای ئەنادۆڵ و فینیقیەکان بە دەستهێناوە، سەرچاوەی میسریشی لە رێگای گریتەوە بردووە. ئەمە بە گواستنەوەی دەستی دووەم ناوزەد بکرێت باشترە. چونکە دوای ئەوەی شارستانییەتی سۆمەر بە گوێرەی ئەنادۆڵ و فینیقی دەگونجێنرێت، دواتر بۆ نیمچە دوورگە دەگواسترێتەوە. شارستانییەتی میسریش دوای وەرچەرخان و گونجاندنی لەلایەن یۆنانەکان، دواتر دەگواسترێتەوە. میکانەکان کە وەکو هێزێکی بەر لە شارستانییەت لە نیمچە دوورگەدا دەژیان هێزی خوڵقاندنی میتۆلۆژیایان نەبوو، لە ئاواکردنی میتۆلۆژیای زیۆس لەلایەن یۆنانەکان ئەمە بە سانایی روونده‌بێتەوە. باوەڕی میتۆلۆژیای

زیۆس كە نزیكەی ساڵانی ١٥٠٠ پ.ز دەبینرێت، نموونەیەكی ئاشكرای چۆنێتی گواستنەوەیەتی بۆ نیمچە دوورگە. لە بواری پێكهاتەی زمانەوە وشەی زیۆس لە وشەی ئاریانی "Div" هاتووە. دێڤ لەو سەردەمەدا لە تەواوی گروپە ئاریەكان وەكو "Dev" بە واتای گەورەترین بەكاردەهێنرا. هەروەكو دەزانرێت مەزنترین بە "**شتی خودایی**" ناوزەد كراوە."Dev" كاتێك بۆ سۆمەریەكانیش گواستراوەتەوە ئەم رۆڵەی بینیوە. گەوهەری زاراوەی خوداوەند لە رۆژهەڵاتی ناوین بەو رەوشە سەرەتاییەی لەلایەن كۆمەڵەكانی نئۆلیتیكی ئاریان دەكرێت بە گوزارشتێك و بەمجۆرە وەكو خاوەن ناسنامەیەك رووبەڕوومان دەبێتەوە. دوای دەربازبوون بە گەلێك قۆناخی جیاوازدا گەورەترین خودا دەبێتە ئیلاه، تاوەكو دەگاتە زاراوەی ئەڵڵا.

كۆنترین كولتووری خوداوەندی ژن لە ئەنادۆڵ قیبەلە **(كیبەلە)** رۆڵی گرنگترین سەرچاوە دەبینێ و وەكو خوداوەندی ژن "**ئارتامیس**" دەگونجێنرێ، خوداوەندی میوە و شەراب **تارهۆزا** وەكو "**دیونیۆس**" گۆڕدراوە و گونجێنراوە. ئەمەش لە ئاسەواری پەیكەرەكانی (لەویەكان) دەبینرێ كە بەر لە قۆناخی هێلینزم كۆنترین گروپی گەلی ئەنادۆڵ بوون، بە تایبەتیش خودای میوە و خۆشاب و شەراب **تارهۆزا** زۆر بەرچاوە. بە تایبەت كردنی بە شێوەی **دیونیسۆس** نموونەیەكی دیكەی روون و ئاشكرای تێربوون و بەخێوكردنە لەلایەن سەرچاوەوە. لە دایكبوون و خوڵقاندنی ئافرۆدیت لە كەفی ئاوی كەنارەكانی قوبرس دیار دەكات كە پابەند بوونی میتۆلۆژی چۆن پێشكەوتووە، واتا زۆر بە باشی كاروانسەراكەی دەستنیشان دەكات. لە ئاپۆلۆنەوە ئیتر پێبەپێ بەرامبەر بە خوداوەندی ژن پایەدارتر دەبێت و وەكو شێوەبەندی خودایی باوكسالاری لە رۆژئاوای ئەنادۆڵەوە دەربازی یۆنانستان دەبێت، كاتێك لەلایەنی هیتیت و هۆریەكان دەیگوازنەوە دەیكەن بە "**تەلەپینۆ و تەشوب**". ئەمانەش بابەتی دەستنیشان كراون كە خوداوەندی میسر ئیسیس و ئۆسیریس كاریگەرییەكی هاوشێوەیان لەسەر **دەمەترە** و كچەكەی **پەرسەفۆنا** كردووە.

كەوتنە نێو وردەكاری و لقەكانی چۆنێتی گواستنەوەی میتۆلۆژیا زێدە واتادار نابێت. بەڵام بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین هۆسیۆدۆس "**تیۆلۆژیا**"ی خۆی لەسەر بنەمای سەرچاوە جیاوازەكانی میتۆلۆژیای ئەو سەردەمە نووسیوە، بە تایبەتیش داستانی خوڵقاندنی بابل "**ئەنومائەلیش**". گروپە كولتوورییەكانی ئەم قۆناخە خاوەنی تیۆلۆژیایەكی هاوشێوەن. ئەم تێروانین و شێوە زانیاریانەی گەوهەری بۆ سۆمەریەكان دەگەڕێتەوە، بێگومان بە گوێرەی ئاستی زاراوەی سەردەمی نئۆلیتیك ئاستێكی پێشكەوتووی ئایدیۆلۆژی نیشاندەدات. ئەم تیۆلۆژیەی وەكو دەمامكی سەرەكی ئایدیۆلۆژی كۆیلایەتییە، لە بناخەی تەواوی زانستەكانی خوداناسی شاراوەیە كە دواتر دەركەوتوون. دەبێ لەبیرنەكەین ئەگەر ئەوە نەبێت ناشێ و ناتوانین بە تێروانینی فەلسەفی و زانستی بگەین. چونكە پەیوەندی دیالەكتیكی مێژوویی نێوانیان ئاشكرایە و مسۆگەرە.

٢ ـ خاڵێكی دیكەی گرنگ كە دەزانرێ ئەوەیە كە ئەم ئەلف و بێیەی ئەمڕۆ لە تەواوی ئەوروپا بە كاردەهێنرێت هەمان ئەلف و بێیە كە فینیقیەكان لە سۆمەریەكانیان وەرگرتووە و لە ماوی نێوان ساڵانی ١٠٠٠ تا ٧٠٠ پ.ز بۆ یۆنان گواستراوەتەوە. شارستانییەتی یۆنان لە رێگەی ئەم ئەلف و بێیەوە بۆتە موڵكی مێژوو. بە هەمان شێوە بیركاری و ئەندازە لە میسر و سۆمەریەكان وەرگیراوە. زمان و ناوەڕۆك و شێوازی ئەدەبیاتی كولتووری (میسر و سۆمەر) بە بناخە وەرگیراوە. ئەو پێكهاتە رۆحی و هزرییەی لای یۆنانەكان پێكهاتووە، هەروەكو چۆن لە تەواوی قۆناخدا هەیە لە شێوەگرتندا قەرزاری ئەم سەرچاوەیەن، ئەوا زانیویانە چۆن رۆڵی كارامەیەی خۆشیان تێدا نیشانبدەن. گرنگییە سەرەكییەكەشی لێرەدایە. ئەمە بە تەواوی بە شێوازی كۆپیەگەری نەبووە، بەڵكو بە شێوەی هەرسكردن و تەڤلیكردنی رەنگی تایبەتی و گەیشتن بە پێكهاتەیەكی هزری و رۆحی دەوڵەمەندتر بووە. لەم بوارەشدا رۆڵی بە دەستهێنانی دەسكەوتی بۆ مێژووی شارستانییەت بەدیهێناوە. هەڵوێستی چەوت ئەمەیە كە ئەم رۆڵە وەكو رۆڵی چاوگ و زایین (خوڵقاندن) چەواشە بكرێت؛ شارستانییەتی یۆنان دواییش ئەوروپا لەمیانەی ئاستێكی فەناتیزمی شۆڤێنیزم، ئەم چەواشەكاری و شێواندنەیان ئەنجامداوە. نیشاندانی هەموو كەسێك وەكو هۆڤ لەلایەن یۆنانیەكانەوە وەكو داب و نەریتێكی لێهاتووە. گەرچی كاتێك هێشتا نەببوون بە هێزێكی شارستانییەت و بە شێوەی سیستەمی هۆز و تیرە سەرەتاییەكان دەژیان، لە مێژبوو شارستانییەت لە چاوگە رەسەنەكاندا خوڵقێنرابوو.

٣ ـ كاتێك خۆیان بە "**هێلینیەكان**" ناو برد ئاسن كە ئامرازێكی سەرەكی شارستانییەت بوو كە لە میزۆپۆتامیای خوارو دۆزراوەتەوە، لە رێگای فریگیەكان بۆ نیمچە دوورگە گواستراوەتەوە. لە رێگای تەروادەشەوە ئامرازە مسیەكان گۆیزراونەتەوە. دوای ئەوەی چەكە مسی و ئاسنیەكان لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز بەدواوە بە شێوەیەكی بەربڵاو بە دەستی هێلینیەكان كۆدەبێتەوە، دەبن بە هێزێك بتوانن هەڵمەتێكی پێچەوانە ئەنجامبدەن. دوای كەوتنی تەروادە لە ساڵانی ١٢٠٠ پ.ز دەرگای ئەنادۆڵ دەكرێتەوە. سەرەتا ئەنادۆڵ و رۆژئاوا دەكەوێتە ژێر كاریگەری كولتووری ئایۆنیەكان، دوایی تەواوی ئەنادۆڵ تاوەكو دەگاتە فورات هێرشی هێلینیەكان بۆ گۆڕین و توانەوەی ناوچە دەستپێدەكات. لەوییەكان دەسڕدرێنەوە. هەروەها **فریگیا** و **لیدیا** دووچاری هەمان چارەنووس دەبنەوە. بەڵام ئەو گروپە ئەتنیكییانەی بە میرنشینە گەورەنشینەكانی "**كۆماگەنەس**" ناودەبرێن و بە باپیرە گەورەی كوردەكان و ئەرمەنیەكانی رۆژگاری ئەمڕۆمان لە قەڵەم دەدرێن هەبوونی خۆیان دەپارێزن. ئەم بڵاوبوونەوە كولتووری هێلینیەكان لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز دەستپێدەكات و دوای قۆناخێكی پڕ لە هەڵكشان و داكشان لە رێگای ئەسكەندەرەوە دەگاتە لوتكە و لەسەرەتاكانی سەدەی بیستەم لەلایەن توركەكانەوە لە ئەنادۆڵ بەدەر دەكرێن و بە شێوەیەكی تراژیدی كۆتایی بەم قۆناخە دێت.

بڵاوبوونەوە لە رۆژئاواش بەردەوام دەكات. لە ساڵانی ١٥٠٠ پ.ز بەدواوە یۆنان سەربەخۆیی خۆی لەدەستدەدات. قوبرسیش بە نێو هەمان قۆناخدا دەربازدەبێت. ڤەبوون بەرەو مەكەدۆنیا ئەنجامدەدرێت. لەم ماوەیەدا قۆناخێكی بە كاریگەری كۆلۆنیكردن پێشدەكەوێت. لە كەنارەكانی دەریای رەش كۆلۆنی پۆنتۆس و لە هەموو شوێنێكی دەریای سپیدا كۆلۆنییەكانی هێلینی ئاوا دەكرێت. نیمچە دوورگەی ئیتالیا بە رووی نیشتەجێ بوونێكی چڕ دەكرێتەوە. باشووری ئەم نیمچە دوورگەیە تەواو دەكەوێتە ژێر كاریگەری هێلین و هەروەكو بڵێی دەبێت بە هێلین.

٤ ـ لە سەدەی ٧،٦ پ.ز لە نیمچە دوورگەی یۆنان لەسەر بنەمای چینایەتی لە فیدراسیۆنی پێكهاتە ئەتنیكیەكانەوە پێكهاتەی دەوڵەتێكی ناوەندی كۆیلەداری دێتە ئاراوە. تایبەتترین لایەنی ئەم شێوەگرتنەی دەوڵەتی كۆیلەداری ئەوەیە كارەكتەری راهیبێتی بە پلەی دووەم ماوەتەوە و لایەنە سیاسییەكەی دەركەوتۆتە پێش و سەرەكی بووە. لەوەش گرنگتر لە دوای قۆناخێكی كورتخایەنی پادشایەتی شێوەیەكی بەخۆوەگرت دەتوانین كۆماری كۆیلەداری پێبڵێین. لە كاتێكدا لە پێكهاتەی دەوڵەتی كۆیلەداری سۆمەر و میسر و تەنانەت تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین جگە لە رۆڵی سەرەكی چینی راهیب ئەوا دواتر پێكهاتەكانی بنەماڵە و خانەدانەكان رۆڵێكی سەرەكی دەبینن، بەڵام لە نموونەی یۆنان و ئیتالیا لایەنی كۆماری (كۆماریەت) دەردەكەوێتە پێش. بێگومان ئەم رەوشەش گرێدراوی سەرلەنوێ ئاواكردنەوەی بواری ئایدیۆلۆژی و جگە لە هەبوونی كشتوكاڵی بە زیادبوونی بایەخی بازرگانییەوە گرێدراوە. بە تایبەتی بازرگانی پێشكەوتنێكی كۆمەڵایەتی نزیك لە چینی بۆرژوا لەگەڵ خۆیدا دێنێ. بە شێوەیەكی بنچینەیی وەكو چینی ناوین زیاتر نزیكی علمانیەتە و بەهۆی بەرژەوەندییەكانی هەڵوێستێكی دوور لە شێوازی بەڕێوەبەرایەتی راهیب و خانەدانان نیشاندەدەن.

ئەو بازرگانیەی لە رێی دەرياییەوە دەكرێت بە بەراوردكردن لەگەڵ رێگای وشكانی بایەخدارتر و لەبارتر دەبێت، ئەمەش سەرەكیترین زەمینەی ماددی هەڵكشان و باڵاتربوونی یۆنانییەكان پێكدێنێ. ئەو دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانییەی بازرگانی لەگەڵ خۆیدا دێنێ، زەمینەی ماددی شێوازی هزری فەلسەفی پێك دێنێ. لەپێشكەوتنێكی جیاوازی ئابووری زیاتر، ئەنجامدانی دابەشكردنێكی كار بە گوێرەی بازرگانی زۆر بایەخدارە. بە گوێرەی هەلومەرجەكانی ئەو سەردەمە، ئەم دابەشكردنەی كار لە بواری بازرگانی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا، باكوور ـ باشووری جیهان، پسپۆر بوونێك لەگەڵ خۆیدا دێنێ. بەمجۆرە قۆناخێكی نوێی پێشكەوتن و بڵاوبوونەوەی پیشەكاری دێتە ئاراوە. دەتوانرێ بگوترێت كە لە زەریای ئەتڵەسییەوە تاوەكو زەریای مەزن دەرفەتی گەڕان و سووڕانی كەلوپەل و موڵك دەرەخسێ. یەكەمین گرنگترین جیهانیبوون بەمجۆرە پێشدەكەوێت و پێكدێت.

هەڵبەتە لەمیانەی رێگاكانی بازرگانییەوە باوەڕی و بیرە هاوبەشەكانیش ئاڵوگۆڕی بە خۆیانەوە دەبینن. نابێ سەرمان لەوە سووڕ بمێنێ كە پێكهاتەی گونجاو بە گوێرەی ئەم پێشكەوتنە ئابووری و كۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژیە كۆمارە، دواتریش پێشكەوتووترین گوزارشت و شێوازی كۆمار "**دیموكراسییەتە**". پێشكەوتنی چینایەتی كە پشت بە هەلومەرجی ئاڵۆز و

دەوڵەمەند دەبەستێ، لە بواری سیاسیدا گونجاوترین پێکهاتە بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. بە رادەی بەهای مێژوویی **"دیموکراسی ئەتینا"** دەسکەوتی بۆ شارستانییەت لەم بوارەوەیە. بێگومان ئەم دیموکراسییەتە، دیموکراسییەتێکی چینی کۆیلەدارە، بەڵام دیسان نوێبوونەوەیەکی گرنگە. دووربوونی لە ژێر پاوانی توند و رەهای راهیب و خانەدانان، رۆڵێکی مەزن دەبینێ لەوەی ببێتە لانکەی شارستانییەتی رۆژئاوا.

٥ ـ بێگومان گرنگترین نوێبوونەوە کە شارستانییەتی یۆنان ئەنجامیداوە و وەکو دەسکەوتێکی مێژوو دادەنرێت، پێشخستنی شێوازی **"هزری فەلسەفی"**یە. لەبەر ئەوەی واتای وشەی فەلسەفە حەزکردنە لە زانیاری، ئەوا بینینی فەلسەفە وەکو داهێنانێکی نیمچە دوورگەی یۆنانی، دەبێتە هەڵوێستێکی زێدەرۆیانە و کەموکوڕییەکی مەزن لە خۆوە دەگرێت. هەروەکو دەزانرێ ئەو ناوانەی وەکو زانای دەستپێکردنی شێوازی هزری فەلسەفی دەبینرێن ئەتلەسی خەڵکی میلت و فیساگۆرس، بە درێژایی تەمەنی لاوێتی پەروەردەی خۆیان لە بابل و میسر بینیوە. بەر لەوەی شێوازی هزری فەلسەفی دەرکەوێت، تەواوی پێشەنگەکانی مەعنەویات (رۆحی) پەروەردەی خۆیان لە قوتابخانەی راهیبەکانی میسر و بابل دەبینی. لەم ساڵانە قوتابخانەیەکی تایبەت لە نیمچە دوورگە دانابوو، بەڵام شیمانەی ئەوە دەکرێت کە لە ساڵانی ٨ ، ٧ پ.ز کەسانی وەکو هۆمیرۆس، هیدۆس و ئۆرفائۆس بە شێوەی هۆزان و گەریدەکان، گەڕاون و سووڕاون. ئەمە لەم لایەنەوە جێ بێڵین لەم ساڵانە نەبوونەتە خاوەنی پەرستگایەك لە ئاستی پەرستگاکانی میسر و بابلدا بێت، بەڵکو زەمینەیەکی بەهێزی کولتووری پەرستگای خۆجێییش ئاوانەکرابوو. بە شێوەیەکی چڕ و بەردەوام ئایدیۆلۆژیا لە رۆژهەڵاتەوە دەنێردرێتە رۆژئاوا. تەنانەت هۆمیرۆسیش هۆزانێکی رۆژئاوایی ئەنادۆڵە.

بەڵام هەروەکو چۆن ئەم راستینەیە گرنگی مەزنی دەرکەوتنە پێشی هزری فەلسەفی بەلاوە نانێت، لەهەمانکاتدا دەبێ وەکو موڵکێکی هاوبەشی شارستانییەت ببینرێت. بە گوێرەی دیالەکتیکی هزری فەلسەفی بەرهەمی زەمینەیەکە ئیتر روونکردنەوەکانی میتۆلۆژیاکانی رۆژهەڵات تێیدا کورت دێنن و ناتەواو دەبینرێن و هزری مرۆڤ تێرناکات. ئیتر ئەو میتۆلۆژیا و هەڵوێستە ئایینیانەی لێیەوە سەرچاوە دەگرن و رۆڵی رۆنی چەورکردن و دەمامکی ئایدیۆلۆژی دەبینن، تەنانەت ئەو ناتەواوییەی تێیکەوتوون پێکهاتەی رۆحی و هزری مرۆڤ بەرەو لێگەڕینی نوێ دەبات. بە بەراورد کردنی کۆمەڵگای یۆنان لەگەڵ کۆمەڵگای میسر و بابل لاوازی باوەڕی ئایینی یۆنانەکان و ئەوەی کە هەشە وشك نییە، نزیکی رژێمە سیاسییەکەی لە کۆمار و دیموکراسییەت، رەخساندنی گوزەرانێکی خۆشی و دەست بەتاڵی لە ئەنجامی زەمینەی ماددییەوە، تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی زەمینەی هزری نوێ پێکدێنێ. دەوڵەمەندی ماددی و پێکهاتەی رژێمە سیاسییەکان و پێشخستنی گفتوگۆ دەکەنە پێویستییەك و ئەمەش توانستەکانی ئاسایش و ئازادی لەگەڵ خۆی دێنێ، هەروەکو چۆن سەردەمی ترسان لە خوداوەندەکان بەسەرچووە. دەوڵەتی شارە ئاڵۆزەکان ماقووڵتر بوونە و پێویستی هزری ئاقڵمەندانە نیشاندەدەن. هۆکاری سەرەکی ئەوەیە، لە کاتێکدا شارستانییەتی کۆیلەداری قۆناخێکی ٣٠٠٠ هەزار ساڵی لە دوای خۆی بەجێ دێڵێ، ئەوا لە دوای قۆناخی پێشکەوتنی سروشتی و پێگەیشتن، مسۆگەر لە پەلوپۆکەوتنێکی جددیش لەدوای خۆی دێنێ. ئیتر سیستەم بەرەو کۆتایی تەمەنی دەچێ. گەیشتنە لوتکە و پووکانەوەشی نزیکە. بە شێوەیەکی سەرەکی شارستانییەتی یۆنان ـ رۆما دانپێدانانی ئەم راستییەیە.

تەواوی ئەم هەلومەرجانە ئاماژە بەوە دەکەن سەردەمی باوەڕە میتۆلۆژییەکان بەسەرچووە و کاتی ئەوە هاتووە لەمیانەی مێشك بیربکرێتەوە. توانستی قۆناخە درێژەکانی مرۆڤایەتی وەکو گەنجینەی زانیاری تا بڵێی مەزنبووە. زانیاری ئاقڵمەندانە کە بەرهەمی کردار و رەنجە، دەرهەق بە دیاریکردن و روونکردنەوەی جیهانی سروشت و گیا و گیانلەبەران، رۆڵێکی رۆشنکەرانە دەبینێ. بەبێ هەبوونی رۆح و خوداوەندەکان پەیوەندی نێوان هۆکار ـ ئەنجام، دەردەکەوێتەڕوو. پێبەپێ ئەم تێڕوانینە پەسنددەکرێت کە جودا لە ئیرادەی مرۆڤ و خوداوەند پێڕەوێکی سەربەخۆ و تایبەتی سروشت هەیە. بە پێی دەربازبوونی کات گومان بەرامبەر جیهانی بیروباوەڕییە ساویلکەکان زیاتر دەبێت. هەنگاوی بوێری دەربازبوون لە جیهانی خەیاڵی منداڵانەوە بۆ جیهانی واقیعی دەهاوێژرێت. ئەوەی بناخەی ئەم دیاردانە پێکدێنێ، راستینەی جیهانی بازرگانی یۆنانەکانە کە لەپێناوی بە دەستهێنانی بەرژەوەندی و قازانج لە هەموو دەرگایەك بدات و حەزی لە ئاشکراکردنی نهێنییەکانە. ئەوکارەی بازرگانەکانی سۆمەر بە شێوەیەکی سنووردار ئەنجامیاندا جیهانی بازرگانی یۆنانییەکان سوورە لەسەر ئەوەی تاوەکو دوایی پێیبگات. ئەمەش هەروەکو بۆرژوازی پیشەسازییە کە لەپێناو بە دەستهێنانی دەسکەوت و قازانج، سنوور ناناسێ. ئیتر یاسای خوداوەندەکان تەنگ و سنووردارە، جیهانی بازرگانی پێویستی بە هێزی تاکەکەسی و مێشکێك هەیە لەپێناو قازانجی خۆیدا بە خێرایی بیربکاتەوە. میتۆلۆژیا تێری پێکهاتەی جێگیری کشتوکاڵی وەرزی دەکات و وەڵامی دەداتەوە، مسۆگەر تێری جیهانی بازرگانی و پیشەکاری شارەکان ناکات و شتێکی کۆمێدییە. چینی باڵادەستی کۆمەڵگا ناچارە هزری باڵادەستی خۆی بخوڵقێنێ. هەروەها لەسەر بنەمای هەبوونی پەیوەندی کۆیلەداری گۆڕانکاری لە پێکهاتەی چین و پێکهاتەی سەرخانی خۆیدا دەخوڵقێنێ.

دەتوانرێت زیاتر هەلومەرجە بابەتی و خودییەکانی شۆڕشی فەلسەفی هزر تاوتوێ بکرێت. بەڵام ئەم دەستنیشانکردنانە تێری ئەنجامدانی پێناسەیەکی راست دەکات. گەوهەرەکەشی ئەمەیە؛ هەروەکو چۆن پێشکەوتنی شارستانییەت لە ژێرخانی خۆیدا لە نێو پەیوەندییەکی دیالەکتیکی و وەکو زنجیرێك وایە، ئەوا ئامرازەکانی تەسەوور و بیرکردنەوە و گواستنەوەی ئایدیۆلۆژی کە دەزگایەکی سەرەکی سەرخانە، لە ناو یەکبوونێکی وەکو زنجیر و پەیوەندی دیالەکتیکی دان. ئەمە هەر لە خۆیەوە و بە بێ پشتبەستن بە توانستە کەڵەکەبووەکان و لەمیانەی ژیری مەزاجی چەند کەسێك دەرنەکەوتووە. ئەم رەوشە، رۆڵی فەیلەسوفەکان بچووك ناکاتەوە. بە پێچەوانەوە بە واتای روونکردنەوەی ئەوە دێت کە بەرهەمی کامە هەلومەرج و تا چ رادەیەك خوڵقێنەری مەزنی شارستانییەتن. هاوکات دەرفەتی ئەوە دەرەخسێنێ کە راستینەی ئەوان هەڵسەنگێنرێت و ئەنجامی راست هەڵبهێنجرێت.

لە قۆناخی فەیلەسوفەکاندا و لە دوای دابڕان لە میتۆلۆژیا، لەسەر دوو بنەما قۆناخێکی ناکۆکی هزری دەستپێدەکات.

ا ـ لە بواری پرۆسەی پراکتیزە کردندا زیاتر شێوازی بە بنەماگرتنی هەستەکان بەکاردەهێنرێ. هەبوونی بابەتیانەی سروشت بە بنەما دەگرێت. دەرك بە پەیوەندی هۆکار و ئەنجامەکانی رووداوەکان دەکات؛ دەزانێ کە خاوەنی یاسای سەربەخۆ و بەدەر لە داخوازی و کردەوەی مرۆڤن. یەکەمین شێوەگرتنی زانیارییە لە رێگای تێڕوانین و ئەزموونەوە بەدیهاتبێت. بەبێ ئەوەی پشت بە قالبە میتۆلۆژی و ئایینیەکان ببەستێ، هەوڵدەدات بە شێوازێکی شرۆڤە کردنی سروشت بگات. بەردی بناخەی رێگاکانی زانست بە شێوەیەکی پتەو و رێکوپێك دانراوە.

ب ـ شێوازی هزری ئاقڵمەندانە کە وشیاربوونەتەوە و مسۆگەر رێگا لەپێش کاریگەرییەکی سیحراوی دەکاتەوە، زیاتر لە ژێر کاریگەری دۆگماکانی پێشوو دایە. مێشك هێشتا سەربەخۆیی رانەگەیاندووە و زۆر لەمە دوورە. بەڵام دیسان لە سێبەری خوداوەندەکان دوورە، جەسارەتی ئەوە دەکات لە ناو دارستانێکدا هەنگاو بهاوێژێت کە کەسی پێدا نەڕۆیشتووە. هەر شتێکی هەیە لەمیانەی هزردا ئەنجامدەدرێت. ئەو جیهانەی کە هەیە هەڵخەڵەتێنەرە. ئەو هزرەی لە مێشکەوە سەرچاوەی گرتبێت لە هەموویان بەهادارترە. بێگومان بۆ یەکەمین جار و لەمیانەی هێزی خۆی، سەرهەڵدانی هزر کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر ئەمە هەیە. مرۆڤ ئەقڵی هێندە لە لای خۆی مەزنکردووە، لای ئەو هێندە گرنگ نییە ئایا لە دەرەوەی ئەقڵ راستینەیەکی دیکە هەیە یاخود نا. هەروەکو چۆن دەرکەوتنی یەکەمینی هەرشتێك سەرنج راکێشە، هەڵبەتە شتێکی ئاساییە کە ئەم پێشکەوتنە مەزنەی مێژووش زێدەڕۆیی بکات.

بە جەختکردنەوە ئاماژە بەوە دەکەم ئەم دوو لقە بە لانی کەم بە ئەندازەی میتۆلۆژیای سۆمەر کاریگەریان تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. هەروەکو چۆن میتۆلۆژیای سۆمەر رۆڵی لە پێکهاتەی بناخەی جیهانی باوەڕیمان هەیە، ئەوا ئەو هزرانەی سەرچاوەی خۆیان لەم دوو لقە وەردەگرن و وەکو لێشاو هاتوون رۆڵیان لە پێکهاتنی بناخەی هزری فەلسەفی و زانستییانەمان هەیە. ئەم کەسایەتییانە (فەیلەسوفانە) لە ئاستی پلە و پایەی پێغەمبەرەکاندان. لەسەرووی هەموویانەوە ئەتلەس، فیتاگۆرس، پارمەنیدس، هەرکلیتۆس، سوقرات، ئەفلاتوون و ئەرستۆ کە رەوتێکیان پێکهێناوە و وەکو زنجیرە هاتوون بە لانی کەم لە پێکهاتنی هێزی بیر کردنەوەدا هێندەی پێغەمبەرەکان جیهانی باوەڕییەکان خاوەن رۆڵن. لە

دەرخستنەڕووی هێزی تاکەکەسدا ڕۆڵی چاوگ و سەرچاوە دەبینێ. لە کاتێکدا میتۆلۆژیا و ئایینەکان مژدەی ستاتۆکانی پیرۆزی کۆمەڵگا لەگەڵ خۆیان دێنن، ئەوا فەلسەفە مزگێنی ئەو تاکە لەگەڵ خۆی دێنێ کە وشیاربۆتەوە و بەرەو ئازادی بەڕێدەکەوێت.

هەرچەندە فەلسەفە و ئایین هەردووکیان دەزگای دەست لێبەرنەدراو بن بۆ پێشکەوتنی شارستانییەت، درێژبوونەوەی ریشەی میتۆلۆژی لە نێوانیاندا هەبێت، بەڵام پێبەپێ لە یەکتر جیابوونەتەوە و لەگەڵ یەکتردا کەوتونەتە نێو ناکۆکی و پێکدادان و ناوە بە ناوەش لە سەنتێزێکی باڵاتردا یەکانگیربوون، یاسای هەبوون و یەکێتی دژەکان لە نێوان جیهانی فکر و باوەڕیدا پیادە دەکرێت. ئەم یاسایە پەیڕەدەکرێت و پێشکەوتن بەدیدێت. ئەم یاسایەی کە دواتر دەکەوێتە نێوان هەردوو لقەکەی فەلسەفەش، پێشکەوتنی فەلسەفە لەمیانەی ناکۆکی و پێکدادان و دوای گەیشتنی بە سەنتێزێك تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دێنێ. کاتێك پەرە بە زانست دەدات، خۆشی خۆراك لە زانستەوە وەردەگرێت.

٦ ـ دەسکەوتی یۆنانیەکان لە بواری پێکهاتەی هونەر و مەعنەوییات هەمیشەیی و مەزنبووە و بەمجۆرە دەسکەوتیان بۆ شارستانییەت بە دەستهێناوە. لەگەڵ ئەوەی لە بواری مۆسیقادا کاریگەری سۆمەریەکان لە ئارادایە، بەڵام توانیویەتی تایبەتبوونێکی بە گوێرەی خۆشی بێنێتە ئاراوە. لە پەروەردەکردنی سۆزەکاندا پێشکەوتن بەدیهاتووە. هەم لە پەرستگا هەم شێوازی گۆڕانی تاکەکەسی پێشکەوتنی بە خۆیەوە دیوە. فیتاگۆرس مۆسیقا وەکو زمانی گەردوون هەڵدەسەنگێنێ، هەمان هەڵوێست لەلایەن سۆمەریەکانیش لە ئارادایە. تەنیا بە روونکردنەوە و دەربڕینی ژیان لەمیانەی میتۆلۆژیا و زمانی ئەدەبی و فەلسەفی ناوەستن، بەڵکو دەربڕینی ژیان لەمیانەی مۆسیقادا جێگای خۆی دەگرێت. کاریگەری میسر لە بواری بیناسازیدا بەرچاوە. بەڵکو دوای میسر توانیویانە دووەمین و گرنگترین هەنگاوبهاوێژن. لەهەر شوێنێکی کولتووری هێلینی تێدا بڵاو بووبێتەوە شوێنەواری بیناسازییان بەجێماوە. ڕۆڵی لە دروستکردنی پەیکەر و پەیکەرسازیدا زۆر بەرچاوە و نوێنەرایەتی ڕەوتێك دەکات. هەروەکو بڵێی لەگەڵ جوانی سروشت لە نێو پێشبرکێیەکدایە و دەتوانێ دیمەنی زیندوو بنەخشێنێ. بە شێوەیەکی گشتی خۆجێییەتی هونەری یۆنان بە خێرایی تواناکاری بە گەردوونی بوون نیشان دەدات. دەسکەوت و ڕۆڵی یۆنانییەکان وەکو بەرهەمی سەنتێزێکی باڵا لە بەرامبەرماندا قیت دەبێتەوە.

پێشکەوتنی هاوشێوە لە بواری مەعنەوی و ئەخلاقدا دەبینرێت. بە تایبەتیش چەمکی "**فەزیلەت**" کە لەگەڵ دەرکەوتنی سوقرات سەریهەڵدا "**بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی تاکە کەس**" روون دەکاتەوە. بۆ تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگا پێشبینی بەدیهێنانی پێشکەوتنێك لە ئاستی زانیاریدا دەکات. پارۆلای ئەمە "**خۆت بناسە**"یە. ئەگەر بێت و "**فەزیلەت**" لە هەموو بوارێکدا وەکو گەیشتن بە کامڵبوون لە قەڵەمبدرێ، کەواتە ئەوەی دەکەوێتە سەرشانی تاکەکەس؛ مسۆگەر پێویستە بگات بە تەواوی ئەو زانیارییانەی کارەکەی پەیوەندیداردەکات و بەمجۆرە ژیانێکی کامل بەدیبێنێ. بەمجۆرە هەڵسوکەوتی بەرپرسیارانەی تاکەکەس بە واتای پێوانەی ئەخلاقی بەرز دێت. چەمکێکی هەڵوێستی ئەخلاقی بەمجۆرە گرنگە، کە تا ڕادەیەك بناخەکەی خۆی لە زەردەشتیەوە گرتووە. هەرچەندە بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت دەرفەتی ئازادی دەرەخسێنێ. لە چەمکێکی ئەخلاقی بەمجۆرەدا تاکەکەس دەتوانێ چارەنووسی خۆی دیاری بکات. هەڵبەتە بە گوێرەی چەمکەکانی پێشوو ئەو یاسایانەی پێشتر لەلایەن بەها پیرۆزەکان دەستنیشانکراوە چۆن بێت و چی بێت، دەبێ بە گوێرەی ئەو هەڵسوکەوت بکرێت. تەنانەت گۆڕانکارییەکی جیاوازتر بە خەیاڵیشیدا دەرباز نابێت. بێگومان لە سیستەمی باوەڕییەکاندا ئەوەی بە شێوەیەکی ڕەها (مطلق) هەموو شتێك دەستنیشان دەکات خوداوەندەکانن. تاکەکەس وەکو سێبەر وایە و هیچ هەبوونێکی نییە. گەوهەری فەلسەفەی بەندە و کۆیلە، سەرچاوەی خۆی لێرەوە دەگرێت. ئەمەش سەیرە کە چۆن تاکەکەس لە ڕێی تاکەکەسیشدا کۆمەڵگای بەندکردووە. ئەو هەڵسوکەوتانەی سەرچاوەی خۆی لە میتۆلۆژیا و باوەڕییە ئایینیەکان دەگرێت، لەمیانەی تایبەتمەندێتیەکانی داب و نەریتە کلاسیکییەکان بووە بە حاکمییەتێکی ڕەوا بەسەر هەڵسوکەوتی تاکەکەسدا.

ئەم ڕەوشەش زۆر لەو ئاستەی هەڵسوکەوتی ئازادانەی تاکەکانی سەردەمی نیۆلیتیك پاشکەوتووترە و بە پێچەوانە تەواوی پەیوەندییە ڕۆحی و هزرییەکانی مرۆڤی لەمیانەی ئەو بەنە گرێداوە کە بە "**قەدەر**" ناو دەبرێت و لە ڕێگای گرێدانی ئایدیۆلۆژییەوە دەکرێت بە چارەنووسێکی ئەبەدی و یەکجارەکی. ئەم چەمکە ئەخلاقییەی شارستانییەتی کۆیلەداری بە دەستی ڕاهیبەکانەوە بۆ نێو کۆمەڵگای گواستەوە و جێگیری کرد، ڕۆڵێکی سەرەکی لە بەڕێوەچوونی سیستەمدا دەبینێ. ئەوەی لە هزری زەردەشت و بودا و سوقرات بە شێوەیەکی سەرەکی هێرشی کراوەتە سەر و پارچەکراوە، ئەم چەمکە ئەخلاقییەیە، ناوبردنیشیان بە "**ریفۆرمخوازە گەورەکانی ئیرادە**" سەرچاوەکەی لێرەوە دێت. لەوانەیە بە شێوەیەکی ئاشکرا دژی خوداوەند، واتا بە شێوەیەکی ئاشکرا دژی شارستانییەتی کۆیلەداری ناوەستن کە بووە بە ڕەمز، بەڵام ئەو ڕێگایەی تاقییان کردۆتەوە لە گەوهەری خۆیدا پارچەکردنی سیستەم و ڕاکشانیەتی بە لای ئازادیدا. ئەمە لە پیلانی (پلەی) دووەمدا دەمێنێ کە لەمیانەی کامە شێوازی خەیاڵی و ئایدیۆلۆژی ئەنجامیانداوە. ئەم هەنگاوانەی (لە سەدەی ٥ پ.ز) بەرەو ئازادی هاوێشترا، پێبەپێ بەهێزبوو و لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بۆتە بەهێزترین هەڵسوکەوت و چەمکی ئەخلاقی.

بابەتێکی سەرەکی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان کە ڕەخنەدەکرێت ئەم کێشەیە کە گرنگییەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. چەمکی "**تاکڕەوێتی، ئەخلاقی ئازاد**" کە بەرامبەر بەو چەمکی ئەخلاقیەی سیستەمی درێژخایەنی بەندە ـ کۆیلە دەرکەوت، بە پێچەوانەوە بە شێوەیەکی بەرجەستە گوزارشت لە مەترسی دیلگرتنی تاکەکەس دەکات. بە تایبەتیش ئەم چەمکە ئەخلاقی لە شارستانییەتی ئەوروپا گەیشتۆتە لوتکە، پێشخستنی ئەلتەرناتیف و هەڵسەنگاندنی فرەلایەنە دەکاتە پێویستییەکی ژیانی. ئەگەر بێتو ئەم چەمکەی"**ئەخلاقی تاکڕەوی**" شینەکرێتەوە کە بە شێوەیەکی بێسنوور لەلایەن زانست و تەکنۆلۆژیاوە تێر دەکرێت، ڕێگا لەپێش مەزنترین کارەسات دەکاتەوە، بە تایبەتیش لەمیانەی ڕێکردنەوە لەپێش شێوازی شەڕە شەیتانییەکانی سەدەی بیستەم، ئەوا تەنیا بەمە ناوەستێ ژینگە بخاتە نێو ڕەوشێکەوە دەرفەتی ژیانی تێدا نەمێنێ؛ بەڵکو بە شێوەیەکی چاوکوێرانە هەڵوێستە دەکات و کارەسات و سیستەمێکی هۆڤییانەی وەها لەگەڵ خۆی دێنێ زۆر لە سیستەمی هۆڤێتی سەرەتایی دڕندانەتر بێت.

بێگومان ڕۆڵی شارستانییەتی یۆنان لەم درزە ئەخلاقییەدا، لەو لایەنەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەخلاقی تاکڕەوێتی پێشخستووە. لە ڕێگای شارستانییەتی ڕۆما زیاتر پێشدەکەوێت و لە شارستانییەتی ئەوروپاشدا دەگاتە لوتکە. لایەنی دیکەی درزیش، "**کولتووری هەڵسوکەوتی ڕۆژئاوا**" یاخود ئەخلاقەکەی ئەنجامی دەدات. لە کاتێکدا خودا لە لای یۆنانەکان پێبەپێ دەبێت بە مرۆڤ و دەکەوێتە نێو قۆناخی بوون بە هێزی تاکەکەس، لە پێکهاتەی هزری و ئەخلاقی ڕۆژهەڵاتدا پێشکەوتنی قۆناخێك جێگای باسە کە تاکەکەس خۆی دەکات بە خوداوەند و ئەو سیستەمەی کە دایمەزراندووە لە ڕێگای نیشاندانی وەکو سیستەمی خودا پیرۆزی دەکات. لە کاتێکدا ئەم دوو چەمك و مەیلە ئیرادییانەی کە لە ڕێگای سۆمەریەکانەوە ریشەیەکی هاوبەشیان هەیە، لە ڕێگای زەردەشتەوە دەبێت بە دووڕیان، جیا بوونەوەی مێژووی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا وەکو هێڵێکی ئەستووری لە یەکتر جیاوازی شارستانییەت بەبێ ئەوەی گرنگی خۆیان لەدەستبدەن، لەمیانەی ناکۆکی و پێکدادان و گەیشتن بە سەنتێزی باڵاتر، تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە. بۆ ئەوەی ئەم پێکهاتە ناکۆکەی شارستانییەتی قۆناخی ئایندە بەلاوە بنرێت، ئەنجامدانی هەڵسەنگاندنی بەرفراوان وەکو مەرجێك دەسەپێنێ. هەڵسەنگاندنێکی لەلایەنی گشتیدا پەسند دەکرێت بەمجۆرەیە، کە ئەو هەڵسەنگاندنانەی تاوەکو ئێستا لیبرالیزمی سەرمایەداری و سۆسیالیزمی مارکسیزم ئەنجامیانداوە بە شێوەیەکی ڕووکەشی ماونەتەوە. ئەو بەهەشتەی لیبرالیزم و سۆسیالیزم بەڵێنیان دابوو، پێکنەهات. دەشێ هەڵە لە خودی چەمکی بەهەشتدا بێت. ئیتر هەڵسەنگاندن سەبارەت بەم بابەتە بۆ بەشەکانی دواتر بە جێدێڵم. ئەم هەڵوێستە مێژووییەمان ئەگەر نەبێتە هێزی چارەسەری ئەم کێشەیەش، ئامانجم ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردنێتی.

بێگومان ڕێبازی ڕۆژئاوا کە لە ئەنجامی ئەو درزە هاتە ئاراوە کە شارستانییەتی یۆنان قووڵیکردەوە کە مرۆڤی بە بناخە گرتووە و لەمیانەی بەکارهێنانی تواناکارییەکانی هەوڵی شیکردنەوەی سروشت و کۆمەڵگای داوە، هەروەها لەسەر بنەمای بەرژەوەندی تاك ئاستی سیاسی، کولتووری، کۆمەڵایەتی و ئابووری پێشخستووە، بۆتە هۆکاری باڵا بوونی شارستانییەتی

ئەوروپا. لە کاتێکدا لە ڕێگای ئەرستۆوە گەیشتە لوتکەی ئایدیۆلۆژی خۆی، ئەوا ئەو هەڵمەتە مەزنەی بڵاوبوونەوە بۆ ڕۆژهەڵات کە لەلایەن ئەسکەندەری مەزنەوە ئەنجامدرا، ئەم باڵابوونەی ئەوروپای لە ماوەیەکی زۆر کورتخایەندا بەسەر تەواوی شارستانییەتەکاندا سەپاند. قوتابیە ژیرەکەی هزری نوێ کە زۆر باش پەروەردە کراوە، سەرکەوتنێکی شکۆداری لە ئەرکی خۆدا بەدیهێناوە. بەڵام هەرچی شێوازی هزری ڕۆژهەڵاتە، بە تایبەتی لە ڕێگای گفتوگۆکانی ڕاهیبەکان کە بابل تێیدا خنکاوە، هێزی خوڵقێنەرانەی ڕابردووی لەدەستداوە، تەنیا خۆیان لە نێو ئاستی پەیوەندیداربوون بە کۆپیەی مەتنە سەرەکییەکاندا خنکاندووە. سیستەمی براهمانیزمی هیندستان خەریکی دووبارەکردنەوەی سیستەمی کۆنی ڕاهیب و پادشاکانی میسر و سۆمەرە. ئەم نەڕاندنەی زەردەشت سەبارەت بە ئیرادە ئەنجامی دەدات تێری وەستاندنی ئەم کەوتنە ناکات. لە کاتێکدا پێشکەوتنی ئایینە تاکخوداییەکان ڕێگە لەبەردەم پێشکەوتنێکی سنووردار دەکەنەوە، چەمکی دەوڵەتی ڕاهیبی تێپەڕناکرێت، کە بناخەکەی زۆر بە پتەوی داڕێژراوە. سیستەمی ناسنامەی نوێی کۆمەڵگا کە لە دەوروبەری پەرستگا پێکهاتووە، بە دەوڵەتبوون وەکو نوێنەری سیستەمی خودایی ـ ئاسمانی لەسەر زەوی بە بنەمادەگرێت. تەواوی ئەخلاق و ئایدیۆلۆژیاکان بە گوێرەی ئەم بنەمایە نوێدەکرێتەوە، دادەڕێژرێت و دەکرێتە ئەبەدی. تاک دەکەوێتە نێو ڕەوشێك کە ناناسرێتەوە و وون دەکرێت. سیستەمێکی چینایەتی ـ خودایی بەمجۆرە پێکدەهێنرێت کە جێگا بە سێبەرەکەشی نادات. چەمك و ئەخلاقێکی بەمجۆرە زاڵە کە تەنیا کارەکەی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانە. ئیتر ڕووبەڕووی **"ڕێبازی ڕۆژهەڵات"**ین کە مردن لەپێناو پادشا، خاوەن و مێرد وەکو پیرۆزترین پلە و پایە دیاردەکات. هەرچەندە ئەو ڕابوونەی لەسەر بنەمای پشتبەستن بە هەڵمەتی ئیرادەی ئازادی زەردەشت پێشکەوت تاوەکو بەر دەروازەکانی ئەتینا ڕۆیشت، بەڵام لەبەر ئەوەی کەوتۆتە ناو هەمان چەمکەکانی ڕۆژهەڵات، نەیتوانی لە شکست بەرامبەر بە ئەسکەندەری خوێندکاری ٢٥ساڵانە ڕزگاری بێت و بەمجۆرە باڵادەستی دەکەوێتە دەست ڕۆژئاوا. ئەمەش سەرباری ئەوەی هێزی ماددی ڕۆژهەڵات مەزنە و هێزی سەربازیشی زۆرە. ئەم چەمکەی کە هەموو شتێك حەواڵەی خودا دەکات و پادشاکانیشیان لە شوێنی خودا داناوە بەرامبەر بە قۆناخی ئاقڵمەندی کە ئەرستۆ گەیاندوویەتییە لوتکە هیچ بەهایەکی نییە و لە شکست ڕزگاری نابێت. **"ڕێبازی ڕۆژهەڵات"** بەرپرسیارە لە بەرامبەر دۆڕاندنی شەڕ.

چین و هیندستان کە هەمان ڕێبازیان پەیڕەو دەکرد، ئەنجامیش هەمان ئەنجامبوو. سەرەڕای شکۆمەندی و درێژخایەنی ئەزموونی ریفۆرم کە لەسەرەتاکانی چەرخی ناوین لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیسلامییەت دەرکەوت، بەڵام دیسان گرێدراوی **"ڕێبازی ڕۆژهەڵات"** مایەوە و لێی ڕزگارنەبوو، بەمجۆرە لە شکست بەرامبەر بە **"ڕێبازی ڕۆژئاوا"** ڕزگاری نەبوو. ئەگەر سەرنج بدرێت و کاتێك لە بەشەکانی داهاتوو بە فراوانی تاوتوێ کرا، ئەو کاتە دەبینرێ ئەوەی بناخەی هەڵکشان و کەوتن دیاریدەکەن پێکهاتەی لۆژیکی بنەمای سیستەمەکان و قالبەکانی هەڵسوکەوت و ئەخلاقییە؛ ئەوەی ئاراستەیان دەکات شێوازی بیرکردنەوە و هێزی ئیرادەیە. لەمیانەی نموونەی یۆنان بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش سەلمێنراوە کە هۆکاری دیاریکراوی سەرهەڵدان، هەڵکشان، گۆڕانکاری و کەوتنی شارستانییەتەکان ئەو هزر و بەها ئەخلاقییانەیە کە پشتی پێدەبەستێت و بەها ماددییەکان لە ڕێگای پابەندبوون بەو هزر و بەها ئەخلاقییانە بە بایەخ دەبێت و پێشدەکەوێت.

## ٢ ـ قۆناخی ڕۆمای شارستانییەتی کۆیلەداری

لەنێو ئەو هەلومەرجانەی کە ئامادەکاری هەڵکشانی ڕۆمای کرد، پێشکەوتنی کۆنفیدراسیۆنی ئەتروسك لە باکوور لەسەر بنەمای ١٢ ناوچە بەردەوامبوو. تەشەنەکردنی کولتووری نیۆلیتیك هەروەها لە مێژوویەکی زوو لە ساڵانی ١٠٠٠پ.ز بەکارهێنانی ئامرازەکانی ئاسن لەلایەن گەلە بە ڕەچەڵەك لاتینەکان و بەهێزبوونیان و بڵاوبوونەوەیان و لێدانی مۆرکی خۆی لە پێکهاتەی ئەتنیکی نیمچە دوورگەی ئیتالیا جێگای باسە. ئەتروسکەکان لە ڕێگای ئەنادۆڵەوە بەهاکانی شارستانییەتی میزۆپۆتامیایان گواستەوە و تاوەکو سەردەمی هەڵکشانی ڕۆما ڕۆڵێکی پێشەنگایەتییان بینی. گرنگترین سەرچاوە کە ڕۆمای بەخێوکردووە، ئەتروسکەکانن. کۆلۆنییەکانی هێلین لە باشوور، کەمێك ماوە دووەمین ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ بخوڵقێنێ، چەندین نیمچە دەوڵەتی شاری ئاوا کردووە. دەسەڵاتی بازرگانی کولتووری و ئایدیۆلۆژی بەردەوام لە نێو پێشکەوتندایە. پادشایەتی سیراگۆزا لە باشوور و شارستانییەتی قەرتاجەی، بە ڕەچەڵەك فینیقی باکووری ئەفریقیا لە نێو قۆناخێکی پرشنگدار دەژین. کاریگەرییەکانی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین لەمیانەی تەواوی ئەم لقانەوە، بناخەکانی ڕۆما بەردرێژ دەکات. لە ساڵانی ٧٥٠ پ.ز دا دەبینرێ کە ڕۆما دەبێتە دەوڵەتێکی پادشایەتی ـ شار. لەگەڵ کاریگەری قووڵی ئەتروسکییەکان، گروپە ئەتنیکییە بە ڕەچەڵەك لاتینی، مۆری خۆیان لە قۆناخ دەدەن. بەرەو ساڵانی ٥٠٠ پ.ز ڕۆما وەکو کۆمارێکی بە ڕەچەڵەك لاتین، دەربازی قۆناخی هەڵکشان دەبێت. تێکۆشان و ململانێی توندی نێوان چینە ڕەسەنەکان **(پاتریجی)** و هەژارەکانی نوێنەرایەتی چینی ژێر **(پلەبەکان)** دەکەن و لە ئەنجامی جیابوونەوەی پێکهاتەی ئەتنیکی هاتۆتە ئاراوە، لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی نێوان ئەم چینانە، ڕێگا لەپێش ئاوا کردنی کۆمار دەکاتەوە و هەوڵی ڕێکخستن دەدات. ساناتۆ و ئەنجوومەنەکانی گەل زۆر لەو نموونەی ئەتینا بەهێزتردەبێت. بۆ دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتی باڵا **(ماگیسترا)** و دادگاییکردن **(پراتۆر)** جیادەکرێتەوە و هێندەی پێویستییەکان خۆیان بسەپێنن دەزگای دیکەی لەم جۆرانە دەئافرێنرێ.

هاووڵاتییەتی ڕۆما بایەخێکی جیاواز پەیدا دەکات. کاتێك مافەکانی هاووڵاتێتی کە سەرەتا بە خەڵکی شاری ڕۆما دەدرا، تەواوی نیمچە دوورگەی گرتەوە، کێشەکانی کۆمار ڕووی لە زیادبوون کرد. دوای ئەوەی مەترسی قەرتاجە (٢٦٤ تا ١٤٦ پ.ز) بێکاریگەر و بەلاوەنرا، هەنگاو بە هەنگاو قۆناخی زاڵ بوون بەسەر جیهانی هێلینی دەستیپێکرد. لەگەڵ گەیشتن بە دوا سەدەی پ.ز بە تایبەتیش لە دەرئەنجامی سەفەرەکانی قەیسەر، فەتحکردنی گالیا (فەرەنسا)، باشووری ئەڵمانیا، باشووری دوورگەی بەریتانیا، ئیسپانیا و ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی و ئەنادۆڵ، بەرەو تەواوبوون چوو. میسر کەوتووە و بووە بە هەرێمێکی پابەند. بە ئەندازەی قەڵا سەرەکییەکانی شارستانییەت چەندین خاکی دەستلێنەدراو (پاکیزە)ش لە ژێر حوکمڕانی ڕۆمادا بوو. قۆناخی زێڕینی شاعیر **فیرگیلیۆس** دەستیپێکردووە. لە جیاتی ڕژێمی کۆماری، ڕۆژگارەکانی ئیمپراتۆرییەت، ئیمپراتۆرەکانی **(پرینجیبا)**، قۆناخی هاووڵاتییە پلە یەکەکان دەستیپێکردووە.

حوکمی مێژوو لەوە مسۆگەرە کە ئەم هەڵکشان و بڵاوبوونەوەی شارستانییەتی کۆیلەداری ڕۆما، نوێنەرایەتی مەزنترین هێز دەکات کە تاوەکو ئەم قۆناخە پێکهاتوون. بەڵام ڕوونکردنەوەکان زۆر لەوە دوورن فاکتەر و پێوانە بابەتییەکانی پێکهاتنی بە بناخەبگرن. هەروەکو هەڵوێستە کوێرانە و زێدەڕۆیی و میتۆلۆژیاکانی سەردەمی دەرکەوتنی یۆنان، هەمان شت لە نموونەی ڕۆماشدا دەبینرێ. شێوازی **"من سەنتەرم"**ی تەواوی شارستانییەتەکانی تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، لێرەشدا تاوەکو دوایی ئەم بانگەشەیە پەیڕەو دەکات. ئەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆی مێژووی زانستییانە، پێوانە و خاڵەکان لە شوێنی خۆیدا بنێت و ڕوونکردنەوەیەکی ڕاست پێشبخات. شتێکی ڕێکەوت نییە کە شاعیری مەزن فیرگیلیۆس لە داستانی بە ناوی **ئاییناس** دا، ئاواکردنی ڕۆما بە |**"ئاییناس"** ەوە دەبەستێتەوە، کە دوای جێگرتنی لە بەرخودانی تەروادە هاتۆتە ئیتالیا. بەمجۆرە چاوگی ئەو کولتوورە دەستنیشان دەکات کە ڕۆمای خوڵقاندووە. ئەو ڕاستینەیەی کە نکۆڵی لێناکرێت ئەوەیە کە ڕۆما لە نزیکەوە بە شێوەیەکی بەهێز لە ژێر کاریگەری کولتووری یۆنانیدا بووە و تەنانەت بە واتای بەردەوامکردنی کولتووری یۆنان دێت. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا ڕاستەوخۆ و کاریگەری ئەنادۆڵ، فینقییەکان و میسر بە پلەی دووەم دێت. بەهۆی ئەوەی شارستانییەتی ڕۆما لەلایەن ئەم سەرچاوانەوە تێرکراوە، بۆیە تێربوونی ڕۆما لەم سەرچاوانە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆیە. هەرچەندە بەمجۆرەش بێت، وەلێ کاتێك تەماشای کاریگەری سۆمەریەکان لەسەر ئەتروسکییەکان بکەین و بێنینە بەرچاو، ئەوا ئەمەش ڕاستە ئەو شارستانییەتەی ڕۆژئاوا دواترین و گەورەترین ئەڵقەی ئەو شارستانییەتە پێك دێنێ کە سەرچاوەکەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوینەوە هاتووە. هەروەکو چۆن گەورەترین ئەڵقەی ڕۆژهەڵات ئیمپراتۆرییەتی **چینە**، کە پشت بە زەریای مەزن دەبەستێ، ئەوا دواترین ئەڵقەی ڕۆژئاوا کە پشت بە زەریای ئەتلەسی دەبەستێت، ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمایە. بەمجۆرە ڕۆما بە واتای سێیەمین و دواترین ئەڵقەی بڵاوبوونەوەی ڕاستەوخۆی شارستانییەتی کەوانی زێڕین دێت.

کاتێك هەوڵ دەدەین شارستانییەتی رۆما شیبکەینەوە، پێوانەکردنی لەگەڵ شارستانییەتی سۆمەر گەلێك ئەزموونمان فێر دەکات. لە کاتێکدا سۆمەریەکان پێکهاتەی رەسەنی کۆمەڵگای کۆیلەدارین، رۆما وەکو لێهاتووترین هێزی تەواو کردنیەتی. لە کاتێکدا سۆمەریەکان خۆراکی تەواوی پێکهاتەکانی سەرخان و ژێرخانی سیستەمەکەیان لە رێگای هزرێکی ئەفسانەیی و کولتووری پیرۆزی پەرستگای راهیبەکان بە دەستدەهێنا و وەکو نوێنەری سیستەمی پیرۆزی ئاسمانی، لەسەر زەوی نیشانیان دەدا؛ ئەوا رۆما کولتووری یۆنانییەکانیشی دەداتە پشت خۆی و بە شێوەی پێکهاتەی کۆمارێکی علمانی و ئاقڵمەندی بەرجەستە ببوو. پادشا ـ خوداکان جێگای خۆیان بۆ ئیمپراتۆرە خواوەندەکان بە جێ هێشتووە. هەروەکو چۆن ئیمپراتۆر سەرجۆن مۆدێلی هەموو ئیمپراتۆرەکان بوو، ئەوا کارەکتەری سەرەکی و سەرچاوەی ئیلهامی ئیمپراتۆرەکانی رۆما بووە. لە کاتێکدا میتۆلۆژیای سۆمەریەکان رەسەنە ئەوا ئەوەی رۆما سێیەمین کۆپیەی میتۆلۆژیای سۆمەرە. داستانی گلگامیش کراوە بە داستانی ئایینیاس. دەشێ لە گەلێك بابەت و بواریتردا درێژە بە بەراوردکردن بدەین. پەیوەندییەکانی نێوانیان مسۆگەرە و هاوشێوەیە. جیاوازییەکان لە ناوەڕۆکدا نییە، بەڵکو تایبەتە بەو شێوەیەی کە بەسەرچوونی کات و گۆڕانکاری شوێن، رێگای لەپێشدا کردۆتەوە. ئەگەر لە یەکچوونێکی قەبە ئەنجام بدەین، دەتوانین بڵێین تۆپە بەفرینەیەکی بچووکە لە بنارەکانی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس گلۆربۆتەوە و لەو بەهایانەی شارستانییەت پێکهاتووە کە خوداوەندە ژن عەشتار (ئینانا) گوتوویەتی ئەم ("ما"کانی، یاساکانی منە)، لە رێی دەشتاییەکانی میزۆپۆتامیا بەرەو دۆڵی نیل چووە، لەوێشەوە گەورەتربووە و بەرەو ئەنادۆڵ و تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین و دواتریش بەرەو نیمچە دوورگەی یۆنان رۆیشتووە، لەوێشەوە بەرەو نیمچە دوورگەی ئیتالیا و لە رێی باکووری ئالپەوە لە رێی شوێن پەنجەی پێشەنگەکانییەوە کاتێك گەیشتۆتە رۆما بۆتە تۆپە بەفرینەیەکی یەکجار مەزن. واتا شارستانییەت لە تۆپە بەفرینەیەك دەچێت کە بەر هەر شوێنێك بکەوێت بەهای نوێ لەخۆدەگرێ، گەورەدەبێت و دەبێ بە هەرەسێك هیچ شتێك بەرگەی ناگرێت. باوەڕ ناکەم لەمیانەی هەڵسەنگاندنی بەمجۆرە کەوتبێتینە نێو رەوشێك کە لایەنە تایبەتەکانی رۆما و مەزنبوونەکەی بچووك بکەینەوە. بە پێچەوانەوە بەڵکو دەخوازین لە رێگای دەستنیشانکردنێکی راست و بە پێوانەی ئەو سەرچاوانەی تێریکردوون، پێناسەی بەها راستەقینەکەی بکەین. بەبێ ئەوەی شتێك بە شێوەیەکی راست پێناسە بکرێت، ناشێ و ناتوانرێ هەڵسەنگاندن و بڕیارێکی راستی دەرهەق بدرێت.

بێگومان بەهای شارستانییەتی بەمجۆرە هەن کە رۆما کارەکتەرەکەی دیاریکردووە و گەوهەری خۆی داوەتێ و گرنگییەکی بەرچاوی هەیە. ئەگەر بخوازین لەمیانەی هێڵە گشتییەکان تەماشای بکەین بەمجۆرەیە.

١ ـ لە پێکهاتی میتۆلۆژیادا تایبەتبوونێکی زێدە نییە. **ژوپیتەر** **Jupiter** جێگای خوداوەندی بابلی مەردۆك و سەرۆك خوداوەندی یۆنان زیۆسی گرتۆتەوە. لە کاتێکدا **لیبەرتۆ** **Liberto** شوێنی دیۆنیسۆسی گرتۆتەوە، ئافرۆدیت کراوە بە **venus** **ڤەنوس**. خوداوەندە ژنی ئەنادۆڵ **کیبەلە** **kibele** ، بە خۆی و پەرستگاکەی بە بێ گۆڕانکاری بۆ رۆما گواستراوەتەوە. رێزبەندی لەمیانەی لەدەستدانی گرنگییەکەوە بەردەوام دەکات. لێرەدا سەرەکیترین بابەت کە پێویستە ئاماژەی پێبکرێت ئەوەیە، کاتێك میتۆلۆژیای رەسەن و راستەقینەی خوڵقاندنی سەرەکی سۆمەریەکان لە ئەنجامی بەسەرچوونی کات و گۆڕانکاری شوێن بەردەوام دووچاری گۆڕانکاری و توانەوە هات و بەمجۆرە گەیشتە رۆما، تا دواڕادە کزبووە و لەوە دوور کەوتۆتەوە کە باوەڕی پێبهێنرێت. ئەو شێوە نوێیانەی بە خۆیەوەی گرتووە وەکو سەمبۆلیك بووە و تەنیا رێزیان بۆ لێگیراوە. لە واتایەك ئایینی، رۆما پێکهاتەکەی پارچە پارچە بووە، دروستکراوە؛ وەکو ئەمریکای رۆژگاری ئەمڕۆمان. ئایینی سەرەکی، لە سیاسەتدا ڤالکراوەتەوە. خودی سیاسەت هێندەی ئایین پیرۆزی بەدەست هێناوە. ئەو دەزگایەی مەزن و پیرۆزکراوە، بە شێوەی کلاسیك ئایین نەبووە، بەڵکو سیاسەت بووە. ئایدیۆلۆژیای رۆما هێندە پێویستی بە دەمامکی ئایینی نییە، بە شێوەیەکی باشتر لەمیانەی بەها سیاسییەکان گوزارشت لەخۆی دەکات. زەمینەی هەنگاونان لە دەوڵەتی پیرۆز (هییەراتیك) بەرەو دەوڵەتی علمانی (لە ئایین بەدەر)ی ئافراندووە.

٢ ـ ئەوەی واتادارترە پێشکەوتنی دەزگای سیاسی لە رۆما وەکو دەسکەوتێکی شارستانییەتە. هەروەکو چۆن لە دیموکراسی چینایەتیدا ئەتینا خاوەن شوێنگەیەکی تایبەت بێت، ئەوا لە بەدەست هێنانی بەهای یاساکان و جێگرکردنی کۆمار وەکو شێوەیەکی بەڕێوەبردن رۆڵی رۆما هێندە دیاریکراوە. هەموو دیموکراسییەتێك کۆماری نییە و هەر کۆمارێکیش دیموکراتیك نییە. ناتوانرێ یەکسانی لە نێو هەردووکیان دابنرێت. هەروەکو دەزانرێ یەکەمین نموونەکانی ئەنجوومەن، واتە یەکەمین دەزگای دیموکراسی چینایەتی، لە شارستانییەتی سۆمەریەکان بینراوە و سەلمێنراوە. بەڵام سیستەمی رۆما دەسکەوتێکی شارستانییەتە؛ کە لەسەر بنەمای گەوهەرێکی سنوورداری چینایەتییە و شێوازێکی بەڕێوەبردنە کە دان بە هەڵبژاردن دادەنێت و درێژترین تەمەنی هەبووە، سیستەمێکی خاوەن دەزگا و یاسا بووە. پێشکەوتووترین شێوەی باڵادەستی چینایەتییە. دەتوانرێ وەکو شێوەی دیموکراسییەتێکی لە جۆری ئەتینا هەڵسەنگێنرێت کە تا رادەیەك پێشکەوتووتر و کورتخایەنترە. کارەکتەری علمانی کۆماری رۆما تایبەتبوونێکی گرنگە. هەروەکو چۆن بەڕێوەبەران هێندە پێویستی پەنابردنە بەر دەمامکی ئایینی نابینن، بە مەودا نزیکی هەر ئایینێك دەبنەوە و کاتێك هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانیان نەکات، لەگەڵیا رێك دەکەون و تەنانەت پەسندیشی دەکەن و توانیویانە ببن بە رژێمێکی فرە ئایینی. دەشێ باس لە ئایینی سۆمەر، میسر یاخود ئەتینا بکرێت. بەڵام باسکردنی ئایینی رۆما شتێکی سانایی نییە. لەم لایەنەوە رۆما هەروەکو ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپای رۆژگاری ئەمڕۆمان دیارە کە وەکو هەرێمەکانی شارستانییەتیان تێدا پێشکەوتووە فرە لایەنی و هەمە رەنگی لە ئارادایە. بەڵام ئەو دوو نموونەیە تەنیا لەلایەنی قۆناخی سیاسی رۆما و چەمکی سەبارەت بە ئایین بەرچاو و سەرنج راکێشە. رۆڵی لەپێشکەوتنی چینی سەربازیدا دەبینێ و بنگەکەشی بۆ ئایینی **میترا** **Mitra** دەگەڕێتەوە کە ئایینی هیندە ئارییەکانە، بەر لە مەسیحییەت کەمێك مابوو بکرێ بە ئایینی فەرمی. هەربۆیە تاوەکو ناوەندەکانی ئەورووپا رێگا بە پەرستگاکانی ئایینی میترا دراوە و پاشماوەکانی تا رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. بەڵام لەبەر ئەوەی مەسیحییەت پێکهاتەی سەربازی لاوازدەکات کراوە بە ئامانجی لێدان، بە دڕندانەترین شێوازی ئەشکەنجەیان بەرامبەر پەیڕەوکراوە. بەڵام لە قۆناخی هەڵوەشانەوە کاتێك بینیان کە دەتوانێ رۆڵی چیمەنتۆی یەکانگیرکردن ببینێ، لەوە دوانەکەوتن وەکو ئایینی فەرمی رایگەیەنن. لە پەیوەندییەکانی نێوان ئایین و دەوڵەت بەردەوام بەلاوەنانی گەوهەری خاوەن پرەنسیپ بەلاوەدەبرێت و بەرژەوەندی لە ئارادایە.

٣ ـ لەلایەنی پێشکەوتنی شارستانییەت گرنگترین دەسکەوتی رۆما لە بواری دەزگاکاندا لە بواری مافدایە. تاوەکو ئەم قۆناخە جگە لە یاساکانی داب و نەریتە کۆنەکان گوتەی ئەو کەسانە بە واتای یاسا دەهات کە خۆیان بە نوێنەر یان ئیرادەی خوداوەندەکان دادەنا و لە نێو بەڕێوەبەرایەتیدا خاوەن رۆڵی مەزن و بە کاریگەر بوون. نە زانستێکی یاسایی و نە دەزگایەکی یاسایی بەمجۆرە هەیە ماف دەستنیشان بکات و بیپارێزێت، شتێکی بەمجۆرە جێگای باس نییە. بە شێوەیەکی سەرنج راکێش راگەیاندنی ئیرادەی چین و نووسینەوەی وەکو سیستەمێکی یاسا و پراکتیزەکردنی لە کۆماری رۆما کاروبارێکی سەرەکییە. هەربۆیە تێکۆشانی درێژخایەنی سەدان ساڵەی توێژەکانی پاتریجی و پلەب بە پێویست بووە. بە واتایەکی دیکە ئەو ئاڵۆزییە کۆمەڵایەتییەی پێشکەوتووە و ئاڵۆزتر بووە، سیستەمێکی یاسای کردۆتە ناچارییەك. ئەمە تا رادەیەك قەدەری رۆمایە. لە کاتێکدا سەرەتا شاری رۆما ئەم رێکخستنەی کرد بە ناچارییەك، دوای ئەنجامدانی رێکخستن بۆ تەواوی ئیمپراتۆرییەت؛ واتا دەربازبوون بۆ نێو قۆناخێك کە بە شێوەیەکی فەرمی یاساکانی دەستوور خۆی سەپاند، بووە ناچارییەك. لە مێژوودا **پاکس رۆمانا** **(Paxromana)**ی بە ناوبانگ واتە ئاشتی رۆما؛ بە واتا سنووردارەکەی، بە پشتبەستن بە یاسای رۆما بە مانای باڵادەستی سیستەمی فەرمی دێت. یەکێك لەسەرچاوە سەرەکییەکانی یاسای مۆدێرن یاسای رۆمایە. لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا لە ئاستێکی گرنگدا کاریگەری پرەنسیپەکانی ماوە. ئەمەش هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کاروباری کۆمەڵایەتی خۆی جێبەجێکردووە. ئەو کۆمەڵگایانەی یاسایان پێشخستووە بەهای شارستانییەتیان بەردەوام پایەدار و هەمیشەیی بووە. هەر کاتێك کۆمەڵگا پێشبکەوێت، ناتوانرێ تەنیا لەمیانەی یاساکانی ئایین و داب و نەریتەکان بەڕێوە ببردرێت. سیستەمی فەرماندانی بەڕێوەبەرایەتی سیاسی بە گوێرەی گەوهەرەکەی تێری ئاوا کردن و پاراستنی سیستەم ناکات. لە کاتێکدا سیاسەت کارێکە پێویستی بە یاسای رۆژانە و کۆنترۆڵ و چاودێری هەیە. بەڵام یاسا دەزگایەکی ئارام و پشوودرێژە و هەموو کەسێك لەخۆوە دەگرێت. دەتوانرێ وەکو سیاسەتێکی

سەرەکی ڤاڵبۆوە، گوزارشتی لێبکرێت کە جێگیر بووە و ڕێککەوتنێکی گشتی دەرهەق ئەنجامدراوە و هەموو کەسێك دەتوانێ پراکتیزەی بکات. لەم بوارەدا بەهای یاسایی کۆماری ڕۆما مەزنە و شارستانییە.

٤ ـ گومان لەوەدا نییە کە لە بواری سەربازیدا ڕۆما گەورەترین هێزی قۆناخە کە ئەو پێشکەوتنەی بابل، ئاشوور، پارس و میسر لە بواری سەربازی ئەنجامیاندا لەوە زیاتر کە لە بواری گەوهەری تێپەڕیان بکات، وەکو هێزێکی بە هەندێك تایبەتمەندی (**امتیازات**) گەیشتووە، گوزارشتی لە ڕەسەنێتی خۆی کردووە. بەرامبەر بە چینی سیاسەتمەداران، بە تایبەتیش ئەو قۆناخەی بە سیزار (ڤەیسەر) دەستیپێکرد، دەبینرێ کە ڕەوتێکی تایبەتی سەربازی هەوڵیداوە بەسەر سیاسەتدا کاریگەربێت و ڤورسایی خۆی نیشان بدات؛ بێگومان کاتێك لە قۆناخی کۆنفیدراسیۆندا بوو ئەوانەی هێزی سەربازییان هەبوو دەسەڵاتی ماددیان لەپێشبوو؛ بە شێوەیەکی گشتی کەسانی وەکو، سەرۆك خێڵ، سەرۆك، پادشا یاخود ئیمپراتۆر تایبەتمەندێتیە سیاسی، سەربازی، یاسایی تەنانەت تایبەتمەندێتیە ئایینیەکانیشیان لە کەسایەتی خۆیاندا کردۆتە یەك. بە واتایەکی دیکە مێژووی شارستانییەت مێژووی پێشکەوتن و یەکلابوونەوە و تایبەتبوونی ئەو دەزگایانەیە. سەرەکیترین یەکلابوونەوە لە کۆماری ڕۆما (دوایی دەبێ بە ئیمپراتۆرییەت) یەکلابوونەوەی ناوەندە سیاسی و سەربازییەکانە. لە میسر و سۆمەریش یەکلابوونەوەی سەرەکی لە نێوان دەزگاکانی پەرستگا و پادشایەتییە. هەردوو یەکلابوونەوەش لەمیانەی ماوەیەکی درێژخایەن و تێکۆشانێکی دژوار ئەنجامگیربوون و بە گوێرەی هێز و گرنگییەکەیان بوون بە دەزگا. هەر دەوڵەتێکی دامەزرابێت، یەکلابوونەوەیەکی بەمجۆرە یاخود یەکبوونی بەبنەماگرتووە. لە ڕاستیدا دەزگای بونیادنراوی بە سیستەمێکی کرداری گەیاندووە. واتە نەیخولڤاندووە. خولڤاندنی بە واتای چالاکی ئاواکردنی ئەو دەزگا تایبەتی و سەرەکییەیە کە وەڵامی داخوازی کۆمەڵایەتی و قۆناخی مێژوویی دەداتەوە. تێکۆشانێکی هەمە لایەنی هزری، ڕۆحی و چینایەتی بناخەکەی پێکدێنێ.

لە ئامراز و تەکنیکی سەربازی زیاتر، بە بنەماگرتنی لێژیۆنی (سەربازی مووچەداری) ناوەندی و هەرێمی بۆ ڕێکخستنی سوپا لەلایەن ڕۆما زۆر گرنگە. سەربازی پێشەیەکی هەمیشەیی و ڕاستەڤینەیە. ئەم تایبەتمەندێتیەی کاریگەرییەکەی تا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان هاتووە. پایەدارتر بوونی دەزگای سەربازی بەرامبەر بە تەواوی هێزە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، لە نزیکەوە گرێدراوی پێکهاتەی هزری و ڕۆحی و داب و نەریتی دەزگاکانی ئەم بوارەی ڕۆمایە. بە واتایەك هەر سەرباز و فەرماندەیەك بخوازێ بەرزبێتەوە و هەوڵبدات گرانی خۆی لەسەر سیاسەتدا دیاری بکات لە ڕاستیدا درێژە بە داب و نەریتی ڕۆما دەدات.

لە کاتێکدا سەرجۆنی ئەکەدی یەکەمین نموونەی پێکدێنێ، دواترین نموونەی بە شان و شەوکەت، ناپلیۆن بوناپارت نوێنەرایەتی دەکات. بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بواری سەربازی وەکو مەیلێکی وزەی شاراوە کاریگەرییەکەی بەسەر سیاسەتدا بەردەوام دەکات. بە تایبەتیش لە قۆناخە قەیراناوییەکاندا ڕۆڵی بە کاریگەر و دیاریکراو دەگرێتە ئەستۆ. ئەمجۆرە مەیلە سیاسییانە بە شێوەیەکی گشتی بە "**سیزاریزم**" یاخود "**بۆناپارتیزم**" ناوزەد دەکرێت.

٥ ـ لە دیاریکردنی ستاتۆی چینەکانی کۆمەڵگا ڕۆڵ و دەسکەوتی ڕۆما گرنگە. بە تایبەتیش لەخۆوەگرتنی هەموو چینەکان لە چوارچێوەی یاسا و ڕۆڵ پێدانیان، ڕوونکردنەوە و یەکلاکردنەوەی پەیوەندی نێوان هاووڵاتییەتی و چینایەتی و دەربازکردنی بە نێو ڕێکخستنێکی ورد تا دەگاتە بوارەکانی ماف و ئەرکەکان و لایەنە تایبەتەکانیەتی. تایبەتمەندێتیەکی مسۆگەر و فەرمی بە زاراوەی چینایەتی بەخشیوە. تەنانەت تاکو دوا قۆناخەکانی ئیمپراتۆرییەت شوێنگەی هەر پیشە و چینێك لەمیانەی ڕێکخستنی یاسایی وردەوە گرێدراوە. لەگەڵ باسکردنی مافەکانی هاووڵاتییەتی، بەڵام کاتێك دانی بە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ نا و مۆری فەرمی لێدا، زەحمەت بوو باسی ئەم مافانا بکرێت. زمانی لاتینی بایەخدار دەبێت و لە بواری باڵادەستیدا دەردەکەوێتە پێش و زمانی یۆنانی لە پلە و ئاستی دووەم بەجێدێڵێ. لە بوارەکانی پەروەردە و تەندروستیدا پێشکەوتن و تایبەتبوونێکی ئەوتۆی نابینرێت. لەگەڵ ئەوەی لە بوارەکانی هزری فەلسەفی و هزری سیاسی و هونەری خیتابەت پێشکەوتنێکی بەدیهێناوە، بە شێوەیەکی سەرەکی گرێدراوە بە فەیلەسوفە یۆنانییەکان زیاتر مەیلی بە دەزگاکردنی هزری **ستۆوا** STOUA و **ئەبیقۆریا** پێشکەوتووە و کاریگەری خۆی کردووە. بەڵام کاتێك لەگەڵ تایبەتمەندییەکی بوون بە ڕەوت و خولڤێنەری فەیلەسوفە یۆنانییەکان بەراوردیان بکەین، ئەوا دەبینین ئەوانەی ڕۆما تا دوارادە دووری خولڤاندن ماون. ڕاستتر بڵێین کاتێك یۆنان لەم لایەنەوە ڕۆڵی خۆی بینی، ڕۆڵی خوێندکاری بۆ ڕۆما مایەوە. کولتووری هێلین ڤورسایی و کاریگەری خۆی دەپارێزێ و وەکو سەرچاوەیەکی خۆراکی سیستەم ڕۆڵی خۆی دەبینێ. لە تەنیشت باڵابوونی سیاسی و سەربازی ڕۆما ئەوا لەمیانەی باڵابوونی هزر و کولتووری هێلینیزم بە درێژایی مێژووی ئیمپراتۆرییەت لە ناوەوە پێویستی هاوسەنگی ڕێککەوتنی پێشخستووە و پراکتیزەی کردووە. هەربۆیە بە سیستەمی یۆنان ـ ڕۆما ناو دەبرێت و ئەمەش پێناسەیەکی واقیعیترە. لە نێوان هەردوو هێزی شارستانییەتدا شێوەی لە ژمار نەهاتووی پەیوەندی و دەزگا و هزر ڕۆڵی هاوبەش دەبینن؛ سیستەم پێشدەخات، بە گوێرەی شوێنگە و تواناکەیان دەسکەوتیان بە سەریاندا دابەش دەکات، ناوەناوەش پاکتاویان دەکات.

ئەم دوو سیستەمە سەرەکییە، هەروەکو بڵێی لەسەر بنەمای دابەشکردنی ڕۆڵ بەسەر یەکتردا شێوەدەگرن و زیاتر بەخێوکردنی یەکدی بە بنەمادەگرن.

٦ ـ بواری ئابووری بە شێوەیەکی قووڵ و بەرفراوان مەزنبووە. بەشێکی گرنگی ئەورووپای کردۆتە خاوەنی شێوازێکی ئابووری کۆیلەداری و بەمجۆرە بەرەو شارستانییەتی بردوون. بە شێوەیەکی گونجاو ئاسنی لە کشتوکاڵدا بەکارهێناوە. کشتوکاڵ وەکو پیشەی سەرەکی ڕەسەنەکانە و باشترین بواری چالاکی ئابوورییە. سیستەمی کێڵگەی **Letifundie** پەیڕەو دەکرێت، جۆگەلە و پشتێنەکانی ئاودێری پەرەیسەندووە. بازرگانی و پیشەکاری بە پلەی دووەم دێن و بە کارێکی ڕەسەن دانانرێن. بەهایەکی بەرزی نەبوو، جێگای داخوازی نەبوو. سیستەمێکی زۆر پێشکەوتووی ڕێگا لەئارادایە. هەروەکو لە گوتەی "**هەموو ڕێگایەك دەچێتە ڕۆما**" دیارە ڕێگای گواستنەوە ڕۆڵێکی مەزنی لەپێشکەوتنی بازرگانیدا بینیوە. دەریای سپی وەکو دەریایەکی ڕۆما گرنگییەکەی لە ئەنجامدانی بازرگانیدا پێشکەوتووە و ڕۆڵی خۆی بەردەوامکردووە. کەشتیوانی پیشەیەکی پێشکەوتووە. لە بواری ئابووریدا دەسکەوتی ڕۆما بۆ شارستانییەت زۆر سنووردارە. لە بەدەزگاکردن و ڕێکخستنی ئەوەی پێشتر ئاواکراوە پەریسەندووە. وەکو ئامرازێکی ئابووری سیستەمی کشتوکاڵی چینی کۆیلەی گەیاندۆتە ئاستێکی مەزنی بەرفراوانی. ڕەنجی کۆیلە گەیشتۆتە لوتکە. بۆ یەکەمین جار لە شارەکاندا چینێکی کۆمەڵایەتی بەمجۆرە پێکهاتووە کە لە چینی پرۆلیتاریا دەچێ. لە ڕاستیدا هەردوو شاری ئەتینا و ڕۆما شێوەی سەرەتایی ئەو شارە هاوچەرخانەن کە لەسەر بنەمای سیستەمی سەرمایەداری پێشکەوتووە. بە دەزگابوونی بازار، شانۆ، ئارانا، ئەکادیمیا، پەرستگا و ئەنجوومەن هەمووی بە گوێرەی شێواز و سیستەمی سۆمەری و میسرییەکان پێشکەوتووە. ئەم شارانەی کە لەمیانەی بیناسازییەکی دروست و پتەو ئاواکراون، تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان پاشماوەکانیان کاریگەرییەکی سیحراویان هەیە. هەروەکو چۆن پێشتر دەوڵەتی شار دەزگای سەرەکی سۆمەریەکان بوو، ئەوا شاریش سیستەمێکی جێگیربوونی بە دەزگابوونی تایبەت بە ڕۆما و یۆنانییەکانە. یەکەمین نموونەکانی سۆمەر و میسر زیاتر لە دەوروبەری پەرستگا و کۆشکی پادشا و لەسەر بنەمای دابەشکردنێکی سستی کار ڕۆڵی بڕیارگا و ناوەندەکانی بەڕێوەبەرایەتی پەرستنی بینیوە. ئەم ناوەندانەی کە بە پێی پێویست کۆیلە و پیشەکاریشی لە خۆوە گرتووە، زۆر بە دەگمەنی بینراوە کە ژمارەیان دەیان هەزار کەس دەربازبکات. بێگومان ئەم ڕەوشە پەیوەندی بە پێشنەکەوتن و سەربەخۆنەبوونی چینی ناوینەوە هەیە. بە شێوەیەی سەرەکی شار وەکو سیستەمێکی جێگیری بازرگانی و پیشەکاران پێشدەکەوێت.

شار لەماوەی نێوان ٣٠٠٠ تا ٢٠٠٠ پ.ز سەرهەڵدەدات. لەسالآنی ٢٠٠٠ تا ١٠٠٠ پ.ز بەربڵاو دەبێت، شێوازی شاری یۆنان ـ ڕۆما لەم قۆناخەیە، لە ساڵانی دوای ١٠٠٠ پ.ز قۆناخی مەزن بوون و بە دەزگابوون بایەخدار دەبێت. بە بایەختر بوونی شار لە گوند کە سیستەمی کشتوکاڵی تێیدا جێگیرە، لە قۆناخی یۆنان ـ ڕۆما دێتەئاراوە. تاوەکو ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز لەمیانەی سیستەمی گوند و گروپ و سیستەمێکی شاری بەمجۆرەدا دەژی کە چەند دوورگەیەك پێکدێنێ. قۆناخی پەیدابوون و باڵابوونی شارەکان لە ساڵانی ٥٠٠ پ.ز دەستپێدەکات و لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا بە باڵابوونێکی بێ هاوتا گەیشتووە. هەرچەندە ناوی دووەمی شارستانییەت مەدەنییەت بێت (بە عەرەبی واتای سیستەمی شارە)، بەڵام بەهۆی ئەو کێشانەی ڕێگای لەپێش

کردۆتەوە شار و شارۆچکە سیستەمی ئەو ژیانەن کە تا دوارادە هەرەشەیان لە شارستانییەت کردووە، بەڵام دیسان چاوگ و سەرچاوەی سەرەکی کۆمەڵگایە. بە ئەندازەی ئەوەی ناو و سەمبۆلی شارستانییەتە، لەهەمانکاتدا ئەو سەرچاوەیە کە بناخەکەی رزاندووە. لەمە بەولاوە کە ناوچەیەکی مەزنی نیشتەجێبوونە کێشەیەکی کۆمەڵایەتییە کە پێویست دەکات قووڵاییەکەی هەڵسەنگێنرێت. شیمانەیەکی مەزن ئەوەیە؛ بووە بە سەرچاوەیەکی بەهێزی نەخۆشی. تەنیا ژینگە پیس ناکات، پێویستە تەواوی شێوەکانی ژیانی کە پێچەوانەی رێرەوی سروشتین گرێدراو بە ئاواکردنی شار تاوتوێ بکرێت. لەو هەڵسەنگاندنانەی ئەنجام دراوە بە شێوەیەکی گشتی شار وەکو پێوانەی پێشکەوتن و پەرەسەندن نیشاندراوە. لە بەشی پەیوەندیداردا بە شێوەیەکی بەرفراوان دەیگرینە دەست، لە کۆتاییدا ئاماژە بەوە دەکەم لەگەڵ شارستانییەتدا گرنگی ئەنجامدانی شیکردنەوە سەبارەت بە شار دەردەکەوێتە پێش.

٧ ـ لە گۆڕەپانی هونەر و زانستەوە بەشداربوون و دەسکەوتی رۆما بۆ شارستانییەت لە چەند بوارێکەوە سنووردارە. بە تایبەتی لە بواری بیناسازیدا، دوای میسرییەکان گەورەترین پێشکەوتنیان بە دیهێناوە. دەتوانرێ باس لە هونەرێکی بیناسازی و ئەندازیاری بکرێت. گەرچی راستتر بڵێین لەو بوارەدا شێوازی میسر و یۆنان بە بنەماگیراوە و بە ئاستێکی شکۆدار گەیشتوو. لە ئەنجامدانی ئەوە قەرزداری باڵادەستی بێ سنووری کۆیلەدارییە. بەبێ هەبوونی رەنجی کۆیلەکان نەدەشیا ئەهرامەکانی میسر و ئەو شوێنە مێژووییانەی یۆنان ـ رۆما ئاوابکرێن کە بەهای بیناسازی یەکجار مەزنە. لەمیانەی ئەو شاکارە بیناسازییانەدا دەبینرێ کە فشار و ئەشکەنجەیەکی بێ رەحمانە لەلایەن توێژێکەوە کراوەتە سەر رەگەزی مرۆڤ.

شانۆگەری، ئارانا، ئاگۆرا، پەرستگا و کۆشکی بەڕێوەبەرە پایەدارەکان و تەلارەکانی دیکە وەکو بەڵگەی زیندووی ئەم مێژووە، کاریگەریان بەسەر هەست و سۆزەکانمان و شکۆداریان بۆ هونەری بیناسازی ئەم قۆناخە قەرزدارین. زۆر ئاستەمە هەر شتێك وەکو پاشماوەی قۆناخی کۆیلایەتی مابێتەوە و هێندەی شاکارە بیناسازییەکان کاریگەر بێت. باوەڕەدەکەم بە ئەندازەی ئەوەی رەنجی کۆیلەی بێ سنوور لە ژێر ئەم راستینە سیحراوییە هەیە، بەڵام بەکارهێنانیان بە شێوەیەکی بێ رەحمانە رۆڵێکی دیاریکراوی هەیە، شێوازی بەکارهێنانی رەنجەکە شکۆمەندە و سەرسامی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. دەشێ هەمان مەزنایەتی لە پێکهاتەی پرد، پشتێنەی جۆگەلەی ئاو، گۆڕستان، قەڵا و دیوارەکاندا ببینرێت. شارستانییەتی رۆما لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە تەواوی ئەو نموونانەی بیناسازی ئەنجامداوە کە لە قۆناخی کۆیلایەتیدا هەبوون و گەیشتووە بە سەنتێزێکی بەهێز، بیناسازی تایبەت بە خۆی خولقاندووە، بە راستی گەیشتۆتە لوتکە. مافی کۆیلەداری (مافی کۆیلەداری نابێت، بەڵام بە گوێرەی زمانی ئەوان) جێی هەبێت، رۆما پێداویستییەکانی جێبەجێکردووە و وەڵامیداوەتەوە. هەروەکو لەهەر بە دەزگابوونێکدا بەمجۆرەیە، ئەوا ئەم بابەتە لەلایەنی بیناسازیشدا بە شێوەیەکی سەرنج راکێش گوزارشتی لێدەکرێت.

لە پەیکەرسازیدا وەکو بەردەوامی یۆنانییەکانن. ناتوانرێ باس لەگەوهەرێکی جیاوازتر بکرێ. لە بواری مۆسیقا بە تایبەتیش سرووده سەربازییەکانی، سەرکەوتن تایبەتکراون. دەشێ باس لە مۆدێلێکی جل و بەرگی تایبەت بە رۆما بکرێت. رەسەنایەتی رۆما خۆی لە شێوەی جل و بەرگیشدا نیشان دەدات؛ بەڵام شتێکی روون و ئاشکرایە کە لە تەواوی ئەم بوارانەدا لە رۆژهەڵاتەوە پێیگەیشتووە. لە هونەری ئەدەبیات کاریگەری هێلینیزم دیار و بەرچاوە. ڤیرگیلیۆس تا رادەیەك کاریگەری ئیلیادەی هۆمیرۆسی لەسەربووە و داستانی ئاواکردنی رۆما "**ئاینیاس**"ی لە یادی ئاگۆستۆسی مەزندا نووسیوە. بەڵام دیسان کلاسیکێکی ئەدەبی بەهادارە. هونەری شانۆ پێشکەوتووە. خیتابەت بایەخێکی زیادی پەیداکردووە و بە دەزگاکراوە. لەو باوەڕەدام کە سەرنج راکێشی شێوازی گوزارشت کردنی بەهێزی زمانی ئیتالی لە رۆژگاری ئەمرۆماندا پەیوەندی خۆی بە هێزی خیتابەتی ئەو قۆناخەوە هەیە. بێگومان ئیرادەی هێزێك لە پشت ئەم خیتابەتەوە هەیە کە بەسەر جیهاندا دەسەڵاتدارە. لە کاتێکدا بەهێزترین دەسەڵاتداران بە زمانێکی بەهێز و رەوانبێژی دەگەن؛ ئەوەی بەشی کۆیلەکانە، زمانی نەفرەت لێکراوی"**EZOP**" **ئەزۆپە**، کە کەس لێی تێناگات. لەکاتێکدا هێز و ئازادی، پەیوەندییەکی چڕی بە باڵادەستی زمان و رەوانبێژی و جوانی زمانی قسەکردنەوە هەیە، بەردەوام خیتابەتی باڵادەستەکانی رۆمام دێتەوە یاد. عەرەب، ئیسپانییەکان و ئێرانییەکان لەسەرووی ئەم قەومانە دێن کە بە پلەی دووەم ئەم هونەرەیان پێشخستووە. دەبێ ڤیرگیلیۆس هەم وەکو کەسایەتی هەم لە بواری زمان، وەکو گوزارشتی مەزنی ئەم رەسەنایەتییە ببینرێ. لەگەڵ ئەوەی لە بواری زانستەوە دۆزینەوە و داهێنانێکی ئەوتۆی شارستانییەتی رۆما لە ئارادانییە، ئەوا هەروەکو دەبینرێ ئەوانەی کە هەبوون لە بەرزترین ئاستدا پراکتیزەکراون.

ئەو ئەنجامە سەرەکییەی لەو هەڵسەنگاندنەوە بە دەستدێت کە لە ئاستی پێناسەکردندا بوون ئەوەیە، جێگا و شوێنی رۆمای کلاسیك لە مێژووی شارستانییەتی کۆیلەداری، لوتکەی پێش داڕووخانە. رۆما زۆر بەباشی لێکۆڵینەوە سەبارەت بە تەواوی بەها گەوهەرییەکانی نێو سیستەمی کۆیلەداری دەکات و دەیکات بە دەزگابوونێکی دەوڵەت. زۆر باش ئەمەی زانیوە: لە کاتێکدا کۆمەڵەکانی سەردەمی نئۆلیتیك زۆر بە زەحمەتی زگی خۆیان تێردەکرد، ئەمرۆ بەهاکانی شارستانییەت لە تەنیشتیان چەکەرە دەکات کە پشت بە میراسی ٣٠٠٠ ساڵی سیستەمی کۆیلەداری دەبەستێ، بۆ کۆمەڵە ئەتنیکییە لاتینیەکان ئەمە بە واتای خەونی"**چەرخی زێڕین**" دێت. گەلێك کولتوور و هێزی ورد و درشتی شارستانییەت لە سۆمەرەوە تا میسر، لە پارسەکانەوە تاوەکو یۆنان لە ژێر ناوی شارستانییەتی رۆما بەرەو سەنتێزێك دەچن، بەرەو رووی بەرزترین ئاستی تایبەتبوون و بە دەزگابوون دەبێتەوە. لەهەمانکاتدا هەمان شانسی مەزنی رۆمایە.

دەرفەتی بەمجۆرە لە مێژوودا دەرەخسێ، ئەگەر بزانرێ هەڵسەنگێنرێ و بقۆسترێتەوە، رێگا لەبەردەم پێشکەوتنی وەها دەکاتەوە کە خۆشیان ببن بە مێژوویەك. شانسی سۆمەرییەکان شۆڕشی گوندبوو کە لە کەنارەکانی فورات ـ دیجلە پێشکەوت. رۆڵ و دەسکەوتیان خولقاندنی شۆڕشی شار و سیستەمی شارستانییەتە. هەمان شانس لە دۆڵی نیل کەوتە دەست میسرییەکانیش. شارستانییەتی چین لە دۆڵەکانی رووباری زەرد، شارستانییەتی هیندی لە دۆڵەکانی ئیندۆس و پەنجاب ئەڵقە مەزنەکانی دیکەی زنجیرەی شانسن. لە راستیدا ئەگەر جێگای هەبێت و باس لەوە بکرێت! کە لە ژێر ئەم پێشکەوتنەی کە وەکو شانس هاتووە، رەنجی کامە مرۆڤی مەزن و چەندین قارەمانی نەناسراو هەیە؟ تەنیا ئەوە بزانرێ! کە چۆن لەسەر بنەمای ئەم رەنجە میتۆلۆژیای شکۆدار و بەهەشتەکانی سەر زەوی ئاواکران؟ ئەگەر مافەکەی پێبدرێت! بە ئەندازەی ئاواکردنی جیهانە مەزنەکەی ئومێد (بەهەشت)، ئەو ئێش و ئازارانەش باسبکرێت کە زاراوەی دۆزەخی هێنایە ئاراوە، لەوانەیە تۆزێك دادوەری جێگای خۆی بدۆزێتەوە و گوێڕایەڵی راستینە راستەقینەکە بکرێت.

یۆنانیەکان بەر لە هەموو قەومەکانی رۆژئاوا هەستیان بە شانسی شارستانییەت کرد کە لە چوارلاوە دەستیان کەوتبوو. بە حەزێکی مەزنەوە ئەو خۆراکەیان خوارد کە لە رۆژهەڵاتەوە هاتبوو، هەرسیانکرد و لە قۆناخێکی دواتردا وەکو هێزێکی شارستانییەت هاتنە دونیاوە. دەشێ ئەمە لە گفتوگۆی نێوان خوداوەندەکان ببینرێ کە لە دەوروبەری زیۆسی سەرۆکی خوداوەندەکان پێشدەخرێ. ئەوەی لەو ئەفسانەیەدا دەخوازن باسی بکەن چیرۆکی جیابوونەوەی رەسەنەکانە لە گروپە ئەتنیکییەکانی رۆما، بوونیانە بە چینی باڵادەست و باسی چۆنێتی پەسندکردن و هەرسکردنی شارستانییەتی رۆژهەڵات دەکات. ئەم چیرۆکە بە زمانێکی شیعرئامێزانە گوتراوە و بووە بە داستان، بووە بە ئیلیادە و ئۆدێسە. بووە بە زانستی خوداناسی "**تیۆلۆژیا**". لەسەر ئەم بنەمایە هێزی مێشکیان سەپاندووە و خستوویانەتە نێو جموجۆڵ و گەیشتوونەتە فەلسەفە.

یۆنانیەکان زۆر بە باشی رۆڵی لانکەی تایبەتی شارستانییەتی رۆژئاوایان بینیوە. منداڵەکەیان بە شێوەیەکی دروست گەورەکردووە. هەر لە کام لایەنەوە تەماشابکرێ دەبینری کە ئەو مارەییەی لەگەڵ رۆژهەڵات بڕێنراوە، تا دوایی بەرهەمداربووە، کاتێك منداڵەکەشیان گەیشتە پایە و ئاستی ئەسکەندەر، جارێکی دیکە لەخۆڕا لە بابل لەگەڵ سمیرئەمیس مارەیی نەبڕاندۆتەوە. هەم بە شێوەیەکی سەمبۆلی و هەم بە شێوەیەکی واقعی مارەیی "**ژنهێنانی**" ئەسکەندەر سەمیرئەمیس مارەیی و بە یەکگەیشتنی شارستانییەتە و ئەو منداڵەی لە ئەنجامی بە یەکگەیشتنیان هاتۆتە دونیاوە بە "**هێلینیزم**" ناوبراوە. ئەمە یەکەم تێکەڵاوبوونی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوایە. دەگێڕدرێتەوە و دەگوترێ ئەسکەندەر ژنەکانی میزۆپۆتامیای لە ٢٠٠٠٠ سەربازی خۆی مارە کردووە. بەمجۆرە کولتوورەکان تێکەڵ بە یەکتر دەبن و سەنتێزی خۆی دەخولقێنێ. زۆرباش دەزانرێ لەمیانەی مارەییەکی میتۆلۆژی بەمجۆرە، کاتێك خوداوەندی فێڵبازی سۆمەر، واتە نوێنەری سەمبۆلی چینە رەسەنەکانی تازە هەڵکشاوەکان "**ئەنکی**" کاتێك خوداوەندە ژنی چیا **نین هورساك** مارە دەکات و دەیهێنێ، ئەو منداڵەی دێتە دونیاوە

شارستانییەتی سۆمەرە. زۆرباش دەزانین کاتێك لە کەسایەتی ئینانا شاژنی شاخ دەڵێ **"(ما) پیرۆزەکانی من بدەوە"** لێرەدا نکۆڵی لەوە دەکرێت کە ژن خوڵقێنەری شۆڕشی کشتوکاڵی نیئۆلیتیك بێت و ئەویش داوای بەها و ئامرازەکانی شارستانییەت دەکاتەوە کە خۆی خوڵقاندوویەتی. هەروەکو چۆن کاتێك بە شێوەیەکی راست و دروست زمانی میتۆلۆژیا (ئەفسانە) شیبکەینەوە دەتوانین بە شێوەیەکی راست مێژوو بنووسین، ئەوا لەمیانەی هەستکردن بە گەوهەری سیحراوی و شیعرئامێزانەکەی دەتوانین لە ناویدا فێری ئێش و بەختەوەرییەکەشی بین. کاتێك ئەو پەردە رەشەی سەر مێژوومان لادا کە بە درێژایی هەزاران ساڵ بەسەریدا کێشراوە، ئەو کاتە سەوزاییەکەی دەبینین، بەڵێ ئەو کاتە دەیبینین کە دارێکی قایم و بە رەگ و ریشەیە و میوەکانی لە مێشکماندا بەرهەم دێنێ.

بەڵێ کاتێك ئەم شانسە کەوتە دەستی رۆما داری شارستانییەت لە قۆناخی هەرە بەرهەمداری خۆیدا بوو، هەروەکو بڵێی چاوەڕوانی لێکردنەوەبوو. رۆما بە هەموو توانای خۆی بە شێوەیەك بە دارەکەیدا کشا و هەژاندی، دارەکەمان لە ناوقەدی خۆیدا قەڵشی و کەوت و جارێکی دیکە نەهاتەوە سەرخۆ.

بە ئەندازەی سەرکەوتنی مەزنی شارستانییەتی رۆما، نابێ بەرامبەر بەو هۆکار و راستینەیە واقی وڕما و بمێنین کە بناخەی ئەم کەوتنە پێکدێنێ و بەم شێوەیە چاوەڕوانی نەدەکرا. هەروەکو لە نێو سروشتدا روودەدات، بوونەوەرێکی نێو کۆمەڵگاش وەکو پێویستییەکی یاسایی دیالەکتیکی بۆ ئەوەی بتوانێ بە تەواوی خۆی بژێنێ تەواوی وزە شاراوەکانی خۆی بەکاردێنێ. بە گوێرەی ئەم پرەنسیپەی وەکو یەکێتی دژەکان فۆرمیلکراوە تاوەکو لایەنە ناکۆکەکان لەمیانەی ململانێدا بە سەنتێزێکی باڵاتر ئەنجامگیردەبن، ئەم قۆناخە بەردەوام دەکات. ئەوەی رۆما دەرکی پێکرد و چارەسەری کرد، وەرچەرخان و لەخۆوە گرتنی هەر کۆمەڵگایەکی گرنگ کە بە گوێرەی سیستەم پاشکەوتوو بوو. ئەو پەیوەندییەی باڵادەستی سیستەمی کۆیلەداری لەمیانەی لایەنە کۆمەڵایەتییە پاشکەوتووەکانی ئاوایکردووە، ئەم لایەنە پاشڤەڕۆیانە لە ناو  سیستەم پاکتاودەکرا، لە رێگای قالبی رۆحی و هزری نوێ بە دەزگادەکرا و لە ژێر بچمێکی دیکە بەردەوامیان دەکرد. لەم بوارەدا دەتوانرێ رۆما بە داینەمۆیەکی رێکوپێکی هاڕین ببینرێت. تەواوی ئەو کۆمەڵە و گروپانەی دەستی پێیان گەیشتووە بەم داینەمۆیەدا دەربازی کردوون و وەکو خۆی لێکردوون. ئەمەش هەروەکو دیاردەی جیهانگیری رۆژگاری ئەمرۆمانە کە ئەمریکا سەرکێشی دەکات.

هەروەکو دەزانرێ هیچ شتێك لە سروشتدا لە ناوناچێ. ئەوەی روودەدات گۆڕانکاری و وەرچەرخانە. هەڵوێستی میتافیزیکییانەیان ئەم قۆناخە بە شتێکی مەحاڵ دەبینێ، یاخود وەکو لە ناوچوون تێدەگات و هەڵیدەسەنگێنێت. پێکهاتەی ئەم لۆژیکە تاوەکو دوایی مەترسیدارە. کاتێك شارستانییەتەکان هەڵدەسەنگێنین پێویست دەکات بەردەوام ئەم یاسایەی گۆڕانکاری و وەرچەرخان رەچاوبکەین. مەیلی گۆڕان و وەرچەرخانی رۆما تەنیا بەسەر پێکهاتە نیئۆلیتیکەکانی ئەوروپا پەیڕەو ناکرێت کە تازە خراونەتە ناو سیستەمەوە. ئەم مەیلەی خۆی بەسەر ئەو پێکهاتە کۆنانەشدا پەیڕەو دەکات کە پێشتر لە چوارچێوەی شارستانییەتدا بوون و هەموو توانستەکانی خۆیان بەکار نەهێنا. بەرفراوانی و مەزنایەتییەکەی لەم بارەوەیە. شارستانییەتەکانی سۆمەر، میسر، هیتیت، یۆنان و چەندین شارستانییەتی ئاستی نزمتر، لە ناوچەکانی خۆیان سەریانهەڵدا و پێشکەوتن. ئەگەر بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت لەمیانەی شەپۆلەکانی پەلهاوێشتنی لە ناوچەکانی دیکە بڵاوبوونەوە. دەسکەوتەکانیان هەم لە بواری گۆڕەپاندا تەسك و سنووردارە، هەم لە بواری قووڵایی و بەردەوامی کات، بە سەردەمی لە دایکبوون و پێشکەوتن سنووردارن. هێشتا کات بۆ رووخان زووە و لە ساڵانی دیکەی تەمەنیان پێشکەوتنی نوێ بە دیبێنن.

بێگومان لە یەکەمین شارەکانی شارستانییەتەوە تاوەکو تێکەڵاوترین یەکینەکانی لە هەموویاندا لە ئاستی بانگەشە بە گەردوونیبوون لە ئارادایە. بەڵام رۆڵ و دەسکەوتەکانیان لە بواری پراکتیزەکردنی ئەم بانگەشەیە زۆر سنووردارە. سەرجۆن دەتوانێ خۆی بە خودای تەواوی گەردوون دابنێت. بەڵام ئەوەی لە بواری واقعی و پراکتیکیدا ئەنجامیانداوە چەند هەنگاوێکە. بابل و ئاشوور هەنگاوی مەزنتریان هاوێشت، بەڵام دیسان نەیانتوانی بەسەر تەواوی جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناویندا زاڵبن. لە بواری ناوەڕۆکیشدا هیچ کاتێك تایبەتمەندێتیەکانی سۆمەریان تێنەپەڕاند. زۆربەی نیمچە دەوڵەتەکانی دیکەش لە خاوەنداری کردنێکی سیستەمی سێ میرنشینی بەولاوە، هیچ رۆڵێکی دیکەیان نەگێرا. سەنتێزی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوایی ئەسکەندەر ئەزموونێکی گرنگی جیهانییە. رۆڵ و دەسکەوتەکەی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن جێگیر و هەمیشەیی بووە. گەرچی سیستەمی شارستانییەتی رۆما لە کاتێکدا لەسەر بنەمای هەرس کردنی هەنگاوەکانی شارستانییەکانی پێش خۆی هەڵکشا، وەلێ لە رێگای لەخۆوە گرتنی خاکی دەست لێنەدراوی ئەوروپا، لە سەردەمی خۆیدا توانیویەتی ببێ بە مۆدێلی ئیمپراتۆرییەتێکی جیهانی. هەروەکو چۆن لە رۆژگاری ئەمرۆماندا لە هەموو شوێنێك باس لە کاریگەرییەکانی کولتووری ژیانی ئەمریکا دەکرێت،  لەسەردەمی رۆما بە درێژایی سەدان ساڵ گەیشتن بەم کاریگەرییە و نوێنەرایەتیکردنی، ببوو بە فێربوون و خورەوشتێك. تەواوی هێزە دەسەڵاتدارەکانی سیستەمی کۆیلەداری ژیانی بە گوێرەی شێوازی رۆمایان وەکو پێویستییەکی شارستانییەت و رەسەنایەتی دەبینێ. جگە لە چین و هیند کە وەکو دوو دوورگەی داخراو لەناو خۆیاندا مانەوە و تاکو ئێستاش بەمجۆرەن، ئەوا پاکس رۆمانا واتا سیستەمی ئاشتی رۆما، بووە سیستەمێکی جیهانی. بە درێژایی هەزار ساڵی تەمەنی، لە دەوروبەری لۆژیکی خۆی بۆ سیستەمێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەو بەهایانەی زەمینەکەی بینیوە، چەندەی توانیبێتی بە دەزگابوون ئاوابکات، ئاوایکردووە، چەندە ڤەبوون (فەتحکردن) پێویست بووبێ، هێندەی ئەنجامداوە و بە گوێرەی گەوهەرەکەی چەندە توانای بەردەوامبوونی هەبووبێ، بەردەوامبووە، ئەمەش راستینەیەکی بەمجۆرەی مێژووە کە هاوتاکەی نەبینراوە.

بەڵام ناوی ئەم راستینەیە وەکو رۆما ماوەتەوە. بە تایبەتی لە قۆناخەکانی دوای خۆیدا کاتێك لەمیانەی ئەو ئیمپراتۆرانەی لە نێو گروپە ئەتنیکییەکان پێگەیشتبوون، باڵا بوونی ناوچەی جیاجیا دەرکەوتەپێش و لە قۆناخێکدا کە مەزنەدەی بە هێزی یەکێتییەکەی دەکرا، لە رێگای ئەزموونەکانی پارچەبوونی ناوەوە لە ئاستی هەرە ژووردا هێماکانی پێهەڵگرتنی ناکۆکییەکانی ناوەوەی نیشاندا. بێگومان سەرەکیترین هۆکاری شکۆمەندی رۆما و درێژخایاندنی بۆ ئەو هێزەی دەگەڕێتەوە کە لە بەرزترین ئاستدا دەرهەق بە هونەری ژیان نیشانیداوە. شۆڤێنیست نییە، کۆسمۆپۆلۆتیکە. هەر هێزێکی بخوازن لە ئاستی چینەکانی سەرەوە و رەسەنەکان بژین ئەمە لە سیستەمی رۆمادا دەبینن و پێیەوە پەیوەستدار دەبن، بەمجۆرە رۆڵ لە بەهێز بوون و درێژبوونی تەمەنیدا دەبینن. هەروەکو مەزەندە دەکرێ بە پێچەوانەوە زەبر، رۆڵێکی دیاریکراوی نییە. ئاشووری و پارسەکانیش زەبریان بە شێوەیەکی سیستەماتیك پەیڕەوکرد. بەڵام هەمان بەردەوامی و کاریگەربوونیان نیشان نەداوە؛ نەیانتوانیوە رەوشی ناوچەیی دەرباز بکەن. خانەدانەکان کۆڵەکەی پشتی بە

دەزگابوونیان پێکهێناوە و هەرلەسەرەتاوە لەم بوارەوە دووچاری تەنگەتاوبوون هاتوون. هەرچی دەزگاکانی رۆما بە گوێرەی جیاوازی خانەدان، ئایین و ئەتنیك نییە، بە گوێرەی رۆڵ و هێزەکەیەتی لە ناو سیستەمدا. ئەمانەش بە واتای دەزگایەکی بەمجۆرە دێت کە لەمیانەی ئاقڵمەندی، هەوڵی خوڵقێنەرانە و کارەکتەر و هێزەوە تێرخۆراك دەکرێت. ئەگەر بە گوێرەی پێویست وەڵامی داخوازی و مافەکانی و دەزگا و کەسایەتییەکان درایەوە، سیستەم بەهێز و تەمەن درێژدەبێت. کاتێك ئەم ناوەڕۆکەی خۆی لەدەستدا ئەوا هاوسەنگییەکەی نێوان دەزگاکان تێکدەچێت و پارچەدەبێت و دەکەوێتە نێو قۆناخی پەرتەوازەبوون.

وەکو دەرئەنجام، مەزنبوون و تەمەندرێژی شارستانییەتی رۆما؛ هاوچەرخێتی دەزگاکانی، گەوهەری کراوەی بۆ هەر پەرەسەندنێك، بە رادەی ئەوەی هەبوونە کۆمەڵایەتییەکانی پێشتری لەگەڵ خۆیدا ئاوێتە کردووە، ئەوا بوونی بە خاوەنی فەلسەفەیەکی تایبەت و گەیاندنی ئەم هزرو بە دەزگابوونە بە دەربڕینێکی یاسایی مسۆگەر و گرێدانی رۆڵبینین و هەڵکشان لە ناو سیستەمدا بە هێزی سەرسەختی شەڕ و هەوڵێکی لێهاتوانە، نهێنیە راستەقینەکانی پێکدێنێ. کاتێك تەماشای هۆکارەکانی هەڵوەشان و بەلاوەنانی سیستەمی رۆما دەکەین، ئەوا پێناسەکردنی رۆڵی ئیمپراتۆرییەتی پارس کە لەو پەڕی گۆشەی دیکەی سیستەمدایە و هەڵسەنگاندنێکی گشتی گەلێك ئەزموون لەگەڵ خۆیدا دێنێ.

## ٣ ـ دەرکەوتنی میدیا ـ پارس و جیابوونەوەی ڕێبازی

## ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا

کەوانەی بەرهەمدار (ناوەندی هیلالی زێڕین) کە زنجیرە چیاکانی (سیستەمی) زاگرۆس ـ تۆرۆس بە یەکتری دەگەن و ڕێگا لەپێش سەرهەڵدانی شارستانییەت کردەوە، ئەمجارە لە گواستنەوەی ناوەندی شارستانییەت بۆ دەرەوەی میزۆپۆتامیا ڕێنیشاندەری دەکات. لە قۆناخە یەك بە دوای یەکەکانی سۆمەر ـ بابل ـ ئاشوور ناوەندی شارستانییەت ناوچەی نێوان فورات ـ دیجلەیە. کاتێك قۆناخەکانی پێگەیشتن و بە دەزگابوونی شۆڕشی نئۆلیتیکی بخەینە سەر، ئەوا لە ساڵانی ٦٠٠٠ پ.ز تاوەکو ڕووخانی ئاشوور، کۆتایی ساڵانی ٦٠٠ پ.ز، ئەو بەهایانەی ئاراستەی شارستانییەتیان دیارکردووە لەم هەرێمە دەرکەوتوون.

لەخۆڕایی بە لانکەی لە دایك بوونی مرۆڤایەتی ناو نابرێت. دەتوانرێ مێژووی مرۆڤایەتی بۆ سێ قۆناخی مەزن جیابکرێتەوە. قۆناخی کشتوکاڵ ـ گوند (١٠٠٠٠ تا ٣٠٠٠ پ.ز)، قۆناخی شارستانییەتی شار (٣٠٠٠ تا ١٩٥٠ پ.ز)، هەروەها قۆناخی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان کە هەتا ئێستا ناوێکی دیاریکراوی لێنەنراوە. هەندێك بە سەردەمی ئەتۆم، ئەلەکترۆنیك، ئەنتەرنێت ناویدەبەن؛ هەندێکیش بە سەردەمی زانیاری ـ گەیاندن یاخود پۆست مۆدێرنیزم، قۆناخی دوای شارستانییەت ناوی دەبەن.

لەم دابەشکردنە گشتی و قەبەیەدا بەشی میزۆپۆتامیا، ڕۆڵی ڕێبەرایەتیکردنی خولڤاندنە کە هەزار ساڵی خایاندووە. تەوژمی مێژوو کە بە شێوەی ڕووبارێك دێتەخوار، بە ٥ ـ ٦ ناوچەدا تێپەڕ بووە. بەڵگەی زانستی هەیە کە گەنجینەی سەرەکی ئەو هزر و باوەڕی و داهێنانانەی ئاراستەی مێژوویان دیاریکردووە و توانستەکانی زانیاری لەم قۆناخە و لەم ناوچەیەدا پێکهاتووە، ئەمەش سەلمێنراوە.

ئەم ڕۆڵە مەزنەی کولتووری ناوچەکە گوزارشت لەو ڕەوشەی ڕۆژگاری ئەمڕۆش دەکات کە تەنانەت ناش ناسرێت. سیستەمێك چەندە ڕەگ و ڕیشەکەی بە قووڵاییدا بچێت و بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بکات، ئەوا بە شێوەیەکی گشتی ڕێگانادات لەسەر بنچینەی هەمان ڕەگ سیستەمێکی دژی خۆی پێکبێت و سیستەمی نوێ لەسەر ئەم خاکە ئاوا دەبێت کە دەستی لێنەدراوە. گەلێك بەڵگەی سەلمێنەری ئەم یاسایە لەمێژوودا هەیە. کاتێك شارستانییەتی یۆنان ـ ڕۆما ئاوابوو، جوگرافیا و کولتوور لە قۆناخی دەست لێنەدراوی (پاکیزەیی) دابوون. شارستانییەتی سەرمایەداری لە کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی و ناوەندی ئەوروپای ناوین پێکهات، کە تا ئەو کاتە زۆر بە کەمی دەستی شارستانییەتی پێگەیشتبوو. تەنانەت پۆست مۆدێرنیزمیش نەك لە ئەوروپا، بەڵکو لە جیهانی نوێ لە ئەمریکا پێشدەکەوێت. لە گەشە کردنی شارستانییەتدا یاسایەکی سەرەکی بەمجۆرە هەیە. بابەتێکی بایەخدار و شایستەی شیکردنەوەیەکی قووڵترە. کۆنترین ناوەندەکانی کەوانی بەپیت، سۆمەر و میسر؛ ئەمڕۆ ناوچەی هەرە بە ئێش و ئازارن و لەگەڵ ڕاستینە و ڕیشە مێژووییەکەیان ناکۆکن و لە نێو ئەم ناکۆکییانەدا خنکاون کە وەکو گرێکوێرەیان لێهاتووە. بە هیچ جۆرێك مێژووی هاوچەرخ لەگەڵ ڕیشە سەرەکییەکەی موتوربە نابێت. خولقێنەرانی مێژوو لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بوونەتە نەزۆکترین و لاوازترین کەس و لە کۆچبەری بەولاوە ئومێدێکی دیکەیان نییە و بوونەتە بەڵای سەری خۆیان. پێویستە بابەتێکی دیکەی سەرەکی شیکردنەوەی شارستانییەت ئەمە بێت.

خزانی ناوەندەکانی شارستانییەت بۆ دەرەوەی میزۆپۆتامیا بایەخی هەڵوێستێك زیاد دەکات کە بە شێوەیەکی ڕاست ئەو کێشانەی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان تاوتوێ بکات کە چارەسەرییەکی بە پەلە دەخوازێت. کێشەی ناوەند ـ کەنار ئیتر لە سەرتاسەری جیهان دەبێتە کێشەیەکی کرداری. ناتوانرێ مەسەلەی جیهانگیری و ڕکەبەرەکانی بکرێت بە کێشەیەکی ئابووری سادە. ئەگەر بێتو سیستەمی جیهانگیری، کە لە ئارادایە، لەسەر زەمینەی مێژوویی و کولتووری جێگیرنەکرێت، ئەوا هەروەکو چۆن لە هەمان چارەنووسی چاوەڕوان نەکراوی **"سۆسیالیزمی بونیادنراو"** ڕزگاری نابێت، هاوکات هەڵوێستی واقیعیش سەبارەت بە هۆکارە سەرەکییەکانی بێچارەیی پراکتیکی سۆسیالیزمی زانستیش بەدی ناهێنرێت کە پشت بە توانستێکی ٢٠٠ ساڵە دەبەستێ و ئەو ڕووکەشیەی لەم بوارەدا هەیە بەلاوە نانرێت. پەیوەندییەکانی شارستانییەتی سۆمەر لەگەڵ دەوروبەر لە ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز بەولاوە بەرهەمەکانی خۆی دەدات. میسر کە زیاتر لە سیستەمی بە کۆلۆنی کردن دەچێ، وەکو ئەنجامێکی لەباری جوگرافیاکەی دەوروبەری زوو ڕەگی خۆی داکوتا و لە ڕێگای خۆیدا بەرەو پێش هەنگاوی هاوێشت و شارستانییەتی هەراپا و موهانجادرۆی دۆڵەکانی ئیدۆس و پەنجاب لە ڕۆژهەڵات وشکبوون. هەروەکو دەبینرێ ئەمانە خاوەنی هێزێکی ئەوتۆ نەبوون کە بەهەمان خێرایی میسر پێشبکەون. هەڕەشەیەکی هەرە ڕاستەقینە بۆ ناوەندی شارستانییەتی سۆمەر و کۆلۆنییەکانی ڕۆژئاوا لە بیابانی عەرەبستان لەلایەن تیرە ئامۆریتەکان لەباکوور و ڕۆژهەڵاتیش لەلایەن هۆریتەکان کە بە واتای **"خەڵکی وڵاتی بەرزاییەکان"** دێت. هەروەکو دەزانرێ بەرامبەر بە تایبەتمەندێتی کشتوکاڵ و جووتیاری هۆریتەکان، ئامۆریتەکان لایەنی شوانکاری و کۆچبەرییان لەپێشبووە. لە کاتێکدا سۆمەریەکان بەرامبەر بە هەڕەشە و هێرشەکانی ئەم پیلانە سیستەمی پاراستنی شاریان پێشدەخست، لە لایەکی دیکەوە لە کارەکانی ژێرخانی ئابووریدا بەکارهێنانی هێزی کاری هەرزان و کۆیلەکانی وەکو سیاسەتێك پەسندکردبوو. هەروەها لەگەڵ پێشکەوتنی کۆلۆنیکردن، بازرگانییەکی چڕوپڕیش پێشکەوت. هەروەها ئەمەش دەزانرێ کە سەرەتا بازرگانی ڕۆڵێکی گرنگی لە پەیوەندییەکاندا بینی و دواتر لەگەڵ زیادبوونی پێداویستییەکان، بەکارهێنانی هێز و توند و تیژی لەگەڵ خۆیدا هێنا. لەگەڵ ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز هێرشی هێزەکانی دەوروبەر زیادی کرد. بەرامبەر بەمەش، بە تایبەتیش لەگەڵ سەرجۆنی ئەکەدی دەستپێکردنی سیاسەتێکی ئیمپریالیستییانەی سیستەماتیك جێگای باسە. بۆ یەکەم جار شارستانیەتێك بە واتای تاڵان و داگیرکردن بە شێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو سیاسەتێکی توندوتیژی سیستەمکراو، دەگاتە ئامرازێکی دەست لێبەرنەدراوی دەوڵەت. ئەم باڵابوونە تەکنیکیەی لەدەستی ئیمپریالیزمدا بوو، کاتێك کەوتە دەستی هێزە ڕکابەرەکانی، ئەوا قۆناخێکی نوێ لەمیانەی هێرش و دژە هێرش و خۆپاراستن دەستپێکرد. ئەوە مسۆگەرە کە چەکەکانی ئیمپریالیزم بەکاری دێنێ و ئاراستە کردنی دژ بەو بناخە مێژووییەی خۆی، لێرەوە دێت. لەهەمانکاتدا ئەمە دەستپێکردنی قۆناخێکی زۆر بە ئێش، خوێناوی، تاڵان، فڕکردن و داگیرکارییە کە پێویست بوو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕوونەدات.

گەیشتنی ناوەند ـ کەنار بە گەوهەرێکی بەمجۆرە، ئەو جیابوونەوە چینایەتییەی کە لە پێکهاتی کۆمەڵگاکانی ناوەند ڕێگا لەپێش زیاد بوونی توندی و توند و تیژی دەکاتەوە، ئەوا بە سەرکوتکردنی پێکهاتە ئەتنیکیەکانی دەرەوە، بە لایەنی بەرامبەریش بە پێشکەوتنی وشیاری ئەتنیکی ئەنجامگیر دەبێت. لە کاتێکدا ئەو توندوتیژی و فشارە نەخشە بۆ کێشراوەی ناوەوە تێکۆشانی چینایەتی لەگەڵ خۆیدا دێنێ، ئەوا لەبەر ئەوەش تێکۆشانی ئازادی کۆمەڵگا ئەتنیکییەکان بەرامبەر کۆلۆنیالییەت و ئیمپریالیزم، وەکو تایبەتمەندێتیەکی ناکۆك و دەست لێبەرنەدراوی شارستانیەت جێگای خۆی لە مێژوو دەگرێت. بەمجۆرە دیالەکتیك و یاساکانی ماتریالیزمی مێژوویی دەبێتە یاسای پێشکەوتنی کۆمەڵگا. مارکسیزم زیاتر لەمیانەی پەیڕەوکردنی ئەم یاسایانە شیکردنەوەی سەبارەت بە شارستانیەتی سەرمایەداری ئەنجام داوە. بە بۆچوونی من بە ئەندازەی ئەوەی ناتەواوە، هەڵەیەکی پێڕەوە و ڕێگا لەپێش هەڵخەڵەتاندنی مەزن دەکاتەوە. لەبەرئەوەی لەمیانەی تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی کارەکتەر و قۆناخ و زەمینەی لەدایکبوونی ئەم ڕاستینەی شینەکردۆتەوە، ئەوا شیمانەی هەرە مەزن ئەوەیە هەم لەلایەنی تیۆری ـ ئایدیۆلۆژی، هەم لەبواری سیاسەتی ـ پراکتیکی بۆتە شوێن کەوتەی ڕێچکەی ڕاستینەی ئایدیۆلۆژی و سیاسی باو، کە بە درێژایی مێژوو بە شێوەیەکی بە هێز پێکهاتووە. ئەگەر بێتو شیکردنەوەکانی شارستانییەت لە جیاتی بەدەستەوە گرتنی دوا شێوەی کۆمەڵگای ئاوا کراو، یەکەمین کۆمەڵگا وەکو نموونە وەربگیردرێت و بەمجۆرە شیکردنەوەی دەرهەق بکرێت و لەمیانەی تاقی کردنەوە و بەراورد کردندا ئەنجامی لێوەربگیرایە، ئەوا دەبوو بە هەڵوێستێکی واقیعیانەتر. بێگومان ئەو مارکسیزمەی کە پشت بە قۆناخی دەرکەوتنی سۆسیالیزمی زانستی دەبەستێ، کە توانستەکانی زانیاری و فەلسەفە سنووردرابوون، هەربۆیە ڕێکخستنەوەیەکی لێهاتوو و تۆکمە لەسەر بنەمای پشتبەستن بە توانستەکانی فەلسەفە و زانیاری و ئەنجامە دەوڵەمەندەکانی پراکتیزەکردنی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێویستییەکی دەست لێبەرنەدراوی جێبەجێ کردنی ئەرك و بەرپرسیارێتییە. بە تایبەتی ئەو

ڕەوشەی ڕاستینەی "**سۆسیالیزمی بونیادنراو**"تێیدایە و ئەو قەیرانە جیهانگیرییەی سەرمایەداری بە قووڵایی تێیکەوتووە، لەسەر بنەمای ڕەخنەدانێکی لەم بوارەوە پێشبکەوێت، هەڵوێستە ڕەخنەگرەکانیان بەهادار دەبێت و دەرفەتێکی ئەوتۆیان پێدەدات کە لە چارەسەرکردندا واقیعی بن.

لە کۆتاییەکانی ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز بەدواوە هێرشەکانی دەوروبەر بۆ سەر ناوەندەکانی شارستانییەتی سۆمەر و میسر زیاتردەبێت. هەروەها لە سەدەی بیستەم تا ساڵانی ٢٠٠٠ زایینی بووینە شاهیدی دەرکەوتنی هەمان گەوهەر و دیاردە، کە لە دەوروبەری ناوەندەکانی شارستانییەتی سەرمایەداری هاتە ئاراوە، ئینجا ئەمە چ لەمیانەی شەڕەکانی ڕزگاری نیشتمانی بێت، یاخود لەمیانەی کۆچبەرییەوە بێت.

لە کاتێکدا گروپە ئەتنیکییە سامیەکان لە ژێر ئاڵای ئایینی تاکخودایی کۆبوونەوە، لەمیانەی تێپەڕاندنی ناوەند بە وەرچەرخانێکی چڕوپڕدا ڕۆڵی مێژوویی خۆیان بینی، گروپە ئەتنیکییە ئاریانیەکان زیاتر بە شێوەی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا ڕێگایان لەپێش جیابوونەوەی دوو لایەنەی شارستانییەت کردەوە. ئەو گروپانەی لە ژێر ناوی هۆریتەکان کۆببونەوە هەم لە ناوەوەی ناوەند و هەم لە دەرەوەی، جوڵانەوەیەکی مەزنی بڵاوبوونەوەیان ئەنجامدا و لەسەر ئەم بنەمایەش گروپە ئاریەکانی نئۆلیتیك ڕێگایان لەپێش گەورەترین و بەرفراوانترین جموجۆڵی مێژوویی کردەوە کە دەتوانین بە شارستانییەتی هیند ـ ئەوروپا ناوی ببەین.

سەرچاوەی جوگرافی چڕبوونەوەی ئەم جوڵانەوانە و جیابوونەوە بۆ دوو لق دیسان سیستەمی زاگرۆس ـ تۆرۆسە. بەڵام لە بواری پێشکەوتنی گرنگ لە گەوهەر و بواری بڵاوبوونەوە ڕووینەداوە. لە کاتێکدا پەیوەندی بەردەوام لەگەڵ سۆمەریەکان ڕێگای لەپێش لۆژیکی توندوتیژی کۆلۆنیالیست ـ ئیمپریالیست کردەوە، لە لایەکەی دیکەوە بەرخودان بەرامبەر ئەم دیاردەیە و وەرچەرخان لەسەر بنەمای پەسندکردنی چەکەکانی شارستانییەت و بەکارهێنانیان، دەکاتە ناچارییەك. هەروەکو چۆن بەبێ ئەوەی بە شارستانی بوون ڕوویدات، ناشێ لەمیانەی پێکهاتە ئەتنیکییەکانی پێشوو ئەم قۆناخە مێژووییە بە سەرکەوتوویی پێکبێت، ئەوا ناتوانێ خۆی لە قڕکردنێکی سەرتاسەری بپارێزێت. هۆریتەکان بە شێوەیەکی گشتیش تەواوی گروپە ئاریەکان، هەم سەبارەت بە بەکارهێنانی شانسی مێژووییان، هەم پاراستنی هەبوونی خۆیان؛ گرێدراوی ئەو وەڵامانەیە کە دەرهەق بە شارستانی بوون، واتە گرێدراوی ئەم وەڵامانەیە کە بۆ پچڕاندنی بەندەکانی ئەتنیکی و گەیشتن بە دیاردەی کۆمەڵگای چینایەتی دەیدەنەوە.

ئەو وەڵامانەی ئامۆریتە سامیەکان دایانەوە ئەو ئیمپراتۆرییانەی ئەکەد، بابل، ئاشوور بوون کە دەکەوێتە ناوەندەکانی سۆمەر. لە ڕۆژئاواش شارستانییەتی فینیقی و نیمچە دەوڵەتەکانی شاری لە جۆری ئۆگاریت، بوونە وەڵامی گروپە کەنعانی و عیبرانیەکان کە پشتیان بە زاراوەی سامی دەبەست.

هەروەها وەڵامی گروپە ئاریەکانی ناوەوەی ئەنادۆڵ، ئیمپراتۆرییەتی هیتیتەکانە کە لە ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز بەدواوە پێشکەوتنێکی مەزنی بەخۆوە بینی. ئەوپەڕی ڕۆژئاواشی نیمچە دەوڵەتی ـ شاری تەروادە بووە کە ڕۆڵێکی گرنگی لە گواستنەوەی هەڵمەتەکە بۆ ئەوروپا بینیوە. ئەو بە لاتینبوونەی لەسەر بنەمای بە هێلینبوون لە نیمچە دوورگەی گریك و ئەتروسکییەکان لە نیمچە دوورگەی ئیتالیا پێشکەوت، بە واتای ڕزگاربوونی کۆمەڵگا لە پێکهاتەی ئەتنیکی و دەربازبوون بۆ پێکهاتەی کۆمەڵگای چینایەتی و وەرچەرخانیەتی بۆ شارستانییەتی گریك ـ ڕۆما. بە شێوەیەکی چاکتر دەرك کردن بەم وەرچەرخانانە گرێدراوی تێگەیشتنی ئەو جیابوونەوەیەی سیستەمی **زاگرۆس ـ تۆرۆسە**. بەڵام ئەگەر شێوازی نزیکبوون لە مێژوو ڕاست نەکرێتەوە، ئەوا زۆر ئاستەمە لەم لایەنەوە پێشکەوتن بەدیبێت. ئەویش ئەمەیە:"**ئاریانە چاوشین و سوور و سپیەکانی کە لە ئەوروپا و ناوچە زورگاوییەکانی باشووری ڕوسیا هاتوون، لە ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز لە باکووری ئێران، لەوێشەوە چوونەتە هیند، میدیا و ئەنادۆڵ**"، ئەم هەڵوێستە لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵەیە و بە ئامانجی بوون بە ئامرازی پەلهاوێشتنی فاشیزمی ئەڵمان ئامادەکراوە و تێڕوانینێکی نەژادپەرستییە. ڕاستییەکەی زۆر جیاوازە و پێچەوانەیە. بەر لە هەموو شتێك کۆچێکی جەستەیی فراوانی بەمجۆرە لە مێژوودا نییە. ئەگەر هەبێت، لەو ئاستەدا نییە کە ئەنجامگیر بێت. هەمان تێڕوانین بۆ ئەم کۆچانەش ڕاستە کە باس لە مەزنبوونەکەی دەکرێت. ڕاستتر ئەوەیە کە لە کۆچبەرییەکی جەستەیی بڵاوبوونەوەکان زیاتر، کۆچ لەسەر بنەمای پشتبەستن بە دیاردەی بڵاوبوونەوەی توانستی کولتووری ئەنجام دراوە. دیاردە کولتوورییەکانی بە گوێرەی کولتوورەکانی دەوروبەر، خاوەن گەوهەرێکی دەوڵەمەندترن، بەردەوام خاوەن تایبەتمەندێتی بڵاوبوونەوەن. گروپە کۆمەڵایەتییەکانی خاوەنی پێکهاتەیەکی کولتووری لاوازن، دەشێ هێرش بکەنە سەر ناوەندە گەشەسەندووەکان، لەوانەیە هەندێ سەرکەوتنی مەیدانیش بەدەست بهێنن، بەڵام لە ئەنجامدا لە تواندنەوە و ژێرکەوتن ڕزگاریان نابێت.

بە شێوەیەکی ڕێژەیی ئاماژەمان بە چیرۆکە ڕاستەکانی کۆچی ئاریەکان کردبوو. بەر لە هەموو شتێك پێویست بە زانینی ئەوە دەکات کە زاراوەی ئاریان لە دیاردەیەکی نەژادی یان ئەتنیکی زیاتر، ناوێکی گشتییە کە لەو گروپە ئەتنیکییانە دەنرا کە بۆ یەکەمین جار لەسەر بنەمای شۆڕشی کشتوکاڵی، کولتووری شوانکاری و جووتیاری پێشخست. هەروەها ئەمەش ڕاستییەکی زانستییە کە ئەم گروپانە بۆ یەکەمین جار لە کەوانەکانی ناوەوەی سیستەمی زاگرۆس ـ تۆرۆس، لە نێوان فورات و دیجلە سەریانهەڵدا و مەزن بوون. ناولێنان بۆ سیستەمی سۆمەر دەگەڕێتەوە. جارجار ناوی گروپی گاسن (**گاسن = Ar**)، یان گروپی ئاژەڵدار (**بەراز = Gud**)، یاخود بە واتای گەلی وڵاتدار (**تەپە = Ur**) بە واتای هۆریتەکان، گۆتییەکان، ئاریەکان ناودەبرێن. هەمووشیان کەم ـ زۆر گوزارشت لە هەمان جوگرافیا و کولتوور دەکەن. بێگومان ناتوانرێ بگوترێ سەرەتا ئەم گروپە یان فڵانە گروپ ئەنجامیداوە. مەحاڵە شتێکی بەمجۆرە بزانرێ و دەستنیشان بکرێت. بەڵام سەرەڕای هەندێ سنوورداری و لاوازی، جوگرافیا و مێژووی بڵاوبوونەوەی ئەو کولتوورە دەزانرێ. بۆیە ئەگەر هەر باس لە بڵاوبوونەوە بکرێ ئەوەی هەرە ڕاست، شیمانەی بڵاوبوونەوەیەکی کولتوورییە لە ناوەندەوە بۆ هەموو شوێنێکی لەبار و گونجاو. ئەم تێڕوانینە لەمیانەی بەڵگەی مێژووییشەوە پشتگیری لێکراوە. بۆیە شێوازی هەرە ڕاستیش بناخەی خۆی لەم نزیکبوونەوە دەگرێت.

شارستانییەتی سۆمەر کە لە بنارەکانی ناوەوەی کەوانی بەپیت و دەشتەکانی خواروو ئاواکرا، چەندە گرنگە، ئەوا دووڕیانی جیابوونەوەی شارستانییەت کە لە گەڵیدا لە نێو گرێدانێکی دیالەکتیکیدایە و زیاتر لە کەوانەکانی لوتکە بەرزەکانی سیستەمی زاگرۆس ـ تۆرۆس هاتۆتە ئاراوە، واتا یەکەمین جیابوونەوەی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا، بە هەمان ئەندازە ڕووداوێکی مێژووییە. هەربۆیە شیکردنەوەی ڕێبازی شارستانییەتی میدیا ـ پارس زۆر گرنگە. بێگومان ئەو هەنگاوانەی لە مێژوودا وەکو پێشکەوتنی ماد ـ پارس ناوبراوە، ڕەگەکەی بۆ سەردەمێکی کۆن دەگەڕێتەوە. هەروەکو چۆن هەوڵماندا ڕوونی بکەینەوە چونکە دیاردەیەکی گەوهەرییە و لە نزیکەوە پەیوەندییەکی دیالەکتیکی لەگەڵ خوڵقاندنی سۆمەرەوە هەیە، وەلێ نابێ ناوە جیاوازەکانی قۆناخە جیاکان سەرمان لێبشێوێنێ.

هەر لە سەرەتاوە پێکهاتەکانی هەر دوو لایەن بەرامبەر بە یەکدین و بەردەوام پەیوەندییەکانیان پێشدەکەوێت. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا هیچی لە خێراییەکەی خۆی لەدەست نەداوە. دەبێ ئەم مەسەلەیە وەك شێوازێکی شیکردنەوەیەکی ڕاستی مێژوو بەردەوام ڕەچاو بکرێت: پەیوەندییەك لە ڕیشە مێژووییەکەیدا چۆن ئاوا کرابێت، بە شێوەیەکی سەرەکی بەمجۆرە بەڕێوە دەچێت و دەبێتە هەنووکەیی. کاتێك لەمیانەی تێڕوانینێکی بەمجۆرە لە ڕۆژگاری لە ئارادایە تەماشای مێژوو بکرێت، لە مێژووەوەش تەماشای قۆناخی هەنووکەیی بکرێت، ئەوا دەشێ بە گەلێك ئەنجام بگەین کە نزیکی ڕاستییە.

لە قۆناخەکانی دەستپێکدا پەیوەندی و ناکۆکی لەگەڵ سۆمەریەکان لە ڕێگای ئەو گروپە ئەتنیکییانەی زاگرۆسەوە دەبێت کە بە ئیلامی و گۆتی ناودەبرێن، بە گوێرەی سیاسەتی سۆمەریەکان بەردەوام بەکاردەهێنرێن. هەندێ جار هاوپەیمانن، هەندێ جاری دیکە دوژمن. کوشتارەکانی سەرجۆن کە لە ئیلام ئەنجامیدا زۆر هۆڤانەیە، بەڵام ڕێککەوتنی گۆتی و سۆمەریەکان، توانیویەتی خانەدانی (بنەماڵەی) سەرجۆن بڕووخێنێ. بۆ ماوەیەکی درێژ گۆتییەکان بوونەتە هێزی بەڕێوەبردن. پەیوەندییەکی هاوشێوەی ئەمەی کاسیتەکان لەگەڵ بابلیەکان پێشکەوتووە. لە ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز شارستانییەتی هیتیت توانیویەتی لە ڕێی هۆرییەکانەوە پێشبکەوێت. ئەم شارستانییەش نموونەیەکی گرنگی بڵاوبوونەوەیە لە ناوەندەوە بۆ

دەورووبەر. بەڵام ئەوە سەلمێنراوە کە وەکو ئەڵقەی ناوین بە پارزنگی هۆرییەکاندا دەربازبوو. بەمجۆرە قۆناخێکی پەیوەندی و ناکۆکی لە نێوان ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا دەستپێکردووە، کە گەوهەرە دیالەکتیکییەکەی بەهێزە و تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان بەردەوامە. یەکەمین لق، یەکەمین هەنگاوی کە رۆژئاوا واتا یۆنان ـ رۆما دێنێتە دونیاوە، بەمجۆرە هاوێشتراوە. ئەمە هەنگاوێکە زیاتر بە گوێرەی ئەڵقەی کولتووری تۆرۆس ئەنجامدراوە. بەڵام هەرچی لە هێلی زاگرۆسە، ئەوا لەسەر بنەمای پشتبەستن بە توانستە شارستانییەکانی ئیلام و گۆتی و کاسیتەکانی پێشوو، ئەوا لە ناوچەکانی باکووری رۆژئاوای تورکیا یاخود دەریاچەی وان، ئورمیە و ناوچەکانی زاپ، لەسەرەتای ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز لەو وڵاتەی کە شیمانە دەکرێت ئاشوورییەکان ناوی میدیایان لێناوە بۆ جاری یەکەم شارستانییەتی ئورارتوو پێشدەکەوێت کە بەهێزە و بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە بە سەنتەربوونی ئەنجامداوە. دەتوانین بڵێین ئورارتوویەکان پشت بە کولتووری میتانی و هۆرییەکان دەبەستن کە لە ساڵانی ٢٠٠٠ تا ١٢٥٠ پ.ز لە نێو هەمان جوگرافیادا دەژیان و لە ئاستێکی بەرز و لەمیانەی هەمان کولتووردا بە شێوەی کۆنفیدراسیۆنی خێڵەکان تاسلاقی بە دەوڵەت بوونیان دانابوو. واتا شارستانییەت دەسکەوتەکانی خۆی بەرەو باکووری رۆژئاوای ئێران، واتا بەرەو میدیا دەگوازێتەوە. شیمانەی لەپێش ئەوەیە ئەو گروپە ئەتنیکییانەی بە ماد ناو دەبران، لەم ناوچانەوە بۆ شوێنێکی دیکەی دەوڵەمەند لە بواری شارستانییەتەوە، واتا بۆ نێوان فورات ـ دیجلە چوون و لەوێ نیشتەجێبوون.

لەگەڵ ئەوەی ئورارتوویەکان پشتیان بە پێکهاتەی کولتووری هەمان جوگرافیا دەبەست، لەهەمانکاتدا خاوەنی میراسی بەرخودانی قۆناخێکی درێژخایەن بوون. لە کەسێتی ئاشوورییەکاندا شارستانییەتی سۆمەرییان هەرسکرد و زمانی ئاشوورییان وەکو زمانی چینی سەروو بەکارهێناوە؛ بەڵام هەرچی گروپەکانی خەڵکە لەمیانەی زمان و کولتووری خۆیاندا لە نێو ژیانێکی جیاوازدا بوون. لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا چەندین نموونەی بەمجۆرە دەبینرێ. لە کاتێکدا چینەکانی بەڕێوەبەرایەتی هیندستان زمانی ئینگلیزی بەکاردێنن، گروپەکانی خەڵك (جەماوەر) زمانی خۆیان بەکاردێنن و تازەبەتازە دەگەنە ئاستی زمانی نەتەوەیی. لە کاتێکدا زمانی بەڕێوەبەرێتی جەزائیر زمانی داگیرکاری فەرەنسییە، کولتووری زمانی خەڵك عەرەبی و بەربەری و زاراوەی جیاوازە. لە کاتێکدا زمانی عوسمانی تێکەڵاوەیە، ئەو گەلانەی پێیەوە گرێدراون زاراوەی ئەتنیکی خۆیان بەکاردێنن و پێبەپێ بەرەو گەیشتن بە ئاستی زمانی نەتەوەیی بەرزدەبنەوە.

گەلێك شار لە ئارادان دەسەلمێنن چەرخەکانی ناوین و سەرەتاییش بە قۆناخێکی بەمجۆرەدا تێپەڕیون. ئورارتوو وەکو مانای وشە، گروپێکی ئەتنیکی پێناسەناکات، بە زمانی سۆمەری بە واتای "**شوێنی بەرز**" دێت، ئەوەش پێناسەیەکی جوگرافییە. ئەو پێشکەوتنەی لە دوای قۆناخەکانی هۆری و میتانییەکان روودەدات و جیاوازترە، بەلاوەنانی کۆنفیدراسیۆنی خێڵ و گەیشتنیەتی بە رەوشی چینێکی کۆیلەداری ناوەندی. بەخێوکردنی ئەسپ، خاوەنداری کردنی سامانی کانزا و تەختەدار، رێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە کە ببێتە ئامانجی سەرەکی هێرشی هیتیت، سۆمەر ـ ئەکەد، بابلی و ئاشوورییەکان. ئەوەی لە کەسێتی ئورارتوو روودەدات بەردەوام کردن و هەمیشەیی کردنی بەرخودانە لەمیانەی هێزی دەوڵەتی ناوەندی و ئەگەر بکرێت بە هاوسەنگییەکی رێککەوتن بگەن و بە یەکسانی بژین. سیاسەتی ئاشوورییەکان کە لە ئاستێکی بەرزدا پشت بە تالان، داگیرکاری و قڕ کردن دەبەستێ و پاشماوەکانیش ناچاری کۆچبەری و دەربەدەری دەکات، دەرفەت بەمە نادات. هەروەکو رۆمایییەکان لەمیانەی هێشتنەوە دەرفەتی ژیان بۆ ئەو گەلانەی دەیخاتە ژێر باڵادەستی خۆی، درێژە بە ئیمپراتۆرییەت نادات. ئەوەی خاوەن یاسا نەبێت، پراکتیزەکردنی دەسەڵاتێکی بێ سنوور و کەیفی بە بنەما دەگرێت. هەڵبەتە کۆتایی هاتنی بەو شێوەیە کە چاوەڕوانی نەدەکرا گرێدراوی ئەو سیاسەتەیەتی. تەواوی ئەو سیستەمە سیاسییانەی پشت بە توند و تیژی دەبەستن هەمان کۆتاییان هەیە. وەکو میراسێك وەرگرتنی ئەم سیاسەتە ئیمپریالیستییانەیە لە سەرجۆن و پتەوکردنی لە رێگای حامورابی بابل و بە درندانەترین شێوە پەیڕەوکردنی لەلایەن ئاشوورییەکان بۆ تەواوی گەلان و سیستەمەکان و میرنشینی کۆیلەداری رۆژهەڵاتی ناوین بە واتای دۆزەخ دەهات.

رووبەڕوومانەوەی گەلان و کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین بەرامبەر بە سیاسەتی فشار و دەربەدەرکردنی کە لە هیچ قۆناخێکدا هاوتای نەبینراوە، بە ئەندازەی ئەوەی رێگای لەپێش تەنگژەیەکی قووڵ کردەوە ئەوا شوێن پەنجەی خۆی بەسەر پێکهاتەی رۆحی و هزری مرۆڤایەتیدا بە جێهێشتووە. لە کۆتاییەکانی باڵادەستی ئاشوورییەکان دەبینرێ کە داخوازی دامەزراندن و لێگەرینەکانی سیستەم شێوەی رەوشێکی رۆحی گشتی وەرگرتووە. لە کاتێکدا ئەم جۆرە هەوڵانە لە لایەك رێگایان لەپێش گروپی سۆفیگەرایی و ئەو ئایینە تاکخوداییانە دەکردەوە، کە بەڵێنی دامەزراندن و لێبوردنی پێدەدان، لە لایەکی دیکەشەوە لە نزیکبوونەوە سەبارەت شارستانییەت بەرەو جیابوونـەوەی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوایی دەبات.

شیمانەی مەزن ئەوەیە وڵاتی میدیا کە لەسەر بنەمای میراسی ئورارتوو بەهێز دەبێت و ئاشوورییەکان زەحمەتی دەبینن لەوەی بەسەریاندا زاڵبن، لەم وڵاتەدا شێواز و رێچکەکانی رزگاربوون لەم دۆزەخە پێشدەکەوێت. هەربۆیە هەڵسەنگاندن و لە قەڵەمدانی گروپە مادیەکان وەکو قەومێك کە لەوپەڕی قەزوینی باکووری رۆژئاوای ئێران هاتوون، هەڵەی مەزن لەخۆوە دەگرێت. بە پێچەوانەوە مادەکان سەر بە گروپی ئاریانن کە خاوەنی کولتووری بژێردراوی کەوانی بەپیتە، لە قۆناخی ئاشوورییەکاندا هەم بوونە خاوەنی ناوێکی نوێ، هەم بوونە خاوەنی گەوهەرێکی ئایدیۆلۆژی کە لە ئەنجامی بەرخودانی درێژخایەن هاتە ئاراوە و بەمجۆرە جێگای خۆیان لەسەر شانۆی مێژوو گرتووە. لەمیانەی بەرەنگاربوونەوەی ستەمی ئاشوورییەکان سەرلەنوێ لە دایکبوون لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز بەدواوە بەربڵاودەبێت. بۆ یەکەمین جار تیرە عیبرانییەکان یەکدەگرن و لە قۆناخەکانی ساوول ـ داوود ـ سلێمان دەگەنە ئاستی ئاواکردنی پادشایەتی. هێلینەکان تەروادەیان تێکشکاندووە و بە شێوەی دەوڵەتی شار ئەتینا بناخەی شارستانییەتێکی نوێ دادەنێت. پلێشاندەوەی بێ رەحمانەی ئەو بەرخودانانەی لەسەر بنەمای میرنشینە ئەتنیکییەکان پێشدەکەوتن، ئەوا لە ئەنجامی پێشخستنی داب و نەریت و باوەڕی نهێنی لەلایەن ئەو کەسانەی دەستبەتاڵ دەمانەوە، لە بنەچەی خۆیدا بە واتای دەستپێکردنی قۆناخێکی تایفەگەری ـ تەریقەت گەرێتی ـ یە. چەمکی با هەر کەس و گروپێك بەدوای چارەنووسی خۆیدا بگەرێت، بنگەی مێژوویی ئەم مەیلە سۆفیگەراییانە پێکدێنێت.

لێگەڕینی راهیبەکانی میدیاش کە بە **Mag** **ماگ (موغ)** ناودەبرێن پارچەیەکی ئەم مەیلە گشتییەیە. راهیبەکانی موغ نوێنەرایەتی گروپ و ئایدیۆلۆژی رزگاری دەکەن. لایەنی نوێی موغەکان ئەوەیە، چەمکی ئایینی ئاریەکان و ئەفسانەی سۆمەریەکانیان کردۆتە سەنتێزێك و نزیکی هەڵوێستێکی رزگاریخواز و نزیك بە مرۆڤ بوونەتەوە. دەرکەوتنی میتۆلۆژیا بۆ هەر پێشکەوتنێکی جددییانەی شارستانییەت پێویستە و لە رێزی پێشەوە دێت. بە بێ ئەوەی چەمکی ئایینی میتۆلۆژیای باوی سیستەم بەلاوە بنرێت، ئەوا دەرفەتی پێهەڵگرتنێکی نووژەنی شارستانییەت نارەخسێت. لە دوای قۆناخێکی کپ بوون کە ماوەیەکی درێژی خایاند و مۆری میتۆلۆژیا پێوەبوو، قۆناخی جوڵانەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی نوێ دەستپێدەکات. هەروەکو بڵێی رۆڵی رۆن و بەنزینی پێویست دەبینن. ئەگەری ئەوە هەیە کە جوگرافیای سیحراوی و دڵڕفێنی میدیا و کولتووری بەرخودانی درێژخایەن چاوگی ئیلهامی ئایدیۆلۆژی راهیبەکانی موغ بێت. لەگەڵ ئەوەی کاریگەری سۆمەر و چەمکی سروشتی ئایینی ئاریەکانیان لەسەر هەیە، لەمیانەی پەسندکردنێکی جددی وەڵامیان دەداتەوە، نوێیەکە بە گوێرەی خۆجێییەکە دەگونجێنێ. دەشێ بەرخودانی کاوەی ئاسنگەر وەکو لایەنی داستان و کرداری ئەم مەیلە هەڵسەنگێنین. لەم قۆناخە مێژووییەدا داودی ئاسنگەر لە ناو عیبرانییەکان، ئاکهیلۆش لە ناو هێلینەکان هەمان رۆڵی قارەمانێتییان بینیوە. لێکچوونێکی سەرنج راکێش جێگای باسە. بەڵام توێژی بەهێز لەم قۆناخەدا بەرەی ئایدیۆلۆژیایە و راهیبەکان نوێنەرایەتی دەکەن. لە هیندستانیش راهیبەکانی براهمان بە شێوەیەکی بەهێز نوێنەرایەتی دەکەن. راهیبەکانی ـ موغەکانی مادەکان لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز بەدواوە لە ستراتیژیترین ناوچەدا نوێنەرایەتی ئەم مەیل و هەڵوێستە مێژووییە دەکەن. لەگەڵ ئەوەی Kovi ـ Mir ی پێکهاتەی ئەتنیکی دەگاتە ئاستی هێزی دەسەڵاتی سەرۆکایەتی، کۆمەڵگای چینایەتی و پێکهاتنی دەوڵەت دیارنییە.

تاوەکو هەبوونی عەشیرەتەکان بەردەوام بکات ناشێ سیاسەتێك (سیاسیبوون)ێك بێتەئاراوە کە شێوازی میرنشینی دەربازکردبێت. شتی هەرە لەپێشی ئەنجامیبدات، کۆنفیدراسیۆنی نێوان خێڵەکانە.

مادەکانی **میدیا** و تیرە پارسەکانی ناوەڕاست و باشووری ڕۆژئاوای **ئێران** شوێنگە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانیان لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز گەلێك لایەنی لێکچوونیان هەیە، پێکهاتەی ئایینی و میتۆلۆژیادا لەسەرەوە سیستەمێکی سێیانەی خوداوەندەکان جێگای باسە. بە شێوەیەکی گشتی ئەم سیستەمە سێیانانەی (سێکوچکەی) کولتووری باوك، دایك و لێهاتووترین منداڵ، بە تواناترین منداڵ، پشت بە شکۆمەندکردنی ئایینی باوکسالاری دەبەستێ. هەرچەندە نوێنەر و سەمبۆڵەکانیان جیاوازبێت، وەلێ هەمان ئاراستەی پێشکەوتنێکی ئایینی ئەو گروپە نزیکانەی دەوروبەریش دەبینرێت، کە جێگای خۆیان لە ناو شارستانییەتی قۆناخدا گرتووە. لە ساڵانی ١٥٠٠ پ.ز کە هێشتا گروپە هیند ـ ئاریەکان لێك جیانەبوونەوە، ئەم سیستەمە سێیانەی وەکو **ئیندرا ـ میترا ـ ڤارۆنا** ناودەبرێت. لەو تاتە قوڕینانەی کە ئیمزای دەوڵەتەکانی هیتیت و میتانی پێوەیە، سوێند بە ناوی ئەو خوداوەندانە دەهێنرێت.

بە ئەندازەی ئەوەی کولتووری هاوبەش لە ناوچە خۆجێییەکاندا دووچاری وەرچەرخان دێت، جیاوازی میتۆلۆژیاش زیاد دەبێت و ئەمەش بە شێوەیەکی زیاد و بەرچاو لە ناو لێنانی خوداوەندەکان ڕەنگ دەداتەوە. زەردەشت گەورەترین دەسکەوت و ڕۆڵ لە ریفۆرمی ئایدیۆلۆژی میدیادا دەبینێ. کەسایەتی زەردەشت کە شیمانەدەکرێت لە ساڵانی ٦٠٠ پ.ز ژیا بێت، مەزنترین گرنگییەکەی ئەوەیە کە بەر لە کۆنفۆشیۆسی چین، بودای هیندستان، سوقراتی یۆنانستان، بە شێوەیەکی بەهێز ڕۆڵی ریفۆرمی ئەخلاقی ئەنجامدا. لە میتۆلۆژیای سۆمەر و میسر و ئەو چەمکە ئایینییانەی پشتی پێبەستوون، بەهۆی چەمکی بەندە ـ کۆیلەی ڕەهای کە نوێنەرایەتی دەکەن، ئەوا بەرامبەر بەو خودایەی حوکم بەسەر هەموو شتێکدا دەکات، مرۆڤێکی ـ بەندە بە بناخە دەگرێت کە بێچارە و بێ ئیرادەیە. تەنانەت مرۆڤ سێبەری تایبەت بە خۆشیان نییە. هەموو شتێك لە خوداوەندەوە دێت. واتا ئیرادەی چینی ئەفەندی (کۆیلەدار) هەڵکشا و ڕەها و پیرۆزە. بە بێ مۆڵەت کەس نابێ بە خاوەنی سێبەریش. ئەم ئایدیۆلۆژیایە بەسەر پێکهاتەی ڕۆحی و هزری قۆناخدا زاڵە. ئەنجامە سیاسییەکەی سیستەمی پادشا ـ خوداوەندەکان و فەرماندانی بێسنوورە. هەر گوتەیەکی پادشا بە واتای یاسا دێت.

ئەوەی زەردەشت بەر لە هەموو ریفۆرمخوازەکانی دیکە درزی کرد قاڵبی ئەم ئایدیۆلۆژیا باڵادەستیانەیە. لە گاتاکانی زەردەشت شێوازی سکالا و هاوارکردن هەیە، کە وەکو بڵێین لێپرسینەوە لەگەڵ خوداوەندەکان دەکات (گاتاکانی زەردەشت؛ وتەکانی زەردەشت، گۆت = وتن). لە ڕاستیدا لێپرسینەوە دەرهەق بە ئایدیۆلۆژیای قۆناخ دەکات. ئەمە لەمیانەی ئیرادەیەکی یاخیبوو بە شێوەیەکی ئاشکرا و بوێرییەك ئەنجامدەدات کە نموونەی نەبینراوە. فەرموودەی یەکلایەنەی خوداوەندەکانی نییە. ڕووبەڕووی کەسایەتیەکن خاوەن ئیرادەیە و لێپرسینەوە دەکات و تا وەڵامەکەی وەرنەگرێت ناوەستێ. تا ئەو قۆناخە، تەنانەت پادشاکانیش هیچ مرۆڤێك نەیتوانیوە لێپرسینەوەی خوداوەندەکانی بکات. ئەمەیە **"یەکەمین"**ی کە زەردەشت ئەنجامیداوە. لە ڕاستیدا ئەم **"یەکەمین"**ە هەم بەرامبەر بە ئایینی سەرەتایی سروشت، هەم بەرامبەر بە داب و نەریتی خوداوەندی حاکمییەتی ڕەهای سۆمەریەکان ئەنجامدراوە. فەیلەسوفی بە ناوبانگی ئەڵمانی نیتشە کەسایەتییەکە دەرکی بە قووڵایی واتای ئەم قەڵەمبازە کرد و لەخۆڕا شاکارە بە ناوبانگەکەی خۆی بە **"زەردەشت وەهای دەگوت"** ناو نەبرد. کون کردنی ئەو ئایدیۆلۆژیایەی کە سیستەمی ئابلۆقەداوە و بەسەر تەوژمی شارستانییەتدا زاڵبووە، ڕێکردنەوە لەپێش ئیرادەی مرۆڤی هەڵکشاو، یەکێکە لە گەورەترین شۆڕشە ئایدیۆلۆژییەکان. ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە هزر و ئیرادەی ئەو مرۆڤەی تاوەکو ئەو قۆناخەش لە سێبەری خۆی بە خاوەن دەرنەدەکەوت و گەیاندنی بۆ ئاستێك ڕووبەڕووی خوداوەند بێتەوە بڵێ **"من هەم، پێت دەڵێم، وەڵامبدەوە"**، هەنگاو هاوێشتنە بۆ دووڕیانێکی مەزن. بۆ یەکەمین جار لە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا باس لە ئازادی تاکەکەس دەکرێت. قۆناخی خودایيە حاکمڕەهاکان و سیستەمی کۆیلەداری بێ سنوور دەهەژێ و ناچاری ئەنجامدانی ریفۆرمی دەکات.

لە وڵاتی میدیا کە زەردەشت تێیدا دەژیا، شارستانییەت بۆ دوو لق جیا دەبێتەوە. لە چین، هیند، میسر و چەندین نیمچە دەوڵەتی دیکە سیستەمێکی دەسەڵاتی ڕەهایی کە خۆیان دەکەن بە خودا پێشدەکەون، سیستەمی یۆنان ـ ڕۆماش لەسەر بنەمای سنووردارکردنی خوداوەندەکان لەمیانەی ئەقڵ و کۆمار جیابوونەوەی سیستەمی سیاسی و خوداوەندەکان پێشدەکەوێت. بەڵێ دووڕیانی شارستانییەت یاخود ئەو پێشکەوتنەی بە جیابوونەوەی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا ناو دەبرێت یەکەمین قەڵەمبازی مەزنی ریفۆرمخوازی زەردەشت سەرچاوەکەی پێکدێنێت. بە لانی کەم بە ڕادەی خولقاندنی شارستانییەت، ناچارکردنی بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری، بوون بە دوو لق دەبێتە دووەمین هەنگاوی مەزن و مێژوویی کە لە خاکی میدیا ئەنجامدەدرێت. بە تەواوی لەم خاڵەدا زەردەشت واتای زاراوە سەرەکییەکانی ئایدیۆلۆژیاکەی **ڕووناکی ـ تاریکی، باشی ـ خراپی، بەهەشت ـ دۆزەخ، جوانی ـ دزێوی، ڕاستی ـ چەوتی** لەشوێنی خۆیدا جێگیردەکات. بەر لە هەموو شتێك بە پرەنسیپێکی سەرەکی فەلسەفی گەیشتوون؛ پرەنسیپی پێشکەوتن تەنیا لە ئەنجامی یەکێتی دژەکان بەدیدێت. ئەو پرەنسیپەی کە زانستیش لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا پشت ڕاستی کردۆتەوە، گوزارشت لەو یاسایە دەکات کە تەواوی گۆڕانکارییەکانی سروشت و کۆمەڵگا دەخاتە نێو جموجۆڵەوە. ئەمەش ئەو بوێرییەیە کە بە گۆڕانکاری ناودەبرێت.

ئافراندنی ئەم گۆڕانکارییە؛ لەنێو کۆمەڵگایەکدا سانایی نییە کە لەژێر کاریگەری جیهانی ئەو خوداوەندانە دایە کە تاقانەیە، بێ جوڵەیە، دوور لە خولقکارییە و خاوەنی دەسەڵاتێکی ڕەهایە و بەردەوام یەکلایەنە دەجوڵێتەوە. کەسایەتی و پێکهاتەیەکی هزری و ڕۆحی، کە بە یاساکانی سەردەمی نئۆلیتیك و یاساکانی خوداوەندەکانی سەردەمی کۆیلەداری دەربازبووە کە مرۆڤ تێیدا خاوەنی سێبەری خۆشی نەبووە، بەمجۆرە پێکهاتەیەکی ڕۆحی کە خاوەنی هزرێکی ٣٠٠٠ ساڵی بێت پێی بڵێی **"هەڵسە سەرپێ، خاوەنداری لە ئیرادە و هزری خۆت بکە و بەرێز بە"** شۆڕشێکی ئەخلاقی و هزری زۆر ئاستەمە. بەڵێ ئەمەیە دەسکەوتی زەردەشت بۆ شارستانییەت، کە ڕۆژبەڕۆژ ڕاستینە و گرنگییەکەی زیاتر ئاشکرا دەبێت.

زاراوەی خودای باشە **ئاهورا ـ مەزدا** و خودای خراپە **ئەهریمان**، لە باوەڕی زەردەشت بە واتای ئەوە دێت کە ئەم ڕاستینەیە بە گوزارشتێکی ئایینی گەیەنراوە. بەڵام ئەمانە خاڵە گرنگەکانی مەسەلەکە نین. لەبەر ئەوەی وتەکانی ئایدیۆلۆژیای قۆناخ پێویستی بە قاڵبی بەمجۆرە بوو زەردەشت هەمان تەرمۆنۆلۆژی وشەزانین بەکاردێنێ. ئەوەی ئەنجامیداوە لە گەوهەری خۆیدا شۆڕشێکی فەلسەفییە. ئەوەی لە نێو کۆمەڵگاشدا ئەنجامدراوە، شۆڕشێکی مەزنی ئەخلاقییە. هەندێ ئەنجام پراکتیکەکانی دەزانرێ. دەخوازێ کۆتایی بە پێشکەشکردنی قوربانی بێنێت کە پاشماوەی ئایینە سەرەتاییەکانی سروشتە. خۆشەویستییەکی مەزنی بۆ ئاژەڵ هەیە. دەڵێ با ئەم بوونەوەرانە نەکەین بە قوربانی کە لە نێو ژیاندا سوودبەخشن. لەهەمانکاتدا پێغەمبەری کشتوکاڵە. گرنگییەکی مەزن بە جووتیاری دەدات. تامەزرۆی کشتوکاڵە. لەگەڵ ژنێکی (خێزانێکی) کامڵدا خاوەن بەهێزترین گوزارشتی ئەخلاقی ژیانە. ژیانێکی هاوبەش لەگەڵ ژنێکی خاوەن ئیرادەیەکی ئازاد و لە نێو پێوانەی یەکسان، بە گەورەترین بەختەوەری لە قەڵەمدەدات. لە هیچ سیستەمێکدا چەمکێکی هێندە بەهاداری سەبارەت بە ژن نەبینراوە. پەیوەندی لەگەڵ ڕەنج پتەو و دروستە. بەهێزترین نوێنەری چەمکی بەختەوەرییە کە لەمیانەی ئارەقەی نێوچاوانەوە بە دیدێت. تاوەکو دوایی گرێدراوی ڕووناکی و تیشکە. هەست بە جوانی ژن دەکات. هەڵوێست وەرگرتن دژی تاریکایی و سەرمای کردووە بە تایبەتمەندێتی سەرەکی فەلسەفەکەی.

بێگومان شیکردنەوەی **"گۆتا"**کانی زەردەشت و ئەو باوەڕییە ئایینییانەی دراوەتە پاڵی کاریگەرییەکی پسپۆری و شارەزاییانە؛ بەڵام گومان لەوەدا نییە کە هێڵە گشتییەکانی بەمجۆرەیە. هەروەها دەزانرێ کە هەڵوێستە ئەخلاقی و هزرییەکانی تەواونەکراوە. کاتێك ئەمەش بێنینە بەرچاوان کە تەواونەکرا و نەبوو بە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی، ئەو کات بۆمان دەردەکەوێت هزری زەردەشت چەندە مەزن بووە، کە گەیشتنی یەکێتی دژەکان بە سەنتێز و خاوەندارێتی کردنی تاکی ئازادی ڕۆژگاری ئەمڕۆمانی بە بنەماگرتووە. هەروەها دەبێ ئاماژە بەوەش بکرێت تاوەکو ئێستاش کاریگەرییەکانی بەسەر ئەو کۆمەڵگایانەدا بەردەوامە کە تێیدا ژیاوە یاخود پێشتر کاریگەری لێکردووە.

هەروەها بەمجۆرە ئەنجامە سیاسییەکانی زەردەشت و ئەوانەی دوای ئەو هاتن و نوێنەرایەتی زەردەشتێتیان کرد، درەنگ نەدەکەوت.

کاتێك هەلومەرجی سیاسی کولتوورییەکانی بنەماکانی دەرکەوتنی ماد ـ پارس هەڵدەسەنگێنین، بە ئەندازەی ئەوەی پێویستە هەندێ شێوازی چەوتی بەلاوەبنرێت، ئەوا بە بنەماگرتنی هێلە گشتییەکانی زانیارییەکی ڕاست زۆر گرنگە. لە ڕەوشێکی پێچەوانەدا بەهای چارەسەری ئامێزانەی ئەم پێهەڵگرتنە بە شێوەیەکی ڕاست دەرکی پێناکرێ کە لە

جیابوونەوەی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی ناویندا ڕۆڵی کلیلی بینیوە. لە کاتێکدا ئەم قەڵەمبازە قۆناخێکی نوێ دەستپێدەکات، ئەوا پێشکەوتنی شارستانییەتی یۆنان ـ ڕۆمای ڕۆژئاوای خێراکردووە، لە ڕۆژهەڵاتیش ڕۆڵێکی سەرەکی لەوەدا بینیوە کە شارستانییەتی کۆیلەداری چین و هیندستان وەکو نموونەی بەر لە خۆیان **"هەراپا"** نەخنکێن و بە پێچەوانەوە بکەونە نێو قۆناخی پێگەیشتنێکی هەمیشەیی. تێروانینێکی گشتی پەسندکراوی بەمجۆرە هەیە ئەگەر ئەم ئەڵقەیە نەبوایە، ئەوا شارستانییەتی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات نەدەخولقان یاخود بە ڕێڕەوێکی زۆر جیاوازتردا دەڕۆیشتن. ئەم تایبەتمەندێتیەش تەنیا بەهۆی شوێنگە جوگرافییەکەیەوە نییە، بەڵکو لە نزیکەوە پەیوەندی بە گەوهەرەوە هەیە. ئەم ریفۆرمە ئەخلاقی و ئایدیۆلۆژیەی هەوڵماندا وەکو داب و نەریتی زەردەشت پێناسەی بکەین، زیاتر لەوەی مەزەندە دەکرا، جیا بوونەوەی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا ئاراستە دەکات و لەپێناو بەدیهێنانێتی. سیستەمی کۆیلەداری سۆمەر و میسر و هەنگاوەکانی شارستانییەتی کە ئەوانیان بە بنەماگرت بە درێژایی ٣٠٠٠ ساڵ کۆیلایەتی ڕەهایان بەسەر پێکهاتەی هزری و ڕۆحی مرۆڤایەتیدا نەخشاند و لەسەر ئەم بنەمایەش بوون بە دەوڵەت و هەموو جۆرە باڵادەستییەکان بەڕێوە بردووە. سەبارەت بە لایەنی ئازادی ڕەوشێکی مرۆڤایەتی زۆر لەسەردەمی نئۆلیتیك پاشکەوتووتر خولقێنراوە. ئەوانەی ئەم ڕەوشەیان خولقاند هەزار و یەك شێوازی فێڵبازی و تەڵەکەبازییان پێشخست کە تا ئەو کاتە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا نموونەی نەبینرابوو، لەمیانەی دەمامکێکی ئایدیۆلۆژیانەی سەرسووڕهێنەرەوە توانیان بە ناوی **"سیستەمی ئاسمان و بەڕێوەبەرەکانی جیهانی خوداوەندەکان"** بیکەن بە ئایدیۆلۆژیـایـەکـی **"قـەدەر"**. ئەمەش بە بەهای کەوتنێکی مەزنی ئاستی ئازادی مرۆڤایەتییەوە ئەنجامدرا؛ لە لایەکەوە خاوەنەکانی سیستەمی کۆیلەداری هەن، کە هەر وتەیەکی لە زاریان دەربکەوێت دەبێ وەکو ئیرادەی خوداوەند دەرکی پێبکرێت و پەیڕەو بکرێت؛ لە لایەکەی دیکەشەوە سیستەمی مرۆڤە بەندە ـ کۆیلەکان کە ناتوانێ لە سێبەری خۆشی بە خاوەن دەرکەوێت و لە ئامرازێکی بەرهەمهێنان زیاتر هیچ بەهایەکی دیکەیان نییە.

بێگومان بەردەوام بەرخودان بەرامبەر ئەم سیستەمە لە ئارادابووە. هەروەکو کتێبە پیرۆزەکان نووسیویانە ئەم سیستەمە لەمیانەی ئیرادەی خوداوەندە مەزنەکان بەڕێوە نەچووە. هەر هەنگاوێکی ستەمکاری مەزن، درۆ و چەوسانەوە ڕووبەڕووی هەنگاوەکانی بەرخودان و تێکۆشانی ڕاستی و بەدەستهێنانی ماف دەبێتەوە. لێرەشدا بە شێوەیەکی بێڕەحمانە یاسای یەکێتی دژەکانی پێشکەوتن پەیڕەوکراوە. بەڵام بۆ یەکەم جار بە واتای کردنەوەی قۆناخێکی نوێیە لە مێژوودا، سەرکەوتنی ماد ـ پارس جێگای باسە. لە ئەنجامدا ئەم هەنگاوەش کەوتۆتە نێو پراتیك و لۆژیکی سیستەمی دەسەڵاتدار. سیستەمی سیاسی کۆمەڵایەتی دەسەڵاتدار نەڕووخێنراوە و سیستەمێکی نوێ لە جێگای ئاوا نەکراوە. لێرەدا شێوازی بەرهەمهێنان ڕۆڵێکی سەرەکی بینیوە. بەڵام دیسان گومان لەوەدا نییە کە خواستی لە کەسایەتی ئاشووریەکاندا ڕۆژهەڵاتی ناوین و تەواوی مرۆڤایەتی لە کردارە هۆڤییەتێکانی سیستەمی کۆیلەداری ٣٠٠٠ ساڵی ڕزگاربکات، ئەم سیستەمە بڕووخێنێ و لەمیانەی ئەنجامدانی ریفۆرم، دەرفەتی هەناسەدان بۆ مرۆڤایەتی برەخسێنێ و سیستەمێکی نەرمی کۆیلەداری بێنێتەئاراوە، بەمجۆرەش گومان لەوەدا نییە کە هەڵمەتێکی مێژووییە. هەروەها گومان لەوەشدا نییە ڕێگای لەپێش دووڕیانی مەزنی مێژوو کردۆتەوە و لە ئاکامی پەیڕەوکردنی یاسای یەکێتی دژەکان لە ئاستێکی بڵندتری شارستانییەتدا قۆناخێکی نوێی خولقاندووە. بەمجۆرە پێناسەکردنی ڕۆڵی ماد ـ پارس، لە مێژوودا واقیعیترین گوزارەکردنە.

وەکو پێشکەوتنێکی مێژوویی بەرجەستە تێروانینێکی گشتی و پەسندکراوی بەمجۆرە هەیە ڕێکخستنی ماد قۆناخی کۆنفیدراسیۆنی خێڵەکان پێکدێنێت. ئەم ڕێکخستنە خواستوویەتی لە ئەکبەتان ببێت بە سەنتەر. هاتنیان بۆ سەر شانۆی مێژوو بە شێوەیەکی سەرەکی لە سایەی ئەو ڕێککەوتنانە بووە کە پێشتر گۆتییەکان و کاسیتەکان بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە تاقیان کردبۆوە. ڕێککەوتنی بابل ـ ماد کە بەردەوام لەگەڵ ئاشووریەکان لە نێو کێشمەکێش و پێشبڕکێدا بوونە، لە ساڵی ٦١٢ پ.ز بە ڕووخاندن و سووتاندنی نەینەوای پایتەخت ئەنجامگیر بووە. لە لایەکەو ڕێگای بابل ئاواڵا بوو کە پشت بە چەمکی ناوەندی سۆمەر دەبەستێ، لە لاکەی دیکەشەوە هەڵکشانی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی زاگرۆس شانسی پێشکەوتنێکی گرنگ و پێکهێنانی قۆناخێکی نوێی مێژوویی ڕەخساندووە. ئەم هەڵکشانەی لەسەردەمی پێشکەوتنی شارستانییەتی سۆمەر؛ ئیلامییەکان، گۆتییەکان، کاسیتەکان، هۆرییەکان، میتانییەکان و ئورارتووییەکانی هێنایە سەر شانۆی مێژوو؛ لەمیانەی داب و نەریتی بەرخودانی خەڵك بەخێوکراوە کە وەکو ئەفسانەی **"کاوەی ئاسنگەر"**هێنراونەتە زمان و بەردەوام لە هزری خەڵکدا ماوە و سەنتێزکردنی لەگەڵ شۆڕشی ئیرادە ـ ئەخلاقی زەردەشتی پشت بە زەمینەیەکی مێژوویی دەبەستێ. ئەوەی دەمێنێتەوە وردەکارییە و پێویستی بە بەڵگەیە و کاری لێتوێژینەوەی مێژووە.

ڕەهەندێکی دیکەی گرنگی ئەم ڕاستینەیە دیاردەی **"پارس"**ە کە بۆ یەکەم جار جیا دەبێتەوە و لە ژێر ناوی خۆیەوە دەردەکەوێتە سەر شانۆی مێژوو. خزمایەتی پارسەکان لەگەڵ مادەکان دەزانرێت. هەروەها ئەوە سەلمێنراوە مادەکان و ئەوانەی بەر لەوانیش کە بە شێوەیەکی گشتی بە هۆرییە ئاریانییەکان دەناسرێن، باپیرانی کوردەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمانن. هەروەها تێروانینێکی گشتی و پەسندکراوی بەمجۆرە هەیە پێناسەی گۆتی، کاسیت، میتانی، ئورارتوویی و گەلەکانی دیکە ناوی جیاجیان کە لە قۆناخە جیاوازەکان لە هەمان گروپی کولتووری و زمان نراوە. پارسەکانی تاوەکو سەردەمی ڕێکخستنەکانی مادەکان وەکو ناو خۆیان نەسەلماندبوو، دەرکەوتنە پێشیان، لەم مێژووەدا لەمیانەی یاسای بڵاوبوونەوەی شارستانییەت دەرکی پێدەکرێت. ڕەوشی خزمایەتی یەکجار نزیکی نێوان زمان و کولتوورەکانیان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا زۆر بە سانایی لە جوگرافیای ئێرانی فارس و هەرێمی کوردستاندا دەبینرێت. هەروەکو دیارە لە قۆناخەکانی پێشووی مێژوودا زێدە لە یەکتری جیانەبووبوونەوە و لەناو سیستەمێکی هاوبەشدا بوون و ئەو گروپە ئاریانییانەش لە ناو ئەمەدا جێدەگرن کە دواتر بەرەو هیندستان و هەرێمەکانی دیکەی ڕۆژهەڵات کۆچیان کرد. جیابوونەوەی سەرەکی لە ساڵانی ١٥٠٠ پ.ز هاتۆتەئاراوە. هەروەها ئەمەش لە مێژوودا جێگیرە کە لەم گروپانە ئەوانەی باکووری ڕۆژئاوای ئێران بە مادەکان، ئەوانەی باکووری ڕۆژهەڵات بە پـایـیـدەکان، ئـەوانـەی ناوین ـ باشووری ڕۆژئاوا پارسەکان، ئەوانەی باشووری ڕۆژهەڵات بە بەلوجیەکان ناودەبرێن. بڵاوبوونەوەی ئاریانەکان لە ئەفغانستان و هیندستان وەکو بەردەوامکردنی ئەم گروپانەیە. ئەو توێژانەی لەم جیابوونەوە (یەکلابوونەوە) هەم نزیکی نئۆلیتیك، هەم نزیکی ناوەندەکانی شارستانیسەتی سۆمەرە مادەکانن. کەواتە بەهۆی شوێنگە جوگرافییەکەیان ئەوانەی بە پێی دەربازبوونی کات بەهێزبوونە و بەردەوام ناچاربوونە بەرەنگاری ئەکەد ـ بابل ـ ئاشوور ببنەوە، گروپ و تیرەکانی ماد بوون. ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووریش ئەوەی نیشانداوە ڕاستینەی ماد شتێکی ڕووکاری و لەخۆڕا نییە، بەڵکو گرێدانی خۆی بە پێکهاتەیەکی مێژوویی بەرفراوان و درێژخایەن هەیە. تەواوی بەڵگە مێژووییەکان ئاماژەی پێدەکەن.

بابەتێکی دەرکی پێدەکرێت ئەوەیە کە پارسەکان لەم قۆناخە مێژووییە درێژخایەنەدا لە پەلوپۆ نەکەوتن و بەردەوام لە ڕێگای کەناڵی میدیا بەهێزبوون. شتی گرنگتریش ئەوەیە کە تێپەڕاندنی کۆنفیدراسیۆنی خێڵەکان و دامەزراندنی شارستانییەتێکی ناوەندی لەلایەن مادەکان، هاوسەنگییەکەی نێوانیان تێکدەدات. مێژوو ئەوەی دەستنیشانکردووە ئەو کۆنفیدراسیۆنە پارسەکانیش جێگایان تێداگرتبوو و کاتێك مادەکان بەرەو دەوڵەتێکی ناوەندی هەنگاویان هاوێشت، ڕووبەڕووی کودەتایەکی پارسەکان بوونەوە. هەربۆیە کاتێك دواترین سەرۆکی کۆنفیدراسیۆنی ماد ـ فارس ئاستیاك لەلایەنی خوشکەزاکەی کیرۆس (کوراس) لە ڕێی کودەتایەکی ناو کۆشك لە دەسەڵات دەکەوێت، دەسەڵات دەکەوێتە دەست بنەماڵەی ئەخمینییەکانی پارس. هەرچەندە زۆربەی مێژوونووسان ئەم قۆناخە وەکو ژێرکەوتنی مادەکان و سەرکەوتنی پارسەکان نیشاندەدەن، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەو هەڵوێستە لەبواری شێوازدا واقیعی نییە. ئەوەی ڕوویداوە گۆڕینی دەسەڵاتی خانەدانێکە بۆ خانەدانێکی دیکە. پێشکەشکردنی ئەم گۆڕانکارییە وەکو ژێرکەوتنی کۆمەڵەیەکی ئەتنیکی کەموکوڕیەکی مەزنە و بۆچوونێکی چەوتە. لە سیستەمی دواتر مادەکان و پارسەکان لە هەمان ئاستدا لە ڕێزی یەکەم جێگای خۆیان دەگرن. تەنانەت هیرۆدۆت بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئاماژە بە گەوهەری ڕێکخستنی دەوڵەتی ئەو قۆناخە دەکات. لە هەمان ڕێز و ئاستدا جێگرتنی پارس و مادەکان لەنێو ئیمپراتۆرییەتی پارس کە لە" ٢٤والی هەرێمی پێکهاتبوو"، نیشان دەدات خاوەنی

پێکهاتەیەکی ئەتنیکی هاوبەش بوون. ناکۆکی لە نێوان هەندێ سەرۆکەکانی ماد و راهیبە موغ(ماگ)ەکانی مادەکاندایە. ئەم رەوشەش بەردەوام رێ لەپێش یاخیبوون و کوشتار دەکاتەوە. بە کورتی بەمجۆرە تەماشاکردنی دیالەکتیکی پەیوەندی نێوان ماد ـ پارس ئەنجامی راستتر لەگەڵ خۆی دێنێ.

مێژووی دەسەڵاتی خانەدانی ئەخمینییەکانی پارس لە ساڵانی ٥٥٠ ی پ.ز بە کرۆش دەستپێدەکات. لە ماوەیەکی کورتدا ڤەبوونێکی مەزن ئەنجامدەدات. لە ساڵی ٥٣٩ دوای ئەوەی بابل بە خۆیەوە گرێدەدات، بۆ یەکەمین جار ناوەندی شارستانییەت لە میزۆپۆتامیا دەردەکەوێت و بۆ پارسەپۆلیس دەگوازرێتەوە. لە کۆتایی سەدەدا دەست بەسەر میسر و لە رۆژئاواش تەواوی ئەنادۆڵ دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و دەگاتە بەر دەروازەکانی ئەتینا، بۆ یەکەمین جار لە قەفقاسیا ولایەتی هەرێمی ئەرمەنییەکانی پێکهێناوە و گەیشتۆتە دەریای رەش و قەزوین، لە رۆژهەڵاتی دوور گەیشتۆتە پارتییە، ئەفغانستان و هیندستان بەمجۆرە تا ئەو قۆناخە گەورەترین رێکخستنی سیاسی ئاواکراوە. ئەوەی لە ژێر ئەم پێشکەوتنە مێژووییە مەزن و خێراییە شاراوەیە، بە ئەندازەی ئەو زەمینە بەهێز و دەوڵەمەندە مێژوویی و کولتوورییەی کە پشتی پێدەبەستێ، بە بەراوردکردن لەگەڵ ئاشووریەکان رۆڵی شێوازی نەرم و ئاقڵمەندانە زۆر دیاریکراوە. لە شێوازی بەڕێوەبردنی ئاشووریەکاندا دەست لەوە بەردە نەیهێشتووە پێکهاتە ئەتنیکییەکان هەناسەبدەن، بەڵکو ئەمانە لە شوێنی خۆیان دەربەدەرکران و ئەو کەسانە لە جێگایان نیشتەجێکران کە پەیوەندی بەندە و کۆیلایەتیان پەسند کردووە. بەڵام هەرچی پارسەکان بوون بە پێچەوانەوە، تەنیا بەمە نەدەوەستان کە لە وڵاتی خۆیان بمێننەوە، بەڵکو لە ئاستی میرنشینیدا بەشی خۆبەڕێوەبردنی بۆ دەهێشتنەوە. هەر گروپێکی ئەتنیکی یاخود قەومێك، میرنشینی خۆی پێکدەهێنا، جگە لە حوکمی سەرانە و باج و سەرباز، بە تەواوی سەربەست بوون.

بێگومان ئیمپراتۆرییەت هەندێ تایبەتمەندێتی دیکەی تایبەت بە خۆی هەیە. لەمیانەی باشی تۆڕی هەواڵ و گەیاندن کۆنترۆڵ زۆر بە کاریگەرە. لە شاری بەناوبانگی (ساردی) کەنارەکانی ئیگەوە دەستیان پێکردووە تاوەکو پرس پۆلیس بە شێوەیەکی موکەمەل رێگا دروستکراوە. گروپە سوارییەکانی بە شێوەیەکی رۆژانە ئامادەبوون، دەیانتوانی لە ماوەی نەوەد رۆژ لە ساردەوە هەواڵ بگەیەننە پرس پۆلیس. بە گوێرەی ئەو قۆناخە ئەمە خێراییەکی مەزنبوو. پێکهاتە بیرۆکراسییەکان زیاتر پێشکەوتووە. گرنگترین نوێبوونەوەش ئەوەیە کە میتۆلۆژیا (ئەفسانە)ی سۆمەریەکان تێپەڕێندراوە و لەسەر بنەمای داب و نەریتی زەردەشت باوەڕی خوداوەندی مەزن **مەزدا** جێگیر کراوە. هەر لەبەر ئەوەی لە بابل کۆتایی بە دوور خستنەوەیان هات عیبرانییەکان رێزیان لە پارسەکان دەنا و پێشکەوتنی کولتووری تاکخودایی، تا رادەیەکی مەزن لە ژێر کاریگەری باوەڕی مەزدا پێشکەوتووە. تەنانەت پارتییەکی بەهێزی عیبرانییە فارسییەکان پێکهێنراوە کە لایەنگری پارسەکان بوون و تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان وەکو رەچەڵەکێك لە ناو ئیسرائیلییەکان بەردەوامی بە هەبوونی خۆیان دەدەن.

هەندێ بەڵگەی زمانناسی ئەمەیان روون کردۆتەوە، حەزرەتی ئیبراهیم کە بە دامەزرێنەرە یەکەمینەکانی کولتووری عیبرانی دادەنرێت تەنیا سەرۆکی تیرەی عیبرانی نەبووە، لەگەڵ هۆرییەکان لە نێو پەیوەندییەکی نزیکدابوو کە لەم قۆناخەدا گروپی ئەتنیکی دەسەڵاتداری ئورفا بوون، هەروەها نزیکبوونەوەی راست ئەوەیە کولتووری عیبرانی کاریگەرێتی داب و نەریتی ئیبراهیمی کراوەتە سەر. بە کورتی رۆڵی کولتووری هۆری و پارسەکان لەپێشکەوتنی ئایینی تاکخودایی زۆر گرنگە و شایستەی لێکۆڵینەوەیە. قۆناخی ئیمپراتۆرییەتی پارس، بۆ تەواوی کۆمەڵە سیاسی و ئەتنیکییەکانی رۆژهەڵاتی ناوین بۆتە دەرفەتی هەناسەدان. ئەم قۆناخە رۆڵێکی گرنگی لەوەدا بینیوە جەژنی نەورۆز وەکو جەژنی ئازادی پیرۆزبکرێ. لە بواری زیندوویی و پێشکەوتندا تەواوی کولتوورەکان هەنگاویان هاوێشتووە. لە کولتووری سیاسیدا، رەوابوون بە میرنشینەکان دراوە. لەم قۆناخەدا میرنشینی و سیستەمی میرێتی زیاتر دەرکەوتۆتە پێش. سیستەمی کۆیلەداری بە تەواوەتی بەلاوە نەنراوە، بەڵام دیارە کە نەرمکراوە و لەسەر بنەمای نوێبوونەوە، بە ریفۆرمدا دەربازبووە. بە شێوەیەکی سەرەکیش سیستەم هێزی خۆی لەم گۆڕانکارییە سیاسیانەوە دەگرێت. هەروەکو چۆن ناڕەزایی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتییەکی بەمجۆرە کەمە، چەندین پێکهاتەی نوێ کە لە نێو تەنگەتاویدابوون چاوەڕوانی پشتگیرییان کردووە. نموونەی ئەمانە بێ ژمارن و بەڵگە کراون. جگە لە کێشمەکێشی خانەدانی مادەکان، نەبوونی یاخیبوونی ناوخۆ ئەم بابەتە پشت راست دەکاتەوە.

کێشمەکێشی سەرەکی پارسەکان لە نیمچە دوورگەی یۆنانە. لە رۆژهەڵات بەرەو چین و هیندستان رۆڵی پێشکەوتووخوازی دەگێڕێ و بەردەوام بەرەو پێشەوە دەچێت. هەمان پێشکەوتن لە ناوەندە کۆنەکانی میسر و سۆمەریش درێژە پێدەدات. دیسان خاوەن پایەی پێشکەوتووخوازییە. گەلێك گروپی خۆجێیی و کولتووری ئەتنیکی دووچاری گۆڕانکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکات و پێشکەوتنی مەزن دێنێتەئاراوە. کاتێك ئەم گەوهەرە پێشکەوتووخوازانەی رێگا لەپێش هێزی زەبەلاحی ئیمپراتۆرییەت دەکاتەوە، ئەوا لەهەمانکاتدا بە واتای تێکدانی هاوسەنگی و کرۆنیکبوونی دێت و پێبەپێ موحافەزەکاری لەگەڵ خۆیدا دێنێ. سیستەم بە گوێرەی سیستەمی ئاشووریەکان پێشکەوتووە، بەڵام بە گوێرەی سیستەمی ئەنادۆڵی رۆژئاوا و نیمچە دوورگەی یۆنان بە پاشکەوتوویی ماوەتەوە. هەروەکو چۆن راهیبە موغەکانی ماد و ریفۆرمخوازی زەردەشت هەویری ئایدیۆلۆژی بەرزبوونەوەی ماد ـ پارسەکانن، ئەوا لێگەڕینی فەلسەفی و ئایدیۆلۆژی ئەنادۆڵی رۆژئاوا کە بە تالاسی خەڵکی میلت دەستپێکرد، رۆڵی هەویری هەڵکشانی شارستانییەتی رۆما دەبینێ. وەکو هزرێکی ئاقڵمەندانەتر بە بەراوردکردن لەگەڵ هزری پارسەکان، فەلسەفە پێشکەوتنێکی مەزن بە خۆوە دەبینێ. لە راستیدا بەکارهێنان و سوودوەرگرتن لە شاکارەکانی میتۆلۆژیای بابل و ریفۆرمی ئەخلاقی زەردەشت رۆڵێکی مەزن دەبینێ. تەواوی فەیلەسوفەکانی هێلین لەو کەسایەتییانە پێکهاتوون کە بۆ ماوەیەکی درێژ لەم ناوەندانە ماوەنەتەوە و پەروەردەیان بینیوە. ئەوەی ئەنجامیانداوە، قەڵەمبازێکی هزرییە لەمیانەی پشت بەستن بەم توانستە بەرفراوانانە. لە هەڵسوکەوتی مرۆڤ واتا لە بواری ئەخلاقی و ئیرادەی مرۆڤ هەڵمەتی ئازادییە. بە شێوەیەکی زەق لە ئەدەبیاتی یۆناندا دەبینرێ کە کاریگەربوون و کاردانەوە لە ئاستێکی بەرچاودا روویداوە. گەلێك لەم شاکارانە بابەت و ناوەکەشی لەم پەیوەندی و ناکۆکییانەوە وەردەگرێت. هەڵمەتێکی مەزنی ئایدیۆلۆژی بەرامبەر بە هێرشەکانی پارسەکان بەڕێوەدەچێ. سەرباری ئەوەی هیرۆدیت جێگای خۆی لە جەمسەری بەرامبەر دەگرێ، بەڵام بە تایبەتی کتێبی بە ناوی مێژوو ئەم بابەتە بە شێوەیەکی فراوان و بە گوێرەی گرنگی و بایەخەکەیەوە نیشاندەدات. باڵابوونی پارسەکان لە بواری سەربازی و سیاسی مسۆگەرە. خودی ئەتینا زۆر بە زەحمەتی توانیویەتی لە کەوتن رزگاری بێت. بەڵام ئەم رەوشە مەترسیدارەی لە ئاردابوو، گەلێك پێشکەوتن دێنێتەئاراوە کە تا ئەو قۆناخە بیری لێنەدەکراوە و ئەنجام نەدرابوو. لەم نێوانەدا پێشکەوتنەکان بە شێوەی یەکێتی ئەسپارتا ـ ئەتینا، هەروەها لەمیانەی پادشا ڤیلیپێس بڵاوبوونەوە تاوەکو باکووری مەکەدۆنیا دەچێ. بێگومان مەزنبوونی هەڕەشە و مەترسی فاکتەرێکی سەرەکی ناچار کردنە. بەڵام بەو ئەندازەیەش رۆڵی هەڵکشانی ئایدیۆلۆژی گرنگە و مەزنە. کێشمەکێشی پارس ـ یۆنان درێژخایەنە؛ لە راستیدا لە نزیکەوە پابەندی دووڕیانی شارستانییەتە.

کاتێك پارسەکان لەو گەوهەرەی خۆیان نامۆبوون کە رێگای رۆژئاوای کردەوە و قەڵەمبازی رێبازی تاکی خاوەن ئیرادەی ئازادی ئەنجامدا، هەروەها دوای ئەوەی خۆیان کردە ئیرادەی رەها و خوداوەند، ئەوا رێگایان لەپێش هۆکارە ئایدیۆلۆژییەکانی دۆڕاندنیش کردەوە. نەدەشیا دەسپۆتیزمێکی هاوشێوەی مۆنارشییەتەکانی سۆمەر و میسر بەرامبەر بەو دیموکراسییە سەربکەوێت کە لە یۆنان و ئەتینا ئاواکرابوو. بە واتایەکی دیکە پێکدادان لە نێوان دەسپۆتیزمی پرس پۆلیس و دیموکراسییەتی ئەتینا بوو. ئەگەر لە دیدگایەکی فراوانترەوە تەماشای بکەین دەبینین پێکدادانێکی جددی نێوان هەر دوو رێی تازە جیابووەی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوایە. سەرەڕای ئەوەی سەرەتا لە بواری چەندایەتی هێزی سەربازی و سیاسی زۆر لاوازبوو، لەمیانەی پێشەنگایەتی ئایدیۆلۆژی لە ماوەیەکی کورتدا باڵا بوونی تەکتیکە سیاسی و سەربازییەکان کاریگەری خۆی نیشاندا و لە رێگای ئەسکەندەری مەزن کولتووری هێلینیزم بە خێراییەکی بروسك ئاسا کاروانی سەرکەوتنی دەستپێکرد و تا هیندستان چوو. ئەسکەندەر زۆر لاوە، بەڵام گەنجینەی ئەقڵی ئەرستۆ لە پشتییەوەیە. هەروەکو ناپلیۆنیش زۆر بە ئاشکرایی ئاماژەی پێکردووە ئەوەی ئەنجام دیاری دەکات ئەقڵی نوێ و هێزی ئیرادە و ئەو نەخشە و تەکتیکانەیە کە لەسەر ئەم بنەمایە پێشدەخرێت. لە سەردەمی شۆڕشی بۆرژوازیدا، ناپلیۆنیش پێشکەوتنێکی خێرای بەمجۆرەی ئەنجامداوە.

سەربارى ئەوەى پێكهاتەى ئیمپراتۆرییەتی پارس دەزگاى مەزنبوو، بەڵام سست و موحافەزەكارن. لە ڕەوشێكی بەمجۆرەدا نییە كە نوێبوونەوەیەكی هاوشێوازی یۆنانییەكان ئەنجامبدات. گەوهەر و داخوازییەكی بەمجۆرەش نییە. لەدەستدانی گەوهەرەكەی دەستپێك لە زووەوە ئەم شانسەی لەدەستداون. تەنیا لەم كورتە باسەشدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە شارستانییەتی یۆنان لەمیانەی شێوازەكانی كاریگەری و كاردانەوەی تایبەت بە خۆی، بە ڕادەیەكی مەزن پێشكەوتنەكانی خۆی گرێدراو بە ڕاستینەی پارسەكان ئەنجامداوە. بەردەوام شێوازێكی پەیوەندی دیالەكتیكیانە لە نێوان سەركەوتوو و ژێركەوتووەكاندا هەیە. ئەگەر ئەم پەیوەندییە نەبێت بردنەوە و دۆڕاندنیش هیچ واتایەكی نابێت. هیچ كاتێك هۆكارەكانی ڕێ لە پێش بردنەوە و دۆڕاندن دەكەنەوە سەرچاوەی خۆی لە یەكلایەنەوە وەرناگرێت. ئەوەی بە شێوەی پارس ـ یۆنان، ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا لە كاروانی مەزنی مێژوو ڕووبەڕوومان بۆتەوە، حوكم و فەرمانی ئەم یاسایەیە.

هەرچەندە بە شێوەیەكی زێدەڕۆییش باس بكرێت، ئەوەی لە كاروانی ئەسكەندەری مەزندا زاڵە لەلایەنی سەربازی و سیاسی زیاتر لایەنی كولتوورییە. ئامرازە سیاسی و سەربازییەكان ڕۆڵی پردێكی بچووك دەبینن. هەلومەرجی لەپێشینەن؛ بەڵام ئەو لایەنەی هەمیشەییتر و بە كاریگەرترە و زیاتر ڕۆڵی ئاراستەكردن دەبینێ كولتوورە. كولتووری هەلە لەمیانەی شێوازی هزری و فەلسەفی لە ئاستێكی زۆر پێشكەوتووتر دایە. ئەو دەزگایانەی پاشماوەی سۆمەر و میسرن شانسی وەڵامدانەوەی پێداویستییەكانی ئەم پێشكەوتنەیان هێندە كەمە دەتوانی بڵێی نییە. هەروەها ریفۆرمی سنووردارى ماد ـ پارسەكانیش

لەسەردەمی یۆنان و ڕۆما وەڵامی ئەم پێشكەوتنانە نەداتەوە، واتا لە ساڵانی٣٠٠ پ.ز تاوەكو ٣٠٠ ی زایین سەردەمی كولتووری هێلینی بە ئەسكەندەری مەزنەوە دەستیپێكرد، لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا قۆناخێكی نوێیە. یەكەمین سەنتێزی مەزنی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوایە. وەكو ناوەندی ئەو كولتوورەی كە شوێن پەنجەی هەمیشەیی خۆی بەجێهێشتووە، ئەسكەندەرییەی ـ میسر، بەرگامەی ـ ئەنادۆڵ، كیتەسیتۆمی ـ دیجلە و یەكینە ورد و درشتەكانی شارەكانی دیكە ڕێگایان لەپێش نوێبوونەوەی مێژوویی كردۆتەوە. شاری "زاوگما"ی فورات كە بۆتە بابەتێكی زانیاری گرتن، بۆ ئەم قۆناخە دەگەڕێتەوە. دەتوانرێ بگوترێ كە ڕۆژهەڵاتی ناوین؛ لەم قۆناخەدا چەمكی ئەمجۆرە شارەی ناسیوە كە خاوەنی گەرماو، شانۆ و بازار و قوتابخانەن. بازارێك ئاواكراوە كە لە ڕۆماوە بۆ هیندستان و چین لە نێو جموجۆڵدابوو. چینی بازرگانیش لەمیانەی سەربەخۆ بوون و مەزنبوونەوە گەشەیسەندووە. گەلێك لقی پیشەكاری بە سەربەخۆیی خۆی گەیشتووە. بەر لە هەموویان بازاری كڕین و فرۆشتنی كۆیلەكان، بازاری گەورەی ماڵ و كەلوپەل ئاواكراوە. جیهانی ئایدیۆلۆژیا لە دۆگماتیزم ڕزگاربیووە و هزر و ئایینزاكان هەرەس ئاسا گەشەیان كردووە. سیستەمی كۆیلایەتی و ئەخلاقی جاران بەلاوەنراوە كە پشتی بە دۆگماتیزم و پێكهاتەی ئەتنیكی دەبەست، لە جیاتی ئەو لەسەر بنەمای پێكهاتەی هزری و باوەڕی قۆناخی جۆرێكی نوێی پێكهاتەی كۆمەڵایەتی و لێشاوی سۆفیگەرایی لە ناوەوە دەستیپێكردووە.

لە كاتێكدا شتی كۆن لەمیانەی فێربوونەوە بە دەستدێت، ئەوا چەندین نوێكاریش دەخوڵقێ. ئەمەیە ئەو جیهانە نوێیەی سەنتێزی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا هێناوییەتە ئاراوە. بێگومان لێرەدا لەگەڵ كاریگەری پارسەكان بە تایبەتیش كاریگەری قۆناخی دەستپێك، ئەوا باڵابوونی كولتووری هێلین بەسەر كولتووری خۆجێیی و ڕێكردنەوەی لەپێش نوێكاری ڕۆڵەكەی سەرەكییە. لە قۆناخی دواتری ڕۆمادا ئەو هەڵكشانە نوێیەی ئێران ڕۆژهەڵاتی پارتییە (٢٥٠ تا ٢١٦ پ.ز) لە ڕەوشێكی بەمجۆرەدا نییە كە پێش ئەم پێشكەوتنە كولتوورییە بوەستێت. بە پێچەوانەوە خزمەتی دەكات. مسۆگەرە كە سەراوبن بوونێكی مەزن ڕوویداوە. ئیتر كاروانی كۆیلەداری پارس ـ یۆنان ـ ڕۆما گەیشتۆتە خاڵی لوتكە. لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هیچ قۆناخێك هێندە قووڵ و درێژخایەن نەبووە. لە كەسایەتی شارستانییەتی ڕۆما نوێبوونەوەی ریفۆرم گەرایی لە ساڵانی ٣٠٠ ی زایین بەدواوە بە تەواوی خێراییەكەی لەدەستداوە و كەوتۆتە نێو ڕەوشێكی موحافەزەكاری توندەوە. لە كاتێكدا عیسای مەسیح بیروباوەڕی و پێكهاتەی كۆمەڵایەتی دژبەری ئەم قۆناخە پێكدەهێنێت؛ ئەوا ئایینی حەزرەتی مەحەمەدیش بە بێ دواكەوتن لەمیانەی كودەتای سیاسی و سەربازی گران هەوڵدەدات ئەم قۆناخە لە قووڵایی مێژوودا بەجێبهێڵێ.

## ح ـ ڕووخانی شارستانییەتی كۆیلەداری

بە شێوەیەكی گشتی كۆمەڵگا بە تایبەتیش جیاكردنەوەی كۆمەڵگای چینایەتی بۆ قۆناخەكانی كە یەكپارچەیی سیستەم لە خۆوەدەگرێت، وەكو پێداویستییەكی گەوهەرەكەی، جگە لەوەی پێویستییەكە و دەبێ ڕاست بێت، ئەوا گرێدراو بە شێوازەكانی چۆنییەتی نزیكبوونەوە لە دیاردەكان گەلێك خراپی و تەنگەتاوی گرنگ لەگەڵ خۆی دێنێ. ئەوەی جێگای گفتوگۆكردنە ئاخۆ دەبێ جیابوونەوە بە گوێرەی كامە پێوانەی سەرەكی ئەنجامبدرێت. لە ئاكامی بە بنەما گرتنی چەندین فاكتەری جیاواز دەشێ جیابوونەوەی هەمەجۆر و تەنانەت ناكۆكیش ئەنجامبدرێت. بەڵام دیسان ئەو یاسا دیالەكتیكییەی لە شێوەی بیرۆكە ـ دژەبیرۆكە ـ سەنتێزدایە و هەموو شتێكی سروشت پێیەوە گرێدراوە، شێوازێكی دەست لێبەرنەدراوی شیكردنەوە و پەیڕەوكردنی سیستەمی كۆمەڵایەتییە.

هەڵوێستە و نزیكبوونەوەكانی سەبارەت بە لە دایكبوونی شارستانییەتی كۆیلەداری پڕ لە مشتومڕە و ناچارە بەمجۆرە بێت. گەلێك بۆچوونی جیاواز لە ئارادایە سەبارەت بەوەی تا چ ڕادەیەك قۆناخێكی ناچاری پێشكەوتنی كۆمەڵگا بووە، پێویست بووە یا پێویست نەبووە، چۆن شێوەی گرتووە.

چۆن مرۆڤەكانی سەردەمی نیۆلیتیك دەستیان لە سیستەمێك بەردا كە هیوای پێشكەوتنی هەبوو، تا دواڕادە خوڵقێنەر بوو لە بنچینەی خۆیدا ئاستی ئازادی و یەكسانی ناو كۆمەڵگای بە بنەما دەگرت، بۆ چەرخەكانی كۆیلەداریان بە جێهێشت؟ سەربارى توانستە گرنگ و زۆرەكانی كۆمەڵناسی (سۆسیۆلۆژی)، بەڵام زۆر لەوە دوورە وەڵامی ئەم پرسیارە سەرەكییە بداتەوە. بۆچوونی زاڵی"**باڵادەستەكان لەمیانەی زەبر و تەڵەكەبازی پەیوەندی كۆیلەدارییان خوڵقاند**" نزیك بوونەوە قەبەكانی چینایەتییە كە چەوسانەوە بە بنەما دەگرن؛ بەڵام بەرامبەر پرسیاری "**كەواتە، باڵادەستەكان چۆن دەركەوتن**" تەنگەتاو دەبن. نزیكبوونەوەی گشتگیری چینە باڵادەست و چەوسێنەرەكەی دیكە كە دەڵێ "**بۆ پێشكەوتنی شارستانییەت جیاوازی چینایەتی مەرجە**" ئەوانیش بەرامبەر پرسیاری"**سیستەمێكی بەرەو شارستانییەت ئاراستە دەگرێ بۆ چی ڕێ لەپێش ئەم پێشكەوتنە دەكاتەوە كە ئەنجامەكەی پلیشاندنەوەی خۆیەتی**" تەنگەتاو دەبن.

ئەگەر نەشگوترێ تەواوی ئەو بۆچوون و تەنانەت بیرۆكە زانستیانەی لەسەر بنەمای ئەم دوو جۆرە هەڵوێست و نزیكبوونە سەرەكییە پێشخراون ئیفلاسیان كردووە، ئەوا مسۆگەرە لەنێو بنبەست بوونێكی مەزندا دەژین. بە تایبەتیش ئەوە مسۆگەرە سیستەمەكانی تایبەت بە سەرمایەداری كە بانگەشەی زانستی بوونیان یەكجار بەهێزە و لیبرالیزمی تاك بە بناخەدەگرێت و سیستەمەكانی تایبەت بە سۆسیالیزم كە كۆمەڵگا بە بنەمادەگرن لە بواری بەهای چارەسەری كێشە سەختەكانی ڕاستینەی كۆمەڵگا لە نێو كەموكوڕی و لاوازییەكی مەزندا دەژین و ناتوانن وەڵامبدەنەوە. هەرچەندە بگوترێ "**دەبێ پێشكەوتنە زانستییەكانیش لە نێو ناكۆكی و گیروگرفتدابن**" ئەوا ئەو مەترسی و نەخۆشیانەی قەیران لەخۆیەوە دەگرێت، تەنیا دەكرێ لەمیانەی نیشاندانی مرۆڤ وەكو مەترسیدارترین "**دڕندە**" ڕوونبكرێتەوە، ئەمەش بە واتای نكۆڵیكردنی خۆمان و مرۆڤایەتییە.

بۆ دۆزینەوەی ڕەگەكانی ئەم هەڵوێستە و مەیلە مەترسیدارە، دەشێ لە قۆناخەكانی پێكهاتنی كۆمەڵگا؛ تەنانەت تاوەكو تەواوی پەیوەندییەكانی كۆمەڵگا درێژببنەوە و بە هۆكار و ڕوونكردنەوەكانی بگەن. بە تایبەتیش هەڵوێستەكانی پێشكەوتنی شارستانییەت لەسەر بنەمای قووڵبوونەوەی سەبارەت بە چینایەتی؛ ئەگەر ڕوونكردنەوەی میتۆلۆژی منداڵانە، یان ڕوونكردنەوەی جددی ئایینی یاخود ڕوونكردنەوەی بە ناوی فەلسەفی و تەنانەت بە ناوی زانستەوەش بێنن، هەرگیز ئەمانە لەو ئاستەدا نین ئەم ڕەوشە ناكۆكە قورسە بسەپێنن كە مرۆڤایەتی تێیدا دەژی. ئەو مرۆڤایەتییەی بانگەشەی ئەقڵ و خاوەنداریێتی ویژدان دەكات نابێ ئەم ناكۆكییە بە شێوەیەكی ئاسایی و قۆناخی ماددی بەمجۆرە ببینێ كە تێپەڕكردنی

ناچاری بووە. هەڵسەنگاندنی وەها بە واتای بە تەواوی نکۆڵی کردنی خۆی و ئاستی ئازادی و وشیاری کۆمەڵگا دێت و ڕەوشی ئێستاکەی مرۆڤایەتیش دەرفەت بەمە نادات. لە هیچ قۆناخێکدا مرۆڤایەتی تەسلیم بەمجۆرە بۆچوون و باوەڕی و تیۆرییەکانی دۆگماتیزمی ئایدیۆلۆژی نەبووە، ئینجا چی لەمیانەی پیرۆزییەوە پێشکەش کرابێت یاخود لە ڕێگای بانگەشەی زانستیبوونەوە پێشکەش کرابێت، تەنیا کاتێك تاکە گوزارشتی ڕاستی ئەم ڕاستینەیە بوو، ئەو کاتە بە گشتی پەسند دەکرێت و دەبێتە شێوازێکی دەربڕینی نزیك لە ڕاستی.

وەکو دەرئەنجام دەخوازم جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە: مرۆڤایەتی و بە کۆمەڵگابوونەکەی هێشتا لەوە دوورە لە بوارەکانی ڕاستی و دادپەروەری و خۆشەویستی بگات بە پێناسەیەك کە بە گشتی پەسند بکرێت. هەروەکو چۆن بەردەوام لەم بوارانە پێویستی بە پێناسەیەك هەیە، ئەوا بەبێ ئەوەی ئەم پێویستییە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان گرنگییەکەی خۆی لەدەست بدات چاوەڕوانی شیکردنەوە دەکات. ئەم شیکردنەوە ئەرکێکی زانستی دەست لێبەرنەدراوە و هەڵوێستێکی ئەخلاقی بەمجۆرە لەخۆوە دەگرێت کە پێشخستن و نیشان دانی ناچارییەکە. هەوڵدەدەم هەڵوێستم سەبارەت بەم شیکردنەوە لەسەر بنەمای لێپرسینەوەی ئەم دوو شێوازە، واتا بەهای زانستی و یەکپارچەیی سیستەم، پێشخەم کە پێویست بوو هەڵوێستێکی پێویستی ئەخلاقی دەرهەق نیشانبدرێت.

ئەم مەسەلەیە بۆ من دەست لێبەرنەدراوە و بە ئەندازەی ئەوەی بەهایەکی پرەنسیپی هەیە پێڕەوێکی سەرەکییە کە گرنگی پرۆسەی پراکتیکی لەخۆوە دەگرێت.

**١ ـ ئایا شێوازی کۆیلەداری شارستانییەت ناچارییەکە؟** سەرەکیترین ناکۆکی مرۆڤایەتی لەگەڵ خۆی و بەرامبەر بە سروشت، پەیوەندی نێوان ئازادی و ناچارییە. **"ئازادی چییە؟"** تاوەکو کوێ ئازادی،**"ئازادی و ناچاری چییە و چۆن لەگەڵ یەکتردا بگونجێنرێن"**، گومان لەوەدا نییە کە تاوەکو ژیان بەردەوامبێت ناکۆکی نێوانیان بەردەوام دەکات. هەروەکو چۆن بە گوێرەی سروشتی مرۆڤ بەردەوام ئازادی نابێت، ئەوا بەردەوام مەحکومی قەدەر و بێچارەییش نابێت. بە ئەندازەی ئەوەی ڕەوشی ئازادی یەکجارەکی، ئۆتۆپیای بەهەشتی ساختەی ئەو کەسایەتی و چینە مشەخۆرانەیە کە لە کار ـ ڕەنج دابڕاون، ئەوا دیلبوونی ئەبەدیش جیهانی **"ئەشکەنجەی دۆزەخ"** ئەو کۆیلانەیە کە لە تێکۆشان دابڕاون و شکستیان هەرسکردووە. لەگەڵ ئەوەی پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان هەردووکیاندا هەیە، ئەوا مێژووی مرۆڤایەتی خودی ژیان خاوەنی کارەکتەر و لۆژیکێکی پڕ لە گرفتە. لەگەڵ ئەوەی دوو سێ خاڵێکی ڕێگا لەپێش چەندین هەڵوێستی دۆگماتیکییانە دەکاتەوە، ئەوا خودی ژیان خاوەنی ڕاستینەیەکی بەمجۆرەیە کە زیاتر ڕێگا لەپێش ئەو بۆچوونانە دەکاتەوە کە گرێدراوی زانیاری و زانستە.

لێرەدا دەردەکەوێت بونیادی شارستانییەتی کە لە ئاکامی جیابوونەوەی چینایەتی پێشکەوت لە ڕێگای گەوهەرێکدا بەردەوامدەبێت کە ناکۆکییەکانی قووڵکردۆتەوە. جیابوونەوەی چینایەتی هەوڵدەدات لەمیانەی ئەو تێکۆشانانەی کە ناکۆکییەکانی ناوخۆیی ڕێگای لەپێشدەکاتەوە بگاتە ئاستی بە بڕیاربوون. تێکۆشانێکی گەیشتۆتە ئاستی توندوتیژی و شەڕ، هەروەکو چۆن ئاستێکی نوێی بە بڕیاربوون دەکاتە پێویستی، بەڵام ڕەوشێك شایستەی تەبایی و ئاشتی بێت، گوزارشت لە ئاستێکی بڕیاردان دەکات کە هاوسەنگییەکەی جێگیر بووە. هەمیشە ئارامی یاخود بە پێچەوانەوە هەمیشە شەڕ، بە واتای ئەوە دێت کە کۆمەڵگا بە تەواوی لە ناو شەڕ و پێکدادان بەکار ببرێت و بۆ دیاردەی زۆر جیاواز بگۆڕێت، یان لەنێو دەست بەتاڵییەکی قووڵدا دەڕزێتەوە و لەنێو دەچێت.

سەرەکیترین ڕەخنەی ئاراستەی سیستەمی کۆیلەداری بکرێت؛ قۆناخی لە دایکبوون بە چ بەها و نرخێك پێکهات؟ لەگەڵ ئاواکردنی، چ دەسکەوتێکی بۆ مرۆڤایەتی هێنا، چی لەدەستدا؟ "ئەوا ئەم ڕەخنانەی لەمیانەی وەڵامی ئەم پرسیارانە واتادار دەبێت. بە بێ لە بیرکردنی ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە ئەنجامی بەردەوامکردنی پەیوەندی کۆیلەداری و شێوازی ژیانەکەی پێکهاتووە، ئەوا ئەو ڕەخنە بە کاریگەرانەی ئەنجامدەدرێت و وەڵامە واقعی و دروستەکان، ڕۆڵێکی گرنگ لە تێگەیشتنێکی ڕاست سەبارەت بە سیستەم دەبینن. سەرەڕای ئەوەی ئەمە شتێکی نەخوازراوە، بەردەوام کەوتنە نێو ئەم بە هەڵەداچوونە مەترسیدارانە، لە ڕاستیدا پێویستی و گەوهەری ئەنجامەکانی نزیکبوونەوەی زانستییانەش نیشاندەدات، لوتکەی چینایەتی کۆمەڵگا و ڕکابەرە دیالەکتیکییەکانی دیکەی ڕەهەندەکانی کە لە لوتکە دان، بەردەوام کەوتوونەتە نێو خۆ بە کامڵ و نموونەیی نیشاندان و دۆگمای دەست لێبەرنەدراو. تەنیا بەرپرسیار بینینی چینی چەوسێنەری مشەخۆر بەرامبەر بەم کارە ڕێگا لەپێش یەکلایەنی دەکاتەوە. بە ڕادەی کەم هێندەی ئەوانە ناتوانرێ کارەکتەری دۆگماتیکانەی چینە چەوساوە و مەحکووم کراوەکان بەرچاو نەگیرێ. ئەمە بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە: یەکەمیان؛ بە شێوەیەکی ئاسایی لەبەرئەوەی حوکمڕانی ئایدیۆلۆژی بە دەست توێژی سەرەوەیە، بەردەوام لەمیانەی کاریگەری دۆگماتیکییانەی خۆیان بە ئەنقەست، لەمیانەی لە ڕێ لادان، جیهانی خەیاڵی توێژی ژێرەوە تێر و بەخێو دەکات. دووەمیان؛ هەروەها زەحمەتییەکانی ژیان و کاری توێژەکانی ژێرەوە کە ناهێڵن هەناسەبدات، بە سانایی ڕێگا بە هەڵوێست و ئایدیۆلۆژیایەك نادات کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندییەکانی خۆیان بێت.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم شێوازەدا دەتوانرێت وەڵامی واقیعیانە بۆ پرسیاری **"کامە هەلومەرجی واقیعی ڕێگای لە پێش شێوازی پەیوەندییەکانی کۆمەڵگای کۆیلەداری کردەوە"** پێشبخرێ.

کۆمەڵگای کشتوکاڵی نئۆلیتیك لە قۆناخی درێژخایەنی پێگەیشتندا بە تایبەتیش لە ساڵانی ٦٠٠٠ تا ٤٠٠٠ پ.ز، بۆ ئەوەی شێوازێکی بەرهەمهێنانی زیاتر پێشکەوێت، ڕێگای لەپێش توانستێکی تەکنیکی و بەرهەمهێنانێکی دەوڵەمەند کردەوە. مس و ئامرازەکانی لێی دروستکرا بوون؛ گاسن، چەرخی گڵکاری، ئامرازەکانی تەونکاری، سوود بینین لە وزە و توانای ئاژەڵان، کولتووری هەمەڕەنگی گیا، گیانلەبەران، ڕەوڕەوە، بیناسازی ماڵ، مۆر، میتۆلۆژیای پشت بە فرەخوداوەندی دەبەست و ئەو کولتوورانە پێگەیشتوون کە دەرفەتی هەنگاونانی بۆ شارستانییەت ڕەخساندووە. ئەم کولتوورانە لەمیانەی گەیشتن بە ئۆرگینازسیۆنی کۆمەڵگا و بەلاوەنانی پێکهاتەی تیرەکان، دەتوانن ڕێگا لەپێش بەرهەمی زیادە بکەنەوە. کۆمەڵگای سۆمەر و میسر کە هەوڵی پێناسەکردنماندا، لەوە دەچێ لە دەوروبەری پەرستگاوە توانیویانە ئەم ڕێکخراو بوونە سەربخەن. کاتێك پەرستگا جێگای باس بێت، گرنگی و بایەخی باوەڕی دەردەکەوێتە پێش. گرنگی هەنگاوهاویشتن لە سیحربازی و شامانیزمەوە بۆ ڕاهیبێتی گرنگییەکەی لێرەدا شاراوەیە. ئەو سیستەمەی ڕاهیب پێشیخستووە دوولایەنەیە. ئەو فکرە ئایینییانەی لەمیانەی تەوتەمی دیاریکراوەوە نوێنەرایەتی دەکرێت و پشت بە دایکسالاری و یاخود باوکسالاری دەبەستێت، لە کاتێکدا جێگای خۆی بۆ ئەو چەمکە ئایینییانە بەجێدێڵێ کە ئەم داب و نەریتە تێپەڕدەکات و ئاقڵمەندانەترە، لە ڕاستیدا ئەمە شۆڕشێکی ئایدیۆلۆژیە. ئەو کەم بەرهەمییەی کە پەیوەندی خزمایەتی و سنوورداری پێکهاتە ئەتنیکییەکان ڕێگایان لەپێشدا کردۆتەوە، لەمیانەی ئەو هێزە کۆمەڵکارییەی ڕەنجەوە بەلاوەدەنرێت کە لە دەوروبەری پەرستگادا کۆبۆتەوە. کاری هەرەوەزی و کۆمەڵکاری ڕێگا لەپێش بەروبوومێکی نائاسایی دەکاتەوە. ئەو زێدە بەرهەمانەی کەڵەکە بوون، کێڵگەی مەزنی هەرەوەزی دێنێتەئاراوە. ئەنجام تەقینەوەی بەرهەمهێنانە. کاتێك لەم پێناوەدا پیشەکارە پێویستەکانیش لە ژێر موڵکداری پەرستگادا بوون بە یەك، ئەوا کۆمەڵگای نوێ هەم لەمیانەی سەرخان هەم ژێرخان، تۆوەکەی پێکدێت.

پەرستگا دڵی کۆمەڵگای نوێیە. ڕاستتر بڵێین سەرچاوە سەرەکییەکەی لە ئامێزی پەرستگادایە. لەسەر بنەمای دابەشکردنی نوێی کار و پشتبەستن بە سەرخانی ئایدیۆلۆژیەکەی شێوازی بەرهەمهێنانی کۆیلەداری دێنێتەئاراوە. قۆناخی دواتر ئاستی مەزنبوون و دووبارەبوونەوەی ئەم مۆدێلەیە. ئەگەر سەرنج بدرێ دەردەکەوێ شێوازی کۆمەڵگای بەمجۆرە نییە کە لە بنچینەی خۆیدا لەمیانەی توند و تیژییەکی ڕەها ئاوا کرابێت. بەڵکو میتۆلۆژیایەکی زیاتر جێی باوەڕ و شێوازێکی بەرهەمهێنان جێی باسە کە لەئەنجامی بەرهەمهێنانێکی زۆر خۆی سەلماندووە. دواتر زەبر بە شێوەیەکی چڕ و بەرفراوان بەکاردەهێنرێ. لە سەرەتادا مرۆڤایەتی کاتێك هەنگاو بۆ کۆمەڵگای نوێ دەهاوێژێ، لەسەر بنەمای باوەڕپهێنان بە شێوازی کۆیلەداری و ستەمکارییەکەی هەنگاوی بۆ ناهاوێژێت. هەروەها ئاستەمە کە بگوترێ ڕاهیبەکانیش لەمیانەی ئەو تێگەیشتن و فێڵبازییەوە جوڵاونەتەوە. ئەوان لەمیانەی پراکتیکەکەیانەوە بە گوێرەی کۆمەڵگای کۆن پەرەسەندنێکی پێشکەوتووانەتریان دەسەلماند و دەوروبەر باوەڕیان پێدەهێنان. ئەمە سەلمێنراوە گەوهەری بەرایی قۆناخ بەمجۆرە گەشەی

کردووە. هەڵبەتە شێوەیەکی باڵاتری کۆمەڵگا تەنیا لەمیانەی زەبر و فێڵبازییەوە ئاوا ناکرێت. بەبێ ئەوەی باڵاتربوونی خۆی بسەلمێنێ هیچ شێوەگرتنێکی کۆمەڵایەتی، نە دەتوانرێ لە ڕێگای توند و تیژی ئاوابکرێت و نە دەتوانرێ درێژە بە گەشە کردنی خۆی بدات. شتی گرنگتریش ئەوەیە کە زەبر دەتوانێ سەبارەت بەو پێکهاتانە ڕۆڵ ببینێ کە سەردەمیان بەسەرچووە، دەتوانێ لە رووخاندنی کۆن و خولْقاندنی نوێدا ڕۆڵ ببینێ.

بەڵام لەگەڵ مەزنبوون و پەلهاوێشتنی قۆناخ (قۆناخی کۆیلەداری)، ئەو کارەکتەرە لەسەرەتادا دیارنەبوو، ئاشکرادەبێت. کاتێك نموونەی سۆمەریەکان بێنینەوە بەرچاوان، ناکۆکی چینی چاودێر و بەڕێوەبەرایەتی ژوور کە مەزنبوون، بە یەکلابوونەوە و جیابوونەوەدا دەربازدەبن. لە کاتێکدا گروپی ڕاهیبەکان گرنگی خۆیان لەدەست دەدەن، سەرەتا سیاسەت و دواییش فەرماندارێتی سەربازی دەردەکەوێتەپێش. دوایی قۆناخی پادشا ـ ڕاهیبەکان، قۆناخی پادشا سیاسییەکان پێشکەوت. شوێن پەنجەی پێکدادانە توند و تیژیەکان دیارە، تەنانەت ڕەنگدانەوەی خۆی کردۆ تە سەر پێکهاتەی زمان و ئەدەبیاتیش. لەگەڵ زیادبوونی ناکۆکییەکانی نێوان خوداوەندەکانی **"پانتائۆن"** کە پێشتر ڕۆڵێکی ئایدیۆلۆژی دەبینێ و گوزارشتی لە میتۆلۆژیای چینی ژوور دەکرد، ئەوا هەروەکو دەزانرێ جیاوازی لە نێوان خوداوەندەکان پێشکەوت و پێکدادان هاتە ئاراوە. تاوەکو هاوسەنگی نێوان ڕاهیب و سیاسەتمەداران سەراوبن نەبێت، یەکێتی خوداوەندەکان بەردەوام دەبێت. لە سەرەتا لەمیانەی جێگرتنی ژنان لە پانتائۆن کاریگەرییەکانی لە نێو کۆمەڵگا دیارە. لەگەڵ زیادبوونی کاریگەری چینی بژاردەی سیاسەتمەداران بەسەر کۆمەڵگادا، ئەوا دەرهەق بە دابەشکردنی کار و جێگۆڕکێ و شوێنگەی خوداوەندەکان، گۆڕانکاری سەرنج ڕاکێش بەرچاو دەکەوێت.

لەمیانەی ناسنامەی خوداوەندی ژن ئینانا لە شارۆچکەی ئۆرگ دەبینرێ، ژن لە یەکەمین شێوە گرتنی کۆمەڵگا شوێن پەنجەی دیارە و بەهێزە، ئینانا شوێنگەی بەهێزی لە کۆمەڵگای سۆمەردا، لە ڕۆڵی دەستپێکردنی کۆمەڵگای نئۆلیتیکەوە دەگرێت. لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگای کۆیلەداری، ئەم ڕۆڵە گرنگییەکەی خۆی لەدەستدەدات. خوداوەند **ئەنلیل** کە سەرەتا زۆر بەهێز بوو، دامەزرێنەری نیپورە کە ناوەندی ئەدەبیات و پەروەردە بووە، نوێنەرایەتی ناسنامەی ڕاهیبێتی دەکات. ناسنامەی خوداوەندی ئەنکی کە پێبەپێ کاریگەرییەکەی زیاد دەبێت و خولْقێنەرە و ڕێکخەرە، لە ڕاستیدا نوێنەرایەتی چینی سیاسی بەڕێوەبەرایەتی دەکات. دواتر **ئەنکی** لە پێکهاتنی گەلێك خوداوەندی دیکەدا ڕۆڵی ئاقڵمەندی و ڕێنیشاندەر دەبینێ. ئەمەش ڕەنگدانەوەیەکی زەق و بەرچاوی بڵاوبوونەوەی بایەخ و گرنگی هێزی سیاسی کۆمەڵگایە. تێکەڵ نەبوونی زێدەی بە توندوتیژیش، لە نزیکەوە گرێدراوی تایبەتمەندێتی سیاسییانەیەتی. هەروەها جەسارەت و بوێری کە بتوانێ ڕێ نیشانی ئەنلیل بدات، گوزارشتێکی دیکەی پایەداربوونی چینی سیاسەتە بەرامبەر بە گروپی ڕاهیبەکان. خوداوەندی بابل **مەردۆك** دەچێتە شوێنی **"ئەنکی"** باوکی؛ بەسەرداچوونی دژوارانەی مەردۆك بەرامبەر تیاماتی دایکی (خوداوەندە ژنی ـ دایکە)؛ فڕێدانی تیامات لەگەڵ ئەوانەی ڕۆڵی کوڕ و مێردیان دەبینی، بە شێوەیەکی ناسکتر لە شوێنی ئەنکی باوکی دادەنیشێ؛ ڕەمزی دەرکەوتنەپێشی فەرماندارێتی سەربازی و پێشکەوتنی دیکتاتۆرییەتی، مۆنارك، دەسپۆت و ئیمپراتۆرییەتی تاکەکەسییە. شێوازی بەڕێوەبەرایەتی بابل لەسەر بنەمای توندوتیژی و ڕۆڵی زیادبووی پادشا سەرلەنوێ بە دەزگابوونی ئایینی ڕێکدەخاتەوە. بە دەزگابوون و زیادبوونی بە خۆباوەڕبوونی کۆیلەداری ڕەنگدانەوەکەی بەسەر سیستەمی ئاسمانیشەوە دەبێت و **"رووخساری تاکخودایی"** لە ئاسۆ دەبینرێ. ماوەیەکی کورت دوای ئەوە ئیبراهیم بەهۆی لاوازبوونی شێوازی کلاسیکی ڕاهیبێتی و کۆن بوونی، لەمیانەی شێوەی بە دەزگابوونی **"پێغەمبەر"**، ڕەخنە دەرهەق بە سیستەم پێشدەخات، بەمجۆرە ڕێگا لەپێش گەڕان بەدوای گرنگترین دەرگای ڕیفۆرمی سیستەم دەکاتەوە.

٢ ـ ئەوە لە نموونەی سۆمەردا سەلمێنراوە کە لە توندوتیژی زیاتر سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی ئایدیۆلۆژی ڕۆڵی سەرەکی بینیوە. ئەم تایبەتمەندێتیە لە میسریش بەمجۆرەیە. لێرەدا ئەو ڕاستینەیە دەستنیشان دەکرێت: ڕۆڵی دەستپێکی کۆمەڵگای چینایەتی پێشکەوتووخوازانەیە. دەتوانرێ ئەم لە باڵابوونی ئایدیۆلۆژی و ئەو بەرهەمە زیادە ببینرێ کە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە و بەراورد ناکرێت. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا ناتوانرێ مرۆڤایەتی لەمیانەی **"بۆچی کۆیلەداریت پەسندکرد؟"** تاوانبار بکرێت. مەگەر ئەمە ببێت بە ڕەخنەیەك کە بەهای ئەدەبی هەبێت. دواتریش هەبوونی چینی بەڕێوەبەر کە بە شێوەی تەنێکی نەخۆشی مەزن دەبێ، دەبێتە ڕاستینەیەك و باڵابوونی کۆمەڵایەتی وجوداکاری دوژمنانە دەبێتە سەرەکیترین هۆکاری کۆمەڵایەتی. ئەم نەخۆشییە لایەنی بێ واتای جیابوونەوەی چینایەتییە. ئەو توێژەی کپ و دەست بەتاڵ دەمێنێ پێبەپێ بێ ڕۆڵ دەبێ، درەنگ ناکەوێت و دەبێ بە سەرچاوەی ئەو چەوسانەوە و زۆردارییەی سیستەم کە روو لە زیادبووندایە. ئەم ڕەوشەش شانبەشانی مەزنبوونی چینی بەڕێوەبەرایەتی کە لە دابەشکردنی کاری پێشووتردا جێگایەکی پێویست و گرنگیان هەیە، یان ئەوەتا دەبێت بە ئیمپریالیزم و سیاسەتی تاڵان و داگیرکاری پێشدەخات، یاخود لە ناوەوە تاوەکو دوایی تواناکارییەکانی چەوسانەوە پێشدەخات و ڕێگا لەپێش قۆناخی موحافەزەکاری بێ واتا بوونی سیستەمی کۆیلەداری دەکاتەوە.

لێرەدا لێتوێژینەوە سەبارەت بە پێکهاتەی ئایینی ئەو ناسنامە سیاسییەی کە لە ئەنجامی ئەو پێکهاتە ڕۆحی و هزرییەی لە ئەنجامی سروشتی مرۆڤ، بە تایبەتیش تایبەتمەندێتیە سایکۆلۆژییەکانی و ژیانی کۆمەڵگای سەردەمی میتۆلۆژی پێکهاتووە و لە کەسایەتی پادشا خۆی کردووە بە **"خوداوەند"**. بەڵام تایبەتمەندێتی **"سزادان"**ی خوداوەند کە سەرەتا دیار نەبوو، مسۆگەر ئیتر موحافەزەکاری سیستەمی کۆیلەداری و بە دەزگابوونی سیستەمی توندوتیژی چینی بەڕێوەبەر نیشاندەدات، بۆ بەکارهێنانیان بەرامبەر بەو کاردانەوە و ناڕەزاییانەی ڕوو لە زیادبوونن. شیکردنەوە و دەرککردن بە زمانی نێوان سیستەمی خوداوەندەکان و سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ئەرکێکی سەرەکی زانستی کۆمەڵناسییە؛ بەڵام بە دەستەوەگرتنی ئەم زمانە بە بێ گرنگی پێدان و بە شێوەیەکی بێدەنگ و پاسیفانە، تەنیا دەتوانرێ لەمیانەی کاریگەری چینی باڵادەست ڕوونبکرێتەوە. هەڵبەتە بۆ شیکردنەوەی کۆمەڵگاکان بە ئەندازەی بەها ماددییەکان ـ بۆ نموونە پارە ـ بەها مەعنەوییەکان ـ بۆ نموونە ئایین و خوداوەند ـ گرنگن. لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەم لە بەشەکانی تردا هەڵسەنگاندنی بەرفراوانتر دەرهەق بەم بابەتە دەکەم. هەروەها ئەمەش ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو شیکردنەوانەی دەرهەق بە کۆمەڵگای سۆمەر کراوە (یەکەمین نموونەیە)، ئەنجامی سەرنج ڕاکێش و بەبەرهەمی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. لەم بوارەدا مێژووی شارستانییەت بە واتای بەردەوامی کۆمەڵگای سۆمەر دێت کە گەورەبووە و لق و پۆپی هەمەڕەنگ و

جیاوازی لێ بۆتەوە.

لەگەڵ گەیشتن بە ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز ئەو ڕەوشەی لە ئەنجامی هەڵکشانی بابلدا بەرجەستە دەبێت، ستەمکاری سیستەمی کۆیلەداری و فێڵبازی و تەڵەکەبازی و لە ڕێ لادان و سەرلێشێواندنەکانی ڕاهیبەکانە کە بە ئەنقەست پێشیدەخەن، زیاد دەبێ. ئەوەی لە کەسایەتی حامورابی هاتۆتە ئاراوە ئەوەیە کە سیستەم تەنیا لەمیانەی کارەکتەری زۆردارییەوە بەڕێوە دەچێت. هەربۆیە ئەم قۆناخە دەبێتە ڕەوشێکی گشتی و دووڕیانێکی لە جۆری، یان رووخان یاخود ڕیفۆرم دەخاتە نێو ڕۆژەڤی مێژوو. پێشکەوتنەکانی دواتر سەرباری هەوڵەکانی وەستاندن و پێشگرتن لە رووخان لەمیانەی زۆرداری، ئەوا لە ڕێگای پێهەڵگرتنە یەك لە دوای یەکەکانی پێغەمبەران هەوڵدەدرێ نەرم بکرێ و بە شێوەیەك بگونجێنرێ و دەرفەتی ژیانی تێدا هەبێت.

٣ ـ هەروەکو چۆن لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەی پێکرا، حەزرەتی ئیبراهیم وەکو باپیری پێغەمبەرەکان و دەستپێکردنی قۆناخێکی گرنگی مێژوویی ئایینەکان دەردەکەوێت. کەسایەتییەکەی، ئەو قۆناخەی تێیدا ژیاوە و ئەو مەیل و هەڵوێستەی نوێنەرایەتی کردووە؛ لە نزیکەوە گرێدانی خۆی بە رووخانی هێزی سیاسی سۆمەریەکان لە بابل و دەستپێکردنی قۆناخی ـ حامورابی و نەمرووود ـ هەیە، کە بە باشترین شێوە نوێنەرایەتی قۆناخی ئامۆریتەکانیان کرد. ئەم سەردەمە قۆناخی پەیڕەوکردنی زەبرە بە شێوەیەکی سیستەماتیك و دژوار. دواتر خانەدانە ئاشووریەکان ئەمە دەگەیەننە لوتکە. لە میسریشدا ڕەوشێکی هاوشێوە لە ئارادایە. ئەو وەڵامانەی دراوەتەوە، لە ناوەوە شەڕی نێوان خانەدانەکان، لە دەرەوەش جوڵانەوەی ئازادی گروپە ئەتنیکییەکانە بەرامبەر بە ئیمپریالیزم. لە کاتێکدا لە ناو سامیەکاندا پێشکەوتنی لە جۆری گۆڕانکاری دەسەڵاتی بنەماڵەکان و پێغەمبەرایەتی بایەخدار دەبوون، ئەوا لە

ناو ئاریەکان ئەو پێشکەوتنە سیاسییانەی شێوازی میرنشین و کۆنفیدراسیۆنیان هەبوو دەردەکەوتنە پێش، کە لایەنی ئەتنکییان لەپێش بوو. لەهەمانکاتدا ئەو پێشکەوتنانەی کە رۆڵی یەکەمین ئەڵقەی پەلهاوێشتنی بڵاوبوونەوەیان دەبینی، رۆڵیان لە درێژکردنی تەمەنی سیستەمی کۆیلەداریشدا هەبوو. لە میانەی بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی سیستەم لە زەوییە دەست لێنەدراوەکان تەمەنی درێژ دەکات.

گۆمە بچووکەکانی کۆیلەداری تواناکاری ئەوەشیان هەیە لە ناوچەی نێوان هەر دوو زەریادا بڵاوببنەوە. لە ئەنجامی لە رێ لادانی راهیبەکان قووڵبوونەوە لە ناوەندە سەرەکییەکان پێشدەکەوێت و وەکو یەکەمین ئەڵقەکانی بڵاوبوونەوە سیستەم لە رێگای نەرم بوونەوە لە تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین بڵاودەبێتەوە؛ لە ئەنجامی دووەمین شەپۆلی مەزن لە هیند، چین و ئەوروپا بڵاودەبێتەوە، لە ساڵانی ١٠٠٠ ی پ.ز دەگاتە لوتکە. ئەم دوا قۆناخەی کە بە شێوەیەکی فراوان و ئاسان تێیدا بڵاوبووە و دەتوانین بە دیموکراتیزەبوونی سیستەم ناوی ببەین، سەرباری ئەوەی گەلێك نوێبوونەوە و ریفۆرمی لە خۆوەگرتبوو، بەڵام نەیتوانی خۆی لە رەوشێکی بەمجۆرە رزگاربکات کە تەواوی دیاردەکانی رووخان نیشان نەدات. دوای ئەوەی لە ساڵانی ١٠٠٠ ی پ.ز تاوەکو ٥٠٠ ی زایین قۆناخێکی شکۆمەندانە لە هیند، چین و باکووری ئەوروپا بەرێوەچوو، لە هەموو گۆڕەپانێکدا رووخان جێگای خۆی لە نێو رۆژەڤدا گرت. بایەخدارترین پێشکەوتنەکانی ئەم قۆناخە، جیابوونەوەی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا بوو، کە هێزی سیاسی ماد ـ پارس کوێستانەکانی ئێران رێگایان لەپێشکردەوە. لە کاتێکدا داب و نەریتی زەردەشت کە وەکو شۆڕشێکی ئەخلاقی و ئیرادە خۆی نیشاندەدات، وەکو بڵێی لێپرسینەوە لەگەڵ خوداوەند دەکات، بووە زەمینی ئایدیۆلۆژی ئەم دووڕیانە و بووە بە دوو لق؛ لە کاتێکدا ئیمپراتۆرییەتی پارس سیستەمی کۆیلەداری لە هێڵی رۆژهەڵات تاوەکو هیند و چین دەگوازێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە لە رێگای رۆژئاواش خێرایی بە دەرکەوتنی رێبازی یۆنان ـ رۆما دەدات و بەمجۆرەش رۆڵێکی مەزنی مێژوویی دەبینی. ئەم رۆڵەی ئیمپراتۆرییەتی ماد ـ پارس لە ئەنجامی گۆڕاندنی بۆ شێوەیەکی نەرمتر رێگا لەپێش درێژبوونەوەی هەزار ساڵی دیکەی سیستەمی کۆیلەداری دەکاتەوە.

ئەو قۆناخەی چین و هیند لە رێبازی رۆژهەڵات پێیدا دەرباز بوون، لە راستیدا دووبارە بوونەوەیەکی درەنگ وەختی سۆمەر و میسرە، بە درەنگ کەوتنێکی ٢٠٠٠ ساڵە بوو. بەڵام شارستانییەتی یۆنان ـ رۆما کە لە رێبازی رۆژئاوا پێشکەوت و گەیشتە لوتکە، لەمیانەی بەلاوەنانی شێوازی هزری ئایینی و میتۆلۆژی و رێکردنەوە لەپێش هزری فەلسەفی، بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە رۆڵی شێلاندنی یەکەم هەویری شارستانییەتی رۆژئاوای بینی کە لە رۆژگاری ئەمڕۆمان هەڵکشاوە و باڵا بووە. لەبەر ئەوەی تا رادەیەك باسی ئەم بابەتانەمان کرد، ناخوازین دووبارەی بکەینەوە. ئەوەی زیاتر بۆ ئێمە پێویستە سیستەم لە کوێ و کەی دیاردەکانی هەڵوەشانەوە و رووخانی نیشاندا؟ بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بزانرێ ئەو کەسانە و هۆکارانە چین و کێن رێگایان لەپێش کردەوە، ئەوا بە تایبەتی ئەم پێشکەوتنە کرداری و ئایدیۆلۆژییانەی سیستەمی شیکردۆتەوە، گرنگ و بایەخدارە.

ا ـ دەشێ لە بواری تیۆری و پراکتیکی هۆکارەکانی هەڵوەشانەوەی سیستەمی قۆناخی کۆیلەداری شارستانییەت روونبکرێتەوە. بە شێوەیەکی تیۆری هەڵوەشاندنەوەی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دەبێ هەموو هێزەکەی ناواخنی خۆی نیشان دابێت و بەکاری هێنابێت. ئەگەر بە گوێرەی هەلومەرجی واقیعی و بەرجەستە سیستەم خاوەنی هێزی ژیان بێت، پێویستە ئەمە بسەلمێنێ. لەوانەیە ئەم قۆناخەی رووخان لەلایەن ستاتۆی کۆن رێی لێبگیرێت و دوابخرێت، دەکرێ لەمیانەی توندوتیژی سەرکوت بکرێ؛ بەڵام هەر کاتێك هەلومەرج برەخسێ و لەبار بێ دیسان سەرهەڵدەدات. ئەوەی رۆڵی دیاریکراو دەبینێ هێزی ژیانی سیستەمە نوێیەکەیە. بە ئەندازەی ئەوەی وشیاری و ئیرادەکەی گەشە بکات، هیچ هێزێکی زۆرداری و سیستەمێکی فێڵبازی ناتوانێ رێگا لە پراکتیزەبوونی بگرێت.

لەژێر رۆشنایی ئەم یاسایە گشتییەدا بە گوێرەی پێودانگی لۆژیکی پەیوەندی سەرەکی؛ کۆمەڵگای چینی کۆیلەدار توانیویەتی ببێت بە تەمەن درێژترین سیستەم. هۆکاری نهێنی و شاراوەکەی گرێدراوی سیستەمی مولکایەتی مرۆڤە. لە کۆمەڵگاکانی پێشووتردا مولکایەتی گشتی لەسەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنان جێگای باس بوو. تەنیا مولکایەتییەکی سنووردار بەسەر بەهاکانی بەکارهێنان (بەرهەم) لە ئارادابوو. چەمکی مرۆڤی ـ خوداوەند بە کاریگەربوو. ناسنامە جیاوازەکانی (عیبادەت دەکران) و خوداوەندەکان بە یەکەوە لەگەڵ مرۆڤ دەژیا و لەناو کۆمەڵەکاندا جێگای خۆیان دەگرت و خزم و کەس و کاری یەکتری بوون. هێشتا خوڵقاندن و خاوەنداری کردنی مرۆڤ لەلایەن خوداوەندەکان جێگای باس نییە، زیاتر رەوشێکی پێچەوانە هەبوو. خوداوەندی بەمجۆرە هەبوون کە خاوەنەکانیان مرۆڤ و کۆمەڵەکان بوون. ئەم خەیاڵەش لە گەوهەری خۆیدا خۆ بە پیرۆزدانانی مرۆڤ وەکو هێزی کۆمەڵگا و بوونی بە خاوەن ناسنامە و هەستکردن بە خۆی، لەخۆوە دەگرێت. لەو خوداوەندەی کە وەکو نازناو و ناسنامەیەك بووە، هاتووە و گەیشتووە بەو چەمکە خوداییەی کە مرۆڤ دەکات بە بەندە. هەربۆیە بە واتای وەرچەرخانێکی ئایینی، وەرچەرخانێکی ریشەیی کۆمەڵایەتی دێت؛ ئەمەش لە ئەنجامی بەرێوەچوونی تێکۆشانێکی چڕ و فراوانی ئەم قۆناخە بەدیدێت.

بەکورتی بەندایەتی و خزمەتکاری بۆ خوداوەند، لە مێژووی ئایینەکاندا پشت بە پێکهاتەیەکی دژواری چینایەتی دەبەستێت. پێکهاتەی ماددی و چینایەتی وەکو رەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژی، کاریگەرییەکی دیاریکراوی بەسەر پێشکەوتنە ئایینیەکان هەیە. ئەم قۆناخەی کۆمەڵگای سۆمەر زۆر سەرنج راکێش و پڕ لە ئەزموون و وانەیە. لەبەرئەوەی بناخە رەسەنەکەی نیشاندەدات، پێویست دەکات بە گرنگی و بایەخەوە تاوتوێ بکرێت. بە تایبەتیش ئەم دیمەنانە (**تصور**)ی بە شێوەی نین هورساك، ئینانا، عەشتار، ئەن، ئەنکی و مەردۆك شێوەیان گرتووە، بە واتای بەڵگەی وەرچەرخانەکانی کۆمەڵگای سۆمەر دێت. شیکردنەوەی ئەم مەتنە خوداییانەی وەکو ئەفسانە نووسراون، بەڵگەیەکی بەهادارن. هێندە بە بایەخە کە رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە، پێشکەوتنی پەیوەندییەکانی کۆمەڵگای کۆیلەداری بە باشی تێبگەین. لەو قۆناخەدا زانست بەسەر پێکهاتەی هزری و رۆحی مرۆڤدا زاڵ نییە، بەڵکو ئەفسانەکان واتە زمانی شیعرئامێزانەی میتۆلۆژیاکان بە کاریگەرە و بە شێوەیەکی سەرەکیش ئەم زمانە وەکو ئامرازێکی بەهێزبوونی ئایدیۆلۆژی بەکارهێنراوە، هەربۆیە شیکردنەوەی زمانی میتۆلۆژیی ئەرکێکی دەست لێبەرنەدراوی زانستە.

تەنانەت ئەم هەڵسەنگاندنە کورتەی دەرهەق بە دەرکەوتنی پەیوەندییەکانی کۆیلەداری بەسە بۆ ئەوەی تێبگەین کە کردنی مرۆڤ بە ئامرازێکی سەرەکی بەرهەمهێنان، سەرەکیترین تایبەتمەندێتی ئەو کۆمەڵگایەیە. سەرەتا مس و (کانزاکانی دیکە) وەکو ئامرازی بەرهەمهێنان بەکار دەهێنرێن. دوای دەرکەوتنی کۆیلە ئەوان دەکەونە پلەی دووەم. بە تەواوی سەرنج دەکەوێتە سەر بە مولککردنی مرۆڤ و پەیوەندی کۆیلەداری. راهیب لەمیانەی باوەڕپێهێنان و ترسێکی مەزنەوە واتا لە بواری سایکۆلۆژی و سیاسەتمەدار لەرێگای چاودێری و رێکخستنەوە، دادوەر لە رێگای یاسای سزادانەوە سیستەمێکی بەمجۆرە لەسەر سەری کۆیلەکان دروست دەکرێت، تەنیا دەتوانرێ ئەم سیستەمە بە سیستەمی خوداوەندە مەزنەکان ناوزەد بکرێت و بەمجۆرەش بووە. هێندە شکۆمەندکردنی ئایینەکان و ڤیتکردنەوەی وەکو هێزێکی پیرۆز و ترسێنەر بەرامبەر بە مرۆڤ کە ناتوانێ بەرەنگاری ببێتەوە، کارەکتەرێکی دیاریکراوی کۆمەڵگای چینایەتی کۆیلەدارییە. سەرەکیترین تایبەتمەندێتی ستراتیژی پەیوەندی کۆیلەداری ئەوەیە لەنێو ژیاندا بە یاسای رەهای (**مطلق**) گرێدراوە. رەها بوون بناخەی سیستەمە.

بە موڵك کردنی مرۆڤ و راکشانی بۆ ناو بەرهەمهێنان رێگای لەپێش زیاد بوونێکی یەکجار زۆری بەرهەم کردۆتەوە. تەنیا لە کارکردن لە نێو زەویدا رەنجی کۆیلە بەکارنەهێنراوە، بەڵکو لە ئاستێکی بەرزدا لە تەواوی بوارەکانی بازرگانی و پیشەکاریدا بەکارهێنراوە. لە تەواوی خزمەتە تایبەتەکانی چینی بەرێوەبەرایەتی رەنجی کۆیلە بە بنەما دەگرێت. جیاوازی رەگەزی رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە کۆیلایەتی ژن قووڵتربێتەوە. بە کۆیلەکردنی کۆمەڵگا و بە کۆیلەکردنی ژن وەکو رەگەزێکی پلەدوو، لەناو یەکتردا پێشدەخرێت.

ئەو کاتە بەلاوەنانی سیستەمی کۆیلەداری مسۆگەر دەبێت، کە کۆیلە و ئەم شێوازەی پەیوەندی بکەوێتە نێو رەوشێکی بێ بەرهەمی. تاوەکو بەرهەمی پەیوەندی کۆیلەداری بەردەوام بێت، ئەوا زەحمەتە ئەم سیستەمە لە خۆیەوە یاخود لە رێگای بەکارهێنانی زەبر هەڵوەشێنرێتەوە. لە بواری ئایدیۆلۆژیشەوە باڵادەستییەکی بەمجۆرەی بەسەر پێکهاتەی رۆحی و هزری مرۆڤدا ئاوا کردووە، ئەمەش یا ئەوەتا لەسەر بنەمای ترساندن و سزادانی مرۆڤە لەلایەن خوداوەندەکان، یانیش وەکو بەخشین بەرامبەر بە هەڵوێستی خزمەتێکی باش وەکو بەندەیەکی

خۆشەویست دەبینرێ، بەمجۆرە گرێدانێك لە شێوەی تۆڕ دروست دەكرێت، كە پارچەكردنی ئاستەمە. سزادانی كرداریانە لە ئاستێكی زۆر مەترسیدار دایە. لە خاچدان داهێنانێكی شارستانییەتی رۆمایە كە بەهێزبوونەكەی گەیشتبوە لوتكە. سینگ تێكوتان و كەولكردن، دۆزینەوە و داهێنانی ئاشووریەكانە. لە قەبرستانی پادشاكان لە سۆمەر، میسر، هیند، چین و بە تایبەتیش لە سەردەمە سەرەتاییەكانی ئەم قۆناخە، دەستنیشانكراوە كە لە كاتی مردنی پادشا یاخود كاربەدەستەكانی سەروو. لەگەڵ موڵك و خزمەتكارەكانی و تەواوی ژنەكانیشی بە زیندوویی لەگەڵیدا لە گۆڕ دەنران. كۆیلە بە خاوەن گیان دانانێن. كۆیلە؛ ئۆرگانێكی، پارچەیەكی پادشا و خاوەنەكەیەتی. هەربۆیە زۆر ئاسایی دەبینرێ كە پارچەكانیشی لەگەڵیدا بچنە ژێر گۆڕەوە. شتی هەرە خراپ و سەرسوورهێنەر ئەوەیە كە كۆیلە و خزمەتكارەكانیش باوەڕدەكەن بەمجۆرەن، بە شێوەیەك وەكو ئۆرگانێك و پارچەیەك گرێدراون كە بە هیچ جۆرێك بیر لە یاخیبوون ناكەنەوە. ئەهرامەكانی میسر و گۆڕستانی ئازتەك و پەرستگاكانی سۆمەر، هیند و چین و تەواوی شاكارە بیناسازییەكانی رۆما، لە ئەنجامی رەنجی سەدان ساڵەی كۆیلەكان ئاواكراون. جگە لە كۆیلەداری هیچ سیستەمێك نەبۆتە خاوەن هێزێكی بەمجۆرە كە مرۆڤ وەكو ئامراز بەكاربێنێ و ناشبێت.

بێ بەرهەمی ئەم پەیوەندییە و بوونی كۆیلەكان بە بار بەسەر خاوەنەكانیان بناخەی هەڵوەشاندنەوەیە. بەكارهێنانی ئاسن لە كشتوكاڵ و پیشەكاری و سەربازی بە شێوەیەكی بەربلاو، كاریگەری و رۆڵێكی گرنگی لەمەدا هەیە. ئاسن هەم لە بەكارهێنانی بەرفراوانی بەرهەم هێنانی زەویدا رۆڵێكی دیاریكراوی هەبووە، هەم لەسەربەخۆیی چینی پیشەكاران هەمان رۆڵی بینیوە و وەكو چەكیش گەیشتۆتە دەستی گەلێك گروپی جیاواز. مس كانزایەكی سنووردارە و زیاتر لە ژێر موڵكایەتی چینی كۆیلەدار و بەڕێوەبەراندایە. زۆربوونی ئاسن ئەم نەبوون و پاوانخوازییەی سەرمسی شكاندووە. ئەم راستینەیەش واتای ئەفسانەیی ئاسن لە ناو كۆمەڵگادا روونده‌كاتەوە.

لە لایەكی دیكەشەوە ئەو لە رێ لادانەی لە ئەنجامی زێدە بەكارهێناندا لە نێو هەر سیستەمێكدا دەردەكەوێت، لێرەش رووبەڕوومان دەبێتەوە. كاتێك سیستەم پیرۆزی و بەپیتی سەرەتای لەدەستدا، ئیتر بەسەرچوون و مەترسییەكەی پێبەپێ لە وشیاریی مرۆڤدا جێگیر بوو و ئومێدی گەڕان و دۆزینەوەی ئەلتەرناتیفێكی باشتر زیاد دەبێت. پەیوەندییەكانی دەوروبەری ئامرازە نوێكان، بە تایبەتیش ئەو پەیوەندییانەی لە دەوروبەری ئاسن پێشدەكەوێ، رۆڵی سەرەكی لەمەدا دەبینن. لە كاتێكدا فەلسەفەی یۆنانی ساختەبوونی خوداوەندە میتۆلۆژییەكان ئاشكرا دەكات، زەردەشتایەتی میدیا ئیرادەی مرۆڤ بەرامبەر بە خودا دەپارێزێت و پیرۆزی دەكات. تەنانەت لەو سەردەمەی كە سیستەم لە لوتكەدایە، وەرچەرخانێكی ریشەیی لەپێكهاتەی زانین و رۆح، هزر و ئەخلاقدا بە ئاشكرا دەركەوتووە. ئیتر زۆرچاك دەرك بەوە كراوە یاساكان فەرموودەی خوداوەند نییە و فەرمانی پادشا و بەڕێوەبەرەكانە. لە كاتێكدا خوداوەندەكان دەكرێن بە تاكخودا و بۆ ئاسمان بەرزدەكرێنەوە و دەكرێت بە شتێكی نادیار، ئەوا زیادبوونی بایەخی مرۆڤ، بە شێوەی پێغەمبەرایەتی و فەیلەسوفی، دیمەنێكی بە جەسارەت و بوێرانەتر نیشاندەدات. ئیتر زیاتر باوەڕی بەوە دەهێنرێت كە داهێنان كاری ئەو ئەقڵەی مرۆڤە كە تازە و بە شێوەیەكی بەهێز وشیاربۆتەوە. لە هەناوی پەیوەندییە كۆیلەدارییەكانەوە مرۆڤی نوێ شانبەشانی بنەمای سیاسی و كۆمەڵایەتییەكەی لەمیانەی هێزی ئیرادە و هزرەوە دەخوڵقێ و لە رەوشی ئەو بەندە ـ كۆیلە رزگاری دەبێت كە سیستەم پشتی پێدەبەستێ و وەكو هێزێكی بە جۆش و ئاقڵمەند و هێزی چارەسەری گەشە دەكات.

ب ـ دەتوانرێ لە هەموو دەزگاكانی ژێرخان و سەرخانی كۆمەڵگادا بە كرداری هەڵوەشانەوەی سیستەمی كۆیلەداری ببینرێ.

١ ـ لەگەڵ ئەوەی كە دیاردە بەراییەكانی هەڵوەشانەوە و بەلاوەنانی هەر سیستەمێك گرێدراوی یەكترین، ئەوا هەروەكو دەزانرێ پێشكەوتنی پێكهاتە ماددییەكان كاریگەری و رۆڵێكی سەرەكی هەیە لە دیاریكردنی ئەنجامدا. لەگەڵ ئەوەی لەسەرەتادا كەڵەكەبوونی تەواوی ئامرازەكانی بەرهەمهێنانی كە سیستەم خاوەنێتی لەسەرووی هەمووشیانەوە كۆیلەكان دێتەئاراوە، ئەوا پەیوەندییەكانی موڵكایەتی كۆیلەداریش دەرفەت بە بەكارهێنانێكی كۆك لەگەڵ ئەمەدا نادات و بە گوێرەی بەرژەوەندی خۆی نابینێت. پەیوەندی موڵكایەتی، بە تایبەتیش رەوشی كۆیلایەتی بە تەواوی وەكو كۆت و بەندی لێهاتووە. ئەو سەفەرە سەربازییانەی روو لە زیادبوونوندان، بازارەكانیان پڕ لە كۆیلە كردووە. هەروەها بەردەوام دەست بەسەردا گرتنی ناوچە لادێیە ئازادەكان، ژمارەی كۆیلە و چینی پرۆلیتاری زیاد دەكرد. لە كاتێكدا زیادبوونی ژمارەی كۆیلە و بێكاران كە لە دەرەوەی توانای هەرسكردنی سیستەمدا بوو، هەناسەی لەبەر سیستەم بڕی، لە لایەكی دیكەوە بە سانایی دەستكەوتنی ئامرازەكانی بەرهەمهێنان لەسەرووی هەمووشیانەوە ئاسن، ئەوا لە ناوچە لادێییەكاندا لەسەر بنەمای پەیوەندی دەرەبەگایەتی لە دۆزینەوەی دەرگای بەرهەمهێنان دەگەڕێن. گوندێتی (لادێیی) پێشكەوتن و توانستێكی نوێ بەخۆیەوە دەبینێ و لەسەر ئەم بنەمایەش چاوەڕوانی رێكخستنە.

گوندێتی كە بەردەوام كۆیلایەتی بەسەریدا دەشكایەوە ئەمجارە لەسەر بنەمای پشتبەستن بە هێزی دیموكراتیزەكردنی ئاسن هەڵدەستێتە سەر پێیان و ئیتر لەم قۆناخەدایە كە لە رێگای ئامرازە تۆكمەكانی بەرهەمهێنان دەبێتە سەرەكیترین چینی چەرخەكانی ناوین. ئیتر یان لادێیی ئازادە، یاخود لەسەر بنەمای خاوەندارێتی هاوبەشی زەوی گرێدراوی سیستەمێكی پەیوەندییە كە پەیوەندی كۆیلەداری و موڵكایەتی دەربازدەكات. ئەم سیستەمەی پەیوەندیش رێگا لەپێش ئەوە دەكاتەوە كە زیاتر گرنگی و بایەخ بە ئامرازەكانی بەرهەمهێنان بدات و لە نزیكەوە خەریكی بەرهەمهێنان بێت و بە ژیانەوە پەیوەست و ئاسوودەبێ. ئیتر مافی ئەوەی پێدەدرێت ببێتە خاوەن ماڵ (خانوو) ئەم رەوشەش بەرامبەر بە نەبوونی ماف و پەیوەندی كۆیلەكان بەسەر ئامرازەكانی بەرهەمهێنان و تەنانەت تەرخان كردنی بەشێكی بەرهەم كە زگی پڕبكات، ئاستێكی زۆر لە پێشەوەیە. هەڵوەشانەوەی سیستەمی كۆیلایەتی لە ناوچە شاخاكاوییەكان بۆ ئەم پێشكەوتنانە دەگەڕێتەوە كە بەرهەمێكی زیاد بە دەستدێنێ و گەیشتۆتە ئاستێكی بەرز. لە هەموو گۆڕەپانەكاندا زیادبوونی خێرایی كاریگەرییەكانی هەلومەرجەكانی گۆڕانكاری دەبینرێ كە لە بواری ئابووری و كۆمەڵایەتی، سیستەم بەرەو هەڵوەشانەوە دەبات و ئاواكردنی سیستەمێكی نوێی ئابووری و كۆمەڵایەتی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. بە شێوەیەكی واقیعی و بەرجەستە دەركەوتنی ئەم راستینەیە و سەلماندنی توانستی بوون بە ئەلتەرناتیف، هۆكاری سەرەكی هەڵوەشانەوە و رووخانە.

لەگەڵ ئەوەی ئەمجۆرە پێشكەوتنانە لە هەموو ناوچەیەكدا روودەدات، بەڵام لە شوێنە كۆن و ناوەندەكانی سیستەمدا بەرچاوترە. زەوی و خاكە بەرفراوان و دەست لێنەدراوەكانی ئەوروپا كە بۆ كشتوكاڵ لەبار و گونجاون، بۆ پێكهاتنی سیستەمی نوێ لەبارترین هەلومەرجە. لەبەر ئەوەی بە شێوەیەكی قووڵ پەیوەندییەكانی كۆیلەداری بەخۆیەوە نەبینیوە، تایبەتمەندێتی وەها لە خۆوە دەگرێت، هەروەكو بڵێی رێگا لەپێش شۆڕشێكی دیكەی كشتوكاڵی دەكاتەوە. ئەوروپا دەبێتە ناوەندە نوێ و بەهێز و داهێنەرەكەی سیستەمی دەرەبەگایەتی. خاكەكانی رۆژهەڵاتی ناوینیش كە لەسەردەمی نئۆلیتیكەوە بەكاردەهێنرێ لەسەر بنەمای پەیوەندی دەرەبەگایەتی سەرلەنوێ رێكدەخرێتەوە. بێگومان لەبەر ئەوەی بنەمای كشتوكاڵییەكەی زۆر بەهێزە، بۆیە لەگەڵ شێوازی پەیوەندی دەرەبەگایەتی دەبووژێتەوە و دەگاتە پلە و ئاستێك، سەرلەنوێ رۆڵی دووەمین شۆڕشی كشتوكاڵی ببینێ، ئیتر روودانی شۆڕشی دەرەبەگایەتی بۆتە ناچارییەك و هەلومەرجەكانیشی تاوەكو بڵێی لەبارە. كاریگەریە قووڵ و درێژخایەنەكانی كۆیلایەتی، دووەمین بەهای پیرۆزی بە شێوازی بەرهەمهێنان و پەیوەندی دەرەبەگایەتی دەدات و ئەوەش نیشاندەدات كە ئەم ناوچەیە بە سانایی دەست لە رۆڵی پێشەنگایەتی بەرنادات.

قەیران و لێكهەڵوەشانەوەی پێكهاتەی ئابووری و كۆمەڵایەتییەكانی سیستەمی كۆیلەداری لە شارەكاندا قووڵدەبێتەوە. لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز بەدواوە دووەمین كاریگەری مەزنی ئاسن دەكرێتە سەر چینی پیشەكارانی ناوشارەكان. لەبەر ئەوەی پێشتر كانزا بە نرخ بوو زیاتر لە ژێر موڵكایەتی توێژی بەڕێوەبەرانی سیاسیدابوو و لە شێوازی پەیوەندی كۆیلەداریدا رێگای لەپێش پابەندبوون و پاشكۆیەتی دەكردەوە. كاتێك كانزاكان هەرزان و زۆر بوون و كەوتنە دەستی پیشەكارەكانەوە، ئەوا راستینەیەكی دەست لێبەرنەدراوە كە دەبێت بە چینێكی نوێی ركابەری سیستەم. ئیتر شارەكانیش لە رەوشی سەنتەربوونی كۆیلایەتی دەردەكەون و بۆ پێكهاتەی كۆمەڵایەتی وەها دەگۆڕێ كە دەشێ دژی سیستەم رۆڵ ببینن. ئەم پێشكەوتنانە لەسەرووی هەموویانەوە كاریگەری لەسەر بازرگانەكان و توێژەكانی دیكەش دەكات. چەندین پیشەی وەكو تەونكاری، جامچێتی، گلكار، ئاشەوانی و نووسەران و هتد... سەربەخۆ دەبن و دژی شێوازی پەیوەندی كۆیلەداری دەوەستن. ئیتر بەرامبەر بە شێوازی موڵكایەتی كۆیلەداری كە رێگای لەپێش شۆڕشی شار كردەوە، شار رۆڵی گۆڕهەڵكەنە دەبینێ. هەروەكو ناوچەی لادێ،

ئەو قەبرانە مەزن و هەڵوەشانەوەی لە ناوەندی شارەکان سەبارەت بە پەیوەندییەکانی موڵکایەتی کۆیلەداری روودەدات، لە کاتێکدا بەر لە هەموو شتێك رێگا لەپێش کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتووان دەکاتەوە، ئەوا بناخەی شاری نوێش دادەڕێژێ.

لەگەڵ گەیشتن بە سەدەی پێنجەمی زایینی ئەو شارانەی کە سیستەمی کۆیلەداری تێدا دەسەڵاتداربوو وەکو وێرانەیان لێهاتبوو و پاشکەوتنێکی مەزن جێگای باسە. لە کاتێکدا سیستەم لە قۆناخی هەرە لوتکەی خۆیدا بوو، بە تایبەتی رووخانی شارە شکۆدارەکانی یۆنان ـ رۆمان وەکو زیان و لەدەستدانێکی مەزن کاریگەری خۆی دەکات. ئەو بیناسازییەی تاوەکو ئێستاش مرۆڤ لێی واقی وڕدەمێنێ، جارێکی دیکە هاوتای نابینرێ. کاتێ سیستەمی دەرەبەگایەتی وەکو دووەمین شۆڕشی کشتوکاڵی جێگای خۆی لە شانۆی مێژوودا دەگرێت، رۆڵی شارەکان بە پلەی دووەم دێت. هیچ کاتێك ناتوانێ بە ئاستی شاری سیستەمی کۆیلەداری و بیناسازی و دەوڵەمەندییەکەی بگات. ئەم شارانەی کە وەکو گوندی گەورەیان لێهاتووە و بچووك بوونەتەوە بە شێوەی بڕیارگای بەڕێوەبەرایەتییە نوێکان بەکاردەهێنرێن. بەرامبەر بە بچووکبوونەوەی شارەکان و کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوانی، ژمارەی گوند و دانیشتووانەکانیشیان روو لە زیادبوون دەکات.

لەبەرئەوەی شێوازی پەیوەندی کۆیلەداری بە گوێرەی هەلومەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆ تەواوی پێکهاتەی بەرهەم و هزر و ئەخلاقی مرۆڤ تەسك و سنووردارە، هەڵوەشاوەتەوە. بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا دەبینرێ کە مەزنبوونی هێزی بەرهەمهێنانی مرۆڤ لەلایەنی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە و مەزن بوونێکی هاوشێوەش لە ئامرازەکانی بەرهەم هێناندا، پێبەپێی دژبەرایەتی لەگەڵ شێوازی هزر و ژیان و موڵکایەتی کۆیلەداری زیاد دەبێت و ئەمەش هۆی سەرەکی هەڵوەشانەوەیە. هەروەکو چۆن لە سەردەمی ئاواکردندا رێکخستنی گونجاو و پێکهاتەی هزر و ئەخلاق رۆڵی دیاریکراوی بینی و زەبر و فێڵبازی بە پلەی دووەم رۆڵیان بینی، لە رووخانیشدا هەمان هۆکارەکانی دەستبەتاڵی، پاشڤەڕۆیی هزری و ئەو کەوتنەی لە بواری ئەخلاقییەوە هاتە ئاراوە رۆڵی سەرەکی بینیوە. ئەو پێشکەوتنانەی لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە هاتوونەتە ئاراوە، ئەم راستینەیە پشت راست دەکەنەوە. رۆڵی زەبر و ئایدیۆلۆژیا نوێیەکە بە پلەی دووەم دێت.

٢ ـ شارستانییەتی کۆیلەداری لەمیانەی ئیمپریالیزمی رۆما گەیشتە لوتکەی خۆی، دامەزراوە سیاسی و سەربازییەکانیشی بەرزترین ئاستی پێشکەوتنیان بەخۆوە بینی. لە سیاسەتدا شێوەکانی مۆنارشی، ئۆلیگارشی و دیموکراسی وەکو شێوەی بەڕێوەبەرایەتی تاقیکراونەتەوە. رۆما کە سەرەتا کۆمارێکی ئۆلیگارشییانەی هەڵبژاردەیە، دواتر لەگەڵ دەرباز بوونی بۆ رژێمی ئیمپراتۆرییەت، رژێمەکە هەم لە ناوەوە هەم لە دەرەوە بە رادەیەکی هەرە زیادە و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن سیستەمی توند و تیژی بەکارهێناوە. بەڵام ئەو جۆرە هەڵوەشاندنەوەیەی چاوەڕوانی نەدەکرا لە ئیمپراتۆرییەتی رۆمادا دەبینرێ. ئەم پێشکەوتنەش بەڵگەیەکی گرنگە کە زەبری سەربازی و سیاسی رۆڵێکی دیاریکراوی لە وەرچەرخانی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکاندا نییە. لە ساڵانی ٣٠٠ زایینی بەدواوە قەڵای سیستەم لە هەموو لایەکەوە کون کون کرا. هێندە بە کاریگەربوونی ئەو تیرە بەربەرانەی لە باکوور دابەزین لەسەردەمی ئاواکردنی کۆمارەوە ، گرێدراوی رزینی سیستەمە لە ناوخۆیدا.

سەرەڕای ئەوەی ئەو تیرانە هەبوون، بەڵام بێ رۆڵ و بێ کاریگەر بوون، لەم قۆناخەشدا کاریگەربوون و رۆڵ بینیان زۆر بە چاکی ئەم راستییە روونەدەکاتەوە. سەرەڕای ئەوەی دەوڵەت بە تەواوی بۆ شێوەی کۆمەڵکاری (کۆرپۆراتیف) گۆڕاوە، بەڵام دیسان پێشی لە هەڵوەشانەوە نەگیراوە (کۆرپۆراتیف: شێوەیەکی سیستەمە کە نوێنەری هەموو چین و پیشەکان جێگای خۆیان تێدا دەگرن و ئامانجی نەهێشتنی ناکۆکی چینایەتییە و بنەمایەکی ئایدیۆلۆژی هەیە ـ و). شێوەیەکی فاشیزمی کۆیلەداری پەیڕەو دەکرێت. سەرەڕای ئەوەی هەموو شتێك بە گوێرەی پەیڕەوێك بەرنامە رێژکراوە و سیستەم بۆتە خاوەنی پێکهاتەیەکی تۆتالیتاری (لە هەموو لایەکەوە تاك بە دەوڵەت گرێدان) باڵادەست، بەڵام دیسان بەردەوامکردنی هەڵوەشانەوە تەنیا بەم شێوەیە روونەدەکرێتەوە کە تەمەنی سیستەم تەواوبووە.

تەنیا ئەم نموونەش ئەوە نیشان دەدات هەروەکو چۆن دەزگا سیاسی و سەربازییەکان لە دامەزراندن بەمجۆرە بوو، ئەوا لە هەڵوەشانەوەشدا رۆڵیان دیاریکراو نییە؛ ئەمەش ئاشکرا دەبێت کە رۆڵی سەرەکی گرێدراوی پێشکەوتنە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانە. بێگومان لەم قۆناخەدا فشار و زۆرداری دەگاتە ئاستی هەرە بڵند. تیرۆر لەسەر جەماوەر پیادە دەکرێت. دیمەنی تۆقێنەرانە لە ئارانەکان رێکدەخرێت. رکەبەرەکان لەلایەن شێرەوە پارچە پارچە دەکرێن. هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەك پەیڕەودەکرێت. تەڵەکەبازی و پێشێلکاری باڵادەگرن. زوو زوو کودەتا روو دەدات. بەڵام تەواوی ئەمانەش ناتوانێ قۆناخ بەرەو دواوە پێچەوانە بکاتەوە. بەڵکو درەنگی دەخات، هەندێ جاریش خێرای دەکات. ئیتر ئیرادەی سیستەمی کۆن هەژاوە و سیستەمی نوێ خۆی دەسەپێنێ.

لە رۆژهەڵاتیش ئیمپراتۆرییەتی ساسانی ـ پارس کە لە ساڵانی ٢١٦ زایینی ئاوا کرابوو، لەم سەدەیەدا دووچاری رەوشێکی هاوشێوەی رۆما هاتبوو. ئیتر ناتوانێ دەسکەوتێك بۆ مێژوو بە دەستبێنێ. وەکو کۆپییەیەکی ئەخمینییە کۆنەکان هەوڵی بەدەزگابوون دەدات. هەروەکو چۆن خاوەنی بەهایەکی ئەخلاقی و ئایدیۆلۆژیایەکی نوێ نین، ئەوا تایبەتمەندێتی بنەماڵەیی دەزگای ئیمپراتۆرییەت، سنووردار بوون و تەنگ بوونی سیاسیش لەگەڵ خۆیدا دێنێ. لە پەلوپۆ کەوتنیشی بەرامبەر هێرشەکانی ئیسلام ـ عەرەب کە ماوەیەکی کورت دوای ئەمە ئەنجام دەدرێت، هەمان چارەنووسی ئەخمینییەکانمان دێنێتەوە یاد کە بەرامبەر ئەسکەندەر پەرتەوازەبوون. ئەوەی لێرەدا رووبەڕوومان دەبێتەوە، بە زۆر لەسەرپێ هێشتنەوەی سیستەمێکە کە لە ناوخۆی هەڵوەشاوەتەوە. سەرەڕای ئەوەی هێزێکی مەزنی سەربازی هەیە، بەڵام ئایدیۆلۆژیا و ئەخلاقی باڵادەست، دوورە لەوەی بتوانێ بەسەر ئەخلاق و ئایدیۆلۆژیای نوێدا زاڵبێت. کولتووری ئیسلامی رۆڵی پێشکەوتنخوازی فاکتەرەکانی کولتووری هێلین دەبینێ. لە یەکەمین ناتوانێ بەرامبەر بە دژواری توندوتیژی ئەسکەندەر بەرگە بگرێت، بەڵام ئەوەی دووەم بەرامبەر بە زەبرێکی سنووورداری عەرەبە ـ ئیسلامییەکان خۆیان رانەگرتووە و هەڵوەشاونەتەوە. دیسان ئەوەی سەلمێنراوە باڵابوونی هێزی ئەخلاقی و ئایدیۆلۆژی نوێیە. قۆناخی دوای ئەوەش هەرچەندە چەند ژێرکەوتنێکیش بە خۆیەوە ببینێ ئەوا لەسەر بنەمای ئەو ئەزموونانەی لێی وەردەگیردرێت، دەبێتە سەرکەوتنی رێکخستنە سیاسی و سەربازییە نوێیەکە. مێژوو گەواهی پێشکەوتنی بێ ژماری بەمجۆرەیە. رەوشی سۆمەریەکان بەرامبەر بە ئەکەد، بابل و ئاشووریەکان و میسر بەرامبەر بە پارس، یۆنان و رۆماییەکان بەڵگەیەکی دیکەی سەلمێنەری ئەم راستینەیەیە. کاتێك سیستەم لە پەلوپۆ بکەوێت و دووچاری تەنگە نەفەسی بێت، ئەوا لە ناوەوە یان لە دەرەوە، زوو یان درەنگ، سەرەڕای نەبوونی هاوسەنگییەکانی هێز، هێزێکی نوێ بە هەموو توانایەوە بەسەر هێزی کۆندا دەچێت و تێکی دەشکێنێ و بەلاوەی دەنێ. هیند و چین درەنگ وەختتر دووچاری ئەم رەوشە دەبن، بەڵام بە شێوەی پەرتەوازەیی و رزینی ناوخۆ دەبێت، توندوتیژی تەنیا رۆڵی قووڵکردنەوە و مەزنکردنی ئاڵۆزی دەبینێ.

لە نزیکەوە شیکردنەوەی ئەو زەبرەی کە دام و دەزگا سەربازی و سیاسییەکانی سیستەمی کۆیلەداری پیادەیان کردووە، گەلێك وانە و ئەزموونمان فێر دەکات. ئەو سیستەمەی بۆ یەکەمجار لە مێژوودا جەسارەتی کرد لەسەر بنەمای توندوتیژی و بە شێوەیەکی بەرنامەڕێژ کراو هاو رەچەڵەکی خۆی لە نێوببات و ئەم بڕیارەی لە رێگای شێوازی نائاسایی و بێ هاوتا پەیڕەو کردووە، بەرامبەر بەو داب و نەریتەش بەرپرسیارە کە مێژوو بە شێوەیەکی خوێناوی بنووسرێت. هیچ ئاژەڵێك مەیلێکی توند و تیژی بەمجۆرەی بەرامبەر هاوڕەگەزی خۆی بەکارنەهێناوە. هەربۆیە هەروەکو دەگوترێ ئەو زەبرە سیاسی و سەربازییەی لە رێگای جیاوازی چین، رەگەز، ئەتنیکی و کولتوورییەوە پێشدەکەوێت، شتێکی بەدەر لە مرۆڤ و کردارێکی ئاژەڵانە نییە، بە پێچەوانەوە شتێکی بەدەر لە ئاژەڵانە و کردارێکی مرۆڤانەیە کە وەکو راستینەیەکی نەفرینلێکراوی کۆمەڵگای چینایەتی دەردەکەوێت. لەبەرئەوەی زەبری کۆیلەداری بۆ یەکەمجار بەکاردەهێنرێ و خاوەن تایبەتمەندییەکی بەمجۆرەیە، پێویست دەکات بە بایەخەوە شیکردنەوەی دەرهەق بکرێت. گرنگترین پێشکەوتن و لە بواری ئەخلاقیشدا مەترسیدارترین پێشکەوتنی ئەو سەرخان و بەڕێوەبەرانە رێگایان لەپێش کردەوە ئەوەیە کە پەنایان بردبووە بەر هێزی سیحراوی زەبر ئەو شێتایەتییەیە کە خۆیان کردووە بە خوداوەند. کاتێك جارێ

ئەوەدرا کە بەڕێوەبەرایەتی خاوەن کارەکتەری ئیلاهی (خودایی)یە و بە شێوەیەکی بەرفراوان پڕوپاگەندەی بۆ کرا، ئەوا دەرگای شێتایەتی پاشڤەڕۆیی ئاوالابووە. لەمیانەی نموونەی سەرسووڕهێنەرانەوە مێژوو گەواهی ئەوەیە کە ترسناکترین ڕژێم لە ژێر ناوی خوداوەندەکانەوە پیرۆز ڕاگیراوە. لە ڕاستیدا کارەکتەری دەوڵەتی کۆیلەداری کە لە ئەنجامی شیکردنەوەی وشکی چینایەتی چارەسەر ناکرێت و لەمیانەی هەویری ئایدیۆلۆژی شێلراوە و بە توند و تیژی پڕکراوەتەوە، کارەکتەری سەرەکی تەواوی دەوڵەتەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمانە. دەوڵەتی سۆسیالیزمی بونیادنراویش جێگای خۆی تێدا دەگرێ. هەروەکو چۆن کارەکتەری ئەو چینانەی بانگەشەی پرەنسیپی علمانییەت دەکەن بە تەواوەتی ئەم ڕاستینەیان بۆ شینەکراوەتەوە، ئەوا لەمەش بەدوانەکەوتووە کە ئیلاهییاتی خۆی بخزێنێتە ناو دیاردەی سیاسی. ئەو دەوڵەتەی پشت بە شۆڕشی بۆرژوازی فەرەنسا دەبەستێ کارەکتەری علمانییەتەکەی رووکەشییە. هەروەکو چۆن دەستی بۆ گەوهەری کێشەکە نەبردووە، ئەوا هەڵوێستی ریفۆرمیستانەی لە مەزنکردنی مەترسی بەولاوە ڕۆڵێکی دیکەی نەدیوە.

٤- لە سەردەمی ئاواکردن یاخود هەڵوەشانەوە بێت ڕەنگدانەوە ئایدیۆلۆژییەکان جێی بایەخن. کاتێك زمانی ئایدیۆلۆژیا شیبکرێتەوە ئەو کاتە شیکردنەوەی مێژوو بە واتای راستەقینەی خۆی دەگات. کاتێك تەنیا پێشکەوتنی میتۆلۆژی و ئایینی و فەلسەفییەکانی ناواخنی کۆمەڵگای چینایەتی گرێدراو بە فاکتەرە ماددییەکان هەڵسەنگێنرێت، دەتوانرێ بە چەمکێکی ڕاستی مێژوو بگەی. نووسینی مێژووی فەلسەفە و ئایینی و فەلسەفەکان بە شێوەیەکی دابڕاو و داتاشراو گەلێك مەترسی مەزن لەخۆوە دەگرێت. ئەم هەڵوێستەش زانیارییەکی نیوەچڵ دەرهەق بە ڕاستی لەگەڵ خۆیدا دێنێ، ئەمەش لە نەبوونی هیچ زانیارییەك مەترسیدارترە. پێویست بوو مێژوو ببێتە پەرتوکی پیرۆزی مرۆڤایەتی، بەڵام بە ئەندازەی چەواشەکاری و چەوتییە مەزنەکانی بواری مێژوو، هێشتنەوەی بۆشایی و لایەنی نادیار، مرۆڤایەتی مەحکوومی ژیانێك کردووە کە ئەم پەرتووکە پیرۆزەی نەبێت. نەبوونی مێژوو (بێ مێژوویی) بۆ مرۆڤ گەورەترین نەزانییە. مێژووی چەوت، لە نەزانی و کوێری خراپترە، چەوت بینینە. شینەکردنەوەی قاڵبە هزری و ڕۆحییە سەرەکییەکانی قۆناخە ئایدیۆلۆژییەکانی شارستانییەتی کۆیلەداری لەژێر ئەم ڕاستینەیەدا شاراوەیە. سەرچاوەی سەرەکی ئەم هەڵسەنگاندنەی سەبارەت بە پێناسەکردنی کۆیلەداری ئەنجامماندا ئەگەر بە شێوەیەکی لاواز و سنووردداریش بێ، بە چاوێکی پیرۆز تەماشا کردنی مێژووە. دەرك بەوە دەکەم کە هیچ کوێرایەتی و نەزانییەك بە ئەندازەی ئەو کوێرانییەی لە مێژووە سەرچاوە دەگرێت خاوەنی کاریگەرییەکی بەمجۆرە نین کە هزر و دڵ بکوژن.

ئەو پێکهاتە ئایدیۆلۆژییەی سیستەمی کۆیلەداری کە لەسەر بنەمای میتۆلۆژییەکی ئاقڵمەندانە ئاواکراوە، کاتێك لە سێ بەرە گرنگەوە تێکشکێنرا، ئەو کات بەدوای پێشخستنی ئەم ڕێگایانەدا گەڕا کە بەرەو ڕزگاری و ئازادی دەبات.

١ ـ یەکەمین تاقی کردنەوەی ڕێبازی ئازادی و ڕزگاری، تایبەت بە عیبرانییەکانە. هەرچەندە مێژووی هەر سێ ئایینە مەزنە تاکخوداییەکە، خۆیان وەکو تاکە ڕێگای ڕاستی نیشانبدەن، لە ڕاستیدا هەر سێکیان لقی جیاجیای هەمان داب و نەریتن. لەگەڵ پێشکەوتنی وشیاری و تێگەیشتنی مێژوویی، ئەمە روونبۆتەوە کە کاریگەریان لەسەر گەلێك لقی جیاوازتر کردووە و کاریگەریان لێکراوە. هەلومەرجە بابەتییەکانی کە هەن، بناخەی ئەمەن. کەواتە ئەمانە قەڵەمبازی خودایی نین کە لەمیانەی پێکشەوتنەکانی ناوخۆ دەرکەوتبن.

کاتێك ناوەندەکانی شارستانییەتی میسر و سۆمەر پێکهاتن، ئەوا ئەو تیرە بە ڕەچەڵەك سامییانەی کە لە نێوان ئەم ناوەندانە بوون و سۆمەریەکان بە ئامۆریت ناویان دەبردن و میسریەکانیش ئابیرۆیان پێدەگوتن، ئەم تیرانە بەردەوام لە گەڕان و جموجۆڵدا بوون. یان وەکو هێزێکی نوێی کار جێگای خۆی لە نێو سیستەمدا دەگرێت، یاخود ناوە بە ناوە هێرش دەکاتە سەر سیستەم و تاڵانی دەکات. ئەم قۆناخەی کە لە ساڵانی ٣٠٠٠ پ.ز لەگەڵ پێکهاتنی شارستانییەت دەستیپێکرد؛ لە باکووری نیمچە دوورگەی عەرەب وەکو سەرچاوەی ناکۆکییەکی گرنگی مێژوویی شێوەدەگرێت. هەروەکو چۆن هێزێکی ئەوتۆیان نییە کە لەگەڵ سیستەمدا پێشبڕکێ بکەن، بەڵام لە قووڵایی بیابانەکاندا خاوەنی تواناکارییەکانی خۆپاراستنن. دەزگای شێخایەتی کە وەکو سەرۆکی تیرە وایە، ڕۆڵی شامان و سیحربازی تێپەڕدەکات، لەلایەنی بە ساڵاچووترین و زاناترین کەسەوە وەکو شێخ نوێنەرایەتی دەکرێت. تیرە لە ڕێگای داب و نەریتە توندەکانی باوکسالاری بەڕێوەدەبردرێت. شێخ هەم نوێنەری سیستەمە، هەم هێزی پەرەپێدانیەتی. کاریگەری هەردوو ناوەندیش مسۆگەرە. گۆڕانکاری موڵك و هزر وەکو کۆنترین داب و نەریتی مێژوو بەردەوامە. تیرەکان زوو هەست بە گرنگی و بایەخی بازرگانی دەکەن و دەبنە بازرگان. هەروەکو بڵێی ڕۆڵی تەواوکاری ئەڵقەی میسر و میزۆپۆتامیا دەبینن. لەگەڵ ئاواکردنی خانەدانی ئەکەد لە ڕێگای سەرجۆن و لەلایەنی پەیوەندییەکانی خزمایەتییان، ئەم تیرانە بەهێزدەبن. هەروەکو دەبینرێ لە ساڵانی ١٧٠٠ پ.ز تیرەی حەزرەتی ئیبراهیم هەوڵیداوە لە میسر نیشتەجێ بێت. لە ئورفا ـ حەرانەوە چوون بۆ میسر و نیشتەجێبوون. ئەمەش ئاستی بازرگانی و جموجۆڵ نیشاندەدات. لەمیانەی پەرتووکە ئایینە پیرۆزەکاندا روونەدەبێتەوە کە سەرەڕای ئەوەی لەو ناوەندەدا هەندێ بواری فەرمانڕەوایەتی سنووردداریشیان دەسکەوتووە، تیرەی حەزرەتی ئیبراهیم لە رەوشی نیو کۆیلایەتی ڕزگاریان نەبووە و بەردەوام لە نێو ناکۆکییەکی بەمجۆرەدا ژیاون. شتێکی هێندە ئاستەم نییە شرۆڤەیەکی بەمجۆرە پێشبخرێت کە خەیاڵە ئایدیۆلۆژی و پێکهاتەی هزرە ئایدیۆلۆژییەکانی میسر و سۆمەریان ناسیوە و کاریگەرییەکی بەرفراوانیان کراوەتە سەر. بەڵام ئەمەش مەسەلەیەکی ئاشکرایە کە بەهۆی ئەوەی پێکهاتەی تیرەیی ناتوانن بە سانایی دەست لە ئایینە باوکسالارییەکان بەربدەن، شیمانە و چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت لەسەر بنەمای پێکهاتەی تیرەکان بەردەوام پەیوەندی و ناکۆکییە چڕ و بەرفراوانەکان ڕێگا لەپێش هەنگاو پێهەلگرتن دەکاتەوە.

دەزگای پێغەمبەرایەتی بە واتای پەیامنێری دێت. ئەگەر ئیلهام لەسەرچاوەیەکەوە وەربگیردرێت و ڕێگا لەپێش پێشکەوتنێکی واتادار و سەرنج ڕاکێش بکاتەوە، ئەو کاتە ناوبردنی بە قەڵەمبازێکی پێغەمبەرانە شتێکە دەرکی پێدەکرێت. پێغەمبەرایەتی لە بوارێکی دیکەدا بە واتای شێخێکی خولقێنەر دێت. جموجۆڵی بەردەوامی تیرەکان و خۆ تێرکردنیان لەسەرچاوەکانی سیستەم و گرنگی و بایەخدان بەو کەسانەی لە کاتی هەنگاونان ڕێبەرایەتییان بۆ دەکەن، بابەت و تایبەتمەندییەکن کە بەربلاودەبێت. ئەو سەرۆك گروپ و تیرانەی ڕێگایان لەپێش پێشکەوتنی نوێ و هزر و جوڵانەوە کردبێتەوە ناوبردنیان بە پێغەمبەر بە واتای گەوهەری دەزگایە نوێیەکە دێت. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا دەتوانرێ پێغەمبەرایەتی بەو کەس و دەزگایە پێناسەبکرێت کە ئەو هزرانەی لە سۆمەر و میسر و ناوەندەکانی دواتر ئیلهامیان لێگرتووە، لەگەڵ داب و نەریت و چەمکی ئایینی باوکسالاری کردۆتە یەك و ڕێگایان لەپێش پێکهاتەیەکی ئایینی یاخود میتۆلۆژی نوێ کردۆتەوە. کاتێك هەوڵەکانی لەدەستنەدانی ئازادی تیرەشی بخەینە سەر، ئەوا دەرکەوتنی پێغەمبەرایەتی لەژێر دەمامکێکی نوێی ئایینی دەبێتە جوڵانەوەی ئازادی تیرە بەرامبەر بە سیستەمی کۆن. بەڵام لەبەر ئەوەی خاوەنی تواناکاری بەلاوەنانی سیستەم نییە، ئەوا ئەنجامی چاوەڕواننەکراو ئەوەیە خاوەنی کاریگەرییەکی وەها بن، کە سیستەم ناچاری ئەنجامدانی ریفۆرم بکەن. لەوەش گرنگتر پێشکەوتنێکی چاوەڕوانکراو ئەوەیە کە جگە لەم دوو ناوەندە وەکو ڕێگایەکی سێیەم لە جوگرافیایەکی بەرفراواندا کاریگەریان زیاد دەبێت. دەرکەوتنی ئایینە مەزنەکانی کە حەزرەتی ئیبراهیم ڕێبەرایەتی کرد و لە مێژوودا ئەنجامی گرنگ لەگەڵ خۆیدا دێنێ، گوزارشت و دەربڕینی بەرجەستەیی (ماددی) جموجۆڵی ئەو تیرانەیە. ئەم داب و نەریتەی هەم لە بڵاوبوونەوەی کۆیلایەتی، هەم بەلاوەنانی، ڕۆڵێکی سەرەکی بینی و سەرەتا سیستەمی نەرمکرد و بە ریفۆرمیدا تێپەڕاند، لەگەڵ حەزرەتی عیساش، واتا لە قۆناخی هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی کۆیلەداری، ڕۆڵی جوڵانەوەیەکی ئایدیۆلۆژی و کۆمەڵایەتی سەرەکی دەبینێ.

ئەم پێشکەوتنەی بە شێوەیەکی واقیعی و بەرجەستە بە ڕێبازی عیبرانییەکان ناودەبرێت، دەتوانرێت وەکو چیرۆکێکی مەییوی میتۆلۆژیای سۆمەری و میسری شرۆڤە بکرێت، کە بۆ ئایینی تاکخودایی وەرچەرخێنراون. بەو ڕادەیەی لە مێژوو ڕەنگیداوەتەوە، دەتوانرێ ئەم چیرۆکە لە دەرکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیم لە ناوەندە کۆلۆنییەکانی ئورفا و دەوروبەرەکەی دەستپێبکرێت، کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی خانەدانە ئاشووری و بابلیەکان. ئەفسانەی شکاندنی بت لەلایەن ئیبراهیمەوە، بە واتای بێ باوەڕی و سەرهەڵدان دێت بەرامبەر داب و نەریتە کۆنەکان و ئەو میتۆلۆژیایانەی کۆڵەکەکەیان پێکدێنێ. لەو قۆناخەدا داخوازی گەلێك تیرە بۆ جوڵانەوەیەکی ئازادانە و ژیانێکی پڕ لە پێکدادان لە ئارادایە کە سەرچاوەکەی بۆ ئەم داخوازییە دەگەڕێتەوە. دەوڵەتی شار لەمیانەی ئایدیۆلۆژیای فەرمی و کولتووری عیبادەت، نوێنەرایەتی لایەنێك دەکات. دیاردەی بڵاوکردنەوەی کۆمەڵگای چینایەتی هەڕەشە لە یەکسانی

تیره دەکات. دەشێ هەرێمی ئورفا کۆنترین و سەرەکیترین هەرێمی کۆمەڵگای نئۆلیتیك بێت، کاتێك تەڤلی سەردەمی شارستانییەت کراوە، دەشێ لەم قۆناخەدا (کۆتاییەکانی ۲۰۰۰ پ.ز) بووبێتە ناوەندی جموجۆڵێکی کۆمەڵایەتی بەرفراوان. باوەڕی و مەنزلگای پێغەمبەران کە تاوەکو ئێستا لەم ناوچەیەدا باسدەکرێ و سەردانی دەکرێ، ئەم ڕاستینەیە پشت ڕاست دەکات. واتە ئەم ناوچەیە لە رەوشی رکابەرایەتیدابوو دژ بە پەرینەوەی ئاشوور و بابل بۆ کۆمەڵگای چینایەتی. وەستان دژی بتەکان و شکاندنیان، گوزارشتی ئایدیۆلۆژی و سەمبۆڵی ئەم قۆناخەیە. لێرەدا لە جێگای خۆیدایە حەزرەتی ئیبراهیم وەکو باپیرەی ئایدیۆلۆژی و سەمبۆلی ئەم وڵاتە (ناوچەیە) ببینرێت. داننانی بە باڵادەستی بابل و ئاشووری و ئامرازە ئایدیۆلۆژی و ناسنامەکانیان شتێکی ئاساییە.

لە لایەکی دیکەشەوە سەرۆکایەتی تیرە بەڕێوە بردن و پاراستنی داب و نەریتی باوکسالاری دەکاتە ناچارییەك. دەرکەوتنی سەنتێزێکی باڵا لەو دوو کولتوورەی ئەم قۆناخەی مێژوو، وزەی شاراوە گرنگترین پێشکەوتن لەخۆوە دەگرێت. قۆناخی مێژوویی لە سەمبۆڵی ئایدیۆلۆژیای ئەم سەنتێزە دیار دەبێت کە ئەویش لە فرەخوداوەندییەوە، هەنگاو هاوێشتنە بۆ قۆناخی تاکخودایی. هەر لەبەر ئەوەی لە کارەکتەرێکدا بەرجەستەبووە، هەردوو کولتوور تێپەڕ دەکات، بۆیە دەشێ ڕۆڵی کۆڵەکەیەکی پێشکەوتووخوازانە ببینێ. زاراوەی ئیلاه (خودا) کە لە رەوشی بتێتی رزگاریبووە و بەرەو ئاسمان بەرزکراوتەوە، نوێکاری لەخۆوە دەگرێت. بە ئامانجگرتنی فرەخوداوەندی داب و نەریتی سۆمەر و بتەکان بە واتای هەڵوێست نیشاندان دێت بەرامبەر سیستەمی جێگیر واتا هەڵوێست نیشاندانە بەرامبەر کۆیلەداری. لە لایەکی دیکەشەوە پێویست دەکات ئایینی تەوتەمی تیرەکان بەلاوە بنرێت، چونکە بە واتای گەوهەری بتپەرستی دێت. ئەمەش خۆ رزگارکردن لە تیرەی بچووك و تەنگ و هەنگاونان بەرەو یەکێتییەکی مەزنی تیرەکان دەکات بە ناچارییەك. بۆ هەردوو ئامانجیش باوەڕی تاکخودایی وەکو شێوەی باوەڕییەك خۆی نیشان دەدات، کە تا دواڕادە هێزی شیکردنەوەی هەیە. چەمکێکی سەبارەت بە خودا، کە هێزەکەی مەزنکراوە و لە رەوشێکی بەرجەستەیی بتێکی بێ هێز رزگارکراوە و گەیشتۆتە ئاستێك لە ئاسمانەوە فەرمووده و فەرمان بنێرێت بەمجۆرەش دەبێتە وەڵامێکی تەواو بۆ بەرخودان و ئازادی و پێویستی یەکێتی ڕاستینەی کۆمەڵگا. شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە لەم قۆناخەدا، بە شێوەیەکی بەرفراوان گەران بە دوای وەڵامێکی گۆڕانکاری شێوەی کۆمەڵایەتی و ئابووری، واتایەکی پڕ بایەخ و مێژوویی هەیە. وەڵامی ئازادی و یەکێتی بۆ ئەم لێگەڕینە کارەکتەرێکی وزەبەخش و نوێکاری هەیە و بە شێوەیەکی نائاسایی سەرنج ڕاکێشە. خۆ پاراستن بەرامبەر بە دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانی میسر و سۆمەر کە لە زووەوە هێماکانی هەڵوەشانەوەیان دەرکەوتبوون، ئەگەر بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت، تایبەت بوونی ئەم لێگەڕێنە و هەناسەدانی وەکو شێوەیەکی نوێی ژیان، گوزارشتێکی زەقی واتا مێژووییەکەیەتی. کاریگەری بەهێزی ئایینە تاکخوادییەکان سەرچاوەی خۆی لەو گرنگی و بایەخە مەزنەوە دێت کە وەڵامی ئەم پێویستییە مێژووییەی داوەتەوە.

هەروەها دەتوانین گەوهەری جوڵانەوەی ئیبراهیم بەمجۆرە ئاماژە پێبکەین کە نزیك بە سەنتێزی کولتووری ئاریان ـ هۆری و سامی ـ ئامۆری کە لە ناوچەکەدا تێکەڵ بە یەکتری دەژین، هەربۆیە وزەی شاراوەی بوون بەوەڵامی گەردوونی قۆناخ، لایەکی دیکەی گرنگییەکەیەتی.

جوڵانەوەی ئیبراهیمی کە بەمجۆرە ئاماژەمان بە پوختەکەی کرد، هەروەها نزیکی سەنتێزی کولتووری ئامۆریتە ـ سامیەکان و هۆریە ـ ئاریانەکانە کە لە ناوچەکەدا تێکچڕژاون، هەربۆیە لایەنێکی دیکەی بە بایەخی ئەوەیە کە توانستی ئەوە لەخۆوە دەگرێت ببێتە وەڵامی گەردوونی قۆناخ. ئەو زەمینە کولتوورییەی پشتی پێدەبەستێ وایکردووە لە بەرەو رووبوونەوەی سیستەمی کۆیلەداری، ئامانجەکانی لە ئازادی و یەکێتی، ببێتە هۆکاری ئەوەی چەندەی بڵێی ئایدیۆلۆژیای ئایینی تاکخودایی شکۆمەندی بگرێت و بەهایەکی مەزنی پێبدرێت. شوێنگەی ئافراندنی میتۆلۆژیایەك جێگای باسە کە لە ئاستی میتۆلۆژیای ڕاهیبەکانی سۆمەر و میسردایە. ئەم شوێنگەیەش وەکو پێغەمبەرایەتی ـ پەیامبەر بەرجەستەبووە، مسۆگەر جیاوازی نێوان خودا ـ مرۆڤی دەستنیشان کردووە. کاتێك ڕاستینەی، **هەرگیز مرۆڤ نابێت بە خودا**، دەکات بە پرەنسیپێکی سەرەکی خۆی، ئەوا سەبارەت بە چەمکی ئایین ڕێگا لەپێش گەورەترین ریفۆرم دەکاتەوە. دەرککردن بەوەی مرۆڤ نابێت بە خودا شۆڕشێکی مەزنە. لە تەواوی باوەڕییەکانی پێشتر خوداوەندەکانی لە رووخساری مرۆڤ زاڵ و باوە. دەشێ لەمیانەی ئەم باوەڕییە کۆنانەوە مرۆڤ خۆی وەکو خوداوەند خاوەنی هەمان هێزی خودا ڕاگەیەنێ. هەربۆیە دەبینین پادشا ـ خوداوەندەکانی میسر و سۆمەر وەکو شێوەی هەرە زێدەڕۆیی و تۆقێنەر ڕۆڵی مێژووییان بینیوە. نەبوونی مرۆڤ بە خوداوەند لێدانێکی مەزن لەم شێوازەی کۆیلەداری دەدات. جموجۆڵێکی ئایدیۆلۆژی کۆمەڵایەتی بەمجۆرە کە سیستەمی کۆیلەداری هەڵدەوەشێنێتەوە، گەوهەری قەڵەمباز و چالاکییەکی بەهێز لەخۆوە دەگرێت. ڕووداوەکانی مێژوو بە تایبەتیش هی ڕۆژهەڵات بە ڕادەیەکی مەزن گوزارشتی چیرۆك ئامێزانەی ئەم ڕاستینەیە. باس کردنێتی بە شێوەی ئەفسانە یاخود مێژووی ئایین.

چیرۆکی کۆچبەری حەزرەتی ئیبراهیم لە وڵاتی کەنعانەوە بەرەو میسر لە خۆی زیاتر، ئاراستەی جوڵانەوەی داب و نەریتەکەی دیاری دەکات. لەهەمانکاتدا ئەم چیرۆکە لە ناوچەکانی نێوان هەردوو حەوزی دیجلە ـ فورات و نیل باس لە دانوستاندن و گۆڕینەوەی ماڵ و هزر دەکات. زەمینە و هەلومەرج تواناکاری مەزن پێشکەش بەمجۆرە جموجۆڵە دەکات. ئەمەش تەڤلیبوونی و جێگرتنی کاروانی ناوچە بۆ کاروانی شارستانییەت نیشان دەدات. ئیتر گەلێك تیرە و گەلێك ئیبراهیم جێگای باسە. دەرخستنەپێشی ئەم داب و نەریتە باس لە ڕێگا و شەرعییەت (یاسا) دەکات. ئەم لێشاوە شیمانە دەکرێ لە ساڵانی ۱۷۰۰ تا ۱۳۰۰ پ.ز ڕوویدابێت، لەگەڵ دەرکەوتنی موسا لە میسر، دەست بە قۆناخێکی نوێ دەکات. بەڵام لەم نێوانەدا، لە قۆناخی ئیبراهیم چڕ بوونەوەیەك لە دەوروبەری قودس و وەرچەرخانێك جێگای باسە. شارستانییەتی فینیقیەکانی کەناری دەریا پێبەپێ بەرەو ناوەوە ئاراستەدەکرێ و پێشدەکەوێ. قودسیش وەکو ئورفا دووەمین ناوەندی گۆڕانکاری و وەرچەرخانی گرنگە. لەم قۆناخەدا کاریگەر بوون لە کەسایەتی ئیبراهیمدا جێگای باسە. گۆڕینی ناوەڕۆکی خوداوەند و لە جیاتی بنەماڵە بوونی بە خوداوەندی تەواوی تیرەکان، لەهەمانکاتدا گوزارشت لە نیشتەجێبوون و بە کاریگەربوون لە ناوچەکەدا و بەهێزبوون بە شێوەی میرنشینی و دانپێنان دەکات.

شەڕی پاراستنی ناسنامەی تیرە عیبرانییەکان بەرامبەر بە نیشتەجێ بووەکانی پێشتر، ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە ببن بە هێزێکی نیو سیاسی و نیو سەربازی. لەم ماوەیەدا رزگارکردنی ئیسماعیل

لەسەربڕینی وەکو قوربانی، گوزارشت لە هەڵوێست نیشاندان دژی ئەو داب و نەریتە بڵاوە دەکات کە لە ناوچەکەدا بەربڵاوە، منداڵ وەکو قوربانی پێشکەش بە "**بال**" (خوداوەندێکی مەزنی هەرێمییە) دەکرێن. لێرەدا لەمیانەی ڕەتکردنەوە و گوێڕایەڵی نەکردنی داب و نەریتی ئەو فرە خوداوەندییەی لە رووخساری مرۆڤدان و یەکجار پاشڤەڕۆیە، جیاوازی ئایینی لەگەڵ خۆیدا دەئافرێنێ. ئەمەش ئەڵقەیەکی دیکەی وەرچەرخانە. لەسەر بنەمای ئەم جیاوازییانە تیرەکان لە نێو خۆجێیەتیدا، خۆیان لە توانەوە دەپارێزن. گەرچی چیرۆکی **هاجەر** تا ڕادەیەك باس لە توانەوە دەکات. سەفەر و کۆچی **یوسف و یەعقووبی** باوکی، گەڕۆکی و جموجۆڵی تیرە نیشاندەدات. هەروەها لە چیرۆکی **ساراشدا** ڕوون دەبێتەوە کە بازرگانی بە کەنیزەکانیش کراوە. لەگەڵ ئەوەی لە کۆشکەکانی میسر هەندێ پلەی فەرمانبەرێتی بچووکی خزمەت کردنیان بەدەست هێناوە، بەڵام ڕەوش و پایەی نیو کۆیلایەتی دەرباز ناکەن. شیمانەی ئەوە دەکرێ لە ململانێ و پێکدادانەکانی نێو خانەدانەکان لایەنگری لایەنە دۆڕاوەکەیان گرتووە، لە ترسی سزادانێکی توند و وەکو وەڵامێك بۆ داخوازی تیرە بۆ ژیانێکی سەربەخۆ، پێهەڵگرتن و کۆچێك بە ڕێبەرایەتی **موسا** ئەنجام دەدرێت. شیمانە دەکرێ کە ئەم پێهەڵگرتنە لە ۲۵۰۰۰ کەس و ۱۲ تیرە پێکهاتووە، بە ئەندازەی دەرکەوتنی ئیبراهیم لە ئورفا واتادارە. بەڕێوەبردن و تێپەڕاندنی ژمارەیەکی هێندە زۆر بە بیابانەکاندا پێویستی بە ئیقناعێکی ئایدیۆلۆژی مەزن و ڕێکخستنێکی کردارییانە هەیە. ئەم کاروانەی بیابان، موسای خوڵقاندووە. ئەو قەڵەمبازە ئیلاهییەی بەردەوامبووە کە لەمیانەی "**۱۰ فەرمان**" وەکو وەڵامێك بوو بۆ ئەو تێنەگەیشتن و نەزانییە مەزنەی هەبووە. "**ئەل**" کە خوداوەندێکی گشتی هەرێمی کەنعانییەکان بوو، ئیبراهیم دەیکات بە "**ئەلۆهیم**"، موساش لە ژێر ناوی **یەهوە ـ یاهۆڤا** (ئەو خودایە) دەیکات بە خوداوەندێکی میللی. هەروەکو بڵێی لە یەکتری مارە دەکرێن، سەرلەنوێ وەکو خوداوەندی قەومی **ئیسرائیل** دەبێتە خاوەن ناسنامە. لەنێو سروشتدا قسەکردن لەگەڵ خودا پاشماوەیەکی داب و نەریتی شامانیزمە و بە شێوەیەکی بەربڵاو

پەیڕەودەکرێ. گەلێك پێهەلگرتنی پێغەمبەرایەتی ئەم داب و نەریتە بەکاردێنێ. ئامانجی سیستەمی ١٠ فەرمان ئەوەیە کە ڕێکخستنێکی نوێی کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژی و ڕێبەرایەتی موسا بکات بە یاسای شەرعییەت. ئیتر لەمە بەدواوە تیرە عیبرانییەکانی گەوهەری سیاسی و قەومییان بەهێزبووە، بەمجۆرە لەسەر شانۆی مێژوو دەناسرێن کە سەندووقەکەیان بە دەستەوەیە، سەندووقەکەشیان **تەوراتە** کە لە ١٠ فەرمانەوە دەستپێدەکات لەگەڵ یاسا ـ شەرعییەتی تێدایە، واتا وەکو قەومێکی خاوەن تەورات، ١٠ فەرمان، یاسا ـ شەرعییەت دەناسرێن.

لە دوای کاروانی موسا کە شیمانە دەکرێت لە ساڵانی ١٢٥٠ پ.ز روویداوە، قۆناخێکی دیکە دەرباز دەبێت کە لە ئاستێکی نزمتردا کادیری ڕێبەر دەردەکەون. ئەوەی ئەم قۆناخەش دەستپێدەکات فەرماندەی بەناوبانگی موسا **یەشوعە**. یەشوع نیشتەجێبوونی قەوم لە فەلەستینی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ئەنجامگیردەکات. ئەو کاهینانەی ڕۆڵی راهیب دەبینن لێرەشدا لە هەنگاونان بەرەو پادشایەتی پێشەنگایەتی دەکەن. هەوڵدەدەن نموونەیەکی بچووکی مۆدێلی میسر ـ سۆمەر بخوڵقێنن.

هەرچەندە **گۆڕینێکی** خۆجێیی تێدابێت بەڵام مسۆگەر داب و نەریتی کاهینی ڕەنگدانەوەی میسر و سۆمەریەکانە. راهیبی بەناو **سامۆئێل** کە لە ساڵانی ١٠٠٠ ی پ.ز هەوڵدەدات دەوڵەتی راهیبی ئاوابکات، لەگەڵ" **ساوول"** ی نوێنەری توێژی سیاسی لە نێو کێشمەکێشدایە. **داوودی** ئاسنگەر و شوانکار وەکو کەسایەتییەکی بە توانا و خاوەن ئەزموون دێتە مەیدان و لەساڵی ١٠١٠ ی پ.ز یەکەمین پادشایەتی ئیسرائیل ئاوادەکات. بەمجۆرە قۆناخی پادشایەتی دەستپێدەکات، لە ڕێگای **سولێمان** دەگاتە لوتکە و دواییش بەرەو دواوە دەچێ. لە ساڵی ٧٠٠ ی پ.ز عیبرانییەکان دەکەونە ژێر دەسەڵاتی ئاشووریەکان. (لە ساڵی ٥٨٥ پ.ز) لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی **نەبووخزئەلنەسر** گەلێك پێغەمبەر و راهیب لە قودسەوە بۆ بابل دەبردرێت. ماوەیەکی کورت دوای ئەوە بابل دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی پارسەکان. سوود لە سیاسەتی ناسراوی پارسەکان وەردەگرن کە ڕێز لە هەموو کولتوورێك دەگرن و لە شوێنی خۆیاندا دەرفەتی کاریان پێدەدات. بەمجۆرە دووبارە دەگەڕێنەوە قودس. ئەو خوێندن و نووسین و فەرمانبەرێتیەی لە کۆشکەکانی بابل فێریبوون، تاوەکو بڵێی کاریگەری لەسەر عیبرانییەکان دەکات. لەم قۆناخە نوێیەی بە قۆناخی نووسەرەکان ناودەبرێت، پێشەنگایەتی نووسەرێکی بە ناوی **عەزرە**، کە زۆر بەباشی خۆی لە بابل پەروەردەکردووە و پێگەیاندووە، ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ. بۆ جاری یەکەم کتابی موقەدەس (**پەرتووکی پیرۆز**) دەنووسێتەوە. لەمیانەی یەکەم ئەنجوومەنی سیاسی بە ناوی هاگادۆل، ئەم قۆناخە دەبێتە خاوەن ناسنامەیەکی نوێ. کاریگەری پارسەکان بە تایبەتیش کاریگەرێتی داب و نەریتی زەردەشت جێگای باسە. پارتییەکی لایەنگری پارسەکان بە ناوی **فەریسیەکان** پێکدەهێنرێت. ئەمە یەکەمین پارچەبوونی گرنگی سیاسییانەیە. پارچە بوونی چینایەتی پێشدەکەوێ.

دوای ئەسکەندەر رووبەڕووی باڵادەستی یۆنانەکان دەبنەوە. ئەم قۆناخەی بە **ئانتیۆقەکان** ناودەبرێت، ئەمجارە دەکەونە ژێر کاریگەری یۆنانییەکان. پارتییەك ـ مەزهەبێکی نوێی نۆکەری بەناوی **سادوقییەکان** بە ناو دەبرێت و گەوهەرێکی ئەریستۆکراتییان هەیە و لایەنگری یۆنانەکان بوو. ئەمانەش توێژێکی لاوازبوون کە باوەڕییە ئایینیەکەیان گرێدراوی سیستەمی یۆنان بوو.

دووەمین قۆناخی کتابی ـ موقەدەس بە زمانی یۆنانی (**Septuaganint**) دەستپێدەکات. توێژێکی کە لە ٧٢ تیرە هەڵدەبژێردرێت لە تەنیشت پادشایەتی یۆنانییەکان لە ئەسکەندەرییە نیشتەجێدەبن و بەهێز دەبن. توێژێکی بە ناوی ماکابییەکان دەناسرێت لە ساڵانی ٢٠٠ پ.ز لەوێدا قۆناخێکی بەرخودان دەستپێدەکات. لەم قۆناخەی کە بە شێوەیەکی زۆر دژوار تێپەڕ دەبێت ناسنامەیەکی میللی و سەربەخۆیی بەدەست دەهێنرێت. دواتر لە قۆناخی باڵابوونی ڕۆما (٦٣ ساڵ پ.ز) وەکو پادشایەتییەکی لایەنگری ڕۆما و هەرێمێکی هاوپەیمان و گرێدراوی ڕۆما ڕێکدەخرێت. لە کاتێکدا چینی ژوور نۆکەری ڕۆمایە، جوڵانەوەیەکی هەژاران بەناوی **ئەسەنییەکان** پێشدەکەوێت. کاتێك خەتیبی بەناوبانگی جوڵانەوەکە **یەحیا** دەکوژرێت، قۆناخی یاخیبوونی **عیسا** دەستپێدەکا. ئەم پێهەلگرتنەی مێژوو وەکو خاڵی سفری دەستپێکردنی دادەنێت، تاوەکو بڵێی سەیرە و هەڵوێست و نزیکبوونەوەیەکی زانستییانە دەکاتە پێویستییەك.

کاتێك کاریگەری مەزنی ئەم جوڵانەوە مەزنەی بە ناوی عیسا، لەگەڵ تەمەنی عیسا بەراورد بکرێت کە لە مێژوودا کاریگەرییەکی مەزنی هەیە، دەردەکەوێ کە سەرچاوەکەی بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە؛ بە گشتی زەمینە و هەلومەرجی کولتووری عیبرانی، بە تایبەتیش گرێدراوی ئەوەیە کە وەکو جوڵانەوەی کۆمەڵکاری و هەژاران پێشکەوتووە و بۆ هەموو کەسێك کراوە بووە. لەژێر ناوی عیسادا مەیل و هەڵوێستێکی مێژوویی ڕێرەوی گرتۆتەبەر. هەڵوێستێکی دژایەتی تایبەتی عیسا بەرامبەر بە **پلاتۆسی** والی ڕۆما نییە. تەنانەت باس لەوە دەکا کە دەسەڵاتی دونیا **"مافی سزارە"**. ئەوەی عیسا بە دژواری بەرامبەری دەوەستێ دەزگای فەرمی کاهینە یەهوودییەکانە. عیسا باوەڕی بەوە هەیە لە زووەوە کەهانەت ناوەڕۆکی ئەرێیی خۆی لەدەستداوە. زۆر بە باشی پەیوەندی کاهینییەکان لەگەڵ بەرژەوەندی ماددی و ناکۆکییان لەگەڵ جیهانی هەژارەکاندا دەبینێ و هەڵوێست نیشاندەدات. لەوەش گرنگتر ئەوەیە لەمیانەی شۆڤێنیزمێکی وشکەوە باوەڕی تاکخودایی تەنیا تایبەت بە یەهوودییەکان لە قەڵەمدەدەن، ئاماژە بە ناکۆکییەکی ئاشکرا دەکات لەگەڵ جیهانی مرۆڤایەتی کە لە دەوروبەردا هەڵدەچێت. چەمکی تیرە و قەومی باڵای عیبرانییەکان کۆسپە لەپێش ئەوەی ئەم پێشکەوتنە کۆمەڵایەتییانە بچێتە دەرەوەی گروپە ئەتنیکییەکەیان. ئەوەی دەردەکەوێتە پێش جێگرتن لەناو هەمان ریشەی ئەتنیکی نەبووە، بەڵکو دیاردەی جێگرتن بوو لە ناو ئەم گروپە کۆمەڵایەتیانەی هەمان هەلومەرجی ماددی لەگەڵ خۆی دەرخستبوون. ئەسەنییەکانی عیسا ئیلهامی لێگرتووە گروپێکی بەمجۆرەیە. لەگەڵ پارچەبوونێکی قووڵی کۆمەڵگای یەهوودی لەسەر بنەمای چینایەتی، ئایدیۆلۆژیای یەهوودییەکانیش پارچە دەبێت.

لە کاتێکدا حەزرەتی ئیبراهیم و موسا زیاتر گرنگی بە یەکێتی قەومی تیرەکانیان دەدەن و بە گوێرەی ئەمەش شێوە بە ئایدیۆلۆژیا و چالاکییەکانیان دەدەن، داب و نەریتی عیسا یەکێتی قەوم دەخاتە پلەی دووەم، تەنانەت بەرامبەریشی دەوەستێ و بەمجۆرە هەنگاوێکی یەکەمین دەستپێدەکات. عیسا خوداوەندی خۆی دەکا بە گەردوونی. وشەی یەهوودی بوونی نییە. شتی سەرەکی رزگاری ئەو مرۆڤانەیە کە لە ناو ئێش و ئازارەوە دەژین. لەم بوارەوە تاوەکو بڵێی لە **بودا** نزیکبۆتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەمە راستینەیەکی واقیعی و بابەتییە کە ڕێگای بوون بە دەسەڵاتی نیشانی توێژی هەژاری عیبرانییەکان داوە. نەك لە بواری سیاسی و سەربازی؛ بەڵکو لەسەر بنەمای پشتبەستن بە بناخەکانی باوەڕ و ئەخلاق وەکو جوڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتی بڵاودەبێتەوە. کاتێك دەستگیردەکرێ، بە تایبەتی دژی ئەوە دەوەستێ کە **پەترس** (حەوارەیەکی عیسایە) شمشێر بەکاربێنێ. گرنگترین بانگەشەکانی ئەوەیە کە کاهینەکان خیانەتیان لە داب و نەریتی پێغەمبەرایەتی کردووە و ئەوە بسەلمێنێ کە مەسیحی (فریادڕەس) چاوەڕوانکراوە. بەڵام دەزگایەکی بەهێز و دەوڵەمەندی کاهینی لە قودس هەبوو کە پشتی خۆی بە والی ڕۆما بەستبوو. واتا لە زووەوە کەهانەت بووە بە هێزێکی دونیایی و ماددی و سیاسی، ئیتر کاهینەکان لە ڕەوشی بەرپرسیارە ئایینیە سادەکان دەرکەوتوون.

کاریگەری سۆمەریەکان بەسەر چەمکی ئایینی عیسا دیارە. لە راستیدا باوك، ڕۆڵە، ڕۆحی پیرۆز، پاشماوەی خوداوەندی سیانییە. ریشەکەی تاوەکو داب و نەریتی **ئەنکی ـ تیامات ـ مەردۆك** درێژ دەبێتەوە. مریەمی دایك ڕەنگدانەوەیەکی لاوازی باوەڕی خوداوەندە ـ ژن تیاماتە. بەڵام لەمیانەی فووکردن بە ڕۆحیدا، ڕۆڵەی خودا دێتە دونیا. (زاراوەکانی خوداوەندی باوك، خوداوەندی دایك، ڕۆڵە بۆ کولتووری سۆمەریەکانی **خوداوەندە ژن ـ ڕۆڵە ـ مێرد** دەگەڕێتەوە). هەروەکو دەبینرێ تێکەڵاوبوونێکی میتۆلۆژیا (ئەفسانە)یی کۆن و باوەڕی **یهوە** بە ناوەی عیسا جێگای باسە. لەوەش گرنگتر ئەوەیە، جیاوازییەکەی لەگەڵ ڕەوتە ئایینیەکانی پێشتر، گرنگی و بایەخدانێتی بە ئێش و ئازارەکانی مرۆڤ. لێرەشدا هەلومەرجی ماددی و بابەتییەکانی گەیشتنی کۆیلەداری ڕۆما بە هەرە لوتکەی خۆی ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە. یاخیبوونی **سپارتاکۆسی** ساڵانی ٧٠ ی پ.ز لە ڕۆما ئەوەی سەلماندووە کە دەشێ ئێش و ئازارەکان ببێت بە یاخیبوون. هەرێمی یەهوودییەکان لەمیانەی توانستی کولتووری و داب و نەریتی یاخیبوون، خاوەنی هەموو هەلومەرجێکە کە بتوانێ ڕێبەرایەتی بۆ قۆناخێکی بەمجۆرە بکات.

ناتوانرێ بگوترێ عیسا زۆر بە پیلان و رێکخەر (هەڵسووڕێنەر) بووە؛ زیاتر نوێنەرایەتی مرۆڤێکی بە باوەڕ و خاوەن ئەخلاقێکی دروست دەکات. بە دڵسۆزییەوە گرێدراوی باوەڕییەکانییەتی و تەواوی ژیان و کرداری خۆی لەم چوارچێوەیەدا رێکخستووە. خۆ فیداکردنی بەرامبەر بەو نەفرەتەی مرۆڤایەتی راپێچکردووە وەکو پێویستییەکی ژیانی "**فەرموودە**"ی خوداوەندە. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا نییە سیاسەت و تاکتیك بخوڵقێنێ و بەڕێوەیان ببات. لاوازبوونی ئەم لایەنەی، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە بە شێوەیەکی مەزن یادی بکرێتەوە.

لەمیانەی ئەم تایبەتمەندییەوە عیسا نوێنەرایەتی ئەم رێبەرایەتییە دەکات، ئەگەر ئەویش نەبوایە ئەوا قۆناخ یەکێکی دیکەی دەخوڵقاند. هەربۆیە عیسا لە پێغەمبەر و رێبەرێکی کە خۆی پێگەیاندبێت زیاترە، رێبەر و پێغەمبەرێکە کە خوڵقێنراوە و دروست کراوە. دەیکەن بە فریادڕەسێك کە داخوازی تەواوی هەژار و توێژە بە ئازارەکان و رقی نەفرەت لێکراوەکانی لە ئەستۆی خۆی گرتووە. بەمجۆرە دەبێتە مەسیح ـ فریادڕەس ـ ی چاوەڕوانکراو. ئەگەر هەلومەرجی ماددی توانستە مێژووییەکان نەبێت، هیچ کەسایەتییەك لەمیانەی بە مەعریفەتی تایبەتی خۆیەوە ئەرکی رێبەرایەتی ناگرێتە ئەستۆ. هەمان تایبەتمەندێتی بۆ تەواوی رێبەرایەتییە بەناوبانگ و پایەدارەکان جێگای باسە. وەکو شیمانەیەکی مەزن شتی راست ئەوەیە؛ لە خاچدان عیسای راستەقینە دەخوڵقێنێ. ئەگەر مەسەلەی لە خاچدان نەبایە شیمانەی هەبوو مەسیحییەت وەکو تەریقەتێکی سۆفیگەرایی ئەو کاتەی لێدەهات و بەمجۆرە کزدەبوو و کۆتایی پێدەهات.

بەمجۆرە پێکهاتەی تایبەتی کولتووری ناوچە و قۆناخی سۆفیگەرایی چینە هەژارەکان، هەروەها واقیعی ماددی و کۆمەڵایەتی ئەو جیهانەی کۆیلەداری رۆما خوڵقاندبووی، لە کەسایەتی عیسادا پێغەمبەری خۆی خوڵقاند. جوڵانەوەیەکی مەزنی مرۆڤایەتی لەلایەن گروپێکی بچووکەوە دەخوڵقێنرێ (١٢ حەوارەی کە بە زۆر و زەحمەتییەوە خڕدەبنەوە و یەکێکیشیان خائینە). بێگومان بە یەکەوە کاریگەری کولتووری عیبرانی و کولتووری یۆنانی لەسەر ئەو جوڵانەوەیە هەیە. لە لایەکی دیکەوە رۆڵی یارمەتیدەرانەی کولتوورەکانی دیکەش جێگای باسە. ئەخلاقی نوێی زەردەشت و باوەڕی و ژیانی ستۆواییەکان لەگەڵ گەوهەری پتەوی پێغەمبەرانەی کولتووری عیبرانییەکان دەبنە یەك و رێگا لەپێش مەسیحییەتی عیسا دەکەنەوە. لەم بوارەدا لەلایەنی چینایەتی، ئەخلاقی و باوەڕییەوە وەکو سەنتێزێك وایە و دەبێتە گەورەترین جوڵانەوەی دژی سیستەمی کۆیلەداری. بە خێرایی بڵاوبوونەوەی لە ناو هەر قەومێکدا گرێدراوی ئەم تایبەتمەندێتیە گەردوونیەیەتی. باوەڕییەکی دەوڵەمەند و بەهێز و گەوهەری ئەخلاقییانە رێگا لەپێش جوڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتی بەهێز دەکاتەوە. بەمجۆرە پێناسەکردنی ئایینی مەسیحی زیاتر نزیکی واقیعە.

چیرۆکی بەرخودانی شاراوە و نهێنی ٣٠٠ ساڵەی جوڵانەوەکە، لەهەمانکاتدا چیرۆکی رزینی داری شارستانییەتی رۆمایە. بێ ژمار **عەزیز و عەزیزە**ی کردۆتە قوربانی. بەڵام توانیویەتی گەورەترین نوێنەری سیستەمی کۆیلەداری شیبکاتەوە. خاوەن دەرکەوتن لە ئازارەکانی مرۆڤ شێوازی کاری ئاشتیخوازانە، سیستەمی ژیانی کۆمەڵکاری پەرستگا **(مانستەر)**، خاوەن کاریگەری و رۆڵن لە گەیشتنی مرۆڤایەتی بە بنچینەییترین و بەهێزترین پێکهاتەی ئەخلاقی. تیۆلۆژیای مەسیحییەت سەرەتا بە پلەی دووەم دەهات. دوای کاتێك لە قۆناخی سکۆلاستیکدا بوو بە هێزێکی سیاسی و ماددی، لەلایەنی جیهانی پاپاوە دەرخراوەتە پێش. شتێکی سەرەکی لای عیسا هەڵوێستی ئەخلاقییە، نەك باوەڕی. هێزی مەعنەوییە نەك ماددی.

قۆناخی بە فەرمی کردنی ئایین لەلایەن ئیمپراتۆریای رۆمای رۆژهەڵات، لەهەمانکاتدا قۆناخی لە رێ لادانێتی. لە کاتی شەڕەکانی دەسەڵاتدارێتی بەکارهێنانی وەکو ئامرازێکی ئایدیۆلۆژی، رێگای لەپێش پارچەبوونێکی مەزن کردۆتەوە. دوای ئەوەی رۆمای رۆژئاوا رووخا، خودی مەسیحییەتیش بوو بە هێزێکی ئیمپراتۆرییانە (پاپایەتی). پێویست دەکات بە بایەخەوە لەم قۆناخەدا هەڵوێستە سەبارەت بە پێشکەوتنی مەسیحییەت بکرێت کە وەکو هێزێکی ئاواکردن و پاراستنی چەرخەکانی ناوین دادەنرێت.

هەروەکو دەبینرێ لە دایکبوون و پێشکەوتنی مەسیحییەت هەم وەکو ئەنجام و هەم رۆڵی فاکتەری خێراکردنی رزین و هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆیلەداری دەبینێ. داب و نەریتی عیبرانی لەمیانەی رێ خۆشکردنیان بۆ عیسا و ئەسەنییەکان، کاریگەرییەکی مەزن دەکەنە سەر چەرخی ناوین. لە ساڵانی ٧٠ ی زایین بە دواوە یەهوودییەتی میللیگەرایی (ئایینی میللیگەرایی) جارێکی دیکە لە دونیادا بڵاوبوونەوە و گروپە یەهوودییەکان لە هەموو شوێنێکدا بوونە خاوەن تواناکارییەکی باشی چۆنێتی رزاندنی سیستەمەکان و ئاواکردنی ئەلتەرناتیفی نوێ و ئەم کاریگەرییەیان تا رۆژگاری ئەمڕۆشمان بەردەوامبووە. تیرەی یەهوودییەکان کە سەرەتا لە رێگای بازرگانییەوە مەزنبوون، دوای ئەوەی بوون بە قەوم داب و نەریتی بازرگانییان بەهێزکرد. لەلای قەومی یەهوودییەوە بازرگانی تەنیا وەکو ئامرازێکی بازرگانی کردنی موڵك بەکار ناهێنرێت، بەڵکو وەکو ئامرازێکی دانووستاندن و گۆڕینەوەی هزریش پێشدەخرێن و بەردەوام دەبێت. کولتووری یەهوودییەکان کە لە بازرگانیدا بۆتە پسپۆر و شارەزا، لە کاتێکدا قەومی خۆی دووچاری تەنگەتاوی و زەحمەتی مەزن دەکات، لەمیانەی ئەو ئەزموونەی بەدەستیان هێناوە کارامەی ئەوەیان بەدەستهێناوە ببن بە هێزی سیخوری تەواوی شارستانییەتەکان. دەرکی بە سۆمەر و بابل و ئاشوور کردووە، رێگای لەپێش حەزرەتی ئیبراهیم و ئایینەکەی کردۆتەوە. میسریشی کردۆتەوە و بۆتە خاوەنی ئایینی قەومی و هەڵمەتی ئازادی موسا. بەمجۆرەش لە دەرئەنجامی ئەم ئەزموونەیاندا بوونەتە قەومێك کە باش لە واتا و گرنگی ئایین بگەن. هەروەکو دەزانرێ، چۆن لە بواری بازرگانیدا سوودی لە سیستەمی کۆیلەداری میسر و سۆمەر وەرگرتووە، ئەوا هزر و باوەڕییەکانیانی کردۆتە موڵکی خۆی و توانیویانە بە گوێرەی خۆیان بیگونجێنن. لەمیانەی فێربوونی خوێندن و نووسین لە بابلی و پارسەکان توانیویانە ببن بە خاوەنی یەکەمین کتێبی نووسراوەیی ـ کتێبی موقەدەس؛ بەر لە یۆنان و رۆماییەکان لە فینیقیەکان فێر بوون و گەنجینەی کولتوورییان گەیاندۆتە بەرزترین ئاست.

هەڵبەتە هێندە بڵاوکردنەوەی هزر و بازرگانی، بە واتای کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی ناکۆکیی مەزنیش دێت. هەربۆیە بە خۆی بانگەوازی بۆ گەورەترین ئافات کردووە و لەگەڵ خۆیدا هێناوە. لە کاتێکدا لەگەڵ رێخۆشکردن بۆ دەرکەوتنی عیسا ئامادەکاری هەڵوەشانەوەی رۆمای کردووە، بە خۆشی بەهەر چوارلای جیهاندا پەرتەوازەبووە. لە کاتێکدا لە هەموو شوێنێك هەوڵیداوە جیهان فێربکات، لە ئەنجامی شوڤێنیزمی قەومی باڵا بەردەوام رێگا لەپێش قڕکردنی خۆی کردۆتەوە. لە کاتێکدا لە عەرەبستاندا وەکو کولتوورێکی سەرەکی رۆڵی لە دەرکەوتنی حەزرەتی مەحەمەد و ئیسلامییەتدا هەبوو، گەورەترین لێدانیش لەلایەن ئیسلامییەتەوە پێیکەوت.یەکێکە لەسەرەکیترین هێزە خوڵقێنەرەکانی چەرخەکانی ناوین و، بۆتە یەکێك لەو قەومانەی کە بە رادەیەکی هەرە زیادە دووچاری کوشتارەکانی چەرخەکانی ناوین هاتووە. لە کاتێکدا لە سەرووی ئەو هێزە فکری و سەرمایەوە جێگای خۆیان دەگرت کە سەردەمی سەرمایەداریان ئامادەکرد، دیسان ئەو هێزەی دووچاری لێدان و کوشتارەکانی سەرمایەداری و ئەو مارکسیزمە بوون کە رۆڵیان لە دەرکەوتنی هەبووە، دیسان کولتوور و قەومی عیبرانییەکانە.

ب ـ بێگومان دەبێ رۆڵی داب و نەریتی موغەکانی میدیا لە هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆیلەداریدا رەچاوبکرێت کە لە ساڵانی ١٠٠٠ پ.ز لە کوێستانەکانی میدیا ـ پارسی کەوانەی دەرەوەی سیستەمی زاگرۆس ـ تۆرۆس بایەخداربوون. ئەم مەیل و هەڵوێستەی جگە لە داب و نەریتی میتۆلۆژیای سۆمەر زیاتر، وەکو تۆکمەبوونی ئەخلاقی کۆمەڵگای کشتوکاڵی دەردەکەوێت، رۆڵ و کاریگەرییەکی مەزنی لەوەدا هەیە کە سەرلەنوێ ئیرادەی خنکاوی مرۆڤ هەڵسێنێتەوە سەرپێیان. ئەم مەیل و هەڵوێستەی گروپە ئارییەکان، کە لایەنی ئەخلاقییان لەپێشەوەیە و بە خوداوەندکردنی بە پلەی دووەم دێت، زۆر بەر لە عیسا و بودا و سوقرات، لەلایەنی **زەردەشتەوە** بە ریفۆرمدا تێپەڕیوە و بۆتە بناخەی هەڵکشانی ماد و پارسەکان و کۆتایی  بە ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری و بابلی هێناوە، کە گرانترین و دژوارترین شێوەی کۆیلەدارییان پەیڕەو دەکرد. داب و نەریتی زەردەشتی کە پێکهاتەیەکی باڵای باوەڕی و ئەخلاقی بەرامبەر بە کۆیلەداری قۆناخی سەرەتایی چنیوە؛ زەمینەیەکی سەرەکی کاریگەری کردنە سەر بودا و سوقرات و عیسایە. هزری ئیرادەی ئازادانەی **زەردەشت** رۆڵێکی دیاریکراوی هەیە لە پارچەبوونی چینایەتی بۆ دوو شێوەی ئەو مرۆڤەی کە تەنانەت ناتوانێ لە سێبەری خۆی بە خاوەن دەربکەوێت و ئەو مرۆڤانەی کە خۆیان هێناوەتە ئاستی بەهێزترین خوداوەند.

نیشاندانی ئەم ئیرادەیەش لەمیانەی پێشخستنی دیالۆگ لەگەڵ خوداوەند **ئاهۆرا ـ مەزدا**، کە لێی تێناگات و وەکو بڵێی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات، بەهاکەی زیاتر دەکات. بەمجۆرەش لەئەنجامی لە پەلوپۆ خستنی کۆیلەداری چاخی دێرین، هەم لە بواری ماددی، هەم ئایدیۆلۆژی بە شێوەیەکی راستەوخۆ رۆڵ لە هەڵکشانی یۆنان ـ رۆما دا دەبینێ. سەرەڕای ئەوەی ئیمپراتۆرییەتی پارسەکان هەڵوەشاوەتەوە، بەڵام سەرەتا پارتەکان دواتریش ساسانییەکان کە وەکو درێژەپێدانی ئەوانن بەهێز بوونیان تا ئاستێك کە رۆما بە سیستەمی باجدان بە خۆیانەوە گرێبدەن، بۆ ئەو زەمینە ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقییە دەگەڕێتەوە کە لە داب و نەریتی زەردەشتیان وەرگرتووە. هەروەکو دەزانرێ کاریگەری ئایدیۆلۆژی زەردەشتی لە ناوەندەکانی رۆما لایەنگرییەکی باشی بە دەستهێناوە. تێڕوانینی گشتی بەمجۆرە هەیە، ئەگەر کوشتاری راهیبە پاشفەرۆکانی ساسانی نەبوایە، ئەوا مانیزم کە سەنتێزێکی تایبەتی زەردەشتی و مەسیحییەتە، بە ئەندازەی ئایینی عیسا خاوەن وزە و توانای بڵاوبوونە دەبوو. هەروەکو دەزانرێ بە شێوەی تەریقەت تاوەکو ئەوروپا بڵاوبۆتەوە و کاریگەری لەسەر چەرخی ناوین کردووە. لە رۆژهەڵاتیش توانیویەتی تا ئاستی بوون بە ئایینی فەرمی تورکە ئۆیگۆرەکان بەرزبێتەوە.

لەم قۆناخەدا تەریقەتە سۆفیگەراییەکان وەکو باوەڕی تایبەت و گروپی کۆمەڵایەتی لە جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناویندا پێشکەوتنی مەزن بە خۆیانەوە دەبینن. گرنگی ئەم تەریقەتانە لەوە دێت کە نوێنەرایەتی قۆناخێکی گرنگی پێشکەوتنی سەربەخۆیی هزر و ئیرادەی مرۆڤ دەکەن. ئەم گروپە بچووکانە لەمیانەی جودابوونەوەیان و دابڕانیان لە پێکهاتەی هزری و ئەخلاقی فەرمی، رۆڵێکی گرنگ دەبینن لە هەڵوەشانەوەی رووکاری ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی کۆیلەداری. ئەسەنییەکانی سەرەتا عیسا جێگای خۆی تێدا دەگرت و **حەنەفییەکانی** کاریگەریان لەسەر حەزرەتی مەحەممەد کردووە، لەو گروپە سۆفیگەرایی و باوەڕییە شاراوانەن. بە ئەندازەی ئەوەی کۆمەڵگای کۆیلەداری و دەزگا توند و دژوارەکانی کە مرۆڤیان بێهەناسەدان هێشتووە رۆڵیان لە پێشکەوتن و مەزنبوونی ئەم گروپانە هەیە، ئەو شێوەبەندییانە کە دەرفەت بە مەیلی ئازادیخوازی دەدات رۆڵێکی مەزن لەم پێشکەوتنەدا دەبینێ. بە کورتی ئەو کەسانەی لە ئەنجامی پاشفەرۆیەتی رۆما لە رۆژئاوا، ساسانییەکان لە رۆژهەڵات و ئەو شەڕ و پێکدادانە درێژخایەنانەی نێوانیان رایان کردووە، لەمیانەی کاریگەری قوتابخانە فەلسەفییەکانی رۆما و داب و نەریتی ئایینە کۆن و خۆجێییەکان قۆناخێکی تەریقەتگەرایی دەستپێکردووە کە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان ماوە. هەروەکو گروپە راستڕەو ـ چەپڕەوەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان، ئەوا لە قۆناخی دوای سەردەمی ئاشووریەکان بەرامبەر بە ستەمکاری سیستەمی کۆیلەداری کلاسیك بە شێوەی گەلێك گروپی هەمەجۆری ئایینزایی و تەریقەت خۆیان رێکخست و رۆڵێکی گرنگیان لە هەڵوەشانەوەی سیستەمدا بینیوە. بە واتایەکی دیکە ئەوان قارەمانی نەناسراوی ئافرێنەری مێژوون. ئەمەش هەروەکو قارەمانێتییە بێناو و نەناسراوەکانی سیستەمی تیرە و خێڵەکانە کە لە بەرخودان بەرامبەر سیستەمی کۆیلەداری چاخە دێرینەکان نیشانیانداوە. ئەگەر بڵێین مێژوو مێژووی ئەو قارەمانێتییە نەنووسراو و نەناسراوانەیە، ئەوا بە شێوەیەکی راستتر ئاماژەمان بە واقیع کردووە.

ج ـ سێیەمین فاکتەری تێکشکاندنی سیستەمی کۆیلەداری چاخەکانی دێرین، پێشکەوتنە فەلسەفییەکانە، کە بەبێ پشتبەستن بە ئیرادەی خوداوەند، بۆ یەکەمین جار هەوڵی روون کردنەوەی سروشت دەدات. بەردەوام شارستانییەت دەرکەوتن و پێشکەوتنی بە میتۆلۆژیاکانەوە گرێدەدات. بە هەزاران ساڵی خۆی بۆ پڕوپاگەندەی بیر و بۆچوونی میتۆلۆژیا (ئەفسانە) تەرخانکرد کە بە تەواوەتی پێکهاتەی هزری و رۆحی مرۆڤی بەندکردبوو. بە گوێرەی ئەوەی هەموو شتێك پێشتر لەلایەن خوداوەندەکانەوە بڕیاری لەسەر دەدرا، بۆیە هیچ پێویست بە جوڵانەوە و بیرکردنەوە نەبوو. چی لە چارەنووسدا (قەدەر) نووسرابێت ئەوە روودەدات. سیستەم گەورەترین هێزی خۆی لەم باوەڕییە کوێرانەیەی قەدەر وەردەگرت. کاتێك هێزی پادشا ـ خوداوەندەکانیش هاتە سەر ئەمە تاوەکو دوایی رێگای پراکتیزەکردنی بە کۆیلەکردن ئاوالابوو.

کاتێك ئایینی تاکخودایی حەزرەتی ئیبراهیم بە خوداوەندنەبوونی مرۆڤی کرد بە بابەتێکی سەرەکی باوەڕی، سیستەم لێدان و زیانێکی گرنگی ئایدیۆلۆژی بەرکەوت. بەبێ خۆگرێدان بە خوداوەند، دەرکەوتنە پێشی ئیرادەی مرۆڤ لە داب و نەریتی زەردەشتیدا و بە رۆژەڤکردن و دەرخستنە پێشی ئەخلاقی ئازادانە و گەیاندنی بە ئاستی سیاسیبوون، کۆیلەداری سەردەمی کلاسیکی وەکو میسر و سۆمەریەکان بەرگەیان نەگرت و نەیانتوانی لەسەر پێیان بمێننەوە. ئەگەر سەرنج بدرێ دەبینرێ یەکێکیان رێگای لەپێش شۆڕشی باوەڕی کردۆتەوە، ئەوی دیکەشیان رێگای لەپێش شۆڕشی ئیرادە و ئەخلاق کردۆتەوە.

هەرچی شۆڕشی فەلسەفییە کە لە هەناوی سیستەمی کۆیلەداری رۆما پێشکەوتووە سێیەمین و دواترین لێدانی ئایدیۆلۆژی پیا دەکێشێ. بە شێوەیەکی بابەتییانە کاتێك شێوازی ژیان و دەزگاکانی سیستەمی کۆیلەداری لەمیانەی هێزی ئەقڵ، دوور لە دۆگما ئایینی و خوداوەندەکان و بە شێوەیەکی سەربەخۆ دەستی بە بیرکردنەوە کرد، ئەوا بەرەو سەنتێزێکی نوێ دەچێت. لەمیانەی بیرکردنەوەی فەلسەفی بە تایبەتیش لەسەردەمی ئەفلاتۆن و ئەرستۆ، هەوڵدەدرا دەوڵەتی شاری ئەتینا رزگار بکرێت و بگات بە ئاستی خوازراو. تەواوی هەوڵەکانی سوقرات کە وەکو باوکی فەیلەسوفەکان پەسند دەکرێت، ئەوە بوو کە بیسەلمێنێ دەتوانرێ هاووڵاتییەکی تێگەیشتوو و زانا بخوڵقێنرێ و لە رێگای ئەمجۆرە چەمکەی هاووڵاتێتی دەوڵەتی ئەتینا رزگاربکرێت. هەربۆیە بەو ئامانجەش دەیخواست بەر لە ئەنجامدانی کارێك هەموو زانیارییەکانی دەرهەق بەم کارە بە دەستبخات و بەمجۆرە ئەنجامیبدات. ئەمە گەوهەری فەلسەفەکەی بوو. ئامانجی سەرەکی ئەفلاتوون ئەوە بوو ئەم چەمکە، ئەم هەڵوێستە ئەخلاقییە بکات بە کارەکتەر و چەمکێکی دەوڵەت. گونجاوترین بەڕێوەبەری دەوڵەت لای ئەو، دەبوایە وەکو فەیلەسوفێك بێت. هەرچی ئەرستۆیە لەو باوەڕەدا بوو کە کرداریترین رێگای ئەمە بەڕێوەبەرایەتییەکی ئەریستۆکراتییە، هەربۆیە پەروەردە کردنی ئەم چینەی بە بنەما دەگرت. سەرەڕای ئەمەش ئەنجامێکی پێچەوانەی لێکەوتەوە؛ دەوڵەت و دیموکراسییەتی ئەتینا رووخا. بە شێوەیەکی بابەتییانە شێوازی هزری فەلسەفی رێگای لەپێش رووخان کردەوە. چونکە لە سروشتی سیستەمی کۆیلەداریدا جێگای ئیرادە و ئەقڵی مرۆڤ نییە. لە کاتێکدا مرۆڤی کۆیلە خاوەنی هیچ مافێك نییە و وەکو ئامرازێکی بەرهەمهێنان وایە، خاوەن کۆیلەکان دەکرێن بە خوداوەند. لە یەکەم قۆناخی ئاقڵمەندەکاندا هزری فەلسەفی ناکۆکبوون و نەگونجانی لەگەڵ سیستەمدا بە خۆوە بینیوە. ئاقڵمەندەکان بە شێوەیەکی ئاشکرا ئاماژەیان بەوە دەکرد یاساکان لەلایەن خوداوەندەکان پێکنەهێنراوە، بەڵکو لەلایەن مرۆڤەوە خولقێنراوە. باسی ئەوەیان دەکرد کە هەر کەس مافی هەیە بە پێی ئەقڵ و هزری خۆی هەڵسوکەوت بکات. تەنانەت یەکەمین قۆناخی رەخنەکردنی ئاقڵمەندانەیان دەستپێکردبوو. لە کۆتاییەکانی ساڵانی ٥٠٠ پ.ز هەنگاو بۆ ئەم قۆناخە هاوێشتراوە. هەم مەزنبوون هەم هەڵوەشانەوەی شارستانییەتی یۆنان گرێدراوی ئەم راستینەیە. لەو شوێنەی کە ئەقڵ بە شێوەی کارکردنێکی ئازادانە کەوتە کار، بیر لە تەمەن درێژی هیچ قالب و دۆگمایەك ناکرێتەوە. هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆیلەداری پڕ لە دۆگما بەرامبەر بە هێزی ئەقڵ راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراو بوو. لەبەر ئەوەی دەوڵەتی ئەتینا دەرکی بەم راستینە کردبوو، سوقراتی ژەهرخوارد کرد، ئەفلاتونی ناچاری راکردن کردووە، ئەرستۆشی بە رەزامەندی خۆی بۆ هەندەران ناردووە، کە خواستیان رزگاری بکەن. کۆتایی پڕ لە ئێشی گەلێك فەیلەسوف بە شێوەی کوشتن بووە. هەروەکو مەسیحییەتی قۆناخەکانی دەستپێك، تەواوی قوتابخانە فەلسەفییەکان نیوە بە نیوەیان بۆ گروپی شاراوە و نهێنی گۆڕابوون. بە واتایەکی دیکە، قۆناخی ژێرزەمینی (نهێنی) فەلسەفە دەستپێکردبوو. تاوەکو ساڵانی ٥٠٠ زایینی فەلسەفە لە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێری دەمێنێتەوە. دواترین قوتابخانەشی لەم ساڵانە دادەخرێ. لەگەڵ هەنگاونان بۆ چەرخەکانی ناوین لە رێگای دژە شۆڕشێك وەڵامی شۆڕشی ئەقڵ درایەوە.

پەسند کردنی بۆچوونی **(ستۆوایی)** بە شێوەیەکی فەرمی لەلایەن ئیمپراتۆرییەتی رۆما، کە ببوو بە ئیمپراتۆرییەتێکی گەردوونی، بۆ پێویستی ئیمپراتۆرییەت بە ئایدیۆلۆژیایەك دەگەڕێتەوە کە لە رێگایەوە بتوانێ روو لە هەموو کەسێك بکات و موخاتەبەی بکات. ستۆواییەکان ئیمپراتۆرییەتیان وەکو قەدەرێك دەبینی. بە گوێرەی چەمکی تێڕوانینی سروشتییان راستترین شێوازی جوڵانەوە وەکو کۆك بوونی سیستەمی سروشت ژیانێکی کۆك بوو لەگەڵ سیستەمدا. بە واتایەکی دیکە فەلسەفەیان کردبوو بە ئایینی ئیمپراتۆرییەت. هەروەکو چۆن دوای ماوەیەکی کورت مەسیحییەت وەکو ئایینێکی فەرمی رادەگەیەنرێ، ئەوا لەمیانەی پێکهاتەیەکی پارچە پارچەی کە لە هەموو رەوتە فەلسەفییەکان پێکهاتووە، وەکو بۆچوونی فەرمی

دەوڵەت بەکاردەهێنرێ. ستۆواییەکان بە باشترین شێوە نوێنەرایەتیان دەکرد. سەرەڕای ئەوەی سیستەمی ڕۆما لە بناخەی خۆیدا بۆ پارچە بوونێکی چینایەتی بە شێوەی کۆیلەیی کە خاوەن هیچ مافێك نییە ئیمپراتۆری خاوەنی هێزی بێسنوور دابەش ببوو، بەڵام بەرامبەر بە پێشکەوتنی هزری لە جۆری وشیاربوونەوەی ئەقڵ و مرۆڤ تەنیا دەبێت بە بەندەیەکی خۆشەویستی خودا، ناتوانێ زێدە خۆی لەسەر پێیان رابگرێت. ئەو هێزەی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمای رووخاند، واتە بەهێزترین سیستەمی کۆیلەداری شیکردەوە و هەڵیوەشاندەوە، ئەو بەربەرانە نین کە بە سەدان ساڵە لە باکوورەوە هێرش دێنن، بەڵکو ئەوەی لە ماوەی چەند سەد ساڵێکدا لەمیانەی هێزی ئەقڵ و باوەڕییەوە پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی ڕۆمای پچراندووە، جوڵانەوە هزری و کۆمەڵایەتییەکانە. ئەم پێشکەوتنە بەڵکو تیرەکەی و بەرفراوانییەکەی بچووك و تەنگبێت، بەڵام بە گوێرەی کاریگەرییەکەی ڕۆڵێکی دیاریکراوی هەیە. بە گوێرەی چیرۆکێکی تا ئێستا لە ئورفا باس دەکرێت نەمرود بە شمشێر نەمردووە بەڵکو لە ئەنجامی چوونی مێشوولەیەك بۆ ناو مێشکی مردووە. شتێکی روون و ئاشکرایە مێشوولە بە واتای باوەڕ و هزری نوێ دێت. ئەوەی ئاشکرا دەبێت ئەوەیە کە هەروەکو چۆن لە هەڵوەشانەوەی تەواوی سیستەمە دۆگماتیکەکان دەبینرێ، ئەو مێشوولەیەی کەوتۆتە ناو مێشکییەوە سیستەمی کۆیلەداری هەڵوەشاندۆتەوە، واتا ئەو شێوە نوێیانەی هزر و باوەڕ کە ئاراستەی پێکهاتەی باوەڕ و ئەخلاقی سیستەم کراون، سیستەمی هەڵوەشاندۆتەوە، ڕۆڵی سەرکەوتووانەی زەبری ڕەها، چی لە دەرەوە بێت یان ناوەوە تەواوکردنی ئەم هەڵوەشانەوەیە لەمیانەی لێدانی چەند زەبرێکی قەبا. ئیمپراتۆرییەتی ئەفسانەیی ڕۆما، بەرچاوترین نموونەی پشت راست کردنی ئەم راستینەیەیە.

٥ ـ **پەیوەندی سیستەمی کۆیلەداری بە شوێن و کات:** بـابـەتـێـکـی دیـکـە کـە پێویستی بە پێناسەکردن هەیە، پەیوەندی سیستەمی کۆیلەدارییە بە کات و هەلومەرجە جوگرافییەکان. دەرك کردن بە پەیوەندی هەر سیستەمێکی کۆمەڵگا لەگەڵ قالبە ڕۆحی و هزرییە سەرەکییەکانی ئەو قۆناخ و سەردەمەی لە ئارادیە، سەبارەت بەدەست خستنی زانیاری راست زۆر گرنگە. سەپاندنی پەیوەندی کۆیلەداری بەسەر پێکهاتەی ڕۆحی و هزری ڕۆژگاری ئەمڕۆمان زۆر ئاستەمە. ئەمە تەنیا لەمیانەی چەواشە کارییەکی مەزنی هزر و گۆڕین و توانەوەی کەسایەتی و پێکهاتەی کۆمەڵگاوە دەبێت. بەرامبەر بە رەوشێکی بەمجۆرە، ئاستی دەرك پێکردنی ئازادی و ئیرادەی بەرخودانی مرۆڤ و مەیل و هەڵوێستی گشتی سەردەم، زۆر لەوە باڵاترە کە هەڵوێست و کردەوەی بەمجۆرە پەسند و هەرس بکات. شانسی بەڕێوەچوونی کردارێك کە لە دەرەوەی چەرخ بێت، تەنیا لە رەوشی زۆر تایبەتدا دەبێ (شەڕ، یاخی بوون) بەڵام دیسان ئاستی گەیاندن و یاسای گەردوونی و یەکێتی سیاسییانە، دەرفەت بەوە نادات ئەم کردەوانە ماوەیەکی درێژ بەردەوام و هەمیشەیی بن.

هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە شێوازی پەیوەندی کۆیلەداری لە نزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ ئەم قۆناخەدا هەیە، کە هێشتا بە شێوەیەکی فەرمی دان بە مافەکانی مرۆڤ نەنراوە، گەیاندن زۆر سنووردارە، دەزگایەکی سیاسی بە کاریگەر لە ناوەوە و دەرەوە ئاوا نەببوو کە حیساب بخوازێت. تایبەتمەندێتی سەرەکی سیستەم، باڵادەستی رەهای دەسەڵاتی سیاسی و ئایینیە بەسەر ئەندامەکانی کۆمەڵگا. لە هەموو ئاستێك بە دەزگابوونی چینی کۆیلەداری هەڵکشاو، تاکی ناچاری جۆرە پەیوەندییەك کردووە کە تەنیا بتوانێ زگی خۆی تێر بکات. هزر و ڕۆح و تەواوی ژیانی بە گوێرەی ئەم پەیوەندییە شێوە دەگرێت. بەمجۆرە پەیوەندی سەردەمی کۆیلەداری چاخە دێرینەکان بە مرۆڤەوە دادەنرێت. لێرەدا پەیوەندییەکی دیالەکتیکییانەی تەواو لە نێوان کات و شێوەگرتنی کۆمەڵگا دانراوە. ئەمە بژارێکی بە گوێرەی هەوەس (ئارەزوو) نییە. کات (زەمەن)، زانای فیزیك **ئەنیشتاین** هەقدار دەکات و تیۆرییەکەی پشت راست دەکات، چونکە کات وەکو بوارێك وایە کە  سیستەم دەبەستێتەوە. کات وەکو هێزێك وایە. هەروەکو چۆن سیستەمێکی کۆیلەداری بە بێ کات و ڕۆژگار نابێت، شێوەبەندی کۆمەڵگایەکی بە گوێرەی ڕۆژگاریش نەبێت جێگای باس نییە و نابێت. تەنیا رەچاو کردن و پێوانەکردنی کات (زمان) وەکو فاکتەرێکی زانستەکانی سروشت تێرا ناکات و نابێتە وەڵام. شتی گرنگتر بە دەست هێنانی پێوانەی پەیوەندی نێوان کات ـ کۆمەڵگایە. کات بوارێکی زانستی کۆمەڵگایە کە دەرك بە گرنگییەکەی نەکراوە و کاریگەریەکەی روون نەکراوەتەوە. تەنیا کاتێك بە زانستێکی راستی کۆمەڵگا دەگەین کە بە شێوەیەکی راست پێوانەی ـ ڕێژەی کاتی دەستنیشانکرد و لە تەواوی پەیوەندی و ناکۆکی و جوڵانەوە و پێکهاتەکانیدا کاتی رەچاوکرد و خستییە ناو لێکدانەوەکانی خۆی. لەم بوارەدا کاتێك ریزبەندی کاتی شارستانییەتی کۆیلەداری بکەین، دەتوانرێ هەندێ قۆناخی سەرەکی دەستنیشان بکرێت.

١ ـ **لە دایکبوون و پێشکەوتنی:** مەزەندە دەکرێ هاوکاتی رێکەوتـی سـاڵانـی ٢٥٠٠ تا ٣٥٠٠ پ.ز    دەوڵەت ئاوا کراوە. ئەوە یەکلابۆتەوە سیستەم دەتوانێت بژیت. بە گوێرەی بڵاوبوونەوە و کۆلۆنیکردن گونجاوە. بە پوختی دەتوانرێ وەکو حاکمییەتێکی رەهای خانەدانێکی سیاسی یان گروپێك پراکتیزە بکرێت، کە لەلایەنی راهیبە ـ پادشاکان بە شێوەی یەکێتی خوداوەندەکان لەمیانەی میتۆلۆژیاوە بەسەر پێکهاتەی هزری و دەروونی مرۆڤدا سەپێنراوە. لە کاتێکدا باڵادەستی ئایدیۆلۆژی بە بنەما دادەنرێت، بەڕێوەبەرایەتی سیاسی تازە پێشدەکەوێت و بە پلەی دووەم دێت. چینە دەسەڵاتدارەکان تەواوی ئەم پەیوەندییانەی بە دەوڵەت بەستۆتەوە کە وەکو موڵکی بێ سنووری خۆی دەبینێ. دەتوانرێ ئەم قۆناخە بە سیستەمی پادشا ـ خوداوەندەکانیش ناوببرێت. گەوهەرەکەی خۆی لە سۆمەرەکانەوە وەرگرتووە. ئەو شارستانییەتانەی لە نزیکەوە کاریگەریان کردۆتە سەر، شارستانییەتی میسر، ئیندۆس و هەراپا و موهانجادرۆی پەنجابە. شیمانەی ئەوە دەکرێت شارستانییەتی میسر لە ٢٣٥٠ ـ ٣٠٠٠ پ.ز، ئەوانەی دیکەش لەماوەی نێوان ٢٠٠٠ ـ ٢٥٠٠ پ.ز بەم قۆناخەدا دەربازبووبن.

شێوەی سەرەکی هزری ئەو ڕۆژگارە میتۆلۆژییە. زمانی ڕۆژگار شیعرئامێزانەیە. زمانی شیعرئامێزانە لەدەستپێکی هەموو شێوەکانی هزری میتۆلۆژیادا زاڵە. شیعر بە باشترین شێواز، رەونەق و بێگەردی ژیان دێنێتە زمان. زمانی شیعر بیرکاری ژیانە. ئەو پەیوەندییانەی لە زمانی شیعرئامێزانە دادەبڕێن نامۆدەبن، نامۆبوونیش کەوتنە. نیشاندانی ژیان بە زمانێکی شیعرئامێزانە وەڵامێکی راستە سەبارەت بە گەوهەری ژیان. نەبوونی شیعر لە نزیکەوە پەیوەندی بە لەدەستدانی ژیانەوە هەیە.

نابێ دەرهەق بەم بابەتە بکەوینە نێو هەڵەیەکی بەمجۆرە: کێش و قافیە، سیستەمی چوارینەکان، درێژی و کورت بوونی بەیتەکان، تەواوی ئەم لایەنانە دەرهەق بە وردەکارییە و راستینەی شیعر دیاری ناکەن. لە زمانی شیعر چۆنێتی برگەکان و شێوەکانی رێکخستنی زیاتر، ئەو ناوەڕۆکەی لە خۆوەی دەگرێت، سەرەکییە و ڕۆڵی دیاریکراو دەبینێ. هەروەها ئەم قۆناخە لەمیانەی دەزگای نووسەران دەردەکەوێتە پێش. پەیوەندی نێوان دەرکەوتنی شارستانییەت و سیستەمی نووسیندا مسۆگەرە. کاتێك باس لە نووسین دەکرێت نابێ تەنیا بە رێنووس و ژمارەکان تێبگەین. دەبێ وەکو رەنگدانەوەی هێمای هزرەکان تێبگەین. تەنیا قۆناخێکی هزری کە گەیشتۆتە ئەم ئاستە دەتوانێ شارستانییەت بخوڵقێنێ.

لە دەزگا سەرەکییەکانی دیکەدا بیناسازی کۆشك و پەرستگاکان هاتۆتە ئاراوە. ناتوانرێ باس لە قۆناخی کۆیلەداری بکرێت کە خاوەنی کۆشك و پەرستگا نەبێت. بناخەی تەواوی کۆشك و پەرستگاکان  لەسەردەمی ئاواکردندا وەکو یەکەمین پێکهاتووە؛ لە قۆناخەکانی دواتر پێشکەوتن لەسەر بنەمای بە دواداچوونی ئەم شوێن پەنجەیە بەردەوام بووە. لەم قۆناخەدا سیستەمی موڵکایەتی نوێنەرایەتی پەیوەندی ئەو جیهانە دەکات کە خوداوەندەکان تێیدا دەسەڵاتدارن. موڵکداری گشتی (هاوبەش) لەپێشە. خاوەنی زەوی و پەیوەندییەکان و بەڕێوەبردنیش، تەواوی کۆمەڵەیەکە. بەڕێوەبەرایەتی سەرچاوەی خۆی لە جیهانی خوداوەندەکانەوە دەگرێت، بەندەکان ئەرکیان تەنیا خزمەتکردنە.

شوێنی سەرەکی نیشتەجێبوون شارە. شار دەزگایەکی سەرەکییە کە ڕۆح و هزری ئەم قۆناخەی دیاریکردووە. پەیوەندی دەستپێکردنی شارستانییەت لەگەڵ شۆڕشی شار مسۆگەرە. شار تەنیا شێوەیەکی جەستەیی نیشتەجێبوون نییە، بەڵکو ناوەندی ئەو کۆمەڵگا سیاسی و کۆمەڵایەتییەیە کە هزر و ڕۆحی نوێی خوڵقاندووە. وەستایەتی پیشەکاری دەزگایەکە پێشدەکەوێ. بەڵام هێشتان سەربەخۆیی بەدەست نەهێناوە. وەکو پارچەیەکی پەرستگا و کۆشك وایە و پەیوەندی کۆیلایەتی زاڵە، بوونی مرۆڤ بە موڵك، بابەتێکی سەرەکییە. ئەو بازرگانییەی کە پێشدەکەوێت خاوەنی پەیوەندییەکی هاوشێوەیە. ئاستەمە باس لە چینی ناوین و ناسنامەکەی بکرێت. شێوازی پەیوەندی رەهای لە جۆری بەڕێوەبەر ـ بەڕێوەبراو، کە خاوەنی هەموو شتێکە، لە هەموو بوارەکاندا زاڵە. بە هیچ شێوەیەك ناتوانرێ باس لە ناسنامە و ئیرادە و ئازادی چینی ناوین بکرێت.

ئامرازەکانی بەرهەمهێنان زیاتر داهێنانەکانی سەردەمی کۆمەڵگای نئۆلیتیکە، لەگەڵ بوونی بە موڵکی هاوبەشی بەڕێوەبەرایەتی شارە نوێیەکان، شێوازێکی نوێی پەیوەندی ئاواکراوە. خوڵقاندنی ئامرازێکی تایبەت بە خۆی نابینرێ. هەمان شێوەی هاوبەشێتی بەسەر خاکیشدا پەیڕەو دەکرێت. دیاردەی هەرە زێدە پێیەوە گرێدراون ئاودێری سروشتی و دەستکردە.

کۆمەڵەی ئەتنیکی جێگای خۆی بۆ کۆمەڵگای چینایەتی بەجێهێشتووە. کولتووری دەسەڵاتی بنەماڵەیی لە هەڵکشاندایە. چارەسەرکردنی بە دەزگابوونی ماددی و پێکهاتە رۆحی ـ هزرییەکان رێك بە گوێرەی سەردەم و کاتی خۆی کێشە و ئەرکی سەرەکی زانستی مێژوو ناسییە.

**ب ـ سەردەم (کات)ی پێگەیشتن و بڵاوبوونەوە:** شانبەشانی ئەوەی بە گوێرەی هەر ناوەندێك جیاوازی هەیە، بەڵام ئەم قۆناخە بۆ ماوەی نێوان ٢٥٠٠ تا ٥٠٠ پ.ز دەگەڕێتەوە، دیارترین و بەرچاوترین تایبەتمەندێتی جێگیربوون و پەلهاوێشتنی ئەو سیستەمەیە کە خۆی سەلماندووە. کۆمەڵگای سۆمەر لەو سەردەمەدا (٢٠٠٠ پ.ز) جێگای خۆی بۆ بابلی و ئاشوورییەکان بەجێهێشتووە. لەگەڵ ئەوەی قۆناخی دەسەڵاتدارێتی بابلی و ئاشوورییەکان بەناو یەکدا چووە و لەمیانەی ناکۆکییەوە بەڕێوەدەچێت، بەڵام گوزارشت لە یەکپارچەیی دەکات. ٢٠٠٠ تا ١٦٠٠ پ.ز سەردەمی لە دایکبوون و پێشکەوتن. ١٦٠٠ تا ١٠٠٠ پ.ز پێگەیشتنی ناوین، ١٠٠٠ پ.ز تا ١٠٠ زایین گەیشتنە لوتکە و رووخانە. لە میسر ٣٠٠٠ تا ٢٣٥٠ پ.ز لە دایکبوون و پێشکەوتن، ٢٠٠٠ تا ١٨٠٠ پ.ز پێگەیشتنی ناوین، ١٥٠٠ تا ٠ پ.ز گەیشتنە لوتکە و رووخانە. هەراپا بەردەوام نابێت لە ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز کزدەبێ و دەکوژێتەوە. ریزبەندی مێژوویی چینیش ١٥٠٠ تا ١٠٠٠ پ.ز لە دایکبوون و پێشکەوتن، ١٠٠٠ تا ٥٠٠ پ.ز پێگەیشتنی ناوین، ٥٠٠ پ.ز تا ٥٠٠ زایین لوتکە و رووخانە. هیندییەکانیش ١٠٠٠ تا ٥٠٠ پ.ز لە دایکبوون و پێشکەوتن، ٥٠٠ پ.ز تا ٥٠٠ زایین پێگەیشتنی ناوین، ٥٠٠ تا ١٠٠٠ زایینی لوتکە و رووخانە. هەرچی شارستانییەتی یۆنان ـ رۆمایە بە شێوەیەکی گشتی بەرهەمی قۆناخەکانی لوتکە و رووخانن. هەروەها هیتیت، میتانی، فینیقی، عیبرانی و یۆنانییەکان کە زیاتر لە ئاستی ژێردا بە مۆدێلە سەرەکییەکە دەچن، شارستانییەتی ئەم سەردەمەن، هەوڵیانداوە لە ناوخۆیاندا بە تەواوی یاخود بە رێژەیی بەم قۆناخەدا دەربازبىن.

بەرچاوترین تایبەتمەندێتی ئەم قۆناخە ئەوەیە کە مەزن بوون و فراوان بوون لەمیانەی پەلهاوێشتندایە. گەلێك کۆلۆنی و شاری گرێدراوی قۆناخی پێشتر، تا ئاستی نیمچە دەوڵەتی شار بەرزبوونەتەوە و ناوەندی نوێ دەرکەوتوون. لە جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناویندا شارەکان بە شێوەی نەخشەی بڵاوبوونەوەی ئەستێرەکان بڵاوبوونەتەوە. کارەکتەری راهیبێتی بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت کەوتۆتە پلەی دووەمەوە. راهیبێتی زیاتر گەوهەری دەزگایەك لەخۆوە دەگرێت کە بە کاری ئایدیۆلۆژیاوە خەریکە. هەست کردنی دەسەڵاتی سیاسی وەکو هێزێکی نزیك بە خوداوەند و پراکتیزەکردنی جێگای باسە. کۆشك و پەرستگاکان مەزن و زیادبوونە. دەزگای پادشایەتی تۆکمە و پتەوترکراوە.

سەرەکیترین تایبەتمەندێتی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی ئەم قۆناخە لە دایکبوونی چینی ناوین و بە دەست هێنانی کەسایەتی و ناسنامەکەیەتی. بازرگان و پیشەکاران بوونەتە چەکەرە و هێزی سەرەکی مەزن بوونی شارەکان، لە پەیوەندی نێوان شارەکان و شار ـ گوند و پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا رۆڵ و هێزی داینەموٚیان بینی. پیشەکاران سەربەخۆدەبن، بازرگانانیش بە ئەندازەی نیمچە دەوڵەتێکی شارکاریگەرن. لەسەرەتا ئاشوورییەکان دواییش فینیقیەکان، دواتریش گریت، قەرتاجە عیبرانییەکان و گەلێك دەوڵەتۆکەی کەنارەکانی ئەنادۆڵ لە بناخەی خۆیاندا کارەکتەرێکی بازرگانی و پیشەکاریان هەیە. دوای دەزگاکانی پادشایەتی و راهیبێتی شارستانییەت بازرگانەکان ئەو هێزەن کە وەکو گرنگترین چینی کۆمەڵایەتی رۆڵدەبینن.

لە ئابووریدا کاڵا پێشکەوتووە. ئەو ماددە و کەرەستانەی بابەتی بازرگانی، بەردەوام زیاددەبێت. بازرگانی کۆیلەکان چڕ و فراوان بووە. مانیفاکتۆرای نزیك بە کارگە دێتە ئاراوە. لە دەرەوەی کۆنترۆڵی دەوڵەت شێوازێکی کاروباری ئابووری رێڕەوی گرتووە و پێشدەکەوێت. بە تایبەتیش لە ساڵانی ١٥٠٠ پ.ز شارستانییەتی کۆیلەداری لە ناو قۆناخێکی "**جیهانی بوون**"دا دەژیت. دەتوانرێ ئەمە بە قۆناخی **جیهانی بوونی** مس ناوزەد بکرێ. سیستەم تام و چێژی پێگەیشتن دەکات. بۆ یەکەمین جار دەزگای دیبلۆماسی پڕ لە دیاری بە کارهێنراوە، شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین لە قۆناخی هەرە بەهێز و بەخۆباوەڕ دەژیت.

میتۆلۆژیای چاخە دێرینەکان دووچاری تێکشکان دێت. ئەو پێشکەوتنەی لەسەر بنەمایەکی ئایینی بە دیدێت و جەخت لەسەر بە خوداوەندنەبوونی مرۆڤ و بە بت نەبوونی خوداوەندەکان دەکاتەوە، لەم تێکشکانەدا رۆڵی سەرەکیشی دەبینێ. زاراوەی نوێی تاکخودایی کە گوزارشت لە هزری یەك بوونی ئابووری و بازرگانی دەکات، رۆڵێکی یەك پارچەیی و یەك بوونێکی زیاتر دەبینێ و وەکو بەردی بناخەی پێکهاتەی ئایدیۆلۆژیایەك دادەڕێژرێ کە دەتوانێ تەواوی خەڵك موخاتەبە بکات. لە کاتێکدا قۆناخی خوداوەندەکانی دامەزرێنەری شار و تیرەکان تێپەڕدەکرێت، وەکو داب و نەریتێکی ئایینی تاکخودایی کە تەواوی مرۆڤایەتی لە ئامێزگرتووە، "**ئەڵلا**" لە پێشکەوتنی مێژووییدا یەکێك لە گرنگترین رۆڵەکانی خۆی دەبینێ. بە لایەنی کەم هێندەی هەلومەرجی ماددی، باس کردنی رۆڵی مێژوویی رەنگدانەوە مەعنەوییەکان واقیعی و لە جێگای خۆیدا دەبێت.

یەکێك لە بە دەزگابوونە گرنگەکانی ئەم قۆناخە بەکارهێنانی هێز و توانای ئەسپ و بەکارهێنانێتی لە راکێشانی گالیسکەکانی شەڕدا. بۆ یەکەمین جار لە سایەی گالیسکە ئەسپدارەکان، دەزگای سەربازی مەزن کراوە و هێزەکەی دەنگی داوەتەوە و هەموو شوێنێك دەهەژێنێ. ئیتر خێراترین هێزی مێژوو کەوتۆتە کار. ئەم ئامرازانەی لەژێر دەسەڵاتی چینی ژوور دایە، لەگەڵ چەکە لە مس دروست کراوەکان، قۆناخی بەهێزبوونی فەرماندارێتی سەربازی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. ئەم باڵادەستییەش لە کەسایەتی حامورابی پادشای بابل دەگاتە لوتکە.

**ج ـ چاخی کلاسیکی شارستانییەت یاخود قۆناخی گەیشتن بە لوتکە و رووخان:** ئەم قۆناخە لە ماوەی نێوان ٥٠٠ پ.ز تاوەکو ٥٠٠ زایینی بەردەوام بووە. لە کاتێکدا ئەو شارستانییەتەی کە ناوەندەکەی میزۆپۆتامیا بوو، جێگای خۆی بە ئیمپراتۆرییەتی میدیا ـ پارس بەجێهێشت، شارستانییەتەکانی رۆژئاوا کە ناوەندەکەیان میسر و ئەنادۆڵ بوو، جێگای خۆی بۆ شارستانییەتی یۆنان ـ رۆما بەجێهێشت. لە کاتێکدا قۆناخی ئیمپراتۆریەتی ماد ـ پارس زێدەڕۆیی و سەرەڕۆیی بابلی و ئاشوورییەکان بەلاوەدەنێت و لە جێگای ئەو نوێنەرایەتی قۆناخێکی دادپەروەر و ئاشتیخوازانەتر دەکات، ئەوا قۆناخی نەمروود و فیرعەونەکانیش بەجێ دێڵێت کە کاریگەرییەکی بەهێز و سەرسامیان لە پاش خۆیان بەجێ هێشتووە. مژدەی ئەوە دەدرێت کە کۆیلایەتی قەدەرنییە و دەشێ رزگاری و ئازادی بەدەست بهێنرێ. باس لە شکاندنی ئەو زنجیرە دەکرێت کە تاوەکو قورگ لە مرۆڤ ئاڵێنراوە.

لە کاتێکدا لە رۆژئاوا یۆنان و رۆما لەمیانەی پشت بەستن بە هێزی ئەقڵ و فەلسەفە سیستەم بەرەو لوتکە دەبەن، ئەوا تەواوی فاکتەرەکانی کەوتنیش لە ناوخۆیدا دەچێنێ. هەروەکو چۆن کۆماری رۆمای کۆیلەداری و دیموکراسییەتی ئەتینا توانای هێزی فەلسەفەیان سەلماند، لەهەمانکاتدا دانیان بە ناکۆك بوونی خۆیان لەگەڵ ئەم سیستەمانەدا هێنا و سەلماندیان. زێدەڕۆیی لە مەزن کردنی دەسەڵات و گەیاندنی بە ئاستی خوداوەندی، کە سەرەکیترین تایبەتمەندێتی شارستانییەتی کۆیلەدارییە، ناشێ بۆ ماوەیەکی درێژ بە یەکەوە لەگەڵ ئەو باوەڕییە و ئیرادە و هزرەدا بژیت کە ئازادبوونە. هەروەکو چۆن گەیشتنی سیستەمێك بە هەرە لوتکەی پێشکەوتنی خۆی، بەهۆی هەبوونی ئەم ناکۆکییانەیە کە بەر لە قۆناخی هەڵوەشانەوە دەرکەوتن، ئەوا کەوتنەکەشی بەهۆی خستنە گەڕی دژە جەمسەری ئەم ناکۆکییانەیە. لەکاتێکدا لایەنێکی ناکۆکی سیستەم بەرزدەکاتەوە لایەنەکەی دیکە دەیخات. ئیتر سەردەم بووە بە قۆناخی هەرە خێرای سیستەم. خێرابوون واتای زیادبوونی رۆڵ و گرنگی کاتە. خێرایی هەم رووخێنەرە، هەم بونیادنەرە. خێرایی‌بوون لە پێکهاتەیەکدا بە واتای قۆناخی کەوتنە گەر و جموجۆڵی فاکتەرەکانی رووخان و سەرلەنوێ ئاوابوونە. بەمجۆرە مێژوو لە ٥٠٠ پ.ز بە دواوە دەربازی قۆناخی خێرابوون بووە. ئیتر قۆناخی هەرە خێرای گواستنەوەی شارستانییەت لەو پەڕی رۆژئاوا بۆ ئەو پەڕی رۆژهەڵات بە ئەسپ دەستیپێکردووە. بازرگانی ماڵ و هزریش بە هەمان خێرایی هەڵدەسووڕێ. لە کاتێکدا جیابوونەوەی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا

پێش دەکەوێت، لەهەمانکاتدا لە هەموو ئاستێکدا جموجۆڵ لە نێوانیاندا بەردەوامە. کێشمەکێش و پێکدادانی پارس ـ یۆنانیەکانی پێشتر جێگای خۆی بۆ ململانێ و پێکدادانی رۆما ـ ساسانییەکان بەجێ هێشتووە. دیبلۆماسییەتی هاوسەنگییەکان لەگەڵ خۆیدا، رێگای لەپێش چەند پێکهاتەیەکی نوێ کردۆتەوە.

لەگەڵ وزەی ئاژەڵ، دەرفەت و تواناکاری سوود وەرگرتن لە وزەکانی با و ئاو پێش دەکەوێت. پارە کەوتۆتە گەڕ. جامچێتی و نووسەری دووپیشەن کە پێشدەکەون. بیناسازی شارە کلاسیکەکان لە قۆناخێکی دەگمەن و بێهاوتای خۆیدا دەژی. یاسای علمانی (دابڕاو لە ئایین) بناخەکەی دادەنرێ. چینی ناوین لە بواری چەندایەتی و چۆنایەتییەوە درێژە بە پێشکەوتنی خۆی دەدات. ئایینی مەسیحی عیسا کە وەکو ئایینێکی مرۆڤایەتی و گەردوونییە، دەبێتە گەورەترین جوڵانەوەی ئەخلاقی و باوەڕی، هەروەکو بەهێزترین پارتی کۆمەڵایەتی قۆناخی خۆی وایە. هەرەس ئاسا تەریقەتە سۆفیگەرایییەکان دێنە ئاراوە، لە سەرووی هەمووشیانەوە مانیزم.

قوتابخانە فەلسەفییەکان لەسەرووی هەموویانەوە ستۆوایییەکان

لە هەموو شوێنێك دەکرێنەوە و زۆردەبن. لە رێگای ئیمپراتۆرییەتی گەردوونی رۆما شارستانییەتیش لە هەموو گۆڕەپانێکدا ناچاری گەردوونی بوون دەبێت. هیچ دەزگایەکی شارستانییەتی کۆیلەداری لەو هێزەدا نییە ئەو مرۆڤە بوەستێنێ کە لەمیانەی چەمك و چالاکییەکانی خۆیەوە کەوتۆتە ناو جموجۆڵەوە. ئیتر سەردەم سەردەمی قەڵشین و خولڤاندنی نوێترە. سەردەمی کۆیلەداری کە کزببوو، دوای هێدیبوونێکی درێژخایەن جارێکی دیکە خێرادەبێت و بە ئامانجی خولڤاندنی سەردەمی بەهێزترین و خێراترین شارستانییەت چەرخی ناوین دەئافرێنێ.

پەیوەندی نێوان شارستانییەت و جوگرافیا لە پەیوەندییەکی میکانیکی بەولاوە، گرێدراوی گەوهەرە و واتایەکی دیالەکتیکی لە خۆوەدەگرێت. ئەگەر کەوانی بەپیت نەبوایە هەرگیز شارستانییەتی میسر و سۆمەر نەدەبوو. ئەگەر میسر و سۆمەر نەبوایە رۆژهەڵاتی ناوینیش نەدەبوو. بەبێ هەبوونی رۆژهەڵاتی ناوین نە شارستانییەتی هیند و چین لە رۆژهەڵات، نە شارستانییەتی یۆنان و رۆما لە رۆژئاوا پێش نەدەکەوتن. ئەگەر یۆنان و رۆما نەبوایە شارستانییەتی ئەوروپای رۆژگاری ئەمڕۆمان نەدەبوو. بە ئەندازەی ئەوەی ریزبەندی مێژوویی لەلایەنی کات (رۆژگار)ی هەیە، ئەوا ریزبەندییەکی جێگا (شوێن)ی بەمجۆرەی هەیە کە ناتوانرێ لە یەکتری دابڕێنرێ. نابێ پەیوەندی نێوان جوگرافیا و مێژوو تەنیا وەکو پارچەیەکی جەستەیی و لەباری سروشت بە شێوەیەکی تەسك و سنووردار بگیردرێتە دەست. پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان شێوەگرتنی کۆمەڵگای نیۆلیتیك و جۆرەکانی ئاژەڵ و دانەوێڵە و کەش و هەوای جوگرافیاوە هەیە. مێژوو و سروشت ئەم شانسەیان بە جوگرافیای کەوانی بەپیت داوە. ئەوانەی لەم جوگرافیایەدا رێگایان لەپێش قۆناخی کۆمەڵگای نیۆلیتیك و شۆڕشی مەزنی کشتوکاڵی کردۆتەوە، لە راستیدا قارەمانی هەرە راستەقینەن کە مێژوویان لە منداڵدانی سەرەکی خۆی هێناوەتە دونیا و بۆ یەکەمین جار لانکەی مرۆڤایەتییان رازاندووە. ئەمانە دایکە ـ خوداوەند و قارەمانانی ـ رەنجی نەناسراو و بێ ناوی مێژوون. مێژوو بەمجۆرە دەستیپێکرد، بەڵام بە درۆ نووسرا. منداڵ لێرە مەزن بوو بەڵام، ناوێکیتری لێنرا. تەواوی کۆڵەکەکانی شارستانییەت لێرە خولڤێنران بەڵام، بیانییەکان دەستیان بەسەرداگرت. تاوەکو ئێستاش ئەمانە شارستانییەت بەخێودەکەن بەڵام، خەڵکانی دیکە دەژین. تاوەکو دان بەو توانستانە نەنرێت کە کەوانی بە پیت پێشکەشی مێژووی کردووە و مافەکەی نەدرێتەوە، ئەوا ئەم مێژووە بێبنگەیە، ناتوانێ لە مێژوویەکی درۆ و چەواشەکاری رزگار ببێت.

هیرۆدۆت لەسەردەمی خۆیدا ئەوەی دەستنیشان کرد کە میسر دیارییەکی رووباری نیلە. لە کاتێکدا ئیندۆس و پەنجاب شارستانییەتی هیندیان خولڤاندووە، رووباری زەرد چینی ئافراندووە. تایبەتمەندێتی ئاودێری خۆرسك و سروشتی ئەنادۆڵ، تەواو ئەو شارستانییەتانە دەخولڤێنێ کە تێر ئاویان دەکات. ئەو بازرگانییەی لەگەڵ پێکهاتنی ناوەندەکانی شارستانییەت خێرا دەبێت، لە شوێنە جوگرافییە لەبارەکاندا دوورگەی جیاجیای شارستانییەت ئاوا دەکات. جوگرافیای دەریای سپی لەمیانەی کەنارەکانی و ئاوەکەی خاوەنی تایبەتمەندێتی کۆنترین و گەورەترین دەریای شارستانییەتە. پێکهاتەی لەباری ئاو و هەوا و زەوی، تەواوی ئەوروپا دەکات بە ناوەندی گەورەترین شارستانییەت.

لێکۆڵینەوەی هەر جوگرافیایەك سەبارەت بە کۆمەڵگا و مێژوو خاوەن گرنگییەکی تایبەتە. جوگرافیا لەمیانەی لایەنە ئەرێیی و نەرێییەکانی، خاوەنی کاریگەرییەکی بنچینەیی و بەردەوامە بەسەر شارستانییەت و پێکهاتە و پێشکەوتنی کۆمەڵگادا. ئەگەر ئەمڕۆ کێشەکانی ژینگە ئافاتێکی لەگەڵ خۆیدا هێنابێت؛ ئەمەش گرێدراوی ئەو لایەنانەی شارستانییەتە کە لەگەڵ سروشتدا ناکۆکە و لە ئەنجامی بە کوێرایی گرتنەدەستی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا و جوگرافیا لەلایەن ئەم چەرخەمان دەرکەوتووە کە بانگەشەی زانستیبوون دەکات. لە راستینەی کۆمەڵگادا جوگرافیا رۆڵی لانکە دەبینێ. دەبێ مرۆڤایەتی بزانێ کە هیچ کاتێك بەبێ جوگرافیا ناتوانێ بژی و لانکەی خۆی تێکنەدات. یەکێك لە ئەنجامە گرنگەکانی لە شیکردنەوەکانی شارستانییەتی بیدۆزینەوە ئەمەیە.

٦ ـ **میراسی شارستانییەتی کۆیلەداری:** دەرباز بوون بۆ کۆمەڵگای چینایەتی، لە ئەنجامی ئەم ناکۆکییانەوە بوو کە کۆمەڵگای نیۆلیتیك نەیتوانی چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە. لەبەر ئەوەی کەڵەکە بوونی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و ئاستی زانیاری لە بوارێکی ژوورتردا رێکنەخرا، بێکار و بێ سوود دەمانەوە. لە لایەکی دیکەشەوە زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان هاتۆتە ئاراوە. ئیتر کۆتایی بە قۆناخی دابەشکردنی خاك بە شێوەیەکی هاوبەشانە هاتووە. ئیتر دەرفەت و تواناکاری چارەسەرکردنی کێشەکان لەمیانەی بڵاوکردنەوەی کۆمەڵگای لادێ نەمابوو.

لەگەڵ گەیشتن بە ساڵانی ٤٠٠٠ پ.ز، کۆمەڵگای کشتوکاڵی لە زەریای ئەتڵەسییەوە تاوەکو زەریای مەزن تەواوی زەوییە لەبارەکانی ئەوروپا و ئاسیای گرتۆتەوە. چڕبوونەوەی ژمارەی دانیشتووان لە ناوچەکانی دەوروبەری دەریای سپی لە ئاستێکی پێشدابوو. کاتێك کۆمەڵگای لادێ گەیشتە بەرزترین ئاستەکانی پێشکەوتن، یان لەمیانەی سیستەمێکی نوێوە هەنگاودەهاوێژێ، یاخود لە ئەنجامی ئەو شەڕانەی لە قۆناخەکانی دواییدا لەپێناو بەدەست هێنانی خاکدا پێشکەوتووە، لە نێو هەلومەرجی پێکدادانەکاندا دووچاری خراپ بوون و لەرێ لادان دەکات. ئاستی تەکنۆلۆژیا و زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوان چارەسەری لە گۆڕانکاری سیستەمدا دەدۆزێتەوە، هەوڵماندا لە نزیکەوە شێوازی چارەسەرکردنی کۆمەڵگای چینایەتی کۆیلەداری ببینین. ئەمە شۆڕشێکی شار بوو. گەوهەرەکەی پشتی خۆی بە ئۆرگینازسیۆنی کۆمەڵکاری رەنجی مرۆڤ دەبەست کە لەمیانەی ئەو ئامرازانەی کە هەبوو بەروبوومێکی زۆر لەوە زیاتری بەرهەم دێنا کە خەرجی دەکرد. سەفەربەر کردنی ژمارەی زۆری دانیشتوانی دۆڵەکانی رافێدەین و نیل، بۆ کشتوکاڵ و ئاودێری گەنجینەی دەخولڤاند. ئەم ناوەندە نوێیانەی بەرهەمهێنان هەروەکو جێبە جێکردنی خەون و موعجیزەیەك وابوو. ئەو رەوشەی کە مرۆڤایەتی تێیدابوو ئەم پێشکەوتنەی بەمجۆرە هەڵدەسەنگاند. بەمجۆرەش لە تەواوی پێکهاتەی هزریدا دەنەخشێنرا. بێگومان ئەنجامدانی پێهەڵگرتنێکی بەمجۆرە بەرامبەر لە پەلوپۆکەوتنی کۆمەڵگای گوندی نیۆلیتیك کە هەزاران ساڵ بەردەوام بوو، پێشکەوتنێکی مەزن بوو.

لە رەوشێکی بەمجۆرەدا نەبوو کە ئەو ناکۆکیانەی مەزەندە نەدەکران و لە ناواخنی خۆیەوە دەگرت، یەکسەر دەریان بخات. هەموو شتێك لە شێوەی جیهانی خەیاڵ سەرنج راکێش و ئیلهام بەخش بوو. بە گوێرەی رابڕدوو تەنانەت هەر یەکێکی کار بکات دەیتوانی باشتر زگی خۆی تێر بکات و لە ناو ئارامیدا بژیت. سیستەمی سۆمەر کە لە ساڵانی ٣٥٠٠ پ.ز بۆ یەکەمین جار لەمیانەی ئاواکردنی شاری لە جۆری ئورك و ئەریدۆ دەستیپێکرد، بە تەواوی بۆ ماوەی ٣٠٠٠ ساڵ گەوهەرکەی خۆی پاراست و لە رێگای زنجیرەی دەزگاکان بەبێ پچڕان، مەزن بوو و بڵاو بۆوە و هەروەکو بڵێی سەرلەنوێ تەواوی ئەو گۆڕەپانانەی فەتح کرد کە کۆمەڵگای کشتوکاڵی پێکیهێنابوون و بەمجۆرەش سەرکەوت لەوەی بیانکات بە گۆڕەپانی شارستانییەت.

لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئاستەمە باس لەوە بکرێت کە شارستانییەت لە هەموو بوارێکەوە شیکراوەتەوە. تەواوی دەزگا پەیوەندییە سەرەکییەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان سەرچاوەی خۆی لەم شارستانییەتەوە دەگرێت. ئەوەی شارستانییەت خولڤاندوویەتی، لە شێوەی جفرەی کۆمەڵایەتی لە قووڵایی هزرماندا جێگیربووە و ئاراستەمان دەکات. تەواوی دەزگا سەرەکییەکان و چینە کۆمەڵایەتی و ریشەی کولتووری ژیانی بە شار بوون رەگەکەی بۆ ئەم سەرچاوانە درێژ دەبێتەوە. پەرستگا، کۆشك، شانۆ، بازار، ئەنجوومەن، رێگا، مانیفاکتۆرا،

قوتابخانه، ماڵی تایبەتی و گشتی، بۆ یەکەمین جار لەم شارە بچووکانە ئاواکراوە. بەڕێوەبەر، بەڕێوەبراو، فەرمانبەر، وەزیر، کارگێڕی، ئۆرگانی راوێژکاری، فەرماندارێتی سەربازی پاشماوەی ئەم قۆناخەن، نووسین، میتۆلۆژیا، رەسم، مۆسیقا، شانۆ، فۆلکلۆر، عیبادەت، ئەمانە هەموو بە داهێنانەکانی پەرستگا دادەنرێت.

سۆمەریەکان بە قوڵایی هەستیان بە گرنگی ئەم جۆرە دەزگایانە کردبوو، هەربۆیە وەکو شکۆمەندترین یاسا بە "**ما**"کانی خۆیان ناویان دەبرد و بەڕێزەوە نزیکی دەبوونەوە. قۆناخەکانی دواتری شارستانییەت بە واتای پێشکەوتن و تەشەنەکردنی ئەو دەزگا و بۆچوونانە دەهات کە ئاراستەیان کردبوون. کاتێك ناکۆکییەکانیان دەگەیشتە ئاستێك توانای بەرگەگرتنیان نەبوو، پەنایان دەبردە بەر خودا (ئیلاهە)ی نوێ و ئەو ئایینانەی رۆڵی سەرکێشیان بۆ دەبینین. کاتێك زیاتر تەنگەتاو ببوونایە جەسارەتێکی مەزنیان بە ئیرادەی خۆیان دەبەخشی و بەرەو جیهانی نوێی ئازادی دەکرانەوە. کاتێك پێویست بوایە بە بێ گەڕانەوە بۆ خوداوەندەکان و پشت بەستن پێیان، پەنایان دەبردە بەر ئەقڵی خۆیان و هەولیاندەدا دەرك بە زانیاری ئەو یاسایانە بکەن کە لە بنەمای هەموو شتێکدا شاراوەیە. تەنیا بەمە سنووردار نەدەمان کە پێشتر لە سروشت کۆیان دەکردەوە و دەیانخوارد یاخود دواتر فێری چاندن و دروێنە بوون، بەڵکو فێری ئەوەش بوون کە بیگۆڕن و بچمێکی دیکەی پێبدەن و دەوڵەمەند ببن. نەك تەنیا یاسای کۆمەڵگا، بەڵکو یاسای دەوڵەتیشی پێکدەهێنا و دەستووریش دەخوڵقێنرا. مرۆڤایەتی خۆی بەرامبەر بە ناکۆکی مەزنتری شۆڕشی شار دەبینییەوە کە بە ئامانجی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی کۆمەڵگای گوند پێشیخستبوو. هەر چارەسەریەك لە دەرگای ناکۆکییەکی نوێتری دەدا. ئەو سەردەمەی لەگەڵ شارستانییەتدا خێرادەبۆوە، بە پێشکەوتن ناوزەددەکرا. ئەگەر بە قەدەر ناوزەد بکرێت یاخود کاروانی ئازادی مرۆڤ بەمجۆرە بڕیاری لەسەر هەبوونی خۆی دەدا و ملی رێی دەگرت.

ئەو ناکۆکییانەی لە هەناوی شارستانییەتی کۆیلەداری پێشکەوتن، لەو جۆرە ناکۆکیانە نەبوون کە لەمیانەی مەکانیزمەکانی خودی سیستەم چارەسەر ببێت. بەر لە هەموو شتێك رەوشی رۆحی و هزری گشتی کۆمەڵگا، لە هەموو لایەکەوە لەگەڵ شێوازی ژیانی کۆیلەدارییەوە کەوتبووە ناو ناکۆکییەوە. ئەو مێشکەی وشیار ببۆوە و ئەو ئیرادەیەی بەرەو ئازادی هەنگاوی نابوو، بە دوای رێگای نوێدا دەگەڕا. بێگومان ناکۆکییە ماددییەکان بناخەی ئەم جۆرە پێشکەوتنانە پێکدێنن. پەیوەندی موڵکایەتی کە بەسەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنان لەسەرووی هەمووشیانەوە بەسەر کۆیلەکاندا سەپێنراوە، ئاکامی دەستبەتاڵی و بێکاری و پشتگوێ خستنی ئامرازەکانی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا ئاراوە. گەلێك ئامراز بەکار نەدەهێنرا، بۆ نموونە بەهۆی رەنجی هەرزانی کۆیلەکان چەرخی ئاو و ئاشی کە بە چەرخی ئاو کار دەکات، وەکو پێویست بە کارنەدەهێنرا. تەواوی ئامرازە گرنگەکانی بەرهەمهێنان لەلایەن پەیوەندییەکانی موڵکایەتی کۆیلەداری و پێکهاتە هزریەکەیەوە، بە گوێرەی توانستی بەرهەمهێنانیان بۆ ئاستێکی زۆر نزمی بەرهەم و رزین پشتگوێ خرابوون. بەهۆی شەڕ و پێکدادانەکان سوپای کۆیلەکان بەردەوام مەزن دەبوو. سیستەم و شێوازی کاری کۆیلەداری کە لە قۆناخی ئاواکردندا رێگای لەپێش بەرهەمێکی مەزن کردەوە، ئیتر بووە بە سیستەمێکی بێ بەرهەم. چەتە سەربازییەکانی لەدەستپێکدا رۆڵێکی پێشکەوتووانەیان لە هەڵوەشانەوەی پێکهاتە سیاسی و کۆمەڵایەتیە کۆنەکاندا دەبینی؛ لە قۆناخەکانی دواتردا رێگای لەپێش داڕووخان و خەرجی بەمجۆرە دەکردەوە، کە پەیداکردن و جێبەجێ کردنی زەحمەت بوو. چەتە سەربازییەکان هیچ لایەنێکی سەرنج راکێشیان نەمابوو. ئیتر بازرگانی و پیشەکارێتی شارەکان کە چینی ناوین پێیەوە خەریك بوون، هەمان جۆش و خرۆشی جارانیان نەمابوو. هەروەکو چۆن هەوڵی نوێی زانستی و فەلسەفی دەرنەکەوتن، تەنانەت شێوازی گێڕانەوە و ئەزبەرەکردنی کۆنیش لە بیرکراوە و هەنگاو بەرەو قۆناخی تاریکی، نەزانی دەهاوێشترا. ئیتر گەرەنتیە کۆمەڵایەتییەکان، داب و نەریت و یاسا، لەکار کەوتبوون. عیبادەت و ئایدیۆلۆژیا فەرمییەکان کەوتبوونە ئاستێکی هەرە پاشڤەڕۆ و بێ واتا. لە کاتێکدا لە ئەنجامی شەڕی خوێناوی، بنەماڵەکانی سەرو و ناوەند پەرتەوازە دەبوون، ناوەندی هێزە هەرێمییەکان دەردەکەون. هەرچەندە بورغوەکانی دەوڵەت توند کرابوایە، رێگای لەپێش پارچەبوونێکی زیاتر دەکردەوە.

ئەو راستییانەی لە چینەوە تاوەکو رۆما لە ساڵانی ٣٠٠ ی زایینی بە دواوە بە شێوەیەکی ئاشکرا دەردەکەوتنە روو؛ پێشکەوتنێکی بەمجۆرەی بە خۆوە دەبینی.

ئیتر تەواوی ئەو پەیوەندی و دەزگا و هێزانەی سیستەمیان خوڵقاند و مەزنیان کرد و نوێنەرایەتی دەکەن، لە ناو سیستەمدا جێگایان نابێتەوە و ناچاری پەرتەوازە بوونی دەکەن. ئیتر نە لە خاچدانی مرۆڤ و لە ئاراناکاندا پێشکەش کردنی بە شێر، نەیاندەتوانی رێگا لەو وشیاربوونەوە نوێیەی هێزی ویژدان و هزری مرۆڤ بگرن، ئیتر مرۆڤایەتی لەمیانەی ئەو ئەزموونانەی لە شارستانییەت فێرببوو، لە رێگای کاروانی ئەقڵ و ئیرادەی خۆیەوە، بە دوای سیستەمێکی نوێ دەگەڕا. ناوچەی پیرۆزی رۆژهەڵاتی ناوین، جارێکی دیکە لەمیانەی هێزی پیرۆزیەوە لە قۆناخی خوڵقاندندا بوو. ئیتر زۆر لەمێژ بوو عیسا وەکو رۆح ئەلقودس وەکو پادشایەکی مەعنەوی ئاسمان و سەرزەوی جێگای خۆی گرتبوو، کە بەرامبەر بە گڵاوترین نۆکەرەکانی کاهین و پادشاکانی بابل و رۆما، لە قودس یاخیبوو بوو و شۆڕشی مەزنی ویژدانی ئەنجامدا بوو. چەند حەوارییەکی خاوەن باوەڕ لە رێی شەڕی ویژدانی و ئەخلاقی، ئیمپراتۆرییەتی رۆمای شکۆداری لە ناوەوە رووخاندبوو. ئیتر جوڵانەوەی کۆمەڵایەتی ٣٠٠ ساڵەی پارتی مەسیحییەت لە کەناری تەسلیم گرتنی ئیمپراتۆرییەت بوو.

داب و نەریتی زەردەشتی کە بە شێوەی بروسك ئاسا لە کوێستانەکانی میدیا لە رۆژهەڵات دەرکەوتبوو، لەمیانەی هێزی ئیرادەوە خاوەن کاروان و بەڕێوەچوونێکی شێرانە بوو، ئیتر لە کەسایەتی **مانی**دا جارێکی دیکە وەکو جوڵانەوەیەك بەرەو سەرلەنوێ لە دایکبوون هەنگاوی دەهاوێشت. ئەگەر پاشڤەڕۆیەتی راهیبەکانی سەردەمی ساسانییەکان نەبوایە کە لە مێژبوو پاشڤەڕۆببوون، مانی نەکوژرابوایە، ئەگەری ئەوە هەبوو شارستانییەتێکی لە جۆری ئەوروپا لەسەر بنەمای ریشەکانی میزۆپۆتامیا باڵابگرێت. ئیمپراتۆرییەتی ساسانی کە لە زووەوە ببووە خاوەن رۆڵێکی پاشڤەڕۆیانە و ئەخمەنییەکانی کە بەرامبەر بە شەڕە یەك لە دوای یەکەکانی ئەسکەندەر رووخان، دەیانتوانی بەرامبەر بە هێزەکانی ئیسلامییەت درێژە بە هەبوونی خۆیان بدەن. تەنانەت ئەمانە بە ئەندازەی بێزەنتیەکانیش هێزی وەرچەرخان نیشان نادەن. شتێکی روون و ئاشکرایە سیستەم دەرفەت و شانسی خۆ نوێ کردنەوەی نەبوو. لە رۆژهەڵاتی دووریش چین و هیندستان دوای کێشمەکێش و تێکۆشانێکی مەزن لە ساڵانی ٣٠٠ ی زایینی لەمیانەی خانی مەزن و بنەماڵەی **چانداگوبتا**، دەربازی قۆناخی فیوداڵیزم دەبوون.

ئیتر مێژووی پیرۆزی رۆژهەڵاتی ناوین، لە قۆناخی سێیەمین (زایین) خوڵقاندنی مەزنی خۆیدا بوو. جوڵانەوەی یەکینەی (تەریقەت) پیرۆزی، کە بە شێوەیەکی بەربڵاو لە ماوەی ساڵانی ٣٠٠ پ.ز تاوەکو ٣٠٠ زایینی دەرکەوتوون، بە پارتی بوونی نهێنی و نیو رەوا (مشروع)ی ئەم قۆناخەن. لەبەر ئەوەی چینی جێگیر نەبوو، هێشتان یەکلایی نەببوونەوە، دەتوانرا لەژێر ناوی ئەم شێوازانە لێپرسینەوە دەرهەق بە رەوایەتی سیستەم بکرێت. ئیتر ئەمانە چ بە بلیمەت یاخود گروپی سۆفیگەرایی ناو ببرێن؛ ئەم لێشاوە هزریانە، لەمیانەی دابڕانیان لە ئایینی فەرمی و لێشاوەکانی فەلسەفە فەرمییەکان، لە گەوهەری خۆیاندا لێپرسینەوە دەرهەق بە سیستەم ئەنجام دەدەن. کوشتن و لە ناوبردنی سوقرات و عیسا و مانی لە ماوەیەکی کورتدا، شێوازی جوڵانەوەی نهێنی و سۆفیگەرایی دەکردە ناچارییەك. ئەو ئەزموونەی لە ژیانی رێبەرەکانیان بۆیان مابۆوە، ئەمەی دەکرد بە پێویستیەك. لە جوگرافیای پیرۆزدا، جوڵانەوەیەکی ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی شەش سەدە زیاتر بەرامبەر بە شارستانییەتی کۆیلەداری جێی باسە. ئەو بێچارەییەی لە نێو هەلومەرجی ماددی (بابەتی) هەیە، رەنگدانەوەی خۆی دەکاتە سەر جیهانی رۆح و هزر و رێگا لەپێش قۆناخی تەریقەت و رێزانە مەزنەکان دەکاتەوە. ناوزەدکردنی قۆناخی نێوان ٥٠٠ پ.ز تاوەکو ٥٠٠ زایینی بە قۆناخی کلاسیکیە مەزنەکان، لەلایەن مێژوونووسانەوە شتێکی لە خۆڕا نییە و لە نزیکەوە پابەندی کۆتاییەکانی سیستەمە. ئەخلاقی کۆنفۆشیۆسی گرێدان بە چوار یاسای مەزن، ئەخلاقی بودای رزگار بوون لە ئازارەکان، ئەخلاقی زەردەشتی مرۆڤی خاوەن ئیرادە و ئەخلاقی سوقراتی سەبارەت بە خۆت بناسە؛ دەستپێکی چەرخی کلاسیکیە مەزنەکانە. هەموویان لە ساڵانی ٥٠٠ پ.ز دا ژیاون. هەروەکو چۆن ئەو شۆڕشە ئەخلاقی و هزریانەی ئەنجامیانداوە لە گەوهەری خۆیدا دژی شارستانییەتی کۆیلەداری بووە، لەهەمانکاتدا وەڵامێکیشە بۆ داب و نەریتە تەسك و سنوورداره‌کانی پێکهاتە ئەتنیکییەکان. تەواوی ئەو هزرانەی بە ناوی ئایین و فەلسەفەوە پێشخراون، بە ئامانجی خوڵقاندنی شارستانییەتێکی نوێ ریفۆرمیان دەرهەق ئەنجامدرا و لەمیانەی جموجۆڵی مەزنی مێشك و ویژدان، رێگایان لەپێش ئەم هزر و ویژدانە مەزنەی ئەم پێنج سەدەیە کردۆتەوە.

ناکۆکییەکانی هەلومەرجە بابەتییەکان بە شێوەیەکی جودا و سەربەخۆ ڕێگا لەپێش گۆڕانکاری سیستەمی شارستانییەت ناکاتەوە. پێکهاتە هزری و ویژدانیە مەزنەکان تەنیا لە مەودای خۆیدا دەتوانێ ڕێگا لەپێش سیستەمی نوێ بکاتەوە و شێوازی هزر و ڕۆحی چەرخی نوێ بخولقێنێ. ئەو جموجۆڵە کۆمەڵایەتیانەی لەم سەدەیەدا لە خاکە پیرۆزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا بەرهەمداربوو، بە واتای قۆناخی کۆرپەلەیی سیستەمی نوێ دێت لە منداڵدانی دایکیدا.

وەکو ڕەوشێکی بەرجەستە چاوەڕوان دەکرا کە ئەو شارستانییەتەی کۆڵەکەکەی شۆڕشی شار بوو، کاتێك لەگەڵ ئەو ناکۆکیانەدا دەکەوێتە نێو ململانێ کە لە شارەکان سەرچاوە دەگرن و بێچارە دەمێنێتەوە، لە ناوچە لادێییەکاندا لە چارەسەری دەگەڕێت. کاتێك قۆناخێك دەستپێبکرد تەنانەت بەخێوکردنی کۆیلەکانیش لە شاردا ئاستەم ببوو، یان هەر لە خۆیانەوە ڕوویان لە لادێکان کرد. یاخود لەمیانەی ڕاکردنێکی بەرفراوان کە ناتوانرێ پێشی لێبگیردرێت، قۆناخ دەستی پێکردبوو. لێرەشدا ئەوەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، هەروەکو قۆناخەکانی ئاوا کردن ئەوەی ڕۆڵی دیاریکراو دەبینێ توند و تیژی نییە بەڵکو هەلومەرجەکانی بەرهەم هێنانە. ئەوەی لە ئارادایە ڕەوشی بەرهەم و بێ بەرهەمییە لەمیانەی پشت بەستن بە ڕەنجی کۆیلە. یاسای سەرەکی کۆمەڵگا ڕۆڵ دەگێڕێت: کاتێك پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لەگەڵ هێزەکانی بەرهەم هێناندا دەکەوێتە نێو ناکۆکییەکی کە چارەسەرکردنی بۆ نییە، ئەوا تێکشکاندنی ئەمانە و بەڕێوەچوونی لە بن شێوەیەکی دیکەدا دەبێتە ناچارییەك.

مێژوونووسان ئەم وەرچەرخانەیان بە گەلێك ناوی جیاواز ناوزەدکردووە. کۆتاییەکانی چاخی کلاسیك و دەستپێکردنی چەرخەکانی ناوین، یاخود بە شێوەیەکی گشتگیر دەتوانرێ بە قۆناخی دەربازبوون (گواستنەوە) لە شارستانییەتی کۆیلەداری بۆ شارستانییەتی دەرەبەگایەتی ناوببرێت. ڕاگەیاندنی ئایینی مەسیحی وەکو ئایینێکی فەرمی لە ساڵانی ٣٢٥ پ.ز، پارچەبوونی ئیمپراتۆرییەت بۆ ڕۆمای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا (٣٩٥ زایینی)، لە (٤٩٥ زایینی) گۆتەکان دەستیان بەسەر ڕۆما داگرت و خانەدانیان ئاواکرد، ئەمانە وەکو ریزبەندییەکی فەرمی مێژوو هەڵدەسەنگێنرێت. لە ناوەندەکانی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین، چین، هیندستانیش ڕەوشێکی هاوشێوەی ئەمە هاتە ئاراوە، کە لە گەوهەردا وەکو یەك بوون، بەڵام بەروار و شێوەکەیان جیاوازبوو. هەرچەندە مرۆڤایەتی زۆر ماندوو بووبێت، لە هەرێمە سەرەکییەکانی سەردەمی نئۆلیتیك، بەڵام زۆر لەم جیاوازتر و لە ئاستێکی بەرز و لەمیانەی ڕۆح و هزرێکی نوێدا و لە ڕێگای ئامرازە پێشکەوتووترەکانی بەرهەمهێنان، مێژوو هەنگاوی بە خۆ باوەڕ و لەسەرخۆ بەرەو قۆناخی دووەمین شارستانییەتی مەزن دەهاوێژێت و بەرەو پێشەوە دەچێت.

## بەشی دووەم

### سەردەمی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی

**ڕاڤەکردن** و شیکردنەوەی ئەو قۆناخەی لە مێژووی شارستانییەتدا وەکو چەرخەکانی ناوین یاخود وەکو قۆناخی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی ناودەبرێت و تێیدا بانگەوازییەکانی بەناوی خودا ـ ئەڵڵا دەنگی دەدایەوە؛ بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بە تایبەتیش سەبارەت بە کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین تاوەکو بڵێی گرنگی ژیانی خۆی پاراستووە. بە بێ ئەوەی ئەو جۆرە کۆمەڵگایە و ئەو ڕاستینەیەی شارستانییەت شینەکرێتەوە کە لەگەڵ خۆیدا بەرزی کردۆتەوە، ئەوا ناتوانرێ قۆناخی ئەمڕۆشمان تێپەڕ بکرێت کە ڕێگای لەپێش بنبەستبوونی مەزن و ئەو پێکدادانانە کردۆتەوە کە دەریای خوێن و ئێش و ئازارێکی یەکجار زۆریان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە، هەروەها لەمیانەی شێوەی بەڕێوەبەرایەتی سەرەڕۆ و کۆماری گەندەڵبوو، پاشڤەڕۆیەتییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان بەتەواوەتی بووە بە گرێکوێرە و قەیرانێکی مەزن. ئاشکرا بووە کە بناخەی پێشکەوتنەکان، گواستنەوە و تەکنۆلۆژیا و پارە نەبووە. سەرەڕای ئەوەی ئەو پارە و تەکنۆلۆژیایەی لە دەستی عەرەبەکاندایە لە هی هیچ یەکێك لە وڵاتەکانی ئەوروپا کەمتر نییە، بەڵام پەیڕەوکردنی سیستەمەکانی چەرخەکانی ناوین لە لایەنی زۆربەی ئەم وڵاتانەوە، ئەم بانگەشەیەمان دەسەلمێنێ و پشت ڕاستی دەکاتەوە. هەروەها بەردەوامبوونی هەمان ڕەوش بۆ چەندین هێزی هەرێمی ناوچەکە، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە پێویستە سەرچاوەی کێشەکە لە شوێنێکی دیکەدا ببینرێت. گواستنەوەی زانیاری و پارە و تەکنۆلۆژیا بە شێوەیەکی جودا، هەمان دەرئەنجامی سیستەمی شارستانییەتی ڕۆژئاوای لەگەڵ خۆیدا نەهێناوە. کەواتە سەرچاوەی کێشەکە، سەرچاوەی قەیران و بنبەستبوونی **ئایدیۆلۆژییە**. تاکو ئێستاکەش کاریگەری قاڵبەکانی ژیان و هزری دەرەبەگایەتی، ئەم بۆچوونە پشت ڕاست دەکات. تاوەکو پێکهاتەی سەرخانی ئایدیۆلۆژی شینەکرێتەوە، لە شوێنیدا سەرلەنوێ ئاواکردنی ئایدیۆلۆژی ئەنجام نەدرێت، کە وەڵامی قۆناخ بداتەوە، ئەوا ناتوانرێت قەیران و گرێکوێرەی کۆمەڵگا چارەسەر بکرێت و پێشکەوتن بەدیبێت و لەمیانەی سەنتێزێکی باڵا تردا قەڵەمبازێك ئەنجام بدرێت.

باڵابوونی سیستەمی شارستانییەتی سەرمایەداری ئەوروپا لە سایەی شیکردنەوەی سیستەمی دەرەبەگایەتی هاتۆتە ئاراوە، تەواو پێچەوانەی ئەو شیمانانەی دەکرا ، سەرەتا سیستەمی دەرەبەگایەتی لەلایەنی زانست و تەکنۆلۆژیاوە شینەکرایەوە. ئەو شۆڕشەی لە بواری ئایدیۆلۆژییەوە ئەنجامدرا، ڕۆڵی لەپێشینەی هەیە و تەنانەت بناخەی پێشکەوتنەکانی زانست و تەکنۆلۆژیاش پێك دێنێت. **شۆڕشی هزری ئازاد** کە بەرامبەر دۆگماتیزمی کڵێسە سەرکەوتنی بەدەستهێنا، گەوهەری هەموو پێشکەوتنەکانە. بێگومان ڕۆڵی زانیاری و تەکنۆلۆژیا و دەوڵەمەندێتی ماددی هەیە، کە لەپێشکەوتن دا بوون، بەڵام ڕۆڵی دیاریکراویان نییە. دەوڵەمەندێتی ماددی، زانیاری، تەکنۆلۆژیا لەگەلێك ناوچەدا، بۆ نموونە لە چین بە گوێرەی ئەوروپا، نەك پاشکەوتووە بەڵکو پێشکەوتووتریشە. ڕەوشێکی هاوشێوە لە وڵاتە ئیسلامیەکانیشدا لە ئارادایە. دەوڵەمەندێتی ماددی، زانیاری، تەکنۆلۆژی جیهانی ئیسلامی لە ماوەی نێوان سەدەی هەشتەم  تاوەکو سەدەی دوانزدەهەم بە گوێرەی ئەوروپا زۆر پێشکەوتووترە. پاشکەوتنی یەکەمیان و ئەنجامدانی وەرچەرخانێکی مەزن لەلایەن ئەویتریان، ئەوە دەسەلمێنن کە هۆکارەکەی ئایدیۆلۆژییە.

پرسیارێکی دیکەی گرنگ سەبارەت بە شیکردنەوەی سەردەمی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی، دەرهەق بەوەیە لە کوێ و چۆن دەستی پێکردووە؟ هەروەکو چۆن تەواوی چینە دەسەڵاتدارەکان ئەنجامیاندا، ئەوەی لە نووسینی مێژوو نووسەکانی ئەوروپا مۆرکی خۆی لە نووسینی مێژووداوە، ئەو چەواشەکارییە کە بانگەشەی بۆ دەکەن و دەڵێن لەگەڵ ڕووخانی ڕۆما ئەم قۆناخە لە ناوچەکەمان دەستی پێکردووە. ئەمە لە نزیکەوە پەیوەندی بە چەمکی ئاواکردنی باڵادەستیەوە هەیە و گەلێك هەڵەی مەزن لە خۆوە دەگرێت. هەروەکو چۆن سەردەمەکانی نئۆلیتیك و کۆیلایەتی قۆناخەکانی لە دایکبوون، پێگەیشتن و ڕووخاندنیان بە خۆیانەوە بینی، ئەوا شارستانییەتی دەرەبەگایەتیش وەکو بەرهەمێکی ڕۆژهەڵاتی ناوین سەریهەڵداوە و سیستەمێکی شارستانییەتە کە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لە هەموو سیستەمەکانی دیکە کاریگەرترە.

ئەم دەستنیشانکردنەش گرنگییەکی مەزنی هەیە بۆ دەرککردن بەو ڕاستینەیەی کە مێژوو خاوەن زنجیرەیەکی لۆژیکە و بۆ ئەوەی ئەم لۆژیکەش لە دەست نەدرێت شارستانییەتەکان لە خۆیانەوە دەرناکەون. هەڵوەشانەوەشیان سانایی نییە. هەروەکو دەبینرێ لەم بوارەدا ئاڵۆزییەك لە زانستی مێژوودا هەیە. لە هەموو شتێك زیاتر باڵادەستی سیاسی لە زانستی مێژوودا پێویستی ئەوەی بینیوە کە نووسین لە شێوەی خۆ بەناوەند دانان بێت. لەگەڵ ئەوەی زانست لە گەلێك بوار و گۆرەپاندا بە شێوەیەکی بابەتیانە پراکتیزە دەکرێ، بەڵام ئاستەمە بگوترێ لە بواری مێژووشدا بەمجۆرەیە.

ئەگەر لە نزیکەوە تەماشا بکرێ دەبینرێت کە پەیوەندییەکی نزیك لە نێوان هەر دوو سیستەمی دەرەبەگایەتی و کۆیلەداریدا هەیە. دژایەتی سەرمایەداری بەرامبەر دەرەبەگایەتی دژوارەو دابڕانەکەشی فراوانە و لەمیانی پێکدادانەوە دەبێت. بە گوێرەی سروشتەکەی بەمجۆرەیە. شێوازی دەسەڵات و باڵادەستییەکەی پارچەکردنی هەموو کۆت و بەندەکانی دەرەبەگایەتی بە شێوەیەکی دڕەندانە دەکاتە پێویستییەك. گەوهەرە شۆڕشگێڕییەکەشی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. هەرچی هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆیلەدارییە، ئەوە لە نموونەی ڕۆما دەبینرێ، لە

ئاکامی ڕێککەوتن و سازشکارییەکی بێ دەنگ لەگەڵ دەرەبەگایەتی ئەنجام دەدرێت. لە دابڕانێکی بەهێز و پێکدادان زیاتر، لەناوەوە دەوری یەکتر دەکەن و کۆیلایەتی لە خۆیەوە دەکەوێت و دەرەبەگایەتیش لەمیانەی لۆژیکێکی شۆڕشگێڕانە هەڵدەکشێ و لە شێوەی هێڵکاری بەڕێوە دەچێت. دەرباز بوون لە سیستەمی کۆیلەداری ڕۆمای ڕۆژئاوا بۆ سیستەمی دەرەبەگایەتیی و بێزەنتیەکانی ڕۆمای ڕۆژهەڵات بەمجۆرە بووە. بوویەری هیند و چینیش هاوشێوەی ئەمەن. بێگومان کارەکتەری ناکۆکییەکان ڕۆڵی دیاریکراویان لەمەدا بینیوە. جیاوازی نێوان ئاستی وابەستەیی و شێوەی پەیوەندییەکانی کۆیلەداری و ئاستی وابەستەیی شێوەی پەیوەندییەکانی دەرەبەگایەتیی پێویستی بە شیکردنەوەیەکی قووڵ و فراوان نییە. تەنانەت سنووردارنبوونی شیکردنەوەش، ڕاستینەی لێکچووی هەر دوو سیستەمەکە ڕوون دەکاتەوە کە بە شێوازی شۆڕشگێڕانە یاخود پێکدادانی کورت خایەن، دابڕانی ڕیشەیی ئەنجام دراوە. شێوازی وەرچەرخانی پەیڕەو کراو پلە بە پلەیە (**تدريجى**).

یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی مێژوو ئەوەیە کە شوێن و جێگای ئەم وەرچەرخانە سەبارەت بە شارستانییەت بە شێوەیەکی واقیعیانە ئەنجام بدات. ئەوەی بە ناتەواوی ماوەتەوە ئەوەیە کە تاوەکو ئێستاکە مێژوو نەبۆتە خاوەنی سیستەمێکی تایبەت بە پۆلێن کردنی کات و شوێن. هۆی هەرە سەرەکی ئەم ڕەوشە ئەوەیە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن شارستانییەتی ڕۆژئاوا لەمیانەی هزرێکی داگیرکاری ئۆریانتالی، تەماشای شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی دەکرد. بە تایبەتیش شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوینی وەکو هەڕەشەیەکی مەزن دەبینی. تازە بە تازە هێندێك لێکۆڵەرەوە لەمیانەی بۆچوونی جیاوازەوە هەوڵ دەدەن ئەم هەڵە و زۆرداریە بەلاوە بنێن. سەرچاوە گرتنی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین ڕۆڵێکی باش دەبینێ لەوەی گەلێك بابەت و بوار ڕوون ببێتەوە. ئەم دەرئەنجامە بەر لە هەموو شتێك ناکۆکی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا لەسەر بنەمایەکی واقیعیانەتر ڕوون دەکاتەوە. دووەمیان، ڕێگە لەپێش شیکردنەوەیەکی ڕاستی ئایدیۆلۆژیای تاکخودایی لە مێژوودا دەکاتەوە. شیکردنەوەی ئایدیۆلۆژیای ئایینی تاوەکو ئێستاش وەکو ئەرکێکی گرنگی ڕووناکبیران چاوەڕوانی پەیوەندی و پێوەخەریك بوون دەکات. سێهەمیان، ئەم شیکردنەوە خزمەتێکی مەزن سەبارەت بە پێناسەکردنێکی ڕاست بۆ کولتووری ڕۆژهەڵاتی ناوین و هەڵوێستێکی زانستیانە دەرهەق بە ڕۆڵە مێژووییەکەی پێشکەش دەکات و ئەمەش گەورەترین دەسکەوت و بەشداریە بۆ نووسینی زانستی مێژوو بە شێوەیەکی ڕاست و دروست. چوارەمیان، ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە کێشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین و لە ڕێگەی ئەویشەوە تەواوی پاشڤەڕۆکانی جیهان کە هەمان ناوەڕۆکیان هەیە و ئەو کۆمەڵگایانەی لە ناو قەیران و بنەبستبوون دا دەژین، کێشەکانیان دەستنیشان و چارەسەر بکرێت.

گەیشتنی پێکدادانی عەرەب ـ ئیسرائیل بە ئاستێکی بەمجۆرە کە لەپێکدادانی سەرمایەداری ـ سۆسیالیزم زیاتر، جیهان بە خۆیەوە خەریك بکات و تاوەکو ئێستاکەش بە شێوەیەکی هۆڤانە بەردەوام بێت، لە نزیکەوە گرێدراوی ڕیشە مێژووییەکانە. ئەم پێکدادانەش گرنگییە مەزنەکەی لێرەدایە کە بە گوێرەی واقیعی ڕۆژهەڵاتی ناوین ئاستی ناکۆکییەکانی ئەم قۆناخەمان نیشان دەدات کە چۆن ڕێگای لەپێش گرێکوێرە و بنبەست بوون کردۆتەوە.

لەم ناکۆکییەدا کێشمەکێشی مێژوو لە ئارادایە؛ ئاستی کۆمەڵایەتی، کە بە شێوەیەکی ئایین پۆلێن کراون، لە نێو پێکدادان و ململانێدان. سیستەمەکانی شارستانییەت ڕووبەڕووی یەکتری بوونەتەوە. لە ڕووکاردا وەکو شەڕێکی تیرەگەرێتی وایە، بەڵام بە هۆی ئەم تایبەتمەندێتیانەی لە خۆوەی دەگرێت و پێگەگرتنی وەکو شێوەی گشتگیری و کەڵەکە بوونی ناکۆکییەکان و شێوازە دیبلۆماسی و سەربازییەکانی بە درێژایی مێژوو بەردەوام بووە، وەکو شەڕێکی جیهانی وایە. ناچار بوونی پەیوەستدار بوونی تەواوی هێزە بە شانوشەوکەتەکانی جیهان، ئەم بۆچوونە پشت ڕاست دەکاتەوە. هێزی ڕاستینەی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین لە ژێر ئەمەدا شاراوەیە. چەندین جارە جیهان دەبێت بە یەك، نەتەوە یەکگرتووەکان چەندین بڕیاری وەرگرت. بەڵام هێندەی سەری دەرزی بەرەو چارەسەری هەنگاو نەهاوێشتن، ئەوە دەسەلمێنی و نیشان دەدات کە هەڵەی مەزن کراوە. ئەوە دەسەلمێنی، کە ئەوە دەستنیشان نەکراوە پێویستە لە کوێوە و چۆن هەڵوەستە سەبارەت بە کێشەکە بکرێت. تەنانەت شەڕی دووەمی جیهانی سەرەڕای دژواری و کاریگەریە توقێنەرەکەی ئێستا وەکو بیرەوەریەکی لێهاتووە. بەڵام پێکدادانی عەرەب ـ ئیسرائیل لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا وەکو مەشخەڵێك وایە کڵپەی سەندووە و بەردەوام دەکات. هەروەکو دەزانرێ چەندین بەرەی دیکەی پێکدادان لەمە کەمتر نین. تەنانەت ئەم مەسەلەیەش بە شێوەیەکی زۆر داکۆکی کەرانە نیشان دەدات و دەیسەلمێنێ ئەگەر دان بە ڕاستینەی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین نەنرێت، ئەوا دەتوانێ چی بکات و چی لە توانا دایە.

سەرەڕای ئەوەی ئەورووپا لە ماوەیەکی کورتدا سیستەمی دەرەبەگایەتی تێپەڕکردووە و سەردەمێکی درێژخایەنی کۆیلایەتی بناخەکەی پێك ناهێنێت. وەلێ توانیویەتی ئەم قۆناخە لەمیانەی ڕێنسانسێکی بەرفراوان تێپەڕ بکات. دەتوانرێ بانگەشەی ئەوە بکرێت ئەگەر ڕێنسانسی سەدەکانی ١٥ ـ ١٦ هەم نەبوایە ئەورووپای ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لە ئارادا نەدەبوو. بەڵام سەرەڕای ئەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوین لە میانەی کات و شوێنەوە بە شێوەیەکی درێژ خایەن و قووڵ بەم سیستەمانەدا تێپەڕی، ئایا ئەنجام نەدانی ڕێنسانسێك هۆکاری سەرەکی بنبەست بوونی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان نییە؟ پرسیار لە جێگەی خۆی دایە و پێویستی بە وەڵامێکی بەرفراوان و ڕاست هەیە.

قەڵەمبازی ئیسلامییەت دواترین شێوەی بەهێزی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوینە. دەشێ بگوترێ ئیسلامییەت شۆڕشێکی دەرەبەگایەتی شکۆدار بوو. ئیسلام دواترین قەڵەمبازی مەزنی ڕۆژهەڵاتی ناوینە. دەرەبەگایەتیی ئەورووپا لە کەسایەتی ئیسلامییەتدا باڵا بوونێکی بەسەر دەرەبەگایەتیی ڕۆژهەڵاتدا نییە. هەروەکو لە سەفەری سەلیبیەکاندا دەبینرێ ئەورووپا بەردەوام پێویستی بەوە هەیە کە هێز لە باڵا بوونی ڕۆژهەڵاتەوە وەربگرێ. کاتێك تورکە عوسمانیەکان نوێنەرایەتی ئیسلامییەتیان کرد، دەرەبەگایەتیی ئەورووپایی ناچاری پاراستن کردووە. تەنیا لەگەڵ لە دایکبوونی سەرمایەداری ئەورووپا لە ڕەوشی پاراستن ڕزگاری بووە. ئەمەش لەهەمانکاتدا ڕێگای لەپێش باڵا بوون و باڵادەستیەکی بەردەوام و قوڵی شارستانییەتی ڕۆژئاوا دەکردەوە بەرامبەر بە شارستانییەتی ڕۆژهەڵات.

ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتی ناوین کەوتە ناو پاراستن، تەنگەتاو بوون، قەیران و بێ چارەیی و ژێر دەستی ئەم باڵا بوون و زاڵ بوونەی تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە. ڕوونکردنەوەی ئەمە لەمیانەی شیکردنەوە تەسك و سنووردارەکانی لە شێوەی ئیمپریالیزم و داگیرکاری، زۆر کورت دێنێ و ناتەواوە. چونکە ئەم جۆرە شیکردنەوانە سەرچاوەی خۆی لە لقێکی چەمکەکانی مێژووی ڕۆژئاواوە دەگرێت. زیاتر سەرچاوەی خۆی لە سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە دەگرێت. لە کاتێکدا هێشتا هەڵوەشانەوەی خودی سۆسیالیزمی بونیادنراو بەتەواوی شینەکراوەتەوە، ئەوا ناشێ ئەو شیکردنەوە سنووردارانەی ئەنجامی داون لە ئاستێکی بەرز و پڕ بە واتا و لە جێی خۆی دا بێت. لەم قۆناخەدا ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتی ناوین دووچاری دۆڕان و زیانێکی هزری مەزن هاتووە، تاوەکو ئێستاکەش لە گێژ بوون ڕزگاری نەبووە. تەنانەت بە هیچ جۆرێك ڕێنسانسی بە خەیاڵدا نایێت. بەڵام هەموو شتێك گرێدراوی ئەگەری هەڵمەتێکی ڕێنسانسی ڕۆژهەڵاتی ناوینە. پەترۆڵی بێ سنوور، گواستنەوەی تەکنۆلۆژیا و ئەو ڕۆشنگەرییەی لە ئەورووپاوە هاتووە، نابێتە هێزی چارەسەری. ئەمە کێشەی زەبەلاحی زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوان، بێ کاری، بەفیڕۆدانی سەرچاوەکان، خیانەت کردن لە مێژوو، تەنانەت سەرنەکەوتن لە لاسایی کردنەوە، هەست نەکردن بە دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ، لە ڕێ دەرکەوتن و سەرەڕۆیی لە هی سۆمەرییەکان پاشڤەڕۆیانەتر، دەمارگیری ئایینی کە مەترسیدارترین کوێرایی و نەزانییە، بەهای ئەخلاقی کەوتۆتە ژێر سفرەوە، زۆر بە شێوەیەکی پاشڤەڕۆیانە هەڵوەستە کردن بەرامبەر ناکۆکییەکان کە لە کۆمەڵگا بنەماڵەیەکانیش پاشکەوتووترە، ئەمانە دیاردەی ڕوون و ئاشکرای نیشاندانی ئەم قەیرانە هزری و ڕۆحییەن.

تاوەکو ئەمانە بەلاوە نەنرێن ناشێ قودس کە بە شاری پیرۆز ناودەبرێ، لەوە ڕزگاری بێ کە نەفرەت لێکراوترین جۆری مردن و کوشتنی تێدا ڕوو نەدات. ئەگەر فراوانتر و گشتگیرتری بکەین دەتوانین بڵێین تاوەکو ئەم هزرە تێپەڕ نەکرێت، خاکە پیرۆزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین لەو نەفرینە مەزنانە ڕزگاری نابێت، خەڵکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بە هۆی ئەو تاوانە مەزنەی بەرامبەر مێژووی خۆیان کردوویانە لێبوردنیان بۆ نییە. تەنیا لەمیانەی ڕێنسانسی ڕۆژهەڵاتی ناوین بە پیرۆزێتی ڕاستەقینە دەگات و لە ڕێگای هزرێك کە هێزی خۆی لەم

ڕێنسانسە وەرگرتبێت، دەشێ سەرلەنوێ لە دایکبوونی ڕۆحی ڕوو بدات، تەنیا لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانرێ ئاوێتە بوون لەگەڵ مێژوو یەکانگیر بوون لەگەڵ سەردەم بەدی بێت و ئەمەش بە واتای هەنگاو نان بۆ قۆناخی هەڵمەتێکی مێژوویی باڵا دێت. شیکردنەوەی سیستەمەکانی شارستانییەت کە سەرچاوەکەیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوینەوە دێت، گەوهەری ئەم شۆڕشە هزرییە، بەر لە هەموو شتێکەوە پێویستە. تەنیا لە ڕێگای ئەم شۆڕشە ئایدیۆلۆژیەوە دەتوانرێ ئەو پارچەبوونە هزریە بەربڵاوەی پێکهاتەی کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بەلاوە بنرێن. چەندە بە شێوەیەکی ڕاست شارستانییەتی دەرەبەگایەتی شیبکەینەوە و لەسەر ئەو بنەمایەش سەر لەنوێ شێوە بە ژیانی ڕۆحی بدرێت و بۆ شۆڕشێکی هزری وەرچەرخێنرێ، بەو ئەندازەیە دەتوانین وەڵامی ئەو کێشانە بدەینەوە کە بووە بە گرێکوێرە و تەنگەژەیەکی ڕیشەیی.

## ١ـ ناسنامەی ئایدیۆلۆژی سەردەمی دەرەبەگایەتی

ناسنامەی ئایدیۆلۆژی کە گوزارشت لە خەیاڵ و ئاستی هزری کۆمەڵگا دەکات، بۆ تەسکترین و سنووردارترین کۆمەڵگا تاوەکو دەگاتە پێشکەوتووترینیان، دیاردەیەکی دەست لێ بەرنەدراوە. هەربۆیە ئەو پێناسانەی دەرهەق بە کۆمەڵگا کە قورسایی مۆری بواری ئابووریان پێوەیە، گەلێک کەموکوڕی مەزن لە خۆوە دەگرن. لە کۆمەڵناسی (سۆسیۆلۆژی)دا ڕۆڵی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی شینەکراوەتەوە. کاتێك بە شێوەیەکی گشتگیر و بەرفراوان چاوێك بە مێژوودا بخشێنرێ دەبینرێ لە قۆناخەکانی ئاواکردنی هەڵوەشانەوەی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا، پێکهێنانی ناسنامەی نوێی ئایدیۆلۆژی و پەرتەوازە بوونی ناسنامەی کۆن ڕۆڵێکی دیاری کراویان هەیە. ناسنامە ئایدیۆلۆژییەکان کە هەم حافیزەی ڕابردووی کۆمەڵگایە، هەم هێڵی گشتی یۆتۆپیاکانی داهاتووە، ڕۆڵی مێشکی کۆمەڵگا دەبینێ. وەك لێکچواندنێکی گشتی و قەبە، هەروەکو چۆن دەست و پێ لەنزیکەوە پاپەندی ئابووریە، ئەوە ڕۆڵ و کاری سەرەکی مێشکیش خەیاڵی هزرییە. لە کاتێکدا مێشك لە هەموو گیان لەبەرێکدا هێزی بەڕێوەبردنە، ئەوە ئۆرگانەکان هێزی کاری ژیانن. ئەگەر بە شێوەیەکی جیاوازتریش بێت، کاتێك بە کۆمەڵگا بوون وەکو بونەوەرێك شێوە دەگرێت، کێشەی مێشك دێتە ئاراوە. ناوبردنی بە بوون بە خاوەنی هەبوونێکی ئایدیۆلۆژی، پێناسەیەکی ڕاستە. کاتێك لە پێکهاتەی کۆمەڵگادا پێکهاتەی مێشك وەکو بە دەزگابوونی سەرخان هەڵسەنگێنرێت، ئەوە بە دەزگابوونی ئابووری کە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەبینن، دەتوانرێ دەستوپێ وەکو ژێرخان هەڵسەنگێنرێت. هەر لەبەر ئەمەشە سەرخانی ئایدیۆلۆژی ڕۆڵی سەرەکی و لەپێشینە دەبینێ. بێگومان ئەو هەڵسەنگاندنە سەرچاوەی خۆی لەم چەمکە فەلسەفیانەوە دەگرێت کە پەیڕەوکردنی سیستەمی سروشتی سەبارەت بە کۆمەڵگا پشت ڕاست دەکات. ئەو ئاستەی کۆمەڵناسی لە بواری شیکردنەوەدا پێی گەیشتووە، گەلێك بەڵگەی بەهێز و سەلمێنەری ڕاستی ئەم چەمکە لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

کاتێك لە ڕێگای ئەم چەمکەی پراکتیزەکردنی شێواز، شارستانییەتی کۆیلەداریمان هەڵسەنگاند کە یەکەمین و بە تواناترین شێوەی کۆمەڵگای چینایەتییە، ئەوا بایەخ و جێگایەکی تایبەتمان بە نموونەی سۆمەردا. جگە لە تایبەتمەندێتی کۆمەڵگای سۆمەر کە یەکەمین نموونەی مێژووە، ئەوە لەبەر ئەوەی چەندین بەڵگەی نووسراوی لە دوای خۆی جێ هێشتووە، پێویست دەکات وەکو سەرچاوەیەکی سەرەکی شیکردنەوە بەکار بهێنرێت. دەست لێبەرنەدانی بە گوێرەی ئارەزوو نییە، بەڵکو لەبەر ئەم هۆیەیە. بە دەزگابوونی پێکهاتەکانی سەرخان و ژێرخانەکانی چەندین کۆمەڵگای بەرەبەیانی شارستانییەت، گوزارشت لە ئاستێکی گەردوونی کاریگەرییەکەی دەکات. ئەو دەمامکە میتۆلۆژیانەی شارستانییەتی سۆمەر خوڵقاندی وەکو ناسنامەیەکی سەرەکی ئایدیۆلۆژی کۆمەڵگای چینایەتی وا بوو و بنەماکانی تەواوی شارستانییەتەکان پێك دەهێنێت. دەرکەوتنی نموونەی دیکە ئەم گەردوونیبوونە تێك نادەن. بە پێچەوانەوە، بەڵکو وەکو بەڵگەی بەهێزی ئەم مۆدێلە و سەلماندنی بەها سەرەکیەکەیەتی. هەروەکو چۆن ئەگەر کەڵەکە بوونی سەرمایە شینەکرێتەوە، ناتوانرێ ڕوون کردنەوەی زانستیانەی کۆمەڵگای سەرمایەداری بکرێت، ئەوا ئەگەر ئایدیۆلۆژیای، میتۆلۆژیای سۆمەر شینەکرێتەوە ناتوانرێ ڕوونکردنەوەی زانستیانەی دەزگاکانی سەرخان بکرێت، لەسەرووی هەمووشیانەوە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی تەواوی شارستانییەتەکان ناچارییەکەی لێرەدایە. ئەگەر ڕەسەنەکە شینەکرێتەوە، لەمیانەی شیکردنەوەی زۆڵەکە (کۆپیە ـ لاسایی) بە هیچ ڕاستییەك ناگەن. لەمیانەی بە دەستەوە گرتنی نموونە ڕەسەنەکە، دەشێ زۆڵێتی، لە ڕێ لادان یاخود بەرهەمە گۆڕاوەکانی پێناسە بکرێت. بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە ملی ڕێ بگرێت ئاستەمە نموونەی ڕەسەن بدۆزرێتەوە و ڕێگای بەمجۆرە پڕێتی لە تەڵەزگە و بەرەو چەوتی ئاراستەت دەکات. ئەو نموونانەی کە ساختەن و گۆڕانیان بەسەردا هاتووە لەمیانەی باس کردنێکی بێ سنوور، جێگای خۆی لە نێو جیهانی فەلسەفە و ئەدەبیاتدا دەگرێت، بەڵام نموونە ڕاستەقینەکان هەروەکو بڵێی نین و لە بیر کراون، یاخود پێویستی ئەنجامدانی شیکردنەوەیان دەرهەق نابینن. سەبارەت بە مێژووی ئایینەکان ئەم ڕەوشە زۆر مەترسیدارترە. سەرباری ئەوەی تەواوی ئایینە مەزنەکان سەرچاوەی خۆیان لە میتۆلۆژیای سۆمەریەکان وەرگرتووە، بەڵام لەڕێی ئەو نکۆڵیکردن و سوکایەتی پێکردنەی ئەنجامیانداوە، کەوتونەتە نێو گەورەترین لادانی ئایدیۆلۆژی.

ئەم چەواشەکاریە مێژووییانە لە ژێر ناوی پیرۆزی و فەرموودەی خودایی، وەکو کاڵای ئایدیۆلۆژی خراوەتە بازاڕ، بەمجۆرەش دەسکەوتێکی مەزن و ناهەقانە بەدەست هێنراوە. لەم بوارەدا دەتوانرێ باس لە گەورەترین چەوسانەوەی ئایدیۆلۆژی لە مێژوودا بکرێت. هەڵبەتە ئەوەش سەلمێنراوە کە سۆمەریەکان بەشەکانی ئایدیۆلۆژیایان لەمیانەی هەمان شێوازی بردن، لە ئایدیۆلۆژیای نئۆلیتیکەوە وەرگرتووە کە لە تەنیشتیان بوو. لێرەدا گرنگ ئەوەیە شەڕ و ململانێی نێوان ئایدیۆلۆژیاکان بە شێوەیەکی ڕاست و واقیعیەوە هەڵبسەنگێنرێت. هیچ سیستەمێك نییە ئاڵوگۆڕ و دانوستاندنیان لەگەڵ یەکتردا نەبێت. بەڵام ئەوەی دەکەوێتە ئەستۆی مێژوونووسان ئەوەیە وەڵامێکی ڕاست و واقیعی پرسیارەکانی لەجۆری **"کێ، لە کێوە، چی، چۆن، بە کامە ئامانج وەریگرت، چۆن بەکاری هێنا؟"** بداتەوە. ئاستەمە بڵێین بە گوێرەی پێویست ئەمە لە نووسینی مێژووی گشتی دا ئەنجامدراوە و مێژووی ئایدیۆلۆژی بە گوزارشتێکی زانستیانە گەیشتووە. لەم چوارچێوەیەدا دیاریکردنی سەرەکیترین ئەرکی مێژووناسی گرنگ و بایەخدارە.

هەروەکو لەمیانەی ئەم هەڵسەنگاندنە کورتەشدا دەردەکەوێت، بۆئەوەی لە دایکبوونی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی پێناسە بکەین پێویست دەکات سەرەتا چوارچێوە ئایدیۆلۆژیەکەی بگرینە دەست و ئەوەش لە جێگای خۆیدایە. لە بابەتێکی ئاڵۆزی بەمجۆرەدا هەنگاوێکی گونجاوی بەمجۆرە ئاسانکارییەکی مەزن بۆ ڕاستەڕێ گرتن و پراکتیزە کردن دەخوڵقێنێ.

بەرز بوونەوەی ناوی ئەڵڵا، موسا، عیسا، مەحەمەد لە چەرخەکانی ناوین و چڕاندنیان بە گوێی خەڵکی دا، شیکردنەوەی گەوهەری ناسنامەی ئایدیۆلۆژی ئەم زاراوانە دەکاتە مەرجێك. خودا چییە؟ مانای پێغەمبەری نێردراو چییە کە مەحەمەد، عیسا، موسا بە گەورەترینیان دادەنرێت؟ بە گوێرەی لۆژیکی کۆمەڵگا چی واتایەك دەبەخشن؟ باسکردنی مێژوو بە بێ ئەوەی واتای ئەم چەند ناو و زاراوە ڕوون بکرێتەوە، شێوازێکە تاوەکو ئێستا پراکتیزە کراوە. بەڵام ئەو تاوانانەی تاوەکو ئێستا لە ژێر ناوی ئایینەوە ئەنجام دەدرێت، لە ڕاستیدا یان بە تەواوەتی شینەکراوەتەوە، یاخود ئەگەر شیکرابێتەوەش، وەلێ پێداویستیەکانی لە بواری کرداریدا جێبەجێ نەکراوە. ئەگەر ئەمە ئەنجام نەدرێت، ئەوا دەرهەق بە مەسەلەی علمانییەتیش کە ئێستا لە زۆربەی وڵاتەکاندا بووە بە کێشەیەکی مەزن، هەنگاو بەرەو پێشەوە ناهاوێژرێت. چەندین بوویەری مەترسیدار لە ئارادان ئەم دەستنیشان کردنە پشت ڕاست دەکەنەوە. لەبەر ئەم هۆیەیە باس لە ڕێنسانسێکی مەزنی ڕۆژهەڵاتی ناوین دەکەین.

هەروەکو دەزانرێ ئایدیۆلۆژی کۆمەڵایەتی یەکەمین نموونەی شێوەگرتنی کۆمەڵگاکان لە شێوەی ڕۆحانییەت، تەوتەمییەت دان و واتای پیرۆزی دەبەخشن، دەرك پێکردنیان زەحمەتە، تەنیا پشت بە هێزی هەست پێکردن دەبەستن. کاتێك دەبێتە دیاردەیەك ئەوا ئەو هێز و وزەیەی دەرکەوتووە هەوڵدەدات واتا بەخش بێت، بەڵام ڕەوشی سەرەتایی هزر، هەوڵدەدات لەمیانەی خەیاڵی وەکو ڕۆحگەرایی و تەوتەمگەرایی ناسنامەی پێبدات و ڕوونی بکاتەوە. ئەو دیاردەیەی خوڵقێنراوە زۆر گرنگە، چونکە ئەو هەلومەرجەیە کە ژیان بە

شێوەیەکی رەها پێیەوە گرێدراوە. ئەمە هەستی پێدەکرێت، بەڵام بۆ ئەوەی بە روون کردنەوەیەکی زانستیانە بگات، پێویستی بە پراکتیکێکی هەزار ساڵانە هەیە. سانایيترین رێگای مەزەندە و خەیاڵی قۆناخی منداڵێتی شارستانییەت، وەکو منداڵ مەزەندە کردن و هەستکردن بەوەیە کە هەموو شتێك وەکو ئەو زیندووە و خاوەنی داخوازی و سۆزە. لە راستیدا یەکەمین بە کۆمەڵگابوون خاوەنی پێکهاتەیەکی هزری و رۆحی منداڵانەیە. ئەگەر سایکۆلۆژی منداڵ و یەکەمین کۆمەڵگا بەراورد بکرێت گەلێك لێکچوونی سەیر و سەرنج راکێش دەدۆزرێتەوە. جینۆلۆجیا (زانستی جینناسی) سەبارەت بە گەلێك بابەتی بواری سۆسیۆلۆژی توانیویەتی رۆڵێکی رێگا خۆشکەرانە ببینێ. بەکورتی خوڵقاندنی رۆحگەرایی و تەوتەمگەرایی "**واتای پیرۆزی**" لەلایەن قۆناخی منداڵێتی ئایدیۆلۆژی ڤلان (کۆمەڵەی تیرە سەرەتاییەکان)، شتێکە دەرکی پێدەکرێت. دیاردەی کۆمەڵگا وەکو بوونەوەرێکی رۆحانی و پیرۆزکراو گوزارشتی لێدەکرێت و بەناسنامەی خۆی دەگات.

**تەوتەم** رەمزی ناسنامەی ڤلان. ناسنامەی تەوتەم بەواتای رەمزی مەعنەوی و هەستی هزری ئەو کۆمەڵگایە دێت کە هێزی خۆی ناسیوە و هەستی بەبوونی خۆی کردووە. وەکو چوارچێوەی ئەو پەرستگا و خودایە وایە کە دواتر پێشدەکەوێت. لەمیانەی تەوتەمەوە بنەماڵە بەهێز دەبێت و هەست بەخۆی دەکات. داننان بەخۆیەتی. هەروەکو چۆن هیچ بوونەوەرێك بێ ناو نابێت، ئەوا ڤلانیش بەمجۆرە بێ ناو نابێت. ناو لێنان زاراوەیەکە زۆر لە رووخسار ئاڵۆزترە. لەگەڵ هەموو شتێکدا کۆکە کە پێکهاتەی کۆمەڵگا لە خۆیەوە دەگرێت. لەراستیدا تەوتەم وەکو رەمز و نازناوی هێنانە زمانی دیاردەی کۆمەڵگایە. بت پەرستییەکی سادەی تیرە نییە. پابەندی و رێزگرتنی تەوتەم واتای پابەندبوون و رێزگرتنی ئەندامەکانی ڤلانە بۆ خۆیان. لە کاتێکدا بەمجۆرە ئایینی سەرەتایی دەبێتە گوزارشتی سەرەکی ئایدیۆلۆژی کۆمەڵەکە، کاتێك ئەو شتەی کە کردوویەتی بە سەمبۆڵ، دەبێتە خاوەن پیرۆزی و تابۆ، ئەوا ئەمە بە واتای شکۆمەندی و بەهێز بوونی ئەو کۆمەڵگایە دێت کە جێگای خۆی تێدا دەگرێت. ئەو ئایدیۆلۆژیایەی ناسنامەکەی تەوتەمە، دەبێتە هێزی لەسەر پێ گرتنی ئەو کۆمەڵەیەی نوێنەرایەتی دەکات. بێگومان لە کاتێکدا ئەزموونی ژیانی ڤلان (کۆمەڵەی تیرە سەرەتاییەکان) کە لەژێر هەلومەرجێکی زۆر دژوار بەرێوەی دەبات، وەکو بەهای ناوخۆ واتادار دەبن، ئەوا داخوازی پیرۆزی تابۆ، شتێکی زانراوە. ئازارەکانی رابردوو، بەختەوەری، زەحمەتییەکان، رەنج لە هەبوونی تەوتەومدا شاراوەیە. ئەوەی کراوە بە سەمبۆڵ، تەواوی رابردووی کۆمەڵگا و ئومێدی ئایندەیە. بەگوێرەی ئەم پێناسەیە دەرکەوتنی ئایین، وەکو یەکەمین شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی، دەبێتە یەکەمین نموونەی شێوە گرتنی رۆحی و هزری و خەیاڵێکی مەعنەوی ڤلان و تیرە. ئایین یەکەمین شێوەی رەنگدانەوەی هەبوونی ماددی کۆمەڵگایە لە بواری مەعنەویدا. درێژ خایاندنی وشوێنگەی لەپێشینەی لە مێژووی کۆمەڵگاکاندا بۆ ئەم تایبەتمەندێتیەی دەگەرێتەوە.

زاراوەی ئایینی خاوەن خودا، هەنگاوێکی لەپێشتری چەمکی ئایینی تەوتەمە، شێوەیەکی پێشکەوتووترە. پێهەڵگرتن بەرەو زاراوەی خودا، واتای ناسینی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی پێشکەوتووترە. ئەو کۆمەڵگایەی گەورە بووە، هێزەکەی زیاد بووە، تواناکاری بە دەست هێناوە، بە باوەڕی و متمانەوە خۆی بەرێوە دەبات، گوزارشت و زاراوە سەمبۆڵییەکەی بە شێوەی "خودا" ناو دەبرێت و ناسنامەی پێدەدرێت. گوزارشتی گشتی ئەو شتەی کە کۆمەڵگا لەمیانەی بەرێوەبردنی خۆی لە سروشت و ئەزموونەکانی خۆی هەڵیدەهێنجێ، وەکو خودا پێشکەش دەکرێ و وەکو زاراوە ناوزەد دەکرێت. ئەو هەبوونەیە کە هێزی تەواوی سروشت و کۆمەڵگای لێبارکراوە. بە واتایەکی دیکە، دروست کراوە، تەسەورێکە، زاراوەیەکە. ئەگەر دوورتر بڕۆین، بە واتای ناولێنانی یەکەمین هەستەکانی کۆمەڵگایە سەبارەت بە تەواوی یاسا و نهێنیەکانی سروشت. دواتر کاتێك فەلسەفە لەمیانەی هەنگاوێکی لەپێشتر هەوڵدەدات سروشت روون بکاتەوە، لە راستیدا لە هزری ئایینی دادەبڕێت و ئەمە ئەنجامدەدات. بەڵام پەیوەندی نێوانیان گرنگە. زاراوەکانی خوداش روونکردنەوەی سروشت و کۆمەڵگایە. فەلسەفە تەنیا سروشت و کۆمەڵگا بە بناخە دەگرێت و خودا لە دەرەوە دەهێڵێت، راستتر ئەوەیە موحافەزەکاری و بێ بەرهەمی هزری ئایینی (خودایی) دەبینێ، بەمجۆرە دەگات بە ئاستی چەمکێکی کۆمەڵگا کە قۆناخی منداڵێتی دەرباز کردووە و گەیشتۆتە شێوەیەکی نوێی بیرکردنەوە. هزری ئایینی کە پشت بە خوداوەند دەبەستێت لە نزیکەوە گرێدراوی قۆناخی منداڵێتی کۆمەڵگایە. لەگەڵ پێشکەوتن و گۆڕانکاری کۆمەڵگا، هەبوونی گشتی سروشت کە بە خودا ناونراوە، دەبێتە خاوەنی واتای نوێتر. لەگەڵ هێزی گشتی کۆمەڵگا، بەهێزترین لایەن و بواری کۆمەڵگا دەکرێت بە خوداوەند و واتادار دەکرێت. خودا مەزن دەبێت. چونکە گوزارە و دەربڕینی گشتی کۆمەڵگا، کۆی تەواوی هێزەکانی تەنیا بە پێناسە کردنێکی نوێ ناوەستێ، هێزی کۆمەڵگا کە جیادەبێتەوە و شکۆمەند دەبێت، دەبێتە خاوەنی ناسنامەیەکی نوێ.

ئیتر ئەو رەنگدانەوەی تەواوی هێزەکانی سروشت و کۆمەڵگایە. دیاردەی وەکو خاك، دانەوێڵە، ئاژەل، دار، ئاو، با، هەور و ئاو و هەوا کە لە کۆمەڵگای نئۆلیتیکدا بایەخدار دەبن و پەیوەندییەکی ژیانی لەگەڵ بەرهەمهێنان و ژیان هەیە، لە چنینی ئایینی سەردەمی نئۆلیتیکدا رۆڵی سەرەکی دەبینن. تەواوی ئەم دیاردانە ناوی خوداوەندیان لێدەنرێت، دەکرێن بە خواوەند. چونکە ئەمانە دیاردەی وەهان کە ژیانی کۆمەڵگا دیار دەکەن. ئیتر خواوەندەکان بە شێوەیەکی بەرجەستە دەبنە گوزارشتی سەمبۆلی ئەو ماددانەی پێویستی و داواکارییەکان جێبەجێ دەکات. لەمیانەی ئەم شێوە هزرەدا هەروەکو بڵێی یەکەمین زانست ئاوا دەکرێت. راستتر، زانستی خوداناسی لە دایك دەبێت. لەبەر ئەوەی لەسەردەمی تەوتەمەدا گێڕانەوە زۆر سنووردار بوو، ئایدیۆلۆژیا لە عیبادەتێکی سادە بەولاوە تێپەڕ نابێت. میتۆلۆژیا پێشنەکەوتووە. زانستی خوداکانیش دواتر دەردەکەوێت.چەمکی ئایینی خوداوەندەکانی دۆستی مرۆڤی سەردەمی نئۆلیتیك، گەوهەری سەرەکی کۆمەڵگای ئەو سەردەمە نیشاندەدات. کارەکتەری کۆمەڵگای ئارام و تەبا، بە بەراوردکردن لەگەڵ ماڤ دێرینی بەربەرییەت توانستە بەهەشتییەکانی سوود وەرگرتن لە سروشت، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە خواوەندەکان لە ناسنامەیەك بکرێن بە سەمبۆڵ کە بەخشندەیە و دۆستە و بەمجۆرەش واتادار بێت. لەگەڵ مرۆڤەکان تێکەڵ بە یەکترن. چونکە کۆمەڵگا لەگەڵ ئەو دیاردانەدا بەناویەکداچووە کەخواوەندەکان نوێنەرایەتی دەکەن. لەوەش گرنگتر ئەوەیە چونکە هێزی دەست پێکردنی شۆرشی کشتوکاڵی نئۆلیتیك ژنە و هێزیش لەتواناکاری زاوزێ وەردەگرێت، بۆیە تەواوی خواوەندەکان لە رووخساری ژندان. لەیەکەمین قۆناخی سۆمەرییەکان، میسریەکان و هیندیەکانیش ناوی خواوەندی لەژنان دەنرا. لایەنی پیاوێتی خواوەندی زۆر دوای ئەوە دەردەکەوێت. تەواوی ئەو پەیکەرانەی لەسەردەمی نئۆلیتیکەوە ماونەتەوە لە شێوەی ژن دروستکراون . پەیکەری پیاوان هێندە کەمە دەتوانرێ بگوترێ نییە. خودا و مرۆڤ بەیەکەوەن. خوداوەندێکی لە مرۆڤ دابڕاو، واتە هێشتا چەمکی ئایین پێشنەکەوتووە. تەواوی خواوەندە ژنە مەزن و ناسراوەکانی وەکو **عەشتار، ئینانا، ئیسیس، دەمەترە، کیبەلە، ئیندرا** پاشماوەی ئەم قۆناخەن. شێوەگرتنی ئایینی قۆناخ و چەرخ، دەبێتە گوزارشتی ئایدیۆلۆژی تیرە و یەکینە پێشکەوتووترەکانی کۆمەڵگا. بە گوێرەی ژمارەی ئەو دیاردە سەرەکیانەی رۆڵ لە ژیانی تیرەدا دەبینن خواوەند پێکدێن. تا چ رادەیەك هەست بە هێزە سەرەکییەکان بکرێت، چەندە زیان و سوودەکانیان مەزەندە بکرێت، ئەوەندە زاراوە هەیە، بە هێندە خواوەند گەیشتوون. شێوەی هزر و سیستەمی زاراوەکان هەمووی لە میانەی خواوەندەکان گوزارشتی لێدەکرێت و بەرێوە دەبرێت. بێگومان ئەمانەش بە گوێرەی پلە و پایەی خواوەندەکان ریزبەند دەکرێن.

نابێ لەوە سەرمان سووڕبمێنێ کە هێزی سیحراوی ئەم زاراوانە بکرێن بە خواوەند. ئەم سەردەمانە سەردەمی یەکەمین لە دایکبوون و خوڵقاندنە. هەر زاراوە و تواناکارییەکی نوێ، بەواتای خودایەکی نوێ دێت. رۆڵی سەرەکی دایك لەبەرهەمهێنان و تایبەتمەندێتی زاوزێ، بایەخێکی نائاسایی پەیدا دەکات و رێگا لەپێش قۆناخی خوداوەندە ژنەکان دەکاتەوە. چونکە چەندین دۆزینەوە و داهێنان لەلایەن ژنەوە ئەنجامدراوە. شیمانەی ئەوە لەپێشە دانەوێڵەی بە سوود، دارەکانی میوە،ماڵیکردنی ئاژەڵ، بەکارهێنانی زەوی، ئاواکردنی ماڵ "خانوو"، منداڵ بە خێوکردن، کێڵان ، ئاشی دەست و یەکەمین گالیسکە لە دۆزینەوە و داهێنانی ژنە. چەرخی خواوەندەکانی دایك دوای ئەم پێشکەوتنە مەزنانە دەبێتە سەمبۆلی رۆڵی ژن.

لە بەشی پێشتردا ئاماژەمان بەوە کردبوو کە بۆ یەکەمین جار ئەم شۆرشە کشتوکاڵیەی ژنان لە کەوانەی زاگرۆس ئەنجامدراوە. هەروەها باسی ئەوەشمان کرد سۆمەریەکان ئەم کولتوورەیان بۆ لای خۆیان گواستەوەو بوونە یەکەمین نموونەی کۆمەڵگای چینایەتی. رۆڵی دیاریکراوی راهیبەکان لە ئایدیۆلۆژی سۆمەریەکاندا بەرچاو و سەرنج راکێشە. واتە رۆڵی

پێشەنگانەی ئایدیۆلۆژیا لە خوڵقاندندا، ئاشکرا و شکۆدارانەیە. راهیبێتی ناوەندی پێکهاتنی کۆمەڵگای چینایەتییە. رێبەرایەتی ئایدیۆلۆژییە. پەرستگا یەکەمین بڕیارگای کۆمەڵگای چینایەتی و ناوەندی بەڕێوەبردنە. ئەو شێوە ئایدیۆلۆژی و باوەڕیانەی لەوێ پێکدەهێنرێن، وەکو ناسنامەیەکی نوێی کۆمەڵگا هەڵدەکشێ. ئایدیالیزەکردنی کۆمەڵگای چینایەتی و ناوزەدکردنی، هەنگاوێکی دیکە بەرەو پێشەوە چووە و بەرەو ئاسمان شکۆمەند کراوە، وەکو سیستەمی ئاسمانی لێکراوە و لاسایی کراوەتەوە. لەکاتێکدا راهیب کۆمەڵگای نوێی چینایەتی دەخوڵقێنێ، زۆر باش دەرك بە واتای ئەو بەرهەمە مەزنە دەکات کە هاتۆتە ئاراوە، زۆر باشیش هەست بەو ئەرکەی خۆی دەکات کە دەبێ ئەم سیستەمە بکات بە نموونەیی کە بەرهەمێکی بەمجۆرەی خوڵقاندووە و پێویستی ئەوە جێبەجێ دەکات و بەخواوەندەکانی خۆیەوە گرێدەدات. پێویست دەکات ناسنامە نوێیە خوداییەکان بەتەواوی پیرۆزیەکانیانەوە ناویان لێبنرێت و لە شوێنگە مەزن و پیرۆزەکانی خۆیاندا جێگیر بکرێن. زیگوراتەکان (زەقورەکان) پێکدەهێنرێن و هەروەکو چۆن نهۆمی ژوور بۆ خوداوەندەکان تەرخان دەکرێ، نهۆمی ژێریش بۆ سەردانی کۆیلەکان دەکرێتەوە.

لە نموونەی سۆمەریەکاندا پرسیاری لە جۆری سەرەتا ئابووری یاخود ئایدیۆلۆژی، پێویستی بە لێپرسینەوەیەکی گرنگ هەیە. بەڵام تەواوی دیاردە و دەرئەنجامەکان ئەوە نیشاندەدەن بڕیارگای راهیب ناوەندی بەرهەمی ماددی و داهێنانی مەعنەوییە.لەسەر ئەم بنەمایە شارستانییەت و دەوڵەت و شار ئاواکراوە. نموونەیەکی بەمجۆرە نابینرێ کە بەبێ هەبوونی ناوەندی پەرستگای راهیبەکان، بەرهەم بە شێوەیەکی سەربەخۆ ئەنجام درابێت. ئەمە دەسەلمێنرێ: هێزی ناسنامەی ئایدیۆلۆژی کۆمەڵگا و بەخودایی بوونی، بەواتای ئەو دەزگایانە دێت کە هەرگیز بەرهەمی ئایینی دەستیان لێبەرنادات. بە لانی کەم مسۆگەرە لە قۆناخی لە دایکبووندا بەمجۆرەیە. دواتر کاتێك شێوەکانی یەکەمینی بێ واتا دەبن، مانای ئەوە نییە کۆتایی بە رۆڵەکانیان هاتووە. تەنیا بەواتای ئەوە دێت جێگای خۆی بۆ شێوەی نوێ بەجێهێشت. خواوەندە سۆمەریەکان کە کارەکتەری سەرەکی میتۆلۆژیاکانن، لەبەر ئەوەی بەواتای بەردەوامکردنی ئەوانەی نئۆلیتیك دێن، هێشتا نزیکی مرۆڤن و لە شێوەی مرۆڤ دان. وەکو مرۆڤ دەخۆن و دەخۆنەوە، ژن دێنن (مێرد دەکەن) .شێوەی ژن و پیاو لەسەرەتادا وەك یەك هاوسەنگن، بەڵام پێشبڕکێ و ململانێی نێوانیان تا دەچێ دژوارتر دەبێت.

وەکو رەنگدانەوەیەکی جیابوونەوەی چینایەتی کۆمەڵگا، دەرکردنی ئادەم و حەوا لە بەهەشت و مەحکوم کردنیان بە خزمەتکاری، رێکی ئەم قۆناخە هاتووە. جیاوازییەکی مەزن لەنێوان مرۆڤەکان دروست دەبێ؛ لەکاتێکدا خوداوەندەکانی سۆمەردەبن بە خولقێنەر، سەرلەنوێ بەندەکانی خۆیان وەکو خزمەتکار دەخولقێنن. کێشمەکێش و خوڵقاندنی ئەنکی و نین هورساك ـ ئینانا لە میتۆلۆژییەکاندا لە کاتێکدا گوزارشت لە بەجێهێشتنی رۆڵی خولقێنەرانەی رابردووی ژن بۆ پلەی دووەم دەکات و لەبەر چاوانی دەخات، لەلایەکی دیکەوە سەمبۆڵی شێوەی مرۆڤی کۆیلە و خزمەتکارە. ئەو تابلۆیەی راهیبە سۆمەریەکان کێشاویانە لە تەواوی دووالیزمی خودا ـ بەندە سیستەمەکانی دواتردا رۆڵ دەبینێ. لەگەڵ ئەوەی دەستنیشان کردنی ئەم بابەتە زۆر گرنگە، ئەوا دوورکەوتنەوەی پەرتووکە ئایینەکان و تەنانەت رەتکردنەوەیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دەبێ لەپێناو بەرژەوەندییەکانیان رووی راستەقینەیان شاراوە و دەمامك کراو بێت. ئەو ناسنامە خوداییانەی لە کۆمەڵگای سۆمەریەکاندا تەسەور کراوە، وەکو رەنگدانەوەیەکی جێگیر بوون و پێگەگرتنی هێزەکانی سروشت و کۆمەڵگایە. لەگەڵ بواری خۆڕسکیدا، لایەنەکانی کۆمەڵگا دەردەکەوێتە پێش، پێبەپێ قورسایی و پایەی ژن کەم دەبێتەوە، پێشکەوتنی سەرنج راکێش لە جیابوونەوەی مرۆڤی بەندە و خزمەتکار دەبینرێت. لە کاتێکدا زیاد بوونی هێزی سیاسیانەی کۆمەڵگا دەبێتە هۆکاری ئەوەی بە شێکی خواوەندەکان بەرز بنەوە و دەرکەونە پێش، هەندێ ناسنامەش وون دەبن و لە شێوەدا دووچاری گۆرانکارییەکی مەزن دێن. لە قۆناخی بابلدا هێزی رەهای مۆنارشییەت لە بەرزبوونەوەی خواوەند مەردۆك رەنگ دەداتەوە. قۆناخی دواتری میتۆلۆژیای سۆمەر ئەوە نیشان دەدات کە ئیتر گەیشتونەتە بەر دەروازەی لە دایکبوونی ئایینە تاکخوداییەکان.

کاتێك تیرە بەرەچەڵەك سامیەکانی بیابانەکان، کە بەهێز بوون، نە ژیانی باوکسالاری و (مۆنۆلۆك) چۆنیەکەکەی خۆیان لەگەڵ شارستانییەتی سۆمەردەکەن بە یەك، خوداوەندەکانی میتۆلۆژیا لە نێو شەڕدان. لە کاتێکدا کاریگەری ژن و شارستانییەتی سۆمەرنامێنێ و دەسڕدرێتەوە و داب و نەریتی باوکسالاری تیرەکانی بیابان دەبێت بە هێزێکی سیاسی، ئیدی ئاراستەی خۆی بەرەو سەرەڕۆیی و مۆنارشێتی دەگرێت. داب و نەریتی تیرەکانی بیابان لە کەسایەتی حامورابیدا بە شێوەی **"من یاسام"** بناخەی چەمکی پادشایەتی پێکدێنێت. لەهەمانکاتدا قووڵبوونەوە و چڕبوونەوەی ناکۆکی نێوان تیرەکان و ناو خودی تیرە، بە شێوەی داب و نەریتی پێغەمبەر ئیبراهیم بەرامبەر بە هێزی ناوەندی سیاسی کە خۆی وەکو خودا دەبینێ، هێزێکی رکابەر دێنێتە ئاراوە. پێغەمبەرایەتی رێگا لەپێش دابڕانێکی ریشەیی لە چەمکی ئایینی سۆمەریەکان دەکاتەوە. بەرامبەر بە قۆناخی خوداوەندەکانی کە لە شێوە و رووخساری مرۆڤدان، چەمکێکی مرۆڤایەتی لەجۆری **"هیچ کاتێك مرۆڤ نابێت بە خوداوەند"** جێگای دەگرێتەوە.

ناوەڕۆکی ئەم چەمکە پێویستی بە شیکردنەوەیەکی بە بایەخ هەیە. بە خوداوەند نەبوونی مرۆڤ، بە واتای یاخیبوون و هەڵوێست نیشاندان دێت بەرامبەر باوەڕی پادشای ـ خوداوەند. لە لایەکی دیکەشەوە لەمیانەی رزگارکردنی خودا لە شێوە و رووخساری مرۆڤ، لە بەڕێوەبەرایەتی تیرەدا بە شێوەی بریفکاری ـ نێردراو بەرەو بەڕێوەبەرایەتییەکی نەرمتر، هەنگاو دەهاوێژێ. ناسنامە خوداییەکانی لە کۆمەڵگای نئۆلیتیکدا لەگەڵ مرۆڤ دا دەژیان و دۆست بوون و لە رووخساری مرۆڤدا بوون، لە شارستانییەتی کۆیلەداریدا لە ئەنجامی جیابوونەوەی لە جۆری خوداوەند ـ خزمەتکار هاتە ئاراوە و دەبێت بە خوداوەندێکی خاوەن تایبەتمەندی حاکمە، قەهار، سزادەر، خاوەن وەرچەرخانێکی مەزنی ناو و زاراوەکان دێتە ئاراوە. ئیتر هێزی سیاسی کردۆتە ناوەندی کۆمەڵگای چینایەتی، لەسەر ئەم بنەمایەش میتۆلۆژیا شرۆڤە و ناوەڕۆکێکی نوێ لە خۆوە دەگرێت.

لە ئەنجامی بەرخودان و جیابوونەوەی تیرەکان، شێوەی ئایدیۆلۆژی نوێ هاتنە ئاراوە، ئەمەش هەنگاوێکی بەرەو پێشتر هاوێشت و لە پادشای ـ خوداوەند جیاوازتر ناسنامەی خوداوەندێك دەرکەوتە پێش کە میهرەبانی بەسەر بەندەکانی خۆیدا دەبارێنێ و بە تایبەتیش لایەنگری چەوساوە و ستەم لێکراوەکان بوو و وەکو پارێزەری مافەکانیان وا بوو. بە شێوەیەکی سەرەکی داب و نەریتی پێغەمبەر ئیبراهیم یش بەمجۆرەیە. مرۆڤ نابێت بە خوداوەند، بەڵکو تەنیا دەتوانێ ببێ بە وەکیل و نێردراوی خودا. خوداوەندەکان تەنیا نەفرەت نابارێنن و سزا نادەن. دەتوانن فریادڕەسی و میهربانیش بکەن. بەڵام تەنیا کاتێك سزادان دەبێت کە تاوانێکی مەزن بکرێت. بەڵام لەمیانەی پەرستن و عیبادەتەوە دەشێ ببەخشرێ و لێی ببوردرێ. ئەم چەمکە گەوهەری ئایینە تاکخوداییەکانە، لە ئاستێکی زۆر بەرزدا گوزارشت لە جیابوونەوەی هێزی سروشت و کۆمەڵگا دەکات. لە گەوهەری خۆیدا قەڵەمبازێکە دژی چەمکی ئایینی کۆیلەداری کە ناوەندەکەی باوەڕی پادشا ـ خوداوەندییە. شێوە و دەمامکی ئایدیۆلۆژی تێکۆشانی کۆمەڵگا و چینایەتی قۆناخە. هەرچەندە ئەم چەمکە لەمیانەی میتۆلۆژیا و ئایینی کۆیلەداری سۆمەرەوە سەرچاوەی گرتبێت، وەلێ هەنگاو بە هەنگاو لایەنێکی رکابەری دەردەکەوێتە پێش. رکابەرێتیەکەی بەرامبەر شارستانییەتی کۆیلەداری ریشەییە. هەڵکشانی ئایینە تاکخوداییەکانە کە لە شێوەی مرۆڤدا نین، هەربۆیە بەرامبەر بە کۆیلەداری رۆڵی پێشەنگایەتی ئایدیۆلۆژی دەبینێ.

زاراوەی تاکخودایی بۆ بە گەردوونی بوونیش کراوەیە. خاوەن هەڵوێست و مەیلی تێپەڕکردنی سنووری تەسکی تیرەگەرێتییە، چونکە پێویستی تیرەکان بە یەکێتی بەردەوام تاکخودایی دەکاتە ناچارییەك. کاتێك تیرەکانی دیکەش بە هەمان رەوشدا دەرباز ببن، ئەوا بەلاوەنانی تەوتەم و بتە کۆنەکانی تیرە و بنەماڵەکان دەبێتە ناچارییەك. ئەمانە (تەوتەم، بت) ئیتر وەکو شێوەی پاشکەوتوو لەپێش یەکبووندا دەبن بە کۆسپ. بە گوێرەی ئەوەی پێشتر ئازارێکی زۆر بە دەست پادشا ـ خوداوەندەکان بینراوە، بۆیە زاراوەی ئەم خوداوەندە پێشدەکەوێت کە سەمبۆڵی یەکێتی هەمووانە، فریادرەسە، میهربانە، لەمیانەی ئەو ناکۆکی و پێویستی یەکبوونە، پێبەپێ شکۆدار دەکرێ، گەلێك تایبەتمەندێتی نوێی پێ دەبەخشرێ و دەکرێت بە خوداوەندێکی تاقانە و بێ هاوتا. لە کاتێکدا لە رابردوودا هەر تایبەتمەندێتیەکی سەرەکی لەمیانەی خوداوەندێکەوە گوزارەی لێدەکرا، وەلێ لەم ئایینە نوێیەدا تەواوی ئەم

تایبەتمەندانە وەکو تایبەتمەندێتی تاکخودا واتادار دەکرێت. نەوەد و نۆ تایبەتمەندێتی ئەڵڵا، ئەمە لە شارستانییەتی سۆمەریەکاندا وەکو تایبەتمەندێتی شارستانییەت لە شێوەی "**ما**" کان هەبووە کە بە واتای یاسا و داب و نەریت دێت.

ئەو نوێکاریەی موسا بۆ ئایینی تاکخودایی هێنای، بە شێوازێکی رادیکالانە تەواوی تیرە عیبرانیەکانی لە چەمکە کۆنەکانی تیرەگەرێتی دابڕاند و کردوویەتی بە ئایینی نەتەوەیی قەومێك یاهۆڤا (یەهوە) وەکو خوداوەندێکی میللی، لەمیانەی بە خۆوە گرێدانی تەواوی تیرە عیبرانیەکان ئەم پێکهاتەیەی کە گرێدراوی ئەو پێنج فەرمانە بوو کە وەکو سرووش (وەحی) بۆی هات، نوێنەرایەتی قۆناخێکی پێشکەوتوو دەکات. هەر لەبەر ئەوەی گوزارشت لەبەرەنگار بوونەوەی فیرعەونەکانی میسر دەکات، لایەنێکی ئازادیخوازیشی هەیە. لە راستیدا هێڵکاری ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی وەها دەکرێت کە بۆ یەکبوونی ئەو تیرانە سوودی لێ وەربگیردرێت کە پاشکەوتوون و رق و کاردانەوەیان بەرامبەر بابل و میسر هەیە. هەر لەبەر ئەوەی بە ناچاری لەگەڵ هەر دوو ناوەندی بەهێزی کۆیلەداری دەکەونە ناو پێکدادان و بەردەوام پێویستی پێیان هەبوو، کاریگەری و کاردانەوە بە ناو یەکدا چوون. ئەو توانستانەی لە هەر دوو ناوەندەوە بە دەستی دێنن بە گوێرەی تایبەتمەندێتی خۆیان دەیشێلن و شێوە بە ئایدیۆلۆژیایەکی نوێ دەدەن. ئەم ئایدیۆلۆژیایە بناخەی مێژوویی راستینەی عیبرانی یاخود ئیسرائیل پێکدێنێ و تێیدا شاراوەیە. دژایەتیکردنی سیستەمی کۆیلەداری، بەڵام نەبوونی هێز و تواناکاری دەرکەوتن لە ژێر کاریگەری و باڵادەستیەکەی بە درێژایی ئەم مێژووە عیبرانیەکان ناچاری نوێبوونەوە دەکات. رێچکەی ئەوە دەگرنە بەر لەمیانەی ئەو توانست و دەسکەوتانەی لە شارستانییەت وەریدەگرن لاوازیەکانیان بەلاوە بنێن و قەرەبووی بکەنەوە. ئەمەش لەپێشکەوتنی شارستانییەتدا نوێنەرایەتی رێبازێك دەکات.

سەرباری ئەوەی عیسا سەرچاوەی خۆی لە داب و نەریتی یەهوداوە دەگرێت، بۆیە نوێنەرایەتی جەمسەری دژ دەکات. هەروەکو چۆن ئیبراهیم لەمیانەی داب و نەریتی نەمرودەکانی بابل پێگەیشتوو لەسەر بنەمای دژایەتیکردنیان بەرەو ئاینێکی جودا هەنگاوی هاوێشت، عیساش گوزارشتی دابڕان لە یەهودیەتی فەرمی راهیبەکان دەکات کە لەگەڵ سیستەمی کۆیلەداری رۆما بوونەتە یەك و لە جیهانی هەژاران جیا بوونەتەوە. ئەم شوێنگەیەی لەهەمانکاتدا کۆت و بەندەکانی قەوم بەرەو تێکشکان دەبات. جیهانی رۆما کە سیستەمێکی گەردوونی ئاوا کردبوو زەمینە ماددیەکەی پێکهێناوە و رۆڵێکی بابەتیانەی بینیوە. لە کاتێکدا توێژەکانی سەرەوەی تیرە و قەومەکان دەکەونە ژێر کاریگەری رۆما و بەرەو بەکرێگیراوێتی ئاراستە دەگرن، هەرچی توێژە هەژارەکەیە ناچارە بە دوای چارەنووسی خۆیدا بگەڕێت. هەروەکو بڵێی زەمینەیەکی ئەنتەرناسیۆنالی جێگای باسە. دەرکەوتن و قەڵەمبازی عیسا لە بواری ویژدانییەوە جیهانی کۆیلایەتی رۆما بەرز دەکاتەوە. ئەوەش هەروەکو ئەو سۆسیالیستانە وایە کە بەرامبەر بە سەرمایەداری گوزارشت لە بەرژەوەندی چینی کارکەر دەکەن.

عیسا بەرامبەر سیستەمی کۆیلەداری زیاتر نوێنەرایەتی رابوونێکی ئایدیۆلۆژی و کۆمەڵایەتی دەکات. هێشتا چەمکی خوداوەندی سێیانە نەکراوە بە تاکخودایی؛ کاریگەری میسر و سۆمەری کۆن و تەنانەت نئۆلیتیکیش لە خۆوە دەگرێت. تەنیا بەم شێوەیە دەتوانێت یاهۆڤای خوداوەندی قەوم، تێپەڕ بکات. لەمیانەی ناسنامەی خوداوەندی قەوم، دەرفەتی ڤەبوونێکی ئەوتۆی نییە. کاهینە یەهودییەکان هەر لە زووەوە بە شێوەیەکی چڕ ئەم شانس و دەرفەتەیان رەخساندووە. ئایینی عیسا ئایینی فریادرەسییە. سیستەمی کۆیلەداری رۆما هێندەی فشار خستۆتە سەر ویژدانی مرۆڤایەتی، وایکردووە باوەڕی مەسیحی (فریادڕەس) چاوەڕوانکراو بەر لە دایکبوونی عیسا زەمینەیەکی ئایدیۆلۆژی بۆ بڕەخسێ. چاوەڕوانی ها ئەوەتا هات و دێت بەردەوامە و زیندووە. هەر سێ سەرچاوەی باوەڕییەکانی رۆژهەڵاتی ناوین لە قودس لە یەك بۆتەدا تواوەتەوە. هەڵبەتە داب و نەریتی یەهودی رەگی داکوتا بوو. داب و نەریتی هێلینی دوای ئەسکەندەر توێژێکی بە هێزی کۆمەڵایەتی لە نێوان یەهودی و یۆنانییەکان خوڵقاندبوو داب و نەریتی پارس ـ زەردەشتی هەر لە زووەوە کاریگەری بە هێزی خۆی لە ناوچەکەدا کرد بوو. قۆناخ بە تەواوی قۆناخی تەریقەتە سۆفیگەرایییەکانە. ئەوەی هاتۆتە ئاراوە جوڵانەوەیەکی ویژدانە. سیستەمی باڵادەستی گەردوونی رۆما، سیستەمی گەردوونی چەوساوەکان دەکاتە ناچارییەك. لە کاتێکدا رۆما سیستەمەکانی تیرە و پادشایەتیە بچووکەکانی پارچە دەکرد و بە خۆیەوە گرێدەدان، جەماوەرێکی فراوانی لە دواوە بەجێ دەهێشت کە سەربەخۆ و لە جیهانی خۆیاندا مابوونەوە. مرۆڤایەتی بە دوای خاوەن و خواوەندە نوێکەی دەگەڕێت. بە شێوەیەکی سەرەکی ناسنامەی عیسا سەرچاوەی خۆی لەم زەمینەوە دەگرێت. تواناکاری کەسێتی هێندە گرنگ نییە. چاوەڕانکردنی قۆناخ بۆ مەسیح تاوەکو ئاستی وتەبێژی خۆی بەرز دەکاتەوە. ئەم هەڵکشانە ئایدیۆلۆژییەی لەمیانەی مەسیحییەت بۆتە خاوەن ناوێکی گەردوونی، لە ناوەوە پێبەپێ رۆما دەخوات. بەرامبەر بەو بێ ویژدانیە مەزنەی لە ئارادایە مەسیحییەت دەبێتە ویژدانی نوێی مرۆڤایەتی. بەڵکو بۆ جاری یەکەمە پارتییەکی گەردوونی مرۆڤایەتی پێشدەکەوێت. دوای سێ سەد ساڵ ئەم پارتییە دەتوانێ لە ناوەوە رۆما (فەتح) بکات و سەربکەوێت، ئەوەی ئەنجامدراوە شۆڕشێکی (سپییە) بێ خوێن رشتنە. راستتر بڵێین، لە دایکبوونی شارستانییەتی دەرەبەگایەتییە کە رەوڕەوەی پێشکەوتنی کۆمەڵگا رێگای لەپێش کردەوە. شەڕی باوەڕی و جیاوازی ژیانی کۆمەڵایەتی کە لەسەرەتادا هەبوون، دواتر دەگۆڕێت و دەبێتە هێزێکی سیاسی.

کاتێك لە ساڵانی ٣٢٥ی زایینی وەکو ئایینی فەرمی راگەیێنرا، گۆڕانکاری مەزن لە گەوهەری شارستانییەتی رۆما روو دەدات. لە کاتێکدا شارەکانی کۆیلەداری دەرووخێن، ئیدی بەرەو ناوچە لادێییەکان دەچن و وەکو شێوەیەکی نوێی پەیوەندی بۆ مرۆڤایەتی دەزگای پەیوەندییەکانی خاك پێکدەهێنرێت کە پەیوەندییەکی نەرمی کۆیلایەتی لە خۆوە دەگرێت. ئەو شۆڕشە نوێیەی لە بواری کشتوکاڵیدا ئەنجامدراوە، گەڕانەوە بۆ سەردەمی نئۆلیتیك نییە، بەڵکو شێوەگرتنێکی نوێی شارستانییەتە کە لەسەر بنەمای ئامرازەکانی ئاسن هەڵکشاوە و تا رادەیەك مرۆڤ بە ژیانەوە گرێدەدات. ئیتر لە قۆناخەکانی دواییدا ئیمپراتۆرەکانی رۆما پێبەپێ دەستیان لە سیفەتی پادشای ـ خوداوەند بەردابوو. بێگومان رۆڵێکی مەزنی پروپاگەندەی ئایینی تاکخودایی و نەبوونی مرۆڤ بە خوداوەند هەیە، ئیتر خودا لەمیانەی پەردە و دەمامکە ئایینی و فەلسەفییەکان بەرەو ئاسمان بەدەرنراون و بەرز کراونەتەوە. ئەوەی دەخوازرێ لێرەدا شوێنگەکەی بەرتەسك بکرێتەوە فەرمانڕەوایەتی رەهای ئیمپراتۆرە. بە ئەندازەی ئەوەی خوداوەند لە مرۆڤ دوور بێت، تا ئەو رادەیە ئازادی بەدەست هێناوە.

لە کاتێکدا مامەڵە و هەڵسوکەوتێکی بەمجۆرە بەرامبەر خوداوەندی فەرمی دەکرێت، گنۆستییەکان (رۆحانییەکان) و سۆفیگەرایییەکان پەنا دەبەنە بەر چەمکی خوداوەندی دۆستی مرۆڤ و لە راستیدا"**ئەنا ئەلحەق، من خوداوەندم، لەگەڵ خودا ئاوێتە بووم**" بەرامبەر بە نوێنەرایەتی فەرمی سیاسی، چەمیکێکی نافەرمییە. بە واتای پەنابردنی چینی ژێر بۆ داب و نەریتە ئایینیە کۆنەکانی خۆی دێت. لە جیاتی خوداوەندێك کە لەگەڵ مرۆڤدا نامۆیە و بەسەریدا زاڵە و سزای دەدات، ئەم چەمکەی کە خۆی لەگەڵ خودا یەکانگیر دەکات، لەسەرەتادا بە شێوەی "**کوڕی خودا**" لەلایەنی عیساش پەیڕەو دەکرێت. بە واتایەك عیساش سۆفیگەرایە، (رۆحانیە) گنۆستیکە. دواتر لەمیانەی فەلسەفەی ئەفلاتون و ئەرستۆ ئەم چەمکە دەگۆڕدرێت. ئەمەش لە کەسایەتی عیسادا بە شێوازێکی گەردوونیانە مەیلی تەواوی هەژاران لە بۆتەیەکدا کۆ دەکرێتەوە و رێ لەپێش شارستانییەتێکی پایەدار دەکاتەوە، بەڵام ئەوەی گرنگە سەرەڕای ئەم ئاستە بەرزەی، رزگار بوونێکی سنووردار دێتە ئاراوە.

ئەمە مسۆگەرە مەسیحییەت رۆڵێکی مێژوویی لە شێوەگرتنی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی بینیوە. لە بواری باوەڕی و ئەخلاقییەوە کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر چارەنووسی مرۆڤایەتی کردووە؛ بۆ بەلاوەنانی جیهانی کۆیلەداری، فیداکاری و بەرخودان دەکات و ئێش و ئازاری مەزن دەبینێ و چەرخی ناوینیان ئامادە کردووە. ئەمە راستینەیەکە کە وەکو دەستە و رەوتێکی سادەی ئایدیۆلۆژی کەوتنە جموجۆڵ و بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن لە سیاسەت و زمانی توندوتیژی دوور بوون. ژیانی کۆمەڵکاری و خەڵوەتی ناو مانەستەر و کڵێسە، هەمان رۆڵی ژیانی سیستەمی پەرستگای راهیبەکانی سۆمەری بینیوە کە سیستەمی کۆیلەداریان ئافراند. ئەم پێکهاتانە بوونەتە ئەو فێرگەیانەی کە کۆمەڵگای نوێ تێیدا شێوە دەگرێت و دەسەڵات و ژیانی ئەلتەرناتیفی تێدا ئامادە دەکرێت. مانەستەر و کڵێسەکان لە شوێنی عیبادەت زیاتر، شوێنی پەروەردە کردن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای نوێیە. بەردەوامی مۆدێلی سۆمەرە. بێگومان

لەبەر ئەوەی لەناو پەیوەندییەکانی فەرمانڕەوایەتی ڕۆمادا ژیاون، بەدرێژایی قۆناخ کاریگەرییەکی زۆریان کراوەتە سەر. بێگەردی دەستپێکیان لە دەست داوە، ئیتر پێبەپێ خۆشیان وەکو ڕۆمایان لێهاتووە. کاریگەری و کاردانەوە دوو لایەنەیە. ئەو بەرهەمەی کە هاتۆتە ئاراوە سەنتێزێکە.

لە بڕیارگای ڕۆژهەڵاتی شارستانییەتی کۆیلەداریش لە میزۆپۆتامیا، جولانەوەیەکی هاو شێوەی عیسا لە کەسایەتی مانیدا دەردەکەوێت. هەروەکو دەزانرێ خواستی کولتوورەکانی هێڵێنیزم و مەسیحییەت و زەردەشتایەتی لە سەنتێزێکی پێشکەوتوودا کۆبکاتەوە و مەودایەکی چاکیشی بڕی. جولانەوەی ئایدیۆلۆژی مانی کە لەساڵی ٢١٦ی زایینی لەگەڵ ئیمپراتۆرییەتی ساسانی لەهەمانکاتدا هاتنە دونیاوە، ئەگەر بیتوانیبایە چینی پاشڤەڕۆی ڕاهیبەکان بەلاوە بنێت، ئەوا شیمانە هەبوو ئیمپراتۆرییەتی ساسانی تاوەکو ڕۆما ڕەنگ بداتەوە. مانییزم لە دۆگماکانی ئایینە تاکخوداییەکان جیاوازتر بوو، دەیتوانی لێشاوێك پێك بێنێ لە ڕێنسانسی ئەورووپا بچێت. هەر زوو دەیتوانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین هەنگاوێکی شارستانییەتی وەکو شێوازی ئەورووپا بهاوێژێت. لە دایکبوونی پێش وەخت، داب و نەریتی بەهێزی دەوڵەتی کۆیلەداری و ڕاهیبە پاشڤەڕۆ و فەرمییەکانی زەردەشتی کە وەکو کاهینە پاشڤەڕۆکانی یەهودیەکان وابوون، ڕێگایان پێنەدا و دەرفەتی گەیشتنە دەسەڵاتی جولانەوەکەیان نەهێشت و دووچاری گەلێك سزادان و ئەشکەنجەی بێ ڕەحمانەیان کردن. ئەم موحافەزەکاریە ئایدیۆلۆژییەی ئیمپراتۆرییەت، هەم بەرامبەر بێزەنتیەکان هەم بەرامبەر ئەو ئیسلامیەتەی تازە دەردەکەوت، نەیتوانی بەرگە بگرێت و لەسەر پێیان بمێنێتەوە. پێکهاتەیەکی ئایدیۆلۆژی پاشڤەڕۆ تەنانەت بەهێزترین ئیمپراتۆرییەتیش لە پەلوپۆ دەخات و لە ناوخۆیدا دەیڕزێنێ، بەمجۆرەش بۆ چارەنووسێك بەجێ دەهێڵدرێ کە لەمیانەی چەند هێرشێك گیان لە دەست بدات.

ئەو ناسنامە ئایدیۆلۆژیانەی لە هەناوی سیستەمی کۆیلەداریدا شێوەیان گرتووە لە شەڕەکانی سیستەمدا وەکو ڕەوتی پێشەنگ ڕۆڵ دەبینن. ڕابوونی هزری و ویژدانی دژ بە سیستەم لە ریزی پێشەوە دێت و چەندە بە جەماوەری دەبێت، هێندە شانسی خوڵقاندن و داهێنان بەرزتر دەبێتەوە. دوای چەند شەڕێکی لەپێشینە یان ئەو سیستەمەی بەرامبەری دەرووخێنێ، یاخود لەمیانەی وەرچەرخانەوە دەستی بەسەردا دەگرێت. بەڵام بەر لەوەی هێزی مەسیحییەت تەواوی گەندەڵییەکانی کۆیلەداری پاك بکاتەوە، قەڵەمبازی ئیسلامییەت سەرهەڵدەدات. لەوانەیە تەنیا مەسیحییەت تێر نەکات. وەرچەرخانی ڕادیکالانە چاوەڕوانی ڕێبەرایەتییەکی ئایدیۆلۆژی و کرداری ڕیشەدارترە. ئیسلامییەتیش وەکو مەسیحییەت تەنانەت درەنگ تر، لەسەر ڕێی ئایینە تاکخوداییەکان و بە تایبەتیش لە ژێر کاریگەری ڕاهیبە نەستورییەکانی ئاشووری و تیرە یەهودیەکان، وەکو دواترین و گەورەترین تەڤینەوەی عەرەبە بەدەوییەکان شێوەی گرت و لە کەسایەتی مەحەمەد دا پێغەمبەری دوایی خۆی خوڵقاندو ڕۆڵی یەکێك لە کۆڵەکە بە هێزەکانی مێژووی بینی.

شیکردنەوەی ئایدیۆلۆژی ئیسلامییەت، تەنیا بۆ واتا مێژووییەکەی پێویست نییە، ئەوا بۆ شیکردنەوەی کۆمەڵگا ئیسلامییەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان گرنگییەکی مەزن لە خۆوە دەکرێت. تاوەکو ئێستاش دەرك بەوە نەکراوە کە ئیسلامییەت چ جۆرە کەسایەتییەکی خوڵقاندووە. زیاتر وەکو ئایینێکی (جهاد) غەزا کردن، بەمجۆرە باس دەکرێت کە لایەنە سەربازییەکەی لەپێشە، هەرچی ناسنامە ئایدیۆلۆژی و کۆمەڵایەتییەکەیەتی بە شاراوەیی ماوەتەوە. هەرچەندە پێچەوانەکەی بانگەشە بکرێت، بەڵام تاوەکو ئێستا ئیسلام نهێنییەکە و شاراوەیە. وەکو ئایین و سیاسەتیش، تاوەکو ئێستا ڕووەکانی ناوەوەی شینەکراوەتەوە. ڕووی نهێنی و ئاشکرای (تاریکی و ڕووناکی) هێندە بە ناو یەکتردا تێکچرژاون، کە لە ڕاستیدا وەکو پێغەمبەری دوایی و ئایینی تاکخودایی، بە واتای کۆتایی هاتنی قۆناخی ئایین دێت. تەواو بە پێچەوانەی بانگەشەکان، لەگەڵ ئەوەی گەوهەری ئایینی ئیسلامییەت و تاکخودایی دەمامکێکی ئایدیۆلۆژی زۆر لاوازن، وەلێ وەکو ئایینێك بەرجەستە بووە کە لایەنی سیاسی و سەربازییەکەی زاڵترە.

ئیسلامییەت وەکو ئایدیۆلۆژیای سێیەمین قۆناخی وەرچەرخانی میتۆلۆژیای سۆمەرخاوەنی تایبەتمەندێتی فرە ڕەنگی قۆناخەکانە. سەرەڕای هەوڵەکانی حەزرەتی مەحەمەد لەمیانەی قاڵبوونەوە قووڵ و مەزنەکانی، ئەوا لە گەیاندنی ئەو میتۆلۆژیا و ئەو دوو ئایینە مەزنەی ڕێی لەپێشدا کردەوە بە ناسنامەیەکی جیاوازتر سنووردار ماوە. بەڵام ناتوانرێ نکۆڵی لەوە بکرێت کە لە ئەنجامدانی وەرچەرخانێکدا سەرکەوتنی بە دەست هێنا، ناتوانرێ بچووك بکرێتەوە.
لة نزيكةوة سةيركردن و بةدواداضووني ئاييني تاكخودايي و زاراوةي ئةللآ كة ئيَشةنطايةتي ئايديؤلؤذي سةردةمي دةرةبةطايةتين و شيكردنةوةي واتا كؤمةلآيةتييةكانيان، هيَندةي ئةو قؤناخةي تيَيدا هاتنة دونياوة، طرنطن. لةئيَناو رؤشنطةري رؤذهةلآتي ناوين و سةرلةنويَ لة دايكبوون، ثيَويست دةكات ئةو كؤنكريَتة بشكيَنريَ و فريَبدريَت و كةرةستةكان بة شيَوةيةكي راست بةكار بهيَنريَت.